# وتاری ژماره (٥) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

بەڕێزان لەم وتاردا هۆی دابەزینی چەند ئایەت لە سوڕەتی البقره باس دەكەین.

## هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٨٨ ) سوڕەتی ( البقره )

﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلْفُۢ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ٨٨﴾ البقره

واتە: وە (جوولەكەكان) وتیان(بە پێغەمبەر دڵمان داپۆشراوە( لەپۆرگایە قسەی تۆی ناگاتێ)(نەخێر وانیە ) بەڵكو خوا نەفرینی لێ كردن بەهۆی بێ بڕوایی یانەوە بۆ یەكەم جار بڕوا دەهێنن – كەمیان هەیە بڕوا بهێنن.

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

عن ابن عباس قال: قالت اليهود قلوبنا مملوءة علما لا نحتاج إلى علم محمد ولا غيره بل هي غلف فنزلت (بَلْ لَعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِم) العجاب في بيان الأسباب المؤلف: أبو الفضل أحمد بن علي ابن حجر العسقلاني (المتوفى: ٨٥٢هـ)

واتە: ئیبنو دەڵێ: جوولەكە گوتیان: دڵمان پڕە لە زانست پێویستیمان بە زانستی (محمد) و غەیری ئەویش نیە، بەڵكو دڵمان داخراوە بۆ ئەو مەبەستە ، ئەو ئایەتە دابەزی (بَلْ لَعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِم) واتە: لەعنەتی خوایان لێ بێ بەو كوفرەی دەیكەن.

سیفاتی پێغەمبەر لە تەوراتدا:

((عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ لَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قُلْتُ أَخْبِرْنِي عَنْ صِفَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي التَّوْرَاةِ قَالَ أَجَلْ وَاللَّهِ إِنَّهُ لَمَوْصُوفٌ فِي التَّوْرَاةِ بِبَعْضِ صِفَتِهِ فِي الْقُرْآنِ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا وَحِرْزًا لِلْأُمِّيِّينَ أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي سَمَّيْتُكَ المتَوَكِّلَ لَيْسَ بِفَظٍّ وَلَا غَلِيظٍ وَلَا سَخَّابٍ فِي الْأَسْوَاقِ

وَلَا يَدْفَعُ بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَغْفِرُ وَلَنْ يَقْبِضَهُ اللَّهُ حَتَّى يُقِيمَ بِهِ الْمِلَّةَ الْعَوْجَاءَ بِأَنْ يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَيَفْتَحُ بِهَا أَعْيُنًا عُمْيًا وَآذَانًا صُمًّا وَقُلُوبًا غُلْفًا) رواه البخاري

(معاني الكلمات (أجل) حرف جواب مثل نعم. (شاهدا) لأمتك بتصديقهم وعلى الكافرين بتكذيبهم. (مبشرا) للمؤمنين. (نذيرا) للكافرين / الأحزاب ٤٥ /. (حرزا للأميين) حصنا للعرب. (المتوكل) المعتمد على الله تعالى. (بفظ) سيء الخلق. (غليظ) شديد في القول. (سخاب) يرفع صوته على الناس. (يقيم الملة العوجاء) ينفي الشرك ويثبت التوحيد. (عميا) لا تبصر الحق. (صما) لا تسمع دعوة الخير. (غلفا) غطتها ظلمة الشرك]

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٨٩ ) سورەتی ( البقرە )

(وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٨٩ )البقرە

مانای ئایەتەکە(جوولەکە چاوەنواڕی پێغەمبەر بوون، کە هاتیش باوەڕیان پێنەکرد! بەڵێ.. جوولەکە بەر لەهاتنی پێغەمبەر (صلی اللـه علیـه وسلم) هەڕەشەیان لەموشریکەکان دەکرد کە: بەم زوانە پێغەمبەرێ دێ و، لەژێر بەیداخی ئەودا جەنگیان لەگەڵ دەکەن، جا کەهاتیش درۆیانکردو باوەڕیان نەهێنا، بۆیە دەفەرموێ: هەرکە لەلایەن خواوە کتێبێکیان بۆهات کەپشتگیری ئایەتەکانی تەوراتیشی دەکردو مژدەی بەهاتنی پێغەمبەریش دەدا بەمەرجێ بەر لەهاتنی ئەوکتێبە مژدەیان بەهاتنی دەداو دەیانویست لە ژێر بەیداخی ئەودا بەسەر بێ باوەڕاندا زاڵبن کەچی هەرکە ئەو پەیامبەرەیەهات، کەپێشتریش ئەیانناسی ولە

تەوراتدا پێناسەی کرابوو، بڕوایان پێنەکردو پشتیان تێکرد دەسا نەعلەت ونەفرینی خــوا لەســەر ئەوجوولەکــە بــێ باوەڕانــە بێــت کــە باوەڕیــان پێنــەکرد ودرۆیانکرد(تەفسیری ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

( قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ كَانَتْ يَهُودُ خَيْبَرَ تُقَاتِلُ غَطَفَانَ، فَكُلَّمَا الْتَقَوْا هُزِمَتْ يَهُودُ خَيْبَرَ، فَعَاذَتِ الْيَهُودُ بِهَذَا الدُّعَاءِ وَقَالَتْ: اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ بِحَقِّ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي وَعَدْتَنَا أَنْ تُخْرِجَهُ لَنَا فِي آخِرِ الزَّمَانِ إِلَّا نَصَرْتَنَا عَلَيْهِمْ، قَالَ: فَكَانُوا إِذَا الْتَقَوْا دَعَوْا بِهَذَا الدُّعَاءِ، فَهَزَمُوا غَطَفَانَ، فَلَمَّا بُعِثَ النَّبِيُّ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – كَفَرُوا بِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَكَانُوا مِنْ قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا) أَيْ بِكَ يَا مُحَمَّدُ، إِلَى قَوْلِهِ: (فَلَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْكَافِرِينَ) وَقَالَ السُّدِّيُّ: كَانَتِ الْعَرَبُ تَمُرُّ بِيَهُودَ فَيَلْقَوْنَ مِنْهُمْ أَذًى، وَكَانَتِ الْيَهُودُ تَجِدُ نَعْتَ مُحَمَّدٍ فِي التَّوْرَاةِ، وَيَسْأَلُونَ اللَّهَ أَنْ يَبْعَثَهُ فَيُقَاتِلُونَ مَعَهُ الْعَرَبَ، فَلَمَّا جَاءَهُمْ مُحَمَّدٌ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – كَفَرُوا بِهِ حَسَدًا، وَقَالُوا: إِنَّمَا كَانَتِ الرُّسُلُ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَمَا بَالُ هَذَا مِنْ بَنِي إِسْمَاعِيلَ) يؤيده ما أخرجه ابن جرير (١/٣٢٥) وابن أبي حاتم (لباب النقول: ٢١) وأبو نعيم في "الدلائل " (١/١٩) من طريق ابن إسحاق بسنده عن ابن عباس رضي الله عنهما أن يهود كانوا يستفتحون على الأوس والخزرج برسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قبل مبعثه، فلما بعثه الله من العرب كفروا به وجحدوا ما كانوا يقولون فيه ... الحديث. وإسناده حسن، ويشهد له: ما أخرجه ابن جرير (١/٣٢٥) وابن المنذر وأبو نعيم (فتح القدير: ١/١١٣) والبيهقي في "الدلائل" (٢/٧٥) من طريق إسحاق عن عاصم بن عمر بن قتادة عن أشياخ من الأنصار بمعناه. وحسنه الوادعي (الصحيح المسند: ٢) (اسباب النزول ت الحميدان) أسباب نزول القرآن / الواحدي

واتە: ئیبنو عەباس دەڵێ جوولەکە شەڕیان دەکرد لەگەل هۆزی غەتـەفان ، کـاتی ڕووبەڕووی یەکتر دەبونەوە جوولەکە دەشکان ، بەڵام جوولەکە پەنایان دەگرت بەو دوعایـە دەیـانگوت خودایـە لێـت دەپاڕێنـەوە بـە راسـتی ئـەو پێغەمبـەرەی نەخوێندەوار کە بەلێنت داوە لە ئاخیر زەمان ڕەوانەی بکەی ، سەرمان بخەی، خوا سەری دەخستن بەسەر غەتەفان بـەم دوعایـە ، کەچـی کـە خـوا ئـەو پێغەمبـەرەی ڕەوانە کرد، باوەڕیان پێ نـەهێنا، جـا خـوا ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد (وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ )

وەهەروەها سـوودی (کـە زانایەکـە) دەڵـێ عەرەبـەکان جوولەکـەیان ئـازار دەدان ، جوولەکەش وەسفی پێغەمبەریان لە تـەورات دەدیـت ، لـەخوا دەپارانـەوە خـوا زوو ئـەم پێغەمبـەرە رەوانـە بکـات تـاکو لەگـەڵ عـەرەب بجـەنگێن و پشـتگیری ئـەم پێغەمبەرە بکەن ، بەڵام کە خوا پێغەمبەری ئێمەی رەوان کـرد ، پـاش گەزبونـەوە گوتیان ئەبێ ئەم پێغەمبەرە لە نەوەی جوولەکە بێ ، نەك لـە نـەوەی ئیسـماعیل ، ئەوەش تـەنها لەبەر حەسوودی .

مانای ئەم رستە (يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا: أَيْ يَطْلُبُونَ مِنْ أَنْفُسِهِمُ الْفَتْحَ عَلَيْهِمْ (يَسْتَفْتِحُونَ اي يَسْتَنْصِرُونَ ) واتە: بۆخۆیان دەپارانەوە بەسەر ئەواندا زاڵ بکرین .

**ئایا لە کام جەنگ بوو پێغەمبەر بە موسڵمانانی فەرمووی هەموو عەرەب لێتـان کۆبونەوە؟**

وەڵام : لە شەڕی ئەحزاب بوو .

ئایا بۆچی پێغەمبەر هەوڵی دا صولح لەگەڵ هۆزی غەتەفان بکات ؟

وەلاَم : پـاش ئـەوەی جوولەکـە و قـوریش و هـۆزی غەتـەفان هـەموو بەرامبـەر موسڵمان بوونە یەك ، لەپاش قوریش غەتەفان گـەورەترین هێـز بـوون ، پێغەمبـەر ویستی دوژمنـانی کـەم کاتـەوە ، بۆیـە کەوتـە گفتوگۆ لەگـەڵ غەتـەفان ، گوتیانـە پێغەمبەر بۆ ماوەی ساڵێك نیوەی بەروبومی مەدینـە بـۆ ئێمـەی بـێ ئـەوجا ئێمـە لەهاوپیمانی قوریش و جوولەکەی (بـني قوریظـة) دەکشـێنەوە ، ئـەویش فـەرمووی سێیەکی بەروبومتان ئەدەمێ ، هەردوو لا رازی بـوون ، تـەنها مـابوو ئیمـزا بکـرێ ، بـەلاَم پێغەمبـەر ڕاوێـژی بـە هـەر دوو (سـعد ) کـرد، بـۆ صـولح لەگـەڵ غەتـەفان ،ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەر ی خوا ئایا فەرمانی خوایە یان بـۆ بەرژەوەنـدی ئێمەتـە ، فـەرمووی : بـۆ بەرژەوەنـدی ئێوەمـە چـونکە هـەموو عـەرەب لێتـان کۆبونـەوە ، گوتیـان کـاتێ ئێمـە لەسـەر شـیرك وکـوفر بـووین ئـەوان تـەماعیان لەبەربومی ئێمە نەکردووە ، مەگەر بە پارە یان میوانداری ، پاش ئەوەی خـوا ئێمـە بە تۆ و ئیسلامەوە عـەزیز کـردوە ، سـوێند بـەخوا لـە شمشـێر زیاتریـان نـادینێ ، فەرمووی من بۆ بەرژەوەندی ئێوەم بوو ، بەلاَم مادام لە خۆتان رادەبینن لێ گەرێن .(پۆختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا لاپەرە (٥٨٥)

**( موسڵمان بوونی ( نوعەیمی کوڕی مەسعود )ی غەتەفانی :**

**لەسیرە ئیبنو هیشامدا دەڵێ** (إنَّ نُعَيْمَ بْنَ مَسْعُودِ غَطَفَانَي ، أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إنِّي قَدْ أَسْلَمْتُ، وَإِنَّ قَوْمِي لَمْ يَعْلَمُوا بِإِسْلَامِي، فَمُرْنِي بِمَا شِئْت، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إنَّمَا أَنْتُ فِينَا رَجُلٌ وَاحِدٌ، فَخَذِّلْ عَنَّا إنْ اسْتَطَعْتَ، فَإِنَّ الْحَرْبَ خُدْعَةٌ) **ابن هشام**

نوعەیمی کوڕی مەسعودی غەتەفاتی هاتە لای پێغەمبەر ، گوتی ئـەی نێـرراوی خـوا من موسڵمان بوویمە ، هۆزەکەشـم نـەیان زانیـوە ، چ فـەرمانێکم پـێ دەکـەی بـۆت بکەم ، پێغەمبەریش فەرمووی ئەگەر ئێستا تۆ بێتە ناو ئێمە ، تەنها یەك کەسی و یـەك نەفـەر بـۆ ئێمـە زیـاد دەبـێ ، بـەڵکو ئەگـەر پێـت دەکـرێ ، دوژمنـەکانمان پەرتەواز بکە ، چونکە جەنگ فێڵە .

## کارە گرنگەکەی ( نعیم ) :

سـەرەتا دەچـێتە لای (بـني قوريظـة) دەڵـێ ئێـوە دەزانـن مـن دڵسـۆزی ئێـوەم ، کارێکتان پێ دەڵێم ئێوە بیشارنەوە ، ئێوە چاك دەزانن قـوریش و غەتـەفان وەکـو ئێـوە نـین ، خـەڵکی ئێـرە نـین ، دوای شـەڕ ئـەوان دەگەڕێنـەوە مـاڵی خۆیـان ، موحەممەدو هاوەڵانی تۆڵەتان لێ دەکەنەوە ، جا من بۆتان پێشنیار دەکـەم ئێـوە داوا بکـەم هەنـدێ لەسـەرکردەکانیان بـە رەهـن لـە لای ئێـوە دابنـێن تـاکو دوای رانەکەن و ئێوە بەتەنیا بەجێ نەهێلن ، ئەوانیش قسەکەی نوعیمیان پەسـند کـرد و گوتیان قسەیەکی جوانە .

دوای نوعـەیم دەچـێتە لای قـوریش و غەتـەفان ئـەڵێ بیسـتومە (بـني قوريظـة) پەشـیمان بوینـەوە لـە هاوپیمـانی ئێـوە ، وە تـاکو موحەممـەد عـەفویان بکـات ، بـەنیازن چـەند سـەرکردیەك لـە ئێـوە وەربگـرن تەسـلیمی موحەممـەدیان بکـەن و بیانکوژن ،جا ئەگەر داوای چەند سەرکرەیەکیان وەك بارمتـە و رەهـن مەیانـدەنێ ، بەڵام ئێوە ئەو شتە بشـارنەوە لای کـەس باسـی مەکـەن ، قـوریش و غەتـەفان زۆر سوپاسان کرد .

ڕۆژی هێرش کردن شەممە دەبێ ، قـوریش و غەتـەفان هـەواڵ دەنێـرن بـۆ (بـني قوريظة) دەڵێن دەبێ ڕۆژی شەممە هێرش بکـەین ، ئـەوانیش دەڵـێن ئێمـە شـەممە ناشکێنین ، چونکە جوولەکە لە شـەممان هـیچ شـتێك ناکـات ، تـاکو ئێـوە هەنـدێك بارمتەمان نەدەنێ ، چونکە دوای ئێوە ئێمـە بـەجێ دەهـێڵن ، قـوریش و غەتـەفان دەڵێن دیارە بۆچونەکەی (نعيم) ڕاستە ، بەم شێوە ئەوانە بارمتە نانێرن ، ئەوانیش بەشداری شەڕەکە ناکەن ، بەم شێوە بێ مەتمانە لە نێوانیاندا دروست دەبێ ) بـەم شێوە نوعەيم توانی پەیوەندی نێوان جوولەکەو قوریش تێکبدات ، ئەمەش هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ تێکشکانی قـوریش و غەتـەفان ) پوختـەی ژياننامـەی پێغەمبـەری خوا (لاپەڕە ٥٨٨)

## هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٩٤ ) سورەتی ( البقره )

﴿ قُلۡ إِن كَانَتۡ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةٗ مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٩٤﴾

واتە: ئەی موحەممەد بڵێ: ئەگەر ماڵی دوایی(بەهەشـت) بـۆ ئێوەیـە لای خـوا(وەك خۆتان دەڵێن) بەتایبەتی بێ ئەوەی کەس ببێ بـە هاوبەشـتان کەواتـە داوای مـردن بکەن ئەگەر ڕاست گۆن.

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

أخرج ابْن جرير عَن أبي الْعَالِيَة قَالَ (قَالُوا لن يدْخل الْجنَّة إِلَّا من كَانَ هود أَو نَصَارَى) (الْبَقَرَة الْآيَة ١١١) وَقَالُوا (نَحن أَبنَاء الله وأحباؤه) (الْمَائِدَة الْآيَة ١٨) فَأنْزل الله (قل

إن كَانَت لكـم الـدَّار الْآخِـرَة عِنْـد الله خَالِصَـة مـن دون النَّـاس فتمنـوا الْمَـوْت إِن كُنْـتُم صَادِقين) فَلم يَفْعَلُوا) الدر المنثور للسيوطي

واته: جووله و گاور گوتیان : ناچێته بەهەشت ئەو جووله‌کەوگاور نەبێ، وە گوتیـان : ئێمه خۆشەویستی خواین ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزانـد (قل إِن كَانَت لكـم الدَّار الْآخِرَة عِنْد الله خَالِصَة من دون النَّاس فتمنوا الْمَوْت إِن كُنْتُم صَادِقين)

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٩٧) سورەتی (البقره)

﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ٩٧﴾ البقرة

مانای ئایەتەکە (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ: هـەر کەسـێك دوژمـنی جوبرەئیل بێت(ئەوە دوژمنی خوایە) چونکە ئەو بە فەرمانی خوا قورئانی هێناوەتـە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ بەپشتیوانی نامەکانی پێش خـۆی وە بـە ڕێنمـوونیی کـەرو مژدە دەر بۆ بڕواداران) پوختەی تەفسیر

**ئایا هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو ؟**

١- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَقْبَلَتْ يَهُودُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: يَا أَبَا الْقَاسِمِ إِنَّا نَسْأَلُكَ عَنْ خَمْسَةِ أَشْيَاءَ، فَإِنْ أَنْبَأْتَنَا بِهِنَّ، عَرَفْنَا أَنَّكَ نَبِيٌّ وَاتَّبَعْنَاكَ، فَأَخَذَ عَلَيْهِمْ مَا أَخَذَ إِسْرَائِيلُ عَلَى بَنِيهِ، إِذْ قَالُوا: اللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ، قَالَ: (هَاتُوا) قَالُوا: أَخْبِرْنَا عَنْ عَلامَةِ النَّبِيِّ، قَالَ: (تَنَامُ عَيْنَاهُ، وَلا يَنَامُ قَلْبُهُ) قَالُوا: أَخْبِرْنَا كَيْفَ تُؤَنِّثُ الْمَرْأَةُ، وَكَيْفَ تُذْكِرُ؟ قَالَ: (يَلْتَقِي الْمَاءَانِ، فَإِذَا عَلَا مَاءُ الرَّجُلِ مَاءَ الْمَرْأَةِ أَذْكَرَتْ، وَإِذَا عَلَا مَاءُ الْمَرْأَةِ مَاءَ الرَّجُلِ آنَثَتْ) قَالُوا: أَخْبِرْنَا مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى

نَفْسِهِ؟ قَالَ: كَانَ يَشْتَكِي عِرْقَ النَّسَا، فَلَمْ يَجِدْ شَيْئًا يُلائِمُهُ إِلا أَلْبَانَ كَذَا وَكَذَا – قَالَ أَبِي: قَالَ بَعْضُهُمْ: يَعْنِي الْإِبِلَ ( فَحَرَّمَ لُحُومَهَا) ، قَالُوا:

صَدَقْتَ، قَالُوا: أَخْبِرْنَا مَا هَذَا الرَّعْدُ؟ قَالَ: (مَلَكٌ مِنْ مَلائِكَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مُوَكَّلٌ بِالسَّحَابِ بِيَدِهِ – أَوْ فِي يَدِهِ – مِخْرَاقٌ مِنْ نَارٍ، يَزْجُرُ بِهِ السَّحَابَ، يَسُوقُهُ حَيْثُ أَمَرَ اللَّهُ) قَالُوا: فَمَا هَذَا الصَّوْتُ الَّذِي نَسْمَعُ؟ قَالَ: (صَوْتُهُ) قَالُوا: صَدَقْتَ، إِنَّمَا بَقِيَتْ وَاحِدَةٌ وَهِيَ الَّتِي نُبَايِعُكَ إِنْ أَخْبَرْتَنَا بِهَا، فَإِنَّهُ لَيْسَ مِنْ نَبِيٍّ إِلا لَهُ مَلَكٌ يَأْتِيهِ بِالْخَبَرِ، فَأَخْبِرْنَا مَنْ صَاحِبُكَ؟ قَالَ: (جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلامُ) ، قَالُوا: جِبْرِيلُ ذَاكَ الَّذِي يَنْزِلُ بِالْحَرْبِ وَالْقِتَالِ وَالْعَذَابِ عَدُوُّنَا، لَوْ قُلْتَ: مِيكَائِيلَ الَّذِي يَنْزِلُ بِالرَّحْمَةِ وَالنَّبَاتِ وَالْقَطْرِ، لَكَانَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ) (البقرة: ٩٧) إِلَى آخِرِ الْآيَةَ) رواه احمد (قال الهيثمي في مجمع الزوائد ج٨ ص٢٤٢ رواه أحمد والطبراني ورجاله ثقات وأخرجه أبو نعيم في الحلية ج٤ ص٣٠٥ ،كما في التاريخ الكبير للبخاري

واته : ئیبنو عەباس دەڵێ : جوولەکەکان هاتنە لای پێغەمبەری خوا ، گوتیان ئەی باوکی قاسم ئێمە پێنج پرسیارت لێ دەکەین ، ئەگەر هەواڵت پێ داین ، ئەوە دەردەکەوێ ئەتو پێغەمبەری و بە دوات دەکەوین ، پیمانت پێ دەدەین وەك چۆن نەوەی ئیسرائیل پیمانیان بە پێغەمبەری خۆیان دا ، فەرمووی پرسیارەکانتان بکەن گوتیان نیشانەی پێغەمبەرایەتی چییە؟ پێغەمبەر فەرمووی چاوەکانی دەخەون بەلاّم دلّی ئاگادارە ، گوتیان ئەدی چۆن منداڵ دەبێتە کچ و کوڕ ؟ فەرمووی کاتێ ئاوی ژن و پیاو تێکەڵ دەبێ ، ئەگەر ئاوی پیاو بەسەر ئاوی ژندا زاڵ بوو منداڵەکە دەبێتە کوڕ ، بەلاّم ئەگەر ئاوی ژنەکە زاڵ بوو بەسەر ئاوی پیاوەکە منداڵەکە دەبێتە کچ ،گوتیان ئەدی یەعقوب پێغەمبەر چی لەسەر خۆی حەرام کردبوو کاتێ نەخۆشی بوو ، فەرمووی گوشت و شیری وشتری لە خۆ

حەرام کرد ، گوتیان راست دەکەی ، گوتیان هەواڵمان پێ بدە ئەو بروسکە چییە لە هەور پیدا دەبێ ؟ فەرمووی ئەوە فریشتەیەکە راسپێدراوە گورزێکی بە دەستە، لێدەدا و لێی دەخورێ ، گوتیان ئەدی ئەو دەنگە چیە؟ فەرمووی ئەو دەنگی لێدانەیەتی ، گوتیان یەك شت ماوە پرسیارت لێ بکەین ئەگەر وەڵامت داینەوە دوات دەکەوین ، گوتیان هەموو پێغەمبەرێك هاوەڵێکی هەیە لە فریشتەکان وەحی بۆ دێنێ ، ئایا هاوەڵی تۆ کێیە؟ فەرمووی جوبریلە ، گوتیان جوبریل عایدی شەڕ و جەنگ و عەزابە دوژمنی ئێمەیە ، ئەگەر گوتبات میکائیلە شوێنت دەکەوتین ، چونکە ئەو عایدی رووك و رەحمەتە ، بۆیە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی : ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾

بۆ زانیاری (ئەوەی یعقوب لە خۆی حەرام کردبوو ، جولەکەکان هەر جارەو قسەیەکیان دەکرد، دەیانگوت ئەگەر تۆ راست دەکەی شوێنکەوتەی پێغەمبەرانی پێشووی بۆچی شت لە خۆت حەرام ناکەی وەك یعقوب ): (پێشەوا (ئەحمەد) لەوبارەیەوە فەرموودەیەکی درێژ ریوایەت دەکا، لەبەشێ لەو فەرموودەدا هاتووەو دەڵێت: یەعقووب نەخۆشییەکی سەختی گرت، پاشان نەزری کرد کە: ئەگەر خوا شفای بدات، جارێکی تر گۆشت وشیری وشتر نەخوا و پاریزی لێبکا، ئەگەرچی حەزیشی لێبکا، ئینجا خوا نەزرەکەی لێوەرگرت و، شفای نەخۆشییەکەی دا، ئیتر لەمەوە جوولەکەکانیش، چاویان لەوکردو گۆشت وشیری و شتریان لەخۆیان یاساغکرد! واتە: حەق نەبوو ئەوان ئەو گۆشتە لەخۆیان یاساغ بکەن، چونکە ئەو تەنها بۆ خۆی پارێزی لێکردو، هەر لەخۆی حەرامیکرد، جابۆ پتر زانیاری لێی، تەماشای تەفسیری (ئیبن کەسیر) بکە(رامان)

**هەندی زانیاری دەربارەی ئیشی مەلائیکەتەکان:**

١–جبریل وەحی دێنێ بۆ پێغەمبەران

٢–(میکال) سەرپەرشتی رووك و باران و ئاو دەكات

٣–(اسرافیل) عایدی فوکردنە بە کەرِنادا (صور)

٤– (مالك) دۆزەخەوانە سەرپەرشتی ئاگر دەكات

٥–(رضوان) بەهەشتەوانە

٦–(المنکر والنکیر) تایبەتن بە پرسیارکرندنی ناو گۆر

٧– (ملك الموت) فریشتەی گیان کێشان: لەگەڵ چەندین فریشتەی دیکە ، رووح دەکێشین.

**٨–هەیانە دەگەرین بۆ مەجلسی زکر**

**٩–هەیانە کردەوەکانی مرۆڤ تۆمار دەکەن لەسەر شانی مرۆڤن**

**١٠– هەیانە مرۆڤ دەپارێزن لە رووداوەکان .**

## هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠١) سورەتی (البقرە)

**﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ نَبَذَ فَرِيقٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ كَأَنَّهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ١٠١ ﴾** البقرە

واتە: کاتێك کە پێغەمبەرێکیان بۆ هات لەلایەن خواوە بەپشتیوانی تەوراتەکەیان دەستەیەك لەوانەی کە خاوەن نامەبوون نامەکەی خوایان فرِێ دایە پشت خۆیان(پشت گوێیان خست) وەك نەزانن کەئەوە نامەی خودایە.

## ئايا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

وَأخرج ابْن جرير عَن السّديّ فِي قَوْله (وَلما جَاءَهُم رَسُول من عِنْد الله مُصدق لما مَعَهم) الْآيَة قَالَ: وَلما جَاءَهُم مُحَمَّد صلى الله عَلَيْهِ وَسلم عارضوه بِالتَّوْرَاةِ فاتفقت التَّوْرَاة وَالْقُرْآن فنبذوا التَّوْرَاة وَأخذُوا بِكِتَاب آصف وسحر هاروت وماروت كَأَنَّهُمْ لَا يعلمُونَ مَا فِي التَّوْرَاة من الْأَمر بِاتِّبَاع مُحَمَّد صلى الله عَلَيْهِ وَسلم وتصديقه) الدر المنثور والعجاب

واته: دەڵێ کاتێ (محمد) یان بۆ هات ، ویستیان بە تەورات دژایەتی بکەن، بەلاَم کە زانیان تەورات و قورئان دژی یەك نین ، پەنایان برد بۆ کیتابی ئاسیف و سیحری هاروت و ماروت....)

## چەند دەقێك دەربارەی (سلێمان و شەیتانەکان):

١-( عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ إِذْ قَالَ: إِنَّ الشَّيَاطِينَ كَانُوا يَسْتَرِقُونَ السَّمْعَ مِنَ السَّمَاءِ، فَيَجِيءُ أَحَدُهُمْ بِكَلِمَةِ حَقٍّ، فَإِذَا جَرَّبَ مِنْ أَحَدِهِمُ الصِّدْقَ كَذَبَ مَعَهَا سَبْعِينَ كَذْبَةً، فَيُشْرِبُهَا قُلُوبَ النَّاسِ. فَاطَّلَعَ عَلَى ذَلِكَ سُلَيْمَانُ فَأَخَذَهَا فَدَفَنَهَا تَحْتَ الْكُرْسِيِّ، فَلَمَّا مَاتَ سُلَيْمَانُ قَامَ شَيْطَانٌ بِالطَّرِيقِ فَقَالَ: أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى كَنْزِ سُلَيْمَانَ الْمُمَنَّعِ الَّذِي لَا كَنْزَ لَهُ مِثْلُهُ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: تَحْتَ الْكُرْسِيِّ، فَأَخْرَجُوهُ فَقَالُوا: هَذَا سِحْرٌ. فَتَنَاسَخَتْهُ الْأُمَمُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى عُذْرَ سُلَيْمَانَ وَاتَّبَعُوا ما تَتْلُوا الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ.) الواحدي، إسناده صحيح: أخرجه الحاكم في المستدرك (٢/ ٢٦٥) وصححه ووافقه الذهبي على شرط مسلم. وأخرجه ابن جرير (١/ ٣٥٧) .

٢–( عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحَارِثِ، قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: «مِنْ أَيْنَ جِئْتَ؟» قَالَ: مِنَ الْعِرَاقِ قَالَ: (مِنْ أَيِّهِمْ؟) قَالَ: مِنَ الْكُوفَةِ قَالَ: (فَمَا الْخَبَرُ؟) قَالَ: تَرَكْتُهُمْ وَهُمْ يَتَحَدَّثُونَ أَنَّ عَلِيًّا خَارِجٌ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ: (مَا تَقُولُ لَا أَبَا لَكَ لَوْ شَعَرْنَا ذَلِكَ مَا أَنْكَحْنَا نِسَاءَهُ، وَلَا قَسَمْنَا مِيرَاثَهُ) ، ثُمَّ قَالَ: أَنَا سَأُحَدِّثُكَ عَنْ ذَلِكَ إِنَّ الشَّيَاطِينَ كَانُوا يَسْتَرِقُونَ السَّمْعَ، وَكَانَ أَحَدُهُمْ يَجِيءُ بِكَلِمَةِ حَقٍّ قَدْ سَمِعَهَا النَّاسُ، فَيَكْذِبُ مَعَهَا سَبْعِينَ كِذْبَةً، فَيُشْرِبَهَا قُلُوبَ النَّاسِ، فَأَطْلَعَ اللَّهُ عَلَى ذَلِكَ سُلَيْمَانَ بْنَ دَاوُدَ فَأَخَذَهَا فَدَفَنَهَا تَحْتَ الْكُرْسِيِّ، فَلَمَّا مَاتَ سُلَيْمَانُ قَامَ شَيْطَانٌ بِالطَّرِيقِ، فَقَالَ: أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى كَنْزِ سُلَيْمَانَ الَّذِي لَا كَنْزَ لِأَحَدٍ مِثْلُ كَنْزِهِ الْمُمْتَنِعِ؟ قَالُوا: نَعَمْ فَأَخْرَجُوهُ فَإِذَا هُوَ سِحْرٌ فَتَنَاسَخَتْهَا الْأُمَمُ فَبَقَايَاهَا مِمَّا يَتَحَدَّثُ بِهِ أَهْلُ الْعِرَاقِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عُذْرَ سُلَيْمَانَ ، فَقَالَ: (وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُوا الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا) (البقرة: ١٠٢) رواه الحاكم في المستدرك

****************************************

# وتاری ژماره (٦) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٠٩ ) سورەتی ( البقره )

(وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنْ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِيَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ١٠٩) البقره

مانای ئایەتەکە (زۆرێك له خاوەن کتێبەکان ( مەبەست جووەکان و دیانەکانه) پاش ئەوەی که ڕاستێتی ئایینی ئیسلامیشیان بۆ ئاشکرا بووه، کەچی لەبەر حەسوودی خۆیان دەیانەوێت بتانگێڕنەوه بەرەو بێ باوەڕیی .. ئێوه لەوانه ببورن و وازیان لێ بێنن، تا یارمەتی خوداتان بۆ دێت و سەرتان دەخات، بێگومان خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیه) (تەفسیری گوڵشەن)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەته چی بوو؟

لەم بارەوه دوو ریوایەت هەیه:

١-(عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكِبَ عَلَى حِمَارٍ عَلَى إِكَافٍ عَلَى قَطِيفَةٍ فَدَكِيَّةٍ وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ وَرَاءَهُ يَعُودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ فِي بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ، فَسَارَ حَتَّى مَرَّ بِمَجْلِسٍ فِيهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ، فَإِذَا بِالْمَجْلِسِ رِجَالٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُشْرِكِينَ عَبَدَةِ الْأَوْثَانِ وَالْيَهُودِ وَفِي الْمُسْلِمِينَ عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ، فَلَمَّا غَشِيَتِ الْمَجْلِسَ عَجَاجَةُ الدَّابَّةِ خَمَّرَ ابْنُ أُبَيٍّ أَنْفَهُ بِرِدَائِهِ، ثُمَّ قَالَ: لَا تُغَبِّرُوا

عَلَيْنَا، فَسَلَّمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ وَقَفَ فَنَزَلَ، فَدَعَاهُمْ إِلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ وَقَرَأَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ، قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ: أَيُّهَا الْمَرْءُ، إِنَّهُ لَا أَحْسَنَ مِمَّا تَقُولُ إِنْ كَانَ حَقًّا فَلَا تُؤْذِنَا بِهِ فِي مَجْلِسِنَا، ارْجِعْ إِلَى رَحْلِكَ فَمَنْ جَاءَكَ فَاقْصُصْ عَلَيْهِ. فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، فَاغْشَنَا بِهِ فِي مَجَالِسِنَا، فَإِنَّا نُحِبُّ ذَلِكَ. فَاسْتَبَّ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ وَالْيَهُودُ حَتَّى كَادُوا يَتَشَاوَرُونَ، فَلَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُخَفِّضُهُمْ حَتَّى سَكَتُوا، ثُمَّ رَكِبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَابَّتَهُ فَسَارَ حَتَّى دَخَلَ عَلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا سَعْدُ أَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالَ أَبُو حُبَابٍ ". يُرِيدُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ، قَالَ كَذَا وَكَذَا ، فَقَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: يَا رَسُولَ اللهِ اعْفُ عَنْهُ وَاصْفَحْ، فَوَالَّذِي أَنْزَلَ الْكِتَابَ لَقَدْ جَاءَ اللهُ بِالْحَقِّ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْكَ، وَلَقَدِ اصْطَلَحَ أَهْلُ هَذِهِ الْبُحَيْرَةِ عَلَى أَنْ يُتَوِّجُوهُ فَيُعَصِّبُوهُ، فَلَمَّا رَدَّ اللهُ ذَلِكَ بِالْحَقِّ الَّذِي أَعْطَاكَ شَرَّقَ بِذَلِكَ، فَذَلِكَ فَعَلَ بِهِ مَا رَأَيْتَ. فَعَفَا عَنْهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَ وَأَصْحَابُهُ يَعْفُونَ عَنِ الْمُشْرِكِينَ وَأَهْلِ الْكِتَابِ، كَمَا أَمَرَهُمُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ، وَيَصْبِرُونَ عَلَى الْأَذَى، قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا أَذًى كَثِيرًا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ (آل عمران: ١٨٦)، وَقَالَ اللهُ: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللهُ بِأَمْرِهِ إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة: ١٠٩)، وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَأَوَّلُ فِي الْعَفْوِ مَا أَمَرَ اللهُ بِهِ حَتَّى أُذِنَ لَهُمْ فِيهِمْ، فَلَمَّا غَزَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَدْرًا فَقَتَلَ اللهُ بِهِ مَنْ قَتَلَ مِنْ صَنَادِيدِ كُفَّارِ قُرَيْشٍ، قَالَ ابْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ وَمَنْ مَعَهُ مِنْ عَبَدَةِ الْأَوْثَانِ: هَذَا أَمْرٌ قَدْ تَوَجَّهَ. فَبَايَعُوا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْإِسْلَامِ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتە : لە عوروەی کوڕی زوبیرەوە هـاتووە دەڵـێ: ئوسـامەی کـوڕی زەیـد هـەواڵی پێـداوە ، کـە پێغەمبـەر سـواری کـەرێك بـووە ، ئوسـامەش لـە دوای سـوار بـووە ، چوونەتە سەردانی سەعدی کوری عوبادە پێش رودانی جەنگی بەدر ، بەلای کۆڕێك تێپـەرین ، عبـدالله کـوری ئوبـەی کـوڕی سـەلولی لـێ بـوو، پـێش ئـەوەی عبـدالله موسڵمان بێ بە رووالەت ، لەم کۆڕە موسڵمان و موشریك و بتپەرسـت و جوولەکـەی تێدا بوون ، لە موسڵمانان عبدالله کوڕی رەواحەی لێ بوو ، کاتی پێغەمبەرو ئوسامە گەیشتنە نزیك ئەم مەجلیسە عبـدالله کـوڕی ئوبـەی کـوری سـەلول بـە کراسـەکەی لـووتی خـۆی گـرت و گـوتی تـۆز و خـۆڵ مەکـە سـەرمان ، پێغەمبـەریش لای ئـەم مەجلیسـە دابـەزی و بـانگی کـردن بـۆ لای خـوا و قورئـانی بەسـەردا خوێندنـەوە ، عبدالله کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول گوتی شتێکی پـاش نـاڵێی ، ئەگـەر راسـت بوایـە ئێمەت ئازار نەدەدا، بڕوا لای کەس وکاری خۆت ، وەکێ تۆی هێناوە قسـە بـۆ ئـەو بکە ، عبدالله کوری رەاوحە بە جواب هات گوتی ئەی پێغەمبـەری خـوا قسـەمان بـۆ بکە ، ئێمە ئەوەمان پێ خۆشە ، کێشە دروست بوو، لە نێوان موسڵمان و جوولەکـە و موشـریکان دوای پێغەمبـەر وەزعەکـەی هێـور کـردوە ، دوای پێغەمبـەر سـواری کەرەکەی بویەوە چووە لای سـەعدی کـوڕی عوبـادە ، پێغەمبـەر فـەرمووی : ئـەی سەعد نابیستی ئەبو حوباب ، مەبەستی عبدالله ی کـوری سـەلول بـوو چـی دەڵـێ ، سەعد گوتی ئەی پێغەمبەر خـوا عـەفویان بکـەو چاوپۆشـی بکـە ، ئـەویش عـەفوی کردن ، پێغەمبەر و هاوەڵانی موشریك و خاوەن کیتابەکانیان عەفو دەکرد ، چونکە خوا فەرمانی پێ کردبوون ، و ئارامیان دەگرت وەك خوا فەرموویـەتی (لَتُبْلَوُنَّ فِيٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ١٨٦)

واتە : سوێند بێت بێگومان تاقی دەکرێنەوە لـە سـامان و دارایـی و گیـانی خۆتانـدا سوێند بێت بێگومان دەبیستن لەوانـەی کـە نامـەیان پێـدراوە لـە پـێش ئێـوە، وە

لەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا داناوە(ئازارو) قسەی ناخۆشی زۆر جا ئەگەر ئێوە ئارام بگرن و پارێزکار بن ئەوە بێگومان ئەوە لە کارە بەهێز و گەورەکانە لەو کارانەیە لێبڕانی دەوێ.وەهەروەها خوا دەفەرمووێ (وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللهُ بِأَمْرِهِ إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) **واته** : زۆرێك لە خاوەن کتێبەکان ( مەبەست جووەکان و دیانەکانە) پاش ئەوەی کە ڕاستێتی ئایینی ئیسلامیشیان بۆ ئاشکرا بووە، کەچی لەبەر حەسوودی خۆیان دەیانەوێت بتانگێڕنەوە بەرەو بێ باوەڕیی .. ئێوە لەوانە ببورن و وازیان لێ بێنن، تا یارمەتی خوداتان بۆ دێت و سەرتان دەخات، بێگومان خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە

پێغەمبەر بەردەوام بوو لەسەر چاوپۆشی تاکو خوا مۆڵەتی دا چارەسەریان بکا، کاتێ خوا موسڵمانانی سەرخست لە جەنگی بەدر ، و سەرکردەکانی قوریش کوژران ، عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلول و ئەوانەی لەگەلی بوون لە بتپەرستان گوتیان تازە ئەوە شتێکی واقیعە ، بەناچاری بیعەتیان دایە پێغەمبەر، و هاتنە ناو ئیسلام) رواه البخاری

وە لە تەفسیری رامادا دەڵێ (ئوسامەی کوڕی زەید) ئەڵێ: جارێك پێغەمبەر (صلی اللـه علیـه وسلم) سواری گوێدرێژێك ببوو (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبە)یش، تەنزو تەشەرێکی لێدا، پێغەمبەریش بە(سەعدی) گوت: گوێت لێبوو چی گوت؟! سەعدیش پێیگوت: بیبەخشەو قسەکەی پشتگوێ بخە، پێغەمبەریش(صلی اللـه علیه وسلم) – کەهەردەم کاری لێبووردنە– بەخشیی، ئەو جا ئەم ئایەتە هات وفەرمووی (فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ) ڕامان

**ریوایەتی دووەم لەم بارەوە :**

**٢-( عَنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ كَعْبَ بْنَ الْأَشْرَفِ الْيَهُودِيَّ كَانَ شَاعِرًا، وَكَانَ يهجو النبي صلى اللَّه عليه وسلم، وَيُحَرِّضُ عَلَيْهِ كُفَّارَ قُرَيْشٍ فِي شِعْرِهِ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ وَالْيَهُودُ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ حِينَ قَدِمَهَا رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، يؤذون النبي صلى اللَّه عليه وسلم وَأَصْحَابَهُ أَشَدَّ الْأَذَى، فَأَمَرَ اللَّهُ تَعَالَى نَبِيَّهُ بِالصَّبْرِ عَلَى ذَلِكَ وَالْعَفْوِ عَنْهُمْ، وَفِيهِمْ أُنْزِلَتْ: وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَى قَوْلِهِ:فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا) أسباب نزول القرآن للواحدي والبيهقي في دلائل النبوة ، وقال حافظ بن حجر في (العجاب) وهذا سند صحيح**

**واتە : کەعبی کوڕی مالیك ئەڵێ : کەعبی کوری ئەشرەف شاعیرێکی جوولەکە بوو ، جوێنی بە پێغەمبەر دەدا ، و قوریشیەکانی هاندەدا بۆ دژیایەتی پێغەمبەر ، وەلەلایەکی دیکە جوولەکە و موشریکانی مەدینە ئازاری پێغەمبەر و هاوەڵانیان دەدا ، بۆیە خوا فەرمانی پێ کردن ئارام بگرن ئەم ئایەتی دابەزاند وفەرمووی : (وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ).**

**کوشتنی (کەعبی کوڕی ئەشرەف ):**

**-کەعب سەرکردێکی جوولەکە بوو، چەند هەڵویستێکی زۆر خراپی هەبوو ، ١-پاش شەڕی بەدر چووە مەککە بۆ قوریشیەکان گریاو هانیدان دژی پێغەمبەر ٢- شێعری خراپی بەسەر خێزانی موسڵمانانادا دەگوت ٣- شێعری بەسەر هەندێ لە خێزانەکانی پێغەمبەردا دەگوت بە خراپە ، ئەمانە هەموو پەیمان شکێنی بوون ،**

پێغەمبەر فەرمووی: کێ لە کۆڵمان دەکاتەوە ، محمد کوڕی مەسلەمە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەتەوێ بیکوژم ، دەفەرمووی بلێ ، ئەوجا مەفرەزەیەك پێکدەهێنن لە پێنج کەسان کە ئەمانن (١-محمد کوڕی مەسلمە ٢-ئەبو نائیلە (برای شیری کەعبی کوری ئەشرەف ٣-عوبادی کوری بەشری کوری وەقش، ٤-ئەلحاریس کوری ئەوسی کوری موعاز ٥-ئەعەبسی کوری خەبر ، سەرەتا ئەمانە دەچنە لای پێغەمبەر دەڵێن ئەبێ رێگامان بدەی ئێمە چەند قسەیەك بکەین تاکو کارەکەمان سەر بگرێ و کەعب مەتمانەمان پێ بکات ، ئەویش فەرمووی قسەکان بکەن ، ئەوانیش دەچنە لای کەعب دەڵێن ئێمە هاتووین هەندی زادوزەخیرەمان بەقەرز بدیتێ ، ئەم پیاوە لەوتەی هاتووتە مەدینە ئێمەی توشی ئەو وەزعە کردیە ، ئەویش دەڵێ باشە بەلآم خێزانەکانتان بە بارمتە لە لام دابنێن ، ئەوانیش دەڵێن ئەوە نابێ عەیبە ، ئەڵێ مادام وایە منداڵەکانتان لام دابنێن ، ئەوانیش ئەڵێن ئەوەش نابێ دوای عەرەب پێمان دەڵێن منداڵەکانیان کردە بارمتە بەرامبەر مستە جۆیەك ، ئەڵێ ئەی چی دەدانێن ئەوانیش ئەڵێن چەکەکانمان دەکەینە بارمتە ئەویش ئەلێ باشە، جا شەوێك دەچن بانگی دەکەن ، ئەویش دێتە دەرێ ، محمد کوڕی ئەسلمە دەڵێ ئەم بۆنە خۆشە چی لێت دێت و لاشت جوانەو بۆنت خۆشە، ئەویش دەڵێ : کچی فولانی خێزانم بۆن خۆشترین عەرەبە، دەڵێ: رێگام دەدەی سەرت بۆن بکەم، دەڵێ: بەڵێ، ئەویش بۆنی دەکات، دەڵێ: رێگای هاوەڵانم دەدی سەرت بۆن بکەن،دەڵێ: بەڵێ، دووبارە (محمد کوری ئەسلمە) دەڵێ: رێگام دەدەی سەربۆن بکەم ئەڵێ: بەڵێ: ئەوجار دەستی لەسەری گێردەکات و ئەڵێتە هاوەڵانی بکەونە سەر دوژمنی خوا،

بەم شێوە زەفەری پێ دەبن و دەیکوژن.

تێبینی :(محمد کوڕی مەسلەمە بەرپرسی یەکەمین مەفرەزە بووە بۆ لە ناوبردنی دوژمنێکی ئیسلام ) (پۆختەی ژیاننامەی پێغەمبەر مامۆستا علی باپیر)

ئەم رووداوە لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە : ئەمەش دەقەکەیەتی .

( عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الْأَشْرَفِ فَإِنَّهُ قَدْ آذَى اللهَ وَرَسُولَهُ . فَقَالَ لَهُ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ: أَتُحِبُّ أَنْ أَقْتُلَهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: نَعَمْ . قَالَ: أَنَا لَهُ يَا رَسُولَ اللهِ، فَأْذَنْ لِي أَنْ أَقُولَ. قَالَ: قُلْ . فَأَتَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا الرَّجُلَ قَدْ أَخَذَنَا بِالصَّدَقَةِ، وَقَدْ عَنَّانَا، وَقَدْ مَلِلْنَا مِنْهُ. فَقَالَ الْخَبِيثُ لَمَّا سَمِعَهَا: وَأَيْضًا وَاللهِ لَتَمَلُّنَّهُ أَوْ لَتَمَلُّنُّ مِنْهُ، وَلَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّ أَمْرَكُمْ سَيَصِيرُ إِلَى هَذَا. قَالَ: إِنَّا لَا نَسْتَطِيعُ أَنْ نُسْلِمَهُ حَتَّى نَنْظُرَ مَا فَعَلَ، وَإِنَّا نَكْرَهُ أَنْ نَدَعَهُ بَعْدَ أَنِ اتَّبَعْنَاهُ حَتَّى نَنْظُرَ إِلَى أَيِّ شَيْءٍ يَصِيرُ أَمْرُهُ، وَقَدْ جِئْتُكَ لِتُسْلِفَنِي تَمْرًا. قَالَ: نَعَمْ، عَلَى أَنْ تَرْهَنُونِي نِسَاءَكُمْ. قَالَ مُحَمَّدٌ: نَرْهَنُكَ نِسَاءَنَا وَأَنْتَ أَجْمَلُ الْعَرَبِ؟ قَالَ: فَأَوْلَادَكُمْ، قَالَ: فَيُعَيِّرُ النَّاسُ أَوْلَادَنَا أَنَّا رَهَنَّاهُمْ بِوَسْقٍ أَوْ وَسْقَيْنِ، وَرُبَّمَا قَالَ: فَيُسَبُّ ابْنُ أَحَدِنَا فَيُقَالُ: رُهِنَ بِوَسْقٍ أَوْ وَسْقَيْنِ. قَالَ: فَأَيُّ شَيْءٍ تَرْهَنُونَ؟ قَالَ: نَرْهَنُكَ اللَّأْمَةَ – يَعْنِي السِّلَاحَ – قَالَ: نَعَمْ. فَوَاعَدَهُ أَنْ يَأْتِيَهُ، فَرَجَعَ مُحَمَّدٌ إِلَى أَصْحَابِهِ فَأَقْبَلَ وَأَقْبَلَ مَعَهُ أَبُو نَائِلَةَ وَهُوَ أَخُو كَعْبٍ مِنَ الرَّضَاعَةِ، وَجَاءَ مَعَهُ رَجُلَانِ آخَرَانِ، فَقَالَ: إِنِّي مُسْتَمْكِنٌ مِنْ رَأْسِهِ فَإِذَا أَدْخَلْتُ يَدِي فِي رَأْسِهِ فَدُونَكُمُ الرَّجُلَ. فَجَاؤُوهُ لَيْلًا وَأَمَرَ أَصْحَابَهُ، فَقَامُوا فِي ظِلِّ النَّخْلِ، وَأَتَاهُ مُحَمَّدٌ فَنَادَاهُ: يَا أَبَا الْأَشْرَفِ، فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ: أَيْنَ تَخْرُجُ هَذِهِ السَّاعَةَ؟ فَقَالَ: إِنَّمَا هُوَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ وَأَخِي أَبُو نَائِلَةَ. فَنَزَلَ إِلَيْهِ مُلْتَحِفًا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ تَنْفَحُ مِنْهُ رِيحُ الطِّيبِ، فَقَالَ لَهُ مُحَمَّدٌ: مَا أَحْسَنَ جِسْمَكَ وَأَطْيَبَ رِيحَكَ قَالَ: إِنَّ عِنْدِي ابْنَةَ فُلَانٍ وَهِيَ أَعْطَرُ الْعَرَبِ. قَالَ: فَتَأْذَنُ لِي أَنْ أَشُمَّهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَدْخَلَ مُحَمَّدٌ يَدَهُ فِي رَأْسِهِ، ثُمَّ قَالَ: أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُشِمَّ أَصْحَابِي؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَدْخَلَهَا فِي رَأْسِهِ فَأَشَمَّ أَصْحَابَهُ، ثُمَّ أَدْخَلَهَا مَرَّةً أُخْرَى فِي رَأْسِهِ حَتَّى أَمِنَهُ، ثُمَّ إِنَّهُ

شَبَّكَ يَدَهُ فِي رَأْسِهِ فَنَصَاهُ، ثُمَّ قَالَ لِأَصْحَابِهِ: دُونَكُمْ عَدُوَّ اللهِ، فَخَرَجُوا عَلَيْهِ فَقَتَلُوهُ، ثُمَّ أَتَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَخْبَرَهُ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ ومُسْلِمٌ .

-(معاني الكلمات (من لكعب بن الأشرف) أي من كائن لقتله(ائذن لي فلأقل) معناه ائذن لي أن أقول عني وعنك ما رأيته مصلحة من التعريض وغير(قد عنانا) أي أوقعنا في العناء وهو التعب والمشقة وكلفنا ما يشق علينا قال النووي هذا من التعريض الجائز بل المستحب لأن معناه في الباطن أنه أدبنا بآداب الشرع التي فيها تعب لكنه تعب في مرضاة الله تعالى فهومحبوب لنا والذي فهم المخاطب منه العناء الذي ليس بمحبوب(لتملنه) أي لتضجرن منه أكثر من هذا الضجر(بوسقين) الوسق بفتح الواو وكسرها وأصله الحمل(كأنه صوت دم) أي صوت طالب دم أو صوت سافك دم

**دەرسەکانی ئەم ئایەتە:**

١-مرۆڤی موسڵمان ئارام گر بێ و چاوپۆشی لە خەڵکی بکا، بەلاّم ئەبێ هەوڵیش بدا بۆ سەرحستنی ئایینی خوا، ساردنەبێتەوە بە فشارو قسەو توانجی نەیارانی ئیسلام.

٢-حەسوودی کارێکی خراپ و قێزەوەنە، وەجۆرێکە لە نەخۆشی. پێغەمبەر رێگری لێ کردوە

(لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وكُونُوا عِبادَ اللهِ إِخْوَاناً)رواة البخاري

واتە: یەکدی مەبوغزێنن، وە ئێرەیی‌و حەسوودی بە یەکدی مەبەن، بەندەی خوابن‌و، پێکەوە برابن.

## هۆی دابەزینی ژمارە (١١٣) لە سورەتی (البقرە)

(وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ١١٣) البقره

واتە: جوولەکە ئەڵێن: گاوور لەسەر هیچ(ئاینێك ) نین وە گاوور دەڵێن: جوولەکە لەسەر هیچ(ئاینێك) نین لەکاتێکدا ئەوان دەوری نامەکان(یان) دەکەنەوە،(یەکێکیان تەورات و ئەوی تریش ئینجیل) هەر بەم ڕەنگەیان دەووت، ئەوانەی کە نەزانن (لە بت پەرستەکان) ئینجا خوا لە ڕۆژی دوایی دا لە نێوانیاندا بڕیار دەدات لەوشتانەی کەتیایدا جیاواز و ناکۆکن.(پوختەی تەفسیر).

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

نَزَلَتْ فِي يَهُودِ أَهْلِ الْمَدِينَةِ وَنَصَارَى أَهْلِ نَجْرَانَ، وَذَلِكَ أَنَّ وَفْدَ نَجْرَانَ لَمَّا قَدِمُوا عَلَى رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، أَتَاهُمْ أَحْبَارُ الْيَهُودِ فَتَنَاظَرُوا حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمْ، فَقَالَتِ الْيَهُودُ: مَا أَنْتُمْ عَلَى شَيْءٍ مِنَ الدِّينِ، وَكَفَرُوا بِعِيسَى وَالْإِنْجِيلِ، وَقَالَتْ لَهُمُ النَّصَارَى: مَا أَنْتُمْ عَلَى شَيْءٍ من الدين، وكفروا بِمُوسَى وَالتَّوْرَاةِ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ.) الواحدي قال كمال بسيوني زغلول عزاه السيوطي في لباب النقول (ص ٢١) لابن أبي حاتم عن ابن عباس وزاد نسبته في الدر (١/ ١٠٨) لابن إسحاق وابن جرير.

واتە: دەربارەی جوولەکەی مەدینە و گاورەکانی نەجران دابەزیوە، کاتێ وەفدی نەجران هاتنە مەدینە، زانایانی جوولەکە هاتن مونازەرەیان لەگەڵ کردن تاکو

دەنگیان بەسەر یەكدا بەرزكردەوە، تاكو جوولەكە گوتیان ئێوە لەسەر ئایین نـین و كوفریان بە عیسى و ئنجیل كرد، گاوەرەكانیش گوتیان: ئێـوە لەسـەر ئـایین نـین و كوفریان بە موسى و تەورات كرد، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند .

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١١٥ ) سورەتی ( البقره )

﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ١١٥﴾

واتە : ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو (هەموولایەك) هەر خوا خاوەنیەتی، جـا ڕوو بكەنـە هـەر لایەك خوا لەو جێ یە ئاگای لێتانە، بەڕاستی خوا فراوانگیرو زانایە، (ئاسان)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە چی بوو؟

دوو دەق دەربارەی هۆكاری دابەزین ئەم ئایەتە:

١-( عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي وَهُوَ مُقْبِلٌ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ كَانَ وَجْهُهُ قَالَ: وَفِيهِ نَزَلَتْ ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللهِ﴾ (البقرة: ١١٥) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە هـاتووە : ئـەڵێ پێغەمبـەر لـە مەككـەوە بـەرەو مەدینـە دەرۆیشت بەسواری رووی لە كوێ بایە نوێـژی دەكـرد ، لـەم بـارەوە ئـەم ئایەتـە دابەزی ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللهِ﴾

٢-( عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ فَلَمْ نَدْرِ أَيْنَ القِبْلَةُ، فَصَلَّى كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا عَلَى حِيَالِهِ، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا ذَكَرْنَا

ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَزَلَتْ: (فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ) (البقرة: ١١٥) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واته: له عامیری کوڕی ڕەبیعه هاتووه ، ئەویش له باببیەوه ئەڵێ لەسەفەرێك لەگەڵ پێغەمبەردا بووین شەوێکی تاریك بوو ، نەمان دەزانی قیبله له کوێیه ، هەر کەسە و بۆ بەرامبەرێك نوێژی کرد ، کاتی بەیانی بویەوه بۆ پێغەمبەرمان باس کرد لەم بارەوه ئەم ئایەته دابەزی (فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللهِ) .

زانایان دوو ڕایان هەیه بۆ نوێژی سوننەت به سواری:

١-ئەبێ لەسەرەتا رووت له قیبله بێ .

٢-لەسەرەتاوەش رووت له قیبله نەبێ دەبێ.

له تەفسیری ڕامان دەڵێ (نوێژی سوننەت بەسەر وڵاخەوه -رووت له رووگەوه بێ، یا نه- رەوایه.) نوێژ خوێنی فەرز، هەتا دەکرێ دەبێ رووی له رووگەوەبێ، مەگەر کاتێ که نەخۆش بێ و نەتوانێ رووی تێ بکا، وەیان کاتێ ترسی هەبێ، وەیا جەنگاوەر بێ و دوژمن له رووی قیبلەوه بێ، یا له دەس دوژمن هەڵهاتبێ، یا نەزانێ قیبله له کوێوەیه تا رووی تێبکا) (ڕامان)

چەند دەقێك لەم بارەوه:

١- عَنْ جَابِرٍ قَالَ: رَأَيْت النَّبِيَّ - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يُصَلِّي وَهُوَ عَلَى رَاحِلَتِهِ النَّوَافِلَ فِي كُلِّ جِهَةٍ، وَلَكِنْ يَخْفِضُ السُّجُودَ مِنْ الرُّكُوعِ وَيُومِئُ إيمَاءً) رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَفِي لَفْظِ(بَعَثَنِي النَّبِيُّ - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فِي حَاجَةٍ فَجِئْت وَهُوَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، وَالسُّجُودُ أَخْفَضُ مِنْ الرُّكُوعِ) رَوَاهُ أَبُو دَاوُد وَالتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ

واتە : لە جابیرەوە هاتووە : دەڵێ پێغەمبەری خوام بینی نوێژی سوننەتی دەکرد بە سواری بەرەوو هەموو لایەك ، بەلاَم کاتی سوجدەی دەبرد زیاتر سەری نزم دەکردەوە لە رکوع بە ئاماژە (واتە : لەرکوع تۆزێك سەری نزم دەکردەوە لە سوجدەش زیاتر )

٢-( عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - إِذَا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَى رَاحِلَتِهِ تَطَوُّعًا اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَكَبَّرَ لِلصَّلَاةِ ثُمَّ خَلَّى عَنْ رَاحِلَتِهِ فَصَلَّى حَيْثُمَا تَوَجَّهَتْ بِهِ) رَوَاهُ أَحْمَدُ وَأَبُو دَاوُد

٣-( عَنْ جَابِرٍ،أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ الْمَكْتُوبَةَ، نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ) رواه البخاري

واتە: لە جابیرەوە هاتووە ئەڵێ پێغەمبەر لە کاتی سواری نوێژی دەکرد بەرەو رۆژهەلاَت ، بەلاَم ئەگەر ویستبای نوێژی فەرز بکات دادەبەزی رووی لە قیبلە دەکرد.

**زانایان لەبارەی نوێژی فەرزەوە (٣) رایان هەیە :**

١-ئەوەی قیبلەی لێ گۆڕا بۆ کوێ نوێژ بکا دروستە ، کۆشش بکا یان نەکا، ئەگەر دوای بشزانێ هەڵەی کردوە ،نوێژەکەی دروستە (حەنەفیەکان و کوف وهی دیکە )

٢-ئەوەی نوێژی کرد زانی هەڵەی کردوە ، نوێژەکە دووبارە دەکاتەوە (شافعی)

٣-نوێژەکەی دروستە ، ئەگەر کۆششی کرد ، بەلام ئەگەر کۆششی نەکرد ،نوێژەکە دروست نیە

-رووکردنە قیبلە شەرتی دروست بوونی نوێژە مەگەر لە (٣) حاڵەتدا نەبێ:

١–نەخۆشی سەر قەلەوێرە کەس نەبێ رووی لە قیبلە بکات ، یان کەسی سجن کراو کەنازانی کوێ قیبلەیە و کەسیش پێ نەڵێ.

٢–لە حاڵەتی هەلاَتن لە ترسی دوژمن چ سوار بێ یان بەپیادە.

٣–لە حالاتی نوێژی سوننەت.

لەبارەی نوێژی ناو (ئۆتۆمبیل و فڕۆکە و کەشتی ): (شیخ صالح فوزان) دەڵی

حوکمی ماڵەوەیان هەیە لە هەموو شتێك ، ئەگەر پێی نەکرا نوێژ بکا (نوێژەکان کۆدەکاتەوە (نیوە ڕو وعەصر ، یان مغرب و عیشا) ، ئەگەر هەر فڕۆکەکە دانەبەزی لە ناو فڕۆکە نوێژی دەکا لەسەر کورسی بە ئامـاژە روکوع و سوجدە دەبا، ئەگەر نەتوانێ رووشی لە قیبلە نەبێ هەردەبێ و دروستە) تسهیل الالمام لاپەرە(١٠٨) .

–دەرسەکانی ئەم ئایەتە

١–خوا ئاسنکاری بۆ ئێمە دەوێ نەك سەخت گیری

٢–نابێ ئینسان لە هیچ حاڵەتێك واز لە نوێژ بێنێ

٣–لەسەفەر و نەخۆشی و ترسیش نوێژ هەر دەبێ بکرێ .

**********************************

## وتاری ژماره (٧) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

بەرێزان لەم وتاردا بە پشتیوانی خوا هۆکاری دابەزینی دوو ئایەت باس دەکەین.

١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٢٠) سورەتی (البقره)

**(وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ١٢٠)** البقره

واتە : هەرگیز نە جوولەکە و نە گاوور لێت ڕازی نابن تا دوای ئایینیان نەکەویت (پێ یان) بڵێ: هەر ڕێنموونیی خوایە ڕینموونی ڕاست وە ئەگەر دوای ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت(ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) دوای ئەو زانینەی کە(لەخواوە) بۆت هاتووە هیچ سەرپەرشتی کەرو یاریدەدەرێکت نابێ لەلایەن خواوە.(پوختەی تەفسیری قورئان)

<u>تێبینی</u> : ڕاستە ئەم ئایەتە ئاراستەی پێغەمبەر کراوە بەلأم بۆ هەموو موسڵمانێکە.

جا فەرقی نیە ئەو کەسە دەوڵەت بێ ، یان حزب ، یان شەخش بێ بەدوایان بکەوێ

### ئایا هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە چی بوو؟

١-(قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: إِنَّهُمْ كَانُوا يَسْأَلُونَ النَّبِيَّ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - الهدنة ويطمعون أنهم إذا هَادَنَهُمْ وَأَمْهَلَهُمُ اتَّبَعُوهُ وَوَافَقُوهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ **(وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ))** اسباب النزول القران للواحدي

واته : توێـژەرەوانی قورئـان دەڵـێن : داوا ئـاگر بەسـتیان لـە پێغەمبـەر دەکـرد بـە ئومێدی ئەوەی ئەگەر موڵەتیان بدرێ ، بەدوای بکەون و لەگەڵ ئەوبن ، خواش لـەم بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند.

٢–وقـال ابْـنُ عَبَّـاسٍ: هَـذَا فِـي الْقِبْلَـةِ وَذَلِـكَ أَنَّ يَهُـودَ الْمَدِينَـةِ وَنَصَـارَى نَجْـرَانَ كَـانُوا يَرْجُونَ أَنْ يُصَلِّيَ النَّبِيُّ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – إِلَى قِبْلَتِهِمْ فَلَمَّا صَرَفَ اللَّهُ الْقِبْلَةَ إِلَى الْكَعْبَةِ شَقَّ ذلك عليهم، فَيَئِسوا مِنْهُ أَنْ يُوَافِقَهُمْ عَلَى دِينِهِمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ) اسباب النزول القران للواحدي

واتـە : ئیبنـو عـەباس دەڵـێ ئـەم ئایەتـە دەربـارەی قیبلـە دابـەزیوە ، جوولـەکانی مەدینە وگاورەکانی نەجران ئومێدیان هەبوو بە پێغەمبەر ، بەڵام کاتێ خوا قیبلـەی گۆڕی بۆ کەعبە لەسەریان قـورس وگـران بـوو ، بـێ ئومێـد بـوون لـە پێغەمبـەر کـە لەگەڵ ئاینی ئەوان تێکبکاتـەوە ، خـوا لـەم بـارەوە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد (وَلَـن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ)

**بۆ زیاتر روونکردنەوە ئەم بابەتە ئەم دوو ئایەتە بە بەڵگە دێنینەوە:**

-(وَلا يَزَالُـونَ يُقَـاتِلُونَكُمْ حَتَّـى يَـرُدُّوكُمْ عَـن دِيـنِكُمْ إِنِ اسْـتَطَاعُوا )البقـرة: ٢١٧

واتە: بـەردەوام دژتـان دەجـەنگن هـەتا واتـان لێبکـەن لـە دیـن و ئاینتـان پاشـگەز ببنەوە، ئەگەر بۆیان بکرێ ) تەفسیری ئاسان .

-( وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَ ۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ ۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ١٤٥) البقرة: ١٤٥)

واته: سوێند بێت ئەگەر هەرچی بەڵگەو نیشانە هەیە بیهێنیتەوە بۆ ئەم خاوەن نامانە دوای ڕووگەی تۆ ناکەوون وە تۆش دوای ڕووگەی ئەوان ناکەویت وە ئەوان دوای ڕووگەی یەکتری ناکەوون سوێند بێت ئەگەر تۆ دوای ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت دوای ئەو زانینەی کە (بەسرووش) بۆت هاتووە بەڕاستی ئەو کاتە تۆ لەستەمکاران دەبیت.

زانینێك دەربارەی بەشێك لەم ئایەتە :

**-( دەڵێن لە (ئیمام احمد)یان پرسیوە بەڵگەت چییە لەسەر ئەوەی ئەگەر بڵێ قورئان مەخلوقە کافر دەبی ؟ گوتویەتی ئەم ئایەتەیە (بَعْدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ) کەواتە قورئان زانیاری خوایە ، عیلمیش سیفەتی خوایە ، سیفەتی خواش نابێ دروستکراو بێ ، وە خوافەرموویەتی (فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ ١٤) هود) بزانن قورئان بە زانیاری خوا نێرواتە خوارێ**

## جگە لە ئیسلام هەموو ڕێبازێك چەوتە:

(شوشیالیست ، دیموکراسی ،سۆشیال دیموکراسی ، لیبرالی ، عەلمانیەت.....)

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە بابچینە خزمەت سەروەری مرۆڤایەتی (محمد) چەند جوان بێ منجە منج وەك ڕۆژی روناك بۆمان روون دەکاتەوە ، هاوەڵی بەرێز عبدالله کوڕی مەسعود دەڵێ :

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا خَطًّا ثُمَّ قَالَ: (هَذَا سَبِيلُ اللَّهِ) ثُمَّ خَطَّ خُطُوطًا عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: (هَذِهِ سُبُلٌ عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيْهِ) ثُمَّ تَلَا (وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا

تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ) (الأنعام: ١٥٣) رَوَاهُ أَحْمد وَالنَّسَائِيّ والدارمي وابن حبان قال الالباني حسن .

واته: له عبدالله ی کوڕی مسعوده‌وه هاتووه : ئه‌ڵێ ڕۆژێك پێغه‌مبه‌ری خوا خه‌تێکی بۆ ئێمه کێشا فه‌رمووی ئه‌وه ڕێگای خوایه ، دوای چه‌ند خه‌تێکی کێشا له‌لای راست وچه‌پ فه‌رموو ئه‌وانه هه‌موو ڕێگاكانی جگه له ئیسلامن له‌سه‌ر هه‌ر ڕێگایه‌ك شه‌یتانێك هه‌یه، خه‌ڵكی بۆ بانگ ده‌كات ، پاشان ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه (وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ) واته: بێگومان ئه‌مه ڕێگای ڕاستی منه كه ڕاست و دروسته كه‌واته شوێنی بكه‌ون و شوێنی ڕێچكه‌كانی تر مه‌كه‌ون چونكه دوورتان ده‌خه‌نه‌وه‌و لاتان ده‌ده‌ن له ڕێگه‌ی خوا، خوا ئه‌و شتانه‌ی به‌ئێوه ڕاسپاردووه بۆ ئه‌وه‌ی پارێزكار بن.

**جووله‌كه‌و گاور ئه‌گه‌ر باوه‌ڕ به پێغه‌مبه‌ر نه‌هێنن كافرن و ده‌چنه ئاگر**: به‌به‌ڵگه‌ی (قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَا يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ وَلَا يَهُودِيٌّ وَلَا نَصْرَانِيٌّ ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَّا كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ)رواه مسلم

واته: پێغه‌مبه‌ری خوا فه‌رموویه‌تی : سوێندم به‌وه‌ی گیانی موحه‌ممه‌دی به‌ده‌سته هه‌ر كه‌سێك له‌م ئوممه‌ته له جووله‌كه‌و گاور كوێی له من و ڕێبازم بێ ، باوه‌ڕه‌م پێ نه‌هێنی و شوێنم نه‌كه‌وێ و بمرێ ، مه‌گه‌ر ده‌بێته هاوه‌ڵی ئاگر واته ده‌چێته دۆزه‌خ .

تێبینی : گشت مرۆڤایه‌تی و ئه‌وانه‌ی ئیماندارن هه‌ردووك پێیان ده‌گوترێ ئومه‌تی محمد ، به‌لام جیاوازیان ئه‌وه‌یه ، ئه‌وانه‌ی ئیمانیان هێناوه پێیان ده‌گوترێ

ئوممەتی وەلآمدەرەوە (الامة المستجيبة) ، ئەوانەی ئیمانیان نەهێناوە پێیان دەگوترێ ئوممەتی بانگکراو (الامة المدعُوة)

## ئایاکەس هەیە بەدوای جوولەکەو گاورەکان بکەوێ ؟

١-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَتَرْكَبُنَّ سُنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ شِبْرًا بِشِبْرٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ دَخَلَ جُحْرَ ضَبٍّ لَدَخَلْتُمْ، وَحَتَّى لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ جَامِعَ امْرَأَتَهُ بِالطَّرِيقِ لَفَعَلْتُمُوهُ) رواه الحاكم قال الالباني صحيح

واتە: ئیبنو عەباس دەڵێ پێغەمبەری خوا فەرموویەتی( بە دوای رێبازی خەڵکانی پێش خۆتان دەکەون بست بەبست ، گەز بەگەز ، تاکو ئەگەر یەکێك لەوان بچێتە ناو کونی بزن مشکە ئێوەش دەچنە ناوی ، ئەگەر ئەوان لەسەر رێگاکان لەگەڵ ژنەکانیان جوودبن ئێوەش چاویان لێ دەکەن.

٢-( عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَتَتْبَعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ شِبْرًا شِبْرًا وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ دَخَلُوا جُحْرَ ضَبٍّ تَبِعْتُمُوهُمْ قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى قَالَ فَمَنْ) رواه البخاري

واتە: ئەبو سەعیدی خودری دەڵێ پێغەمبەری خوا فەرموویەتی( بە دوای رێبازی خەڵکانی پێش خۆتان دەکەون بست بەبست ، گەز بەگەز ، تاکو ئەگەر یەکێك لەوان بچێتە ناو کونی بزن مشکە ئێوەش دەچنە ناوی ، گوتمان ئەی نێرراوی خوا مەبەستت جوولەکەو گاورەکانە فەرمووی ئەدی مەبەستم کێیە؟ واتە : بەڵێ ئەوان

٣-( عَن أبي واقدٍ اللَّيْثِيّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا خَرَجَ إِلَى غَزْوَةِ حُنَيْنٍ مَرَّ بِشَجَرَةٍ لِلْمُشْرِكِينَ كَانُوا يُعَلِّقُونَ عَلَيْهَا أَسْلِحَتَهُمْ يُقَالُ لَهَا: ذَاتُ أَنْوَاطٍ.

فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ اجْعَلْ لَنَا ذَاتَ أَنْوَاطٍ كَمَا لَهُمْ ذَاتُ أَنْوَاطٍ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (سُبْحَانَ اللَّهِ هَذَا كَمَا قَالَ قَوْمُ مُوسَى (اجْعَل لنا إِلَهًا كَمَا لَهُم آلهةٌ)وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَرْكَبُنَّ سُنَنَ مَنْ كَانَ قبلكُمْ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيّ قال الالباني صحيح

واته: لەئەبی واقیدی لیسیەوە هاتووە دەڵێ پێغەمبەری خوا دەرچوو بۆ جەنگی حونین ، بەلای درەختێك تێپەری موشریكان چەكی خۆیان لێ هەڵدەواسی پێیان دەگوت ئەنوات ،هاوەڵان گوتیان : ئەی نێرراوی خوا تۆش درختێك بۆ ئێمە دیاری بكە بۆ شمشێر هەڵواسین وەك چۆن موشریكان دەرختی خۆیان هەیە، پێغەمبەر فەرمووی (سبحان الله ) ئەو داوایە وەكو قەومی (موسی) وایە كاتێ بەلای گەلێكدا تێپەرین بتەیان دەپرست گوتیان ئەی موسی وەكو ئەمانە پەرستراوێكمان بۆ دابنێ ) فەرمووی سوێندم بەوی گیانی منی بەدەستە بەدوای رێبازی گەلانی پێش خۆتان دەكەون.

## ئایا كەی قەومی موسی ئەو قسەیان كرد؟

وەلآم : ئەم ئایەتە قورئانیە وەلآمەكەمان دەداتەوە.

(وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ١٣٨ ) الاعراف

واتە: لەدەریا پەڕینەوەو بە پەیكەری (بت)یٚ گەیین: و نەوەكانی یەعقووبمان لە دەریای (قولزم) – كەئێستا كەنداوی (سویس)ی پێ ئەڵێن – پەڕاندەوە ئەو ساهاتنە لای كۆمەڵ و قەومێك ، كە هەردەم خەریكی پەرستنی بتەكانیان بوون و

کزۆڵەیان لە بەردەمیاندا کردبوو وتیان: موسا ! دەسا تۆش خوایەکمان بۆ پەیداکە با بیپەرستین وەکو ئەوانە چەند خوایەکیان بۆخۆیان داناوەو دەیانپەرستن موساش وتی: بە ڕاستیی ئێوە گەلێکی نەفام و نەزانن، بۆیە بە گەورەیی خوا نازانن و ئەو جۆرەشتانە داوا دەکەن !. (ئەبوو واقیدی لەیسیی) دەڵێت: هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەرەو (حونەین) دەرچوون و، لەرێگادا دارێکی گەورەی سەوزیان دیت و، داوایان لێکرد کە: وەکو کافرەکان دارێکی تایبەتی خۆیانیان هەیەو، دەچنە بنیی و شیعر و هۆنراوە دەڵێن و، ڕم و کەوانەکانیشیانی لێ هەڵدەواسن و، بەوکارەیان پیرۆزی دەکەن و، لەوێ قەتیس دەمێنن ! دەبا ئێمەیش ئەم دارە پیرۆز بکەین و چەکەکانمانی لێ هەڵواسین و بیپەرستین !. ئەویش فەرمووی: (الله أكبر)! ئەمە هەر لەو قسەیە دەچێ کە هۆزەکەی موسا داوایان لە موسا کردو گوتیان: (اجعل لنا إلها كما لهم آلهة قال إنكم قوم تجهلون ) (تەفسیری ڕامان)

**لە جیاتی ئیمانیان بەهێزبێ ، داوای چی دەکەن.**

**بەلام کەسانێك هەن بەردەوام دەست بە دینی خواوە دەگرن:**

(لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ وَلَا مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ كَذَلِكَ) صحيح البخاري

واتە: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : بەردەوام لە ئوممەتی من کۆمەلێك هەن لەسەر حەقن ، زیانیان لێ نادە ئەگەر پشتیان تێ بکرێ یان دژایەتیان بکرێ تاکو فەرمانی خوا دێت ، واتە تاکو قیامەت

-( لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الحَقِّ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ) رواه الحاكم قال صحيح

-( لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي قَوَّامَةً عَلَى أَمْرِ الله لاَ يَضُرُّهَا مَنْ خَالَفَهَا) رواه البيهقي قال صحيح

-( لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ) رواه مسلم

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٢٥ ) سورەتی ( البقره )

﴿ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ١٢٥ ﴾ البقره

مانای ئایەتەکە(ئەمەشت وەبیربێ کە: کەعبەمان کردە پەناگاو مەڵبەندی ئەمن وئاسایش و هێمنیی و کۆبوونەوە بۆگشت خەڵکانی دنیا، بەشێوەیەك ئەگەر لەماڵی کابەدا بکوژ ببینرایە، کەس وکاری کوژراوەکە بۆیان نەبوو دەستی بۆ بەرن!. (بوخاریی) دەڵێ: (عومەری کوڕی خەتتاب)- خوا لێی ڕازی بێ- بەپەیامبەری گوت: خۆزگە جێ وەستانەکەی ئیبراهیمت دەکردە نوێژگە، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی ناردو فەرمووی: جێ ومەقامەکەی ئیبراهیم بکەنە نوێژگەی خۆتان، واتە: لەلای ئەوبەردەدا لەکاتی دروستکردنی کەعبەدا، ئیبراهیم دەیخستە ژێرپێی، نوێژو تاعەت بکەن (وعهدنا إلي إبراهيم وإسماعيل) ئینجا (ئیبراهیم وئیسماعیل)مان راسپاردن کەماڵەکەم -کەعبە- بۆئەوانەی تەواف ئەکەن وبەدەوریا دێن ودەچن، و بۆئەوانەش ئیعتیکاف تێدادەکەن ولەوێ دەمێننەوە، و بۆ رکوع بەران وسوژدە بەران لەبت و

بتپەرستیی پاك بكەنەوە. تێبینی: وشەی (ئیسماعیل) لە قورئاندا (١٢) جار هاتووە.

## ئایا بۆچی ئەم ئایەتە دابەزی؟

(ئیمامی عمر دەڵێ)بۆ چوونی من لەگەڵ فەرمانی خوا تێكی كردوە لە (٣) شوێنان

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَافَقْتُ رَبِّي فِي ثَلَاثٍ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ اتَّخَذْنَا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى فَنَزَلَتْ (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) وَآيَةُ الْحِجَابِ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ أَمَرْتَ نِسَاءَكَ أَنْ يَحْتَجِبْنَ فَإِنَّهُ يُكَلِّمُهُنَّ الْبَرُّ وَالْفَاجِرُ فَنَزَلَتْ آيَةُ الْحِجَابِ (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ....) (الأحزاب:٥٣) وَاجْتَمَعَ نِسَاءُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْغَيْرَةِ عَلَيْهِ فَقُلْتُ لَهُنَّ عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبَدِّلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ (عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا) (التَّحْرِيم: ٥) مُتَّفق عَلَيْهِ

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێ : عومەری كوڕی خەتاب خوای لێ رازی بێ دەڵێ : لە سێ شوێنان خوا پشتگیری قسەی منی كرد، یەكەم گوتم: ئەی نێرراوی خوا خۆزگە مەقامی ئیبراهیمت دەكردە نوێژگە ، خوا ئایەتی دابەزاند فەرمووی (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) واتە: (مەقامی ئیبراهیم كە شوێنی تایبەتی خواپەرستی ئەو بوو، بیكەنە جێگای خواپەرستی و نوێژ)

دووەم : لە ئایەتی حیجاب گوتم: ئەی نێرراوی خوا خوزگە فەرمانت دەكرد بە خێزانەكانت پەردە بگرنەوە ، چونكە چاك و خراپ دێتەماڵت ، خوا ئەم ئایەتەی

دابەزاند وفـەرمووی (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ....) واتـە: وە هـەر کـاتێ داوای شـتێکی نـاو ماڵتـان کـرد لـە (هاوسەرەکانی پێغەمبەر(صلى اللـە عليـە وسـلم) ئـەوە لـە پشـتی پـەردەوە لێیـان داواکەن ئەو (شێوە داواکردنە) تان خاوێن ترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش.

سێیەم : خێزانەکانی پێغەمبەر کۆبونەوەو بونە یەك داوای شتی زیاتریان دەکـرد لـە پێغەمبەر گوتم ئەگەر ئێوە تەلاّق بدا ئومێد وایە خوا لە کچان و بێوەژنانی لە ئێـوە چاکتر بە قیسمەت پێغەمبەر بکات، خوا ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد و فـەرمووی (عَسَىٰ رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا) **واتە:** دڵنیابن ئەگەر ئێوە تەڵاق بدات پەروەردگاری لەباتی ئێـوە ژنـانێکی باشـتر لـە ئێـوەی دەداتـێ موسـوڵمانانی، بڕوادارانـی، نزاکـارانی، تەوبەکارانی، خواپەرستانی، ڕۆژووگران لە بێوەژنان و کیژان.

تێبینی : حجاب جیایە لـە خۆداپۆشـین ، حجـاب واتـە پـەردە ، ئـەوەی دیکـە پـێ دەگوترێ (ستر ، لباس ، جلباب) واتە خۆداپۆشین.

## ئایا خۆدا پۆشین واجبە ؟ بەڵێ واجبە بە دەقی ئایەت

((يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٥٩) (الأحزاب: ٥٩)

واتە: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: کە بە پۆشاکی باڵا پۆش خۆیان داپۆشن ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تـا ئـازار نـەدرێن و (توشـی گێروگرفـت نـەبن)، هەمیشـەو بـەردەوام خـوا

لێخۆشبوو میهرەبانـە (لـە کـەم و کـوورِی ڕابوردووتـان خـۆش دەبێـت).(تەفسـیری ئاسان)

لە پوختەی تەفسیردا دەڵێ (عەباکانتان....)

لە تەفسیری ڕاماندا دەڵێ (پێناسەیەك بۆ جیلباب: ئیبنو عەباس دەڵێت: جیلباب: ئەو جل و بەرگەیە تەواوی جەستە هەرلـە پـێ تـا تەوقـە سـەر داپۆشـێ دەشـکرێ بڵێـیین: ئـەو پارچـە قوماشـەیە کـە ژنـان بەسـەر جـل و بەرگەکانیانـدا دەیپێچـن بەخۆیاندا وەکو عەبا کە ژنانی عێراقیی بەکاری دێـنن. بـەڵێ ژنـان هـەرکاتێ لـەماڵ چونە دەرێ بۆهەر ئیش و کارێکی پێویست، دەبێ ئەو (جیلباب)ــە بـەکار بهێـنن و تـەواوی سـەرو مـل و گـەردن و سـنگ و بـەرەۆکیان پێداپۆشـن هـەتا دەگاتـە قولـە پێیان.

**پێغەمبەر دەربارەی ( عمر ) خوا لێی رازی بێ فەرموویەتی :**

(قَدْ كَانَ يَكُونُ فِي الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ مُحَدَّثُونَ، فَإِنْ يَكُنْ فِي أُمَّتِي مِنْهُمْ أَحَدٌ، فَإِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ مِنْهُمْ) رواة مسلم (قَالَ ابْنُ وَهْبٍ: تَفْسِيرُ مُحَدَّثُونَ: مُلْهَمُونَ)

واتـە: لـەناو گـەلانی پـێش ئێـوە کەسـانێك هـەبوون کـە قسـەیان لەگەڵـدا دەکـرا (بیرۆکەی باشیان دەخرایـە نـاو دڵ) ئەگـەر لـە ئوممـەتی مـن کەسـێك هـەبێ ئـەوە عومەری کوڕی خەتابە

*******************************************

## وتاری ژماره (٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٣٨ ) سورەتی ( البقره )

**دەقەی ئایەتەکە** (صِبْغَةَ ٱللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ١٣٨) **البقره**

واتە: رەنگ کردنی خودا ، رەنگ کردنی کێ له هی خوا باشتره ( واتـه دەبـێ ئـایین لـه ژیـانی ئینسـان رەنـگ بداتـەوه بەرجەسـته بـێ ) وه ئێمـه بـۆ ئـەو بەنـدەین) تەفسیری قورئانی بەرزو به پێز

-( ڕەنگ ڕشـتنی خـودا جـوانترین ڕەنگـه، کـه بـه پێغەمبەرەکانیـدا ناردوویـەتی و بریتیه له پیشاندانی ڕێگای خواناسیی و ئایین .. جا ئایا ڕەنگ ڕێـژانی کـێ لـه هـی خودا جوانترو چاکتره؟.. ئینجا ئێوه ئەی موسـڵمانینه بڵێن: ئێمـه هـەر بەندایـەتی خودا دەکەین و هەر ئەو دەپەرستین) تەفسیری گوڵشەن

-خوا رەنگی کردوین به رەنگی خۆی (که ئیسلامه..............) پوختەی تەفسیر

**دوو دەق لەسەر هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەته:**

١-(قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ النَّصَارَى كَانَ إِذَا وُلِدَ لِأَحَدِهِمْ وَلَدٌ فَأَتَى عَلَيْهِ سَبْعَةُ أَيَّامٍ، صَبَغُوهُ فِي مَاءٍ لَهُمْ يُقَالُ له: المَعْمُودِي لِيُطَهِّرَوهَ بِذَلِكَ، وَيَقُولُونَ: هَذَا طَهُورٌ مَكَانَ الْخِتَانِ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ قَالُوا: الْآنَ صَارَ نَصْرَانِيًّا حَقًّا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ.) اسباب النزول القران للواحدي

واتــە: ئیبنــو عــەباس دەڵــێ : کــاتێ گاورەکــان منــداڵێکیان دەبــوو ، حــەوت ڕۆژ تێدەپەڕی ، سبوغیان دەکرد بە ئاو پێیان دەگوت (مەعمودی) تاکو پاکی بکەنــەوە ، دەیانگوت ئەم پاك کردنەوە لە جیاتی خەتەنەکردنە ، کە ئەم کارەیان دەکرد دەیـانگوت بـەم سـبوغ کردنـە ئـەم منداڵـە بـوە گـاورێکی ڕاستەقینە، خـواش ئـەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (صِبۡغَةَ ٱللَّهِ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبۡغَةً ۖ وَنَحۡنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ)

٢-(قَالَ الضَّحَّاكُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: دين الله وقد ورد عن ابن عباس أَنَّ نبيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: إن بني إسرائيل قالوا يا رسول الله هَلْ يَصْبُغُ رَبُّكَ؟ فَقَالَ اتَّقُوا اللَّهَ، فَنَادَاهُ رَبُّهُ يَا مُوسَى سَأَلُوكَ هَلْ يَصْبُغُ رَبُّكَ؟ فَقُلْ نَعَمْ: أَنَا أَصْبُغُ الْأَلْوَانَ الْأَحْمَرَ وَالْأَبْيَضَ والأسودَ والألوانُ كُلُّها من صَبْغي) كَذَا وَقَعَ فِي رِوَايَةِ ابْنِ مَرْدَوَيْهِ مَرْفُوعًا وَهُوَ فِي رِوَايَةِ ابْنِ أَبِي حَاتِمٍ مَوْقُوفٌ وَهُوَ أَشْبَهُ إِنْ صَحَّ إِسْنَادُهُ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ) مختصرتفسير ابن كثير

واتــە: ززەحــاك لــە ئیبنــو عەباســەو دەگێریتــەوە دەڵــێ: پێغەمبــەر فەرموویــەتی : ئەوەی ئیسرائیل گوتیان ئــەی نێــرراوی خــوا ، ئایــا خــوای تــۆ شــت ســبوغ دەکــات ؟ئەویش گوتی لە خوا بترسن بۆ ئەم پرسیار ، خوا بانگی (موسی) کرد و فــەرمووی پرسیارت لێ دەکەن ئایا خوای تۆ شت سبوغ دەکات ؟ تــۆ بــەڵێ بــەڵێ ، چــونکە مــن ســبوغی دروســتکراوەکان دەکــەم ، ڕەنگــی ســۆر و ســپی ورەش ، وە هــەموو ڕەنگەکان من ڕەنگم پێ داون و ڕەنگم کردوون .

وفي رواية-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ، قَالُوا: يَا مُوسَى هَلْ يُصَلِّي رَبُّكَ؟، قَالَ: (اتَّقُوا اللَّهَ)، قَالُوا: فَهَلْ يَنَامُ رَبُّكَ؟ قَالَ: اتَّقُوا اللَّهَ، قَالُوا: فَهَلْ يَصْبُغُ رَبُّكَ؟ قَالَ: (اتَّقُوا اللَّهَ) ، فَنَادَاهُ رَبُّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يَا مُوسَى، سَأَلُوكَ: هَلْ يُصَلِّي

رَبُّكَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، أَنَا أُصَلِّي وَمَلَائِكَتِي عَلَى أَنْبِيَائِي وَرُسُلِي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ) (الأحزاب: ٥٦) إِلَى آخِرِهَا، وَسَأَلُوكَ: هَلْ يَنَامُ رَبُّكَ؟ فَخُذْ زُجَاجَتَيْنِ بِيَدَيْكَ فَقُمِ اللَّيْلَ، فَفَعَلَ مُوسَى صَلَّى اللَّهُ عَلَى نَبِيِّنَا وَعَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَلَمَّا ذَهَبَ مِنَ اللَّيْلِ ثُلُثٌ نَعَسَ، فَوَقَعَ لِرُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ انْتَعَشَ فَضَبَطَهُمَا، حَتَّى إِذَا كَانَ آخِرُ اللَّيْلِ نَعَسَ، فَسَقَطَتِ الزُّجَاجَتَانِ فَانْكَسَرَتَا، فَقَالَ: يَا مُوسَى، لَوْ كُنْتُ أَنَامُ لَسَقَطَتِ السَّمَاوَاتُ عَلَى الْأَرَضِينَ فَهَلَكَتْ كَمَا هَلَكَتِ الزُّجَاجَتَانِ بِيَدَيْكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ، وَسَأَلُوكَ: هَلْ يَصْبُغُ رَبُّكَ؟ فَقُلْ: نَعَمْ، أَنَا أَصْبَغُ الْأَلْوَانَ: الْأَحْمَرَ وَالْأَبْيَضَ وَالْأَسْوَدَ، وَالْأَلْوَانُ كُلُّهَا فِي صَبْغِي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (صِبْغَةَ اللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً)(البقرة: ١٣٨) الكتاب: العظمة ، المولف : بأبي الشيخ الأصبهاني.

واته: له ئیبنو عەباسەوە هاتووە ، خوا لە خۆی و باوکی رازی بێ دەڵێ : نەوەی ئیسرائیل پرسیاریان لە موسی کرد ئایا خوای تۆ سەلاوات لێ دەدا ، موسی گوتی لە خوا بترسێن ، گوتیان خوای تۆ دەخەوێ ، موسی گوتی : لە خوا بترسێ ، گوتیان خوای تۆ سبوغ دەکات ، گوتی لە خوا بترسێن

خواش بانگی موسایی کرد و فەرمویٚ پرسیارت لیٚ دەکەن ئایا خوا تۆ سەلاوات لێ دەدا ؟ بەڵێ بەڵی، چونکە من و مەلائیکەتەکان سەلاوات لەسەر پێغەمبەرانم لێ دەدەین ، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ) (الأحزاب: ٥٦) إِلَى آخِرِهَا) وە پرسیارت لێ دەکەن ئایا خوای تۆ دەخەوێ ؟فەرمووی : ئەی موسی دوو شووشە بەدەستەوە بگرە شەوێ هەستەوە ، موسی وایکرد لە سێیەکی شەو خەوی هات و شووشەکانی بەربونەوە بەلام گرتنیەوە ، لە کۆتایی شەو چیتر خۆی پێ نەگیرا شووشەکان بربونەوە شکان ، خوا فەرمووی

ئەی موسی ئەگەر خوا بخەویٚ ئاسمانەکان بەردبنەوە بەسەر زەوی تێك و پێك دەچن وەك چۆن ئەم دوو شووشە تێکچوون و شکان، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند و فەرمووی (فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ ) وەپرسیارت لیٚ دەکەن ئایا خوای تۆ سبوغ دەکات ؟ بلّیٚ بەلّیٚ ، چونکە من سبوغی رەنگەکان دەکەم ، رەنگی سۆر وسپی و رەش ، هەموو رەنگەکانی هی منن ، خوا ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەر دابەزاند و فەرمووی (صِبْغَةَ اللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً)(البقرة: ١٣٨))

## ئایا مانای صەلاٚواتی خوا چییە؟

وەلاٚم: بوخاری دەلّیٚ باوکی عالیە دەلّیٚ ( صەلاٚواتی خوا واتە مەدحی پێغەمبەر دەکات لای فریشتەکان ، بەلاٚم صەلاٚواتی فریشتەکان دوعا کردنە بۆ پێغەمبەر، ئیبنو عەباس دەلّیٚ صەلاٚواتی لیٚ دەدەن واتە: پیرۆزی دەکەن ، سوفیانی سەوری دەلّیٚ صەلاواتی خوا رەحمەتە ، و صەلاواتی فریشتەکان داوای لیٚ بوردنە .وەك لەم دەقەدا هاتووە

(قَالَ الْبُخَارِيُّ: قَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ: صَلَاةُ اللَّهِ تعالى ثَنَاؤُهُ عَلَيْهِ عِنْدَ الْمَلَائِكَةِ، وَصَلَاةُ الْمَلَائِكَةِ الدعَّاء، وقال ابن عباس: يصلون يبرّكون، وقال سفيان الثوري: صلاة الرب الرحمة، وصلاة الملائكة الاستغفار)

**بە کورتی مانای ئەم ئایەتە :**

**١-( صِبْغَةَ اللَّهِ) واتە دینی خوا کە ئیسلامە**

**٢-( وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً) واتە: دینەکەی کیٚ لە ئیسلام چاکترە ، ئەوان مندالٚ سبوغ دەکەن ، خوا ئێمەی بە کاملی بە ئیسلام سوغ کردوە**

٣-( وَنَحۡنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ) ئەبێ ئیمەش ملکەچ بین

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٤٢ ) سورەتی ( البقره )

(سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمۡ عَن قِبۡلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيۡهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٤٢ ) البقره

واته :نەفامەکان دەڵێن ئەوە بۆچی قیبلەی خۆیان گۆڕی، ئـەوەی لەسـەری بـوون ، بڵێ ڕۆژهەلات و ڕۆژ ئاوا هی خوان ، کێی بوی رینمونی دەکات بۆ ڕێگای راست.

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە چی بوو؟**

١-(عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ، فَصَلَّى نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا، وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ نَحْوَ الْكَعْبَةِ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ) (البقرة: ١٤٤) الْآيَةُ، فَمَرَّ رَجُلٌ كَانَ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى قَوْمٍ مِنَ الْأَنْصَارِ يُصَلُّونَ وَهُمْ رُكُوعٌ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَدْ وُجِّهَ إِلَى الْكَعْبَةِ فَتَحَرَّفُوا نَحْوَ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ السُّفَهَاءُ مِنَ النَّاسِ وَهُمُ الْيَهُودُ (مَا وَلَّاهُمْ عَنْ قِبْلَتِهِمُ الَّتِي كَانُوا عَلَيْهَا) (البقرة: ١٤٢) قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (قُلْ لِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) (البقرة: ١٤٢) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ وَمُسْلِمٌ

واتە: لەبەرای کوڕی عازەبەوە هاتووە دەڵێ : کاتێ پێغەمبەر هاتە مەدینە ، شازدە مانگ یان حەڤدە مانگ نوێژی بەرەوە قودس دەکرد ، پێغەمبەریش حەزی دەکرد بەرەو کەعبە نوێژ بکات ، خواش ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاندو فەرمووی (قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ) واتە: (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسورانی ڕووخسارت ڕوو بەئاسمان دەبینین (کە بە هیوای ڕووگەیەکی تایبەتیت، ئێمەش ئاگاداری نیازی دڵت بووین) سوێند بەخوا ئێمەش ڕووت وەردەچەرخێنین بۆ ڕووگەیەك پێی ڕازی و خۆشنوود بیت، دە ڕووت وەربچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (المسجد الحرام) پیاوێك لەگەڵ پێغەمبەر نوێژی کردبوو ، بەلای کۆمەلێك لە ئەنصار رابرد، بینی وا نوێژ دەکەن لە روکوع دان بەرەو قودس ، گوتی شاهیدی دەدەم پێغەمبەر ڕووکردە کەعبە ئێوەش ڕوو بکەنە کەعبە، هەندێ لە نەفامەکان کە جوولەکە بوون گوتیان (مَا وَلَّاهُمْ عَنْ قِبْلَتِهِمُ الَّتِي كَانُوا عَلَيْهَا) (البقرة: ١٤٢) واتە : نەفام و دەم بەتاڵەکان لە خەڵکی (دوای گۆڕینی ڕووگە لە قودسەوە بۆ کەعبە) دەڵێن: باشە چی وای لێکردن کە واز لە ڕووگە پێشوەکە بهێنن؟! کە جاران ڕوویان تێدەکرد، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (قُلْ لِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) واتە: پێیان بڵێ: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و (هەموولایەك) خوا خاوەنیەتی، هەر کەسێکی بوێت ڕێنموویی دەکات بۆ ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و ڕەوان.

٢-(عَنْ الْبَرَاءِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا وَكَانَ يُعْجِبُهُ أَنْ تَكُونَ قِبْلَتُهُ قِبَلَ الْبَيْتِ وَأَنَّهُ صَلَّى أَوْ صَلَّاهَا صَلَاةَ الْعَصْرِ وَصَلَّى مَعَهُ قَوْمٌ فَخَرَجَ رَجُلٌ مِمَّنْ كَانَ صَلَّى مَعَهُ فَمَرَّ عَلَى أَهْلِ الْمَسْجِدِ وَهُمْ رَاكِعُونَ قَالَ أَشْهَدُ بِاللَّهِ لَقَدْ صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ قِبَلَ مَكَّةَ فَدَارُوا كَمَا هُمْ قِبَلَ الْبَيْتِ وَكَانَ الَّذِي مَاتَ عَلَى الْقِبْلَةِ قَبْلَ أَنْ تُحَوَّلَ قِبَلَ الْبَيْتِ رِجَالٌ قُتِلُوا لَمْ نَدْرِ مَا نَقُولُ فِيهِمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ ) رواه البخاري

واته: لەبەرای کوڕی عازەبەوە خوا لێی رازی بێ هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر بەرەو قودس نوێژی کرد شازدە مانگ یان حەڤدە مانگ ، حەزی دەکرد رووگەکەی کەعبە بێ ، نوێژی عەسری کرد ، کۆمەڵێك لەگەڵی بوون لە نوێژ ، یەکێ لەوانەی لەگەڵی بوو لە نوێژ بەلای نوێژ خوێنانەی مزگەوتێدا تێپەری لە رکوعدا بوون ، پیاوەکە گوتی شاهیدی دەدەم بە خوا ، بێگومان نوێژم کرد لەگەل پێغەمبەر بەرەو مەککە ، ئەوانیش یەکسەر رووی خۆیان وەرگێرا بەرەو کەعبە لە ناو نوێژدا ، وە ئەوانەی پێش گۆرینی قیبلە مردبوون و یان شەهید ببوون نەمان دەزانی چارەنوسیان چییە؟ بۆیە خوای میهرەبان ئەو ئایەتەی دابەزاند و فەرمووی (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ) واتە : وەخوای گەورە بڕوا (و نوێژەکانی جاران) تانی بەزایە نەداوە بەڕاستی خوا لەگەڵ خەڵکی دا دڵسۆزی میهرەبانە

تێبینی : ئەو مزگەوتەی ئەم حالەتەی تێدا روودا پێ دەگوترێ (مسجد ذوالقبلتين) واتە مزگەوتی دوو قیبلە.

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٤٣ ) سوڕەتی ( البقره )

(وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ١٤٣ )البقره

مانـای ئایەتەکـە (هـەروەها کردمـانن بەگـەلێکی میانـەڕەو (ی هەڵبـژاردە) تاببنـە چاودێر بەسەر مەردوومەوە، وە پێغەمبەریش(صلی اللـە علیـە وسـلم) چـاودێر بێـت بەسـەر ئێـوەوە ئـەو ڕووگەیـەی کـەجاران لەسـەری بـووی نـەمان گێـڕا (بەڕووگـەو لەپاشان گۆڕیمان بەکەعبە) تەنها بۆئەوەی دەربکەوێت کێ شـوێن پێغەمبـەر(صـلی اللـە علیـە وسـلم) دەکـەوێت( وەجیادەبێتـەوە) لەوانـەی کـەپاش گەزدەبنـەوە وە بەڕاستی (ئەم گۆڕینە) کارێکی زۆر گـەورەو گـران بـوو مەگـەر لای ئەوانـەی کـەخوا ڕێنموونیی کردوون وەخوای گەورە بڕوا (و نوێـژەکانی جـاران) تـانی بەزایـە نـەداوە بەڕاستی خوا لەگەڵ خەڵکی دا دڵسۆزی میهرەبانە) پوختەی تەفسیر

## ئایا هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو ؟

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ : كَانَ رِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – قَدْ مَاتُوا عَلَى الْقِبْلَةِ الْأُولَى، مِنْهُمْ أَسْعَدُ بْنُ زُرَارَةَ وَأَبُو أُمَامَةَ أَحَدُ بَنِي النَّجَّارِ، وَالْبَرَاءُ بْنُ مَعْرُورٍ أَحَدُ بَنِي سَلَمَةَ، وَأُنَاسٌ آخَرُونَ، جَاءَتْ عَشَائِرُهُمْ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ تُوُفِّيَ إِخْوَانُنَا وَهُمْ يُصَلُّونَ إِلَى الْقِبْلَةِ الْأُولَى، وَقَدْ صَرَفَكَ اللَّهُ تَعَالَى إِلَى قِبْلَةِ إِبْرَاهِيمَ، فَكَيْفَ بِإِخْوَانِنَا؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ) الْآيَةَ. ثُمَّ قَالَ: (قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ) وَذَلِكَ أَنَّ النَّبِيَّ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – قَالَ لِجِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ: وَدِدْتُ أَنَّ اللَّهَ صَرَفَنِي عَنْ قِبْلَةِ الْيَهُودِ إِلَى غَيْرِهَا" وَكَانَ يُرِيدُ الْكَعْبَةَ، لِأَنَّهَا قِبْلَةُ إِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ: إِنَّمَا أَنَا عَبْدٌ مِثْلُكَ لَا أَمْلِكُ شَيْئًا فَسَلْ رَبَّكَ أَنْ يُحَوِّلَكَ عَنْهَا إِلَى قِبْلَةِ إِبْرَاهِيمَ" ثُمَّ ارْتَفَعَ جِبْرِيلُ وَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – يُدِيمُ النَّظَرَ إِلَى السَّمَاءِ رَجَاءَ أَنْ يَأْتِيَهُ جِبْرِيلُ بِمَا سَأَلَهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ)
اسباب النزول القران للواحدي

واته : ئیبنو عەباس دەڵێ : پیاوانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر مردبوون لەسەر قیبلەی پێشوو(قودس) لەوانە ئەسعەدی کوڕی زووڕارە ، و ئەبو ئومامە کەیەکێك بووە لە بەنی نەجار ، وە بەرای کوڕی مەعرور کە یەکێ بووە لە بەنی سەلەمە ، کەسانی دیکەش ، خەزمەکانیان هاتن گوتیان ئەی نێرراوی خوا ، ئێمە براکانمان مردن بەلام نوێژیان بەرەو قیبلەی یەکەم دەکرد ، دواتر دوای مردنی ئەوان خوا قیبلەی گۆڕی بۆ لای قیبلەی ئیبراهیم ، ئایا چارەنوسی براکانمان چی دەبێ ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ) **واتە:** وەخوای گەورە بڕوا (و نوێژەکانی جاران) تانی بەزایە نەداوە بەڕاستی خوا لەگەڵ خەڵکی دا دڵسۆزی میهرەبانە

دوای خوا فەرمووی :(قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ) واتە : بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسورانی ڕووخسارت ڕوو بەئاسمان دەبینین (کە بە هیوای ڕووگەیەکی تایبەتیت، ئێمەش ئاگاداری نیازی دڵت بووین) سوێند بەخوا ئێمەش ڕووت وەردەچەرخێنین بۆ ڕووگەیەك پێی ڕازی و خۆشنوود بیت، دە ڕووت وەربچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (المسجد الحرام)، ئەوەش ئەوەبوو پێغەمبەر بە جوبریلی فەرموو سەلامی خوای لێ بێ ، ئاواتە خوازم خوا قیبلەم بۆ بگۆڕێ لە قیبلەی جوولەك بۆ شوێنی دیکە ، حەزیشی لە کەعبە بوو ، چونکە ڕووگەی ئیبراهیم ، جوبریلیش پێی گوت منیش وەکو تۆ بەندەی خوام هیچم بەدەست نیە ، لە خوای خۆت داوا بکە قیبلەت بۆ بگۆڕێ بۆ لای قیبلەی ئیبراهیم ، دواتر جوبریل بەرزبویەوە ، پێغەمبەریش چاوی بربویەوە ئاسمان بە ئومێدی ئەوەی جوبریل دابەزی بۆ ئەوەی هەواڵی قیبلە گۆرینی پێ بێ ، کەباسی لەگەل کردبوو ، خواش ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاند .

## چەند فەرموودەیەك دەربارەی ئێوە شاهیدی خوان:

١-(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، وَجَبَتْ)، وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرًّا، فَقَالَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، وَجَبَتْ)، قَالَ عُمَرُ: فِدًى لَكَ أَبِي وَأُمِّي، مُرَّ بِجَنَازَةٍ، فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرٌ، فَقُلْتَ: «وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، وَجَبَتْ»، وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ، فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرٌّ، فَقُلْتَ: (وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، وَجَبَتْ)؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْرًا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَمَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرًّا وَجَبَتْ لَهُ النَّارُ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللهِ فِي الْأَرْضِ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللهِ فِي الْأَرْضِ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللهِ فِي الْأَرْضِ) رواه مسلم

واته : لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە : گوتویەتی جەنازەکیان تێپەڕاند خەڵکی مەدح وستایشیان کرد ، پێغەمبەر فەرمووی (واجب بوو ، واجب بوو، واجب بوو) بۆی ، دواتر جەنازەکی دیکەیان تێپەڕاند خەڵکی بە خراپە باسیان کرد ، پێغەمبەر فەرمووی : (واجب بوو ، واجب بوو، واجب بوو) بۆی ، عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێ گوتی: دایك و باوکم بە قوربانت بێ ، ئەو جەنازەی تێپەری مەدحیان کرد فەرمووت : (واجب بوو ، واجب بوو، واجب بوو) بۆی ، وە ئەو جەنازەی تێپەری زەمیان کرد، فەرمووت : (واجب بوو ، واجب بوو، واجب بوو) بۆی ، فەرمووی ئەوەی بە چاکە باستان کرد بەهەشتی بۆ مسۆگەر بوو ، ئەوەی بە خراپە باستان کرد ئاگری دۆزەخی بۆ مسۆگەر بوو ، ئێوە شاهیدی خوان لەسەر زەوی ، ئێوە شاهیدی خوان لەسەر زەوی ، ئێوە شاهیدی خوان لەسەر زەوی .

وفي رواية (...قَالُوا: جِنَازَةُ فُلَانٍيِّ الْفُلَانِ كَانَ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، وَيَعْمَلُ بِطَاعَةِ اللَّهِ، وَيَسْعَى فِيهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، وَجَبَتْ) وَمُرَّ

بِجِنَازَةٍ أُخْرَى، قَالُوا: جِنَازَةُ فُلَانٍ الْفُلَانِيِّ كَانَ يُبْغِضُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، وَيَعْمَلُ بِمَعْصِيَةِ اللَّهِ وَيَسْعَى فِيهَا....) رواه الحاكم صحيح

٢-(المَلاَئِكَةُ شُهَدَاءُ اللهِ فِي السَّمَاءِ وَأَنْتُمْ شُهَدَاءُ الله فِي الأَرْضِ) رواه النسائي قال الالباني صحيح

٣-(إنّ لله تَعَالَى مَلائِكَةً فِي الأَرْضِ تَنْطِقُ على أَلْسِنَةِ بَنِي آدَمَ بِمَا فِي المَرْءِ مِنَ الخَيْرِ والشَّرِّ) رواه الحاكم والبيهقي قال الالباني صحيح

واته : خوا بەرز هەندێ فریشتەی هەن لەسەر زەوی ، شت تۆمار دەکەن لەسەر زاری خەڵکی چاکە بێ یان خراپە .

**ڕوونکردنەوەی مانای ئەم سێ ووشانە :**

١- (شهداء) واتە ئێوە چاودێرن و بەڵگەن بەسەر ئوممەتانەوە

٢-(وسطا) واتە: مام ناوەند نەوەك (ملحد) بڵێن خوا نیە ، نەوەك (مشرك) کۆمەڵێك خوا بڕیاربدین

**٣-لە** (القبلة) شدا مام ناوەندن چونکە نەصرانیەکان ڕوویان لە ڕۆژهەلات دەکرد ، جوولەکەکانیش ڕوویان لە ڕۆژئاوا دەکرد ، بەلآم خوا فەرمووی ڕوو لە کەعبە بکەن، کە بە نیسبەت هەردووکیان دەکەوێتە نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا.

**لەڕۆژی قیامەت ئێمە شاهێدین بۆ پێغەمبەران (علیه الصلاه والسلام):**

( عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُدْعَى نُوحٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ يَا رَبِّ فَيَقُولُ هَلْ بَلَّغْتَ فَيَقُولُ نَعَمْ فَيُقَالُ لِأُمَّتِهِ هَلْ بَلَّغَكُمْ فَيَقُولُونَ مَا أَتَانَا مِنْ نَذِيرٍ فَيَقُولُ مَنْ يَشْهَدُ لَكَ فَيَقُولُ مُحَمَّدٌ وَأُمَّتُهُ فَتَشْهَدُونَ أَنَّهُ قَدْ بَلَّغَ (وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا)( البقرة: ١٤٣) فَذَلِكَ قَوْلُهُ جَلَّ ذِكْرُهُ (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا)( البقرة:١٤٣) وَالْوَسَطُ : الْعَدْلُ ) رواه البخاري **واته: ڕێك وڕاست**

واتە: لە ئەبی سەعیدی خودریەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی : ڕۆژی قیامەت بانگی (نوح) دەکرێ ، نوح ئەڵێ بەڵێ خوایە لە خزمەتدام ، خوا دەفەرموێ ئایا ئایینت بە خەڵکی ڕاگەیاند ؟ نوح دەڵێ بەڵێ ، بە گەلی نوح دەگوترێ ئایا نوح پێ ڕاگەیاندن ؟ ئەوان دەڵێن نەخێر هیچ ئاگادار کەرێك (پێغەمبەرێك) بۆمان نەهاتووە ، بە(نوح) دەگوترێ کێ شاهێدت بۆ دەدات ، ئەڵێ (محمد) و ئوممەتەکەی ، جا پێغەمبەر و ئێوە شاهیدی دەدەن بۆ نوح ، ئەڵێن بەڵێ ڕاستە پەیامەکەی ڕاگەیاند ، ئەوەیە خوا دەفەرموی (وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا) واتە: پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) چاودێر بێت بەسەر ئێوەوە، وەهەروەها بەم شێوەش خوا فەرموویەتی (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا) واتە: هەروەها کردمانن بەگەلێکی میانەڕەو (ی هەڵبژاردە) تاببنە چاودێر بەسەر مەردوومەوە.

## ئێمە کۆتا ئوممەت و باشترین ئوممەتین:

چەند دەقێك لەم بارەوە:

١–( قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نُكْمِلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ سَبْعِينَ أُمَّةً، نَحْنُ آخِرُهَا وَخَيْرُهَا)رواه ابن ماجه قال الالباني حسن

واتــە : پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) فەرموویــەتی : ڕۆژی قیامــەت ئێمــە حەفتایــەمین ئوممەتین ، وە ئێمە کۆتا ئوممەتین و باشترینیانین .

٢–( عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (كُنْتُمْ خير أُمَّةٍ أُخرجت للنَّاس) قَالَ: (أَنْتُمْ تُتِمُّونَ سَبْعِينَ أُمَّةً أَنْتُمْ خَيْرُهَا وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللَّهِ تَعَالَى) رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ وَابْنُ مَاجَهْ وَالدَّارِمِيُّ وَقَالَ التِّرْمِذِيُّ: قال الالباني حسن

واتە : لە بە هزی کوڕی حەکیمەوە ، ئـەویش لـە بـاوکی ، ئـەویش لـە بـاپیری ، کـە گـوێی لــە پێغەمبــەر بــووە، دەربــارەی ئایــەتی (كُنْتُمْ خير أُمَّةٍ أُخرجت للنَّاس) فــەرمووی : ئێــوە تەواوکــەری حەفتایــەمین ئوممــەتن ، وە ئێــوە باشــترین و ڕێزدارترینیانن

بەڕێزان بزانن ئەگەر ئێمە دەست لە قورئان بەربدەین ، پێغەمبەر سکاڵامان لەسـەر تۆمار دەکات

وەك لەم ئایەتەدا هاتووە (وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا (الفرقان: ٣٠)

واته : (دوای دوور کەوتنەوەی ئوممەت لە قورئان) پیغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم سکاڵا دەکات و دەفەرموێت: پەروەردگارا بەڕاستی قەومەکـەم وازیـان لـەم قورئانـە هێناوە و پشت گوێیان خستووە و گرنگی پێ نادەن.) تەفسیری ئاسان .

## بەشاهێدی دوو کەسی راست وتەقوادار دەچیتە بەهەشت:

( عَنْ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَيُّمَا مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ) قُلْنَا: وَثَلَاثَةٌ؟ قَالَ: (وَثَلَاثَةٌ) . قُلْنَا وَاثْنَانِ؟ قَالَ: (وَاثْنَانِ) ثُمَّ لَم نَسْأَلهُ عَنِ الْوَاحِد) رَوَاهُ البُخَارِيّ

فائدة: يجب أن يكون الثناء من المتقين أو الصادقين من جيرانه العارفين به من ذوي الصلاح والعلم موجب له الجنة بإذن الله. أما عامة الناس فإنهم يحكمون على الميت على حسب أهوائهم والله أعلم.(كنوز السنة النبوية)

واتە: لە عومەرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: هەر موسڵمانێك چوار کـەس شاهێدی بۆ بە چاکە بدەن ، خوا ئـەو کەسـە ئەخاتـە بەهەشـتەوە، ئـەڵێ گوتمـان: ئەدی سێ کەس شاهێدی بۆ بدەن ، فەرموو : سـێ کەسـیش، گوتمـان : ئـەدی دوو کەس ، فەرمووی : دووکەسیش ،پاشان پرسیارمان لێ نـەکرد دەربـارەی شـاهێدی یەك کەس.

تێبینی: ئەو کەسانەی شاهێدی بۆ دەدەن ، ئەبێ ئەو کەسـە کەسـێکی راسـت بـێ، یان تەقواربێ لە جیرانی کـە بیناسـی لـە ئـەهلی چـاکە وعـیلم بـێ، نـەك عـەوام ، چونکە کەسی عەوام بە پێ ئارەزووی خۆی بریار دەدا.

**********************************

## وتاری ژماره (٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٥٨ ) سورەتی ( البقره )**

(إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ١٥٨) البقره

واته : بەڕاستی صەفاو مەڕوە لەدروشمەکانی(دینی) خوان جا هەر کەسێك حەجی ماڵی خوای کرد یا عەمرەی کرد هیچ تاوانی ناگات کە تەواف ئەو دووانەش بکات وە هەرکەسێك بە ئارەزووی خۆی چاکەیەکی کرد ئەوە بێگومان خودا سوپاسگوزارێکی زانایە.) پوختەی تەفسیر

### چەند زانیارێك دەربارەی ئەم ئایەتە :

١-پێش ئیسلام لەسەر ئەم دوو کێوە دوو بتی لێ بوون ، لە زەمانی جاهیلی لە کاتی صفاو مەروە دەیانپەرستن ، پاش ئیسلام موسڵمانان نەدەوێران بچن تەواف صەفاو مەر بکەن نەوەك گوناح بێت هەر چەند بتەکانیش نەمابوون .(تەفسیری گوڵشەن)

٢-صەفاو مەڕوە دوو تەپۆڵکەن لە نزیکی کەعبەوەو، دووریی نێوانیان نزیکەی (٨٠٠) هەنگاوێك دەبێت.(شعائر): جەمعی(شعیرە) یە، واتە: نیشانە، بەو جێگایانە دەوترێت کە لە کاتی حەجدا ڕوویان تێ دەکرێت، وەکو (صەفا) و (مەڕوە) و(موزدەلیفە).

٣-(عمرە) واتە: زیارەت، عەمرە زیارەتێکی تایبەتیە وەکو حەج.

٤-(تطوع) : بەجێهێنانی کارێکە بەبێ زۆر لێکردن و ناچارکردن، بەڵکو کەسەکە بە حەزو ویستی خۆی ئەنجامی دەدات، جا کارەکە ئایینی بێت یان کاری تر. (جناح) واتە: گوناه(گولشەن).

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

**دوو دەق هەنە لەم بارەوە:**

١-(قَالَ عُرْوَةُ سَأَلْتُ عَائِشَةَ فَقُلْتُ لَهَا أَرَأَيْتِ قَوْلَ اللَّهِ تَعَالَى إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوْ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا) فَوَاللَّهِ مَا عَلَى أَحَدٍ جُنَاحٌ أَنْ لَا يَطُوفَ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ قَالَتْ بِئْسَ مَا قُلْتَ يَا ابْنَ أُخْتِي إِنَّ هَذِهِ لَوْ كَانَتْ كَمَا أَوَّلْتَهَا عَلَيْهِ كَانَتْ (لَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لَا يَتَطَوَّفَ بِهِمَا) وَلَكِنَّهَا أُنْزِلَتْ فِي الْأَنْصَارِ كَانُوا قَبْلَ أَنْ يُسْلِمُوا يُهِلُّونَ لِمَنَاةَ الطَّاغِيَةِ الَّتِي كَانُوا يَعْبُدُونَهَا عِنْدَ الْمُشَلَّلِ فَكَانَ مَنْ أَهَلَّ يَتَحَرَّجُ أَنْ يَطُوفَ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَلَمَّا أَسْلَمُوا سَأَلُوا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ قَالُوا يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّا كُنَّا نَتَحَرَّجُ أَنْ نَطُوفَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ الْآيَةَ قَالَتْ عَائِشَةُ وَقَدْ سَنَّ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الطَّوَافَ بَيْنَهُمَا فَلَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يَتْرُكَ الطَّوَافَ بَيْنَهُمَا) صحيح البخاري ومسلم والنسائي

واتە: عورووە دەڵێ : پرسیارم لە عائیشە کرد (بۆزانین عورووە کوڕی زوبێر ،و کوڕی ئەسمای کچی ئەبوبکرە، ئەسماش خوشکی عائیشەیە) پێم گوت رات چۆنە دەربارەی ئەم ئایەتە کە خوا فەرموویەتی (لَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لَا يَتَطَوَّفَ بِهِمَا) ئەڵێ گوتم: سوێند بەخوا کەسێ سەعی نێوان صەفا و مەروە نەکات گوناحی ناگاتێ ، عائیشە گوتی قسەیەکی خراپت کرد ئەی کوڕی خوشکم ، چونکە ئەگەر وەکو تۆ

راڤـەی بکـەی ئـەبیّ بـەم شـێوە بخوێندرێتـەوە (لَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لَا يَتَطَوَّفَ بِهِمَا) بەڵکو ئەم ئایەتە بۆ ئەنصارەکان دابەزی ، ئـەوان پـێش موسـڵمان بـوون ، لـەکاتی حەج لەلای بتی مەنات کە دەیان پەرست لەکن مەشلل ، ئـەوەی لـەویّ دەسـتی پـیّ کردبایە ناچار دەبوو ، سەعی صەفاو مەروە بکات ، بـەڵاّم کـاتیّ موسـڵمان بـوون ، پرسیاریان کرد لـە پێغەمبـەری خـوا ، گوتیـان ئـەی نێرراوی خـوا ، ئێمـە ناچـارین سەعی صەفاو مەروە بکەین ، خواش ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ) عائیشە گوتی: پێغەمبەر کردیە سوننەت و رێباز ، سەعی نێوان صەفاو مەروە ، بۆیە هیچ کەس بـۆی نیـە ، واز لـە سـەعی بـێنی و تـەرکی بکـات ، چـونکە بویتە دەستور ویاسا.

٢-( عن عَاصِمِ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ سَأَلْتُ أَنَس بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عن الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَقَالَ كُنَّا نَرَى أَنَّهُمَا مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ فَلَمَّا كَانَ الْإِسْلَامُ أَمْسَكْنَا عَنْهُمَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوْ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتە: عاصیمی کوڕی سولیمانەوە هاتووە دەڵێ : پرسیارم کـرد لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیك خوا لێی رازی بـیّ ، دەربـارەی صـەفاو مـەروە ، ئـەویش گـوتی ئێمـە وامـان دەزانی سەعی صەفاو مەروە کارێکی سەردەمی نەزانییە، نە دەچووین بەلایانـەوە ، تاکو ئەم ئایەتەی دابەزانـد و فـەرمووی (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوْ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا) واتـە: بەڕاسـتی سـەفا و مـەروە (کـە دوو جێگەن لـە پـاڵ کەعبـەدا) لـە دروشمـەکانی خـوای پـەروەردگارن، جـا ئـەوەی حەجی ماڵی خوا دەکات، یاخود عەمرە ئەنجام دەدات (کە لە هەموو کاتێکی سـاڵدا دەکرێت) ئەوە هیچ گونـاهێکی لەسـەر نییـە ئەگـەر هاتوچۆو بکـات لـە نێوانیانـدا،

ئەوەش خۆبەخشی دەكات و (عەمرە و تەواف)ی زیاتر دەكات با بزانێت كە خوا سوپاسگوزارو زانایە.

تێبینی: كاتی خۆی هاجەرە خاتوون دایكی ئیسماعیل ئەوسەرو ئەو سەری دەكرد لە ئاو دەگەرا،بۆیە ئێستا سالآن بە ملیۆنان كەس هەمان كار ئەنجام دەدەن ئەوەش بە ریزوحورمەت هەژمار دەكرێت بۆ ئافرەتان.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٥٩ ) سورەتی ( البقره )

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ١٥٩ ) إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَبَيَّنُوا فَأُولَئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (١٦٠) البقره

واتە : ئەوانەی كە ئەو موژدەیەی لە تەورات و ئینجیلدا_ دەرحەق بە ڕاستێتی پێغەمبەرێتی محەممەد(صلی اللە علیە وسلم)_ بەیانمان كردووە، لە ترسی لە دەست چوونی پلەو پایەی خۆیان دەشارنەوە، ئەوانە خودا نەعلەتیان لێ دەكات و لە ڕەحمەتی خۆی دووریان دەخاتەوە، هەروەها هەموو نەعلەتكەرانیش هەر نەعلەتیان لێ دەكەن) گولشەن

مانای ئایەتی (١٦٠) تەنها ئەوانەیان نەبێت كە لە كردەوە خراپەكانی خۆیان پەشیمان دەبنەوەو، ڕێگای ڕاست دەگرن و، پێغەمبەریەتی پێغەمبەر(صلی اللە علیە وسلم) ئاشكرا دەكەن و خۆشیان ئیمانی پێ دەهێنن و، ڕوو دەكەنە چاكەكاریی و ئەنجامدانی ئەركەكانی سەرشانیان، خودا دەفەرموێت: لەوانە خۆش دەبم، چونكە من زۆر تەوبە وەرگرو، خاوەن بەزییەكی بێ ئەندازەم) گولشەن

هەندێ لە زانایان دەڵێن دەربارەی زانایانی جوولەکەو گاور هاتۆتە خوارەوە چونکە سیفاتی پێغەمبەریان شاردۆتەوە لە (تەورات و ئینجیل)

-بەلاَم هەرەشەکە هەموو کەس دەگرێتەوە ئەوەی حەق و راستی بشارێتەوە بەتایبەتی زانایانی ئیسلام

زانایان بنچینەیەکان داناوە : (العِبْرَةُ بِعمومِ المعنى وليسَ بخُصُوصِ السّبَب)

واتە : دەبێ سەرنجی گشگیری مانای بدرێ ، نەك تایبەتمەندی هۆی هاتنەخوا)

## دەرسەکانی ئەم ئایەتە :

١-هەرگیز حەق نەشارینەوە

٢-بەدوای حەق وراستی بکەوین و سەری بخەین

٣-سەرنجام هەر حەق دەباتەوە

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( نَزَلَتْ فِي عُلَمَاءِ أَهْلِ الْكِتَابِ وَكِتْمَانِهِمْ آيَةَ الرَّجْمِ وأَمْرَ محمد صلى اللّه عليه وسلم)اسباب النزول القران للواحدي

واتە: ئەم ئایەتە دەربارەی زانایانی جوولەکەو گاور دابەزیوە ، چونکە ئایەتی رەجم و سیفاتەکانی پێغەمبەریان دەشاردەوە.

## چەند دەقێك دەربارەی خرا پی شاردنەوەی علیم و حەق

١-(مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ أُلْجِمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ)أخرجه أبو داود والترمذي

واتە:هەرکەسێك پرسیاری لیٚ بکریٚ دەربارەی زانستێك بیشارێتەوە ئەبسرێتەوە بە لێبەستراوەکانی ئاگر.

٢-( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: إِنَّ النَّاسَ يَقُولُونَ أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ وَلَوْلَا آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللَّهِ مَا حَدَّثْتُ حَدِيثًا ثُمَّ يَتْلُو إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنْ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى إِلَى قَوْلِهِ الرَّحِيمُ) إِنَّ إِخْوَانَنَا مِنْ الْمُهَاجِرِينَ كَانَ يَشْغَلُهُمْ الصَّفْقُ بِالْأَسْوَاقِ وَإِنَّ إِخْوَانَنَا مِنْ الْأَنْصَارِ كَانَ يَشْغَلُهُمْ الْعَمَلُ فِي أَمْوَالِهِمْ وَإِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ كَانَ يَلْزَمُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشِبَعِ بَطْنِهِ وَيَحْضُرُ مَا لَا يَحْضُرُونَ وَيَحْفَظُ مَا لَا يَحْفَظُونَ) رواه البخاري

واتە: لە ئەبو هوریرەوە هاتووە ، گوتویەتی : خەڵکی دەڵێن ئەبو هوریرە زۆر فەرموودە دەگێڕێتەوە ، ئەگەر لەبەر هەرەشەی ئەم دوو ئایەتە نەبوایە یەك فەرموودەم نەدەگێراوە ، ئەو ئایەتەشی خوێندەوە (إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنْ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى إِلَى قَوْلِهِ الرَّحِيمُ) واتە: برا موهاجیرەکان سەرقاڵ بوون بە تێکەولێکە ، وە برا ئەنصارەکانیش سەرقاڵ بوون بە ئیش وکار ، بەلاٌم ئەبو هوریرە هەردەم لەگەڵ پێغەمبەر بوو ، خۆی لیٚ جیانەدەکردەوە ، بە سکی برسی ، ئەوان ئامادە نەدەبوون لای پێغەمبەر،بەلاٌم من ئامادە دەبووم ، ئەوان لەبەریان نەدەکرد ، بەلاٌم من فەرموودەم لەبەر دەکرد.

<u>بەرێزان</u> : زانای هەیە هەموو شتێك دوعای بۆ دەکات ، بەلاٌم زانا هەیە هەموو کەس لەعنەتی لیٚ دەکات،

پێغەمبەر فەرموویەتی:(مُعَلِّمُ الخَيْرِ يَسْتَغْفِرُ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ حَتَّى الحِيتَانُ فِي الْبَحْرِ) رَوَاهُ الْبَزَّارُ قال الالباني صحيح

واتە :ئەو زانایەیی خەڵکی فێری شتی چاك دەكات ، هەموو شتێك داوای لێ خۆشبونی بۆ لە خوا دەكات ، تاكو نەهەنگی ناو دەریاش .

-وە خوا دەفەرمووی دەبارەی ئەوانەی هەموو کەس لەعنەتیان لێ دەكات :

(إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ)

واتە: بەڕاستی ئەوانەی كە بەرنامە و ڕێنموویيەكانی ئاشكرای ڕەوانە كراوی ئێمە دەشارنەوە كە ناردوومانە، دوای ئەوەی بۆ خەڵكيمان ڕوون كردۆتەوە لە كتێبەكاندا، ئا ئەوانە خوا نەفرينيان لێدەكات و نەفرين كارانيش نەفرەتيان لێدەكەن) تەفسيری ئاسان .

## وە پێغەمبەر دەربارەی زانای خراپ دەفەرمووی :

(رَأَيْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي رِجَالًا تُقْرَضُ شِفَاهُهُمْ بِمَقَارِيضَ مِنْ نَارٍ، قُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جَبْرَئِيلُ؟ قَالَ: خُطَبَاءُ أُمَّتِكَ الَّذِينَ يَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَيَنْسَوْنَ أَنْفُسَهُمْ، وَهُمْ يَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلَا يَعْقِلُونَ) رواه ابن حبان والبيهقي قال الالباني صحيح

واتە: ئەو شەوەی ئیسراو میعراجم پێكرا ، پیاوانێكم بینی ، لێوایان بە مەقەسی ئاگر دەبریەوە ، گوتم ئەی جوبریل ئەمانە كێن؟ گوتی ئەوانە وتاربێژی ئوممەتی تۆن ، بەخەڵكی دەڵێن چاكە بكەن ، بەلاَم خۆیان جێ بەجێی ناكەن ، لەهەمان

کاتدا قورئان دەخوێنەوە ، بەلاّم بیری لیّ ناکەنەوە و کاری پیّ ناکەن. (پەنا بەخوا لەو جۆرە کەسانە)

–زانای چاك رەحمەتە ، زانای خراپ نیقمەتە ، زانای چاك چرایە ، زانای خراپ بەلاّیە

***********************************

## وتاری ژماره (١٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٧٨ ) سورەتی ( البقره )

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَى ۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖۗ ذَٰلِكَ تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞۗ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١٧٨ ) البقره

واته : ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە پێویست کراوە لەسەر تان تۆڵە سەندن لە کوژراواندا(بەیەکسانی) ئازاد بە ئازادو بەندە بە بەندە و ژن بە ژن (مێینە بە مێینە) ئینجا هەرکەسێك بەخشرا لەلایەن برایەکی دینیەوە بەبەشێك(لە خوێنەکە) ئەبێ(خزمەکانی تر) پەیڕەوی بکەن بەباشی(بکوژیش) بەچاکی خوێنەکە بدات ئەمە سووك کردنە لەپەروەردگارتانەوەو میهرە بانی یە ئینجا هەرکەسێك دوای ئەمە دەست درێژیی کرد بۆئەو هەیە سزای بەسوێ، واتە سزای بەئازار) پوختەی تەفسیر

ئایا ئەم بەشەی ئایەتکە (فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖ) مانای چییە؟

وەلأم : واتە: (بە شێوەیەکی چاك وباش بەدوای حەقی خۆیان بکەون، تەرەفی بکوژیش بە شێوەیەکی چاك و باش حەقەکە تەسلیم بکەن )

ئایا ئەم ئایەتە (وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ (١٧٩)) البقره ، مانای چییە؟

واتە : لە کوشتنەوەدا ژیان بۆ ئێوە هەیە ئەی هۆشمەندان بەڵکو خۆتان بپارێزن .

## چەند ڕونكردنەوەیەك دەربارەی ئەم ئایەتە :

١- تەنها دەوڵەت مافی وەرگرتنەوەی قیساس و تۆڵەی هەیە، پێویستە لەسەر موسڵمانان هەوڵبدەن دەوڵەتێكی ئیسلامیی وا دروست بكەن، بڕوای بە (قیساس) ببێ و بشتوانێ ئەنجامی بدا، بەتایبەت ئەمڕۆ كەئەم جۆرە بڕیارانە لەدنیادا پشتگوێ خراون.

٢- هەندێ لە زانایان پێیان وایە: پیاو لەباتی ژن ناكوژرێتەوە بەڵام جەماوەری زانایان ئەڵێن: پیاو بە ژن ئەكوژرێ.

٣- ئاخۆ باوك بەكوشتنی كوڕی خۆی دەكوژرێتەوە؟ بۆ ئەمەش جەماوەری زانایان دەڵێن: نەخێر، بەڵام پێشەوا (مالیك) بۆ ئەم وەڵامە ڕوونكردنەوەیەكی هەیە: دەڵێ هەركاتێ ئەو باوكە كوڕەكەی خۆیخست و سەری بڕی، دەكوژرێتەوە. خۆ ئەگەر بەردێكی بۆهەڵدا، وەیا دارێكی لێدا، وەیان بەئامێرێكی وا كوشتیی، كوشندە نەبوو، ناكوژرێتەوە، چونكە لەوە ناچێ نییەتی كوشتنی بووبێ، بێجگە لەوەش ئەم فەرموودەیە هاتووە:( إِدْرَؤُا الْحُدُودَ بالشبهات ). واتە: لە بەر هەر گومانێك بێت تۆڵەكان ڕاگرن.(تەفسیری ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عن سعيد ابن جُبَيْرٍ فِي قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى) يَعْنِي إِذَا كَانَ عَمْدًا الْحُرُّ بِالْحُرِّ، وَذَلِكَ أَنَّ حَيَّيْنِ مِنَ الْعَرَبِ اقْتَتَلُوا فِي الْجَاهِلِيَّةِ قَبْلَ الْإِسْلَامِ بِقَلِيلٍ، فَكَانَ بَيْنَهُمْ قَتْلٌ وَجِرَاحَاتٌ، حَتَّى قَتَلُوا الْعَبِيدَ وَالنِّسَاءَ، فَلَمْ يَأْخُذْ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ حَتَّى أَسْلَمُوا، فَكَانَ أَحَدُ الْحَيَّيْنِ يَتَطَاوَلُ عَلَى الْآخَرِ فِي الْعُدَّةِ وَالْأَمْوَالِ، فَحَلَفُوا أن لا يَرْضَوْا حَتَّى يُقْتَلَ بِالْعَبْدِ مِنَّا الْحُرُّ مِنْهُمْ، والمرأة منا

الرجل منهم، فنزل فِيهِمْ: (الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى) (رواه ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ) وعن ابن عباس في قوله: (والأنثى بالأنثى) إِنَّهُمْ كَانُواْ لاَ يَقْتُلُونَ الرَّجُلَ بِالْمَرْأَةِ، وَلَكِنْ يَقْتُلُونَ الرَّجُلَ بِالرَّجُلِ، وَالْمَرْأَةَ بِالْمَرْأَةِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ النَّفْسُ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنُ بِالْعَيْنِ، فَجَعَلَ الْأَحْرَارَ فِي الْقِصَاصِ سَوَاءً فِيمَا بَيْنَهُمْ مِنَ الْعَمْدِ رِجَالُهُمْ وَنِسَاؤُهُمْ فِي النفس وفيما دون النفس، وجعل العبيد مستويين فِيمَا بَيْنَهُمْ مِنَ الْعَمْدِ فِي النَّفْسِ وَفِيمَا دُونَ النَّفْسِ رِجَالُهُمْ وَنِسَاؤُهُمْ وَكَذَلِكَ رُوِيَ عَنْ أَبِي مَالِكٍ أَنَّهَا مَنْسُوخَةٌ بِقَوْلِهِ (النَّفْسَ بِالنَّفْسِ) تفسير ابن كثير

واتە : سەعیدی کوڕی جوبیرەوە هاتووە دەڵێ قسەی خوای بەرز : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى) واتـە: ئەگەر کوشتنی بە ئەنقەست بوو ، ئەوەش ئەوە بوو دوو تیرەی عەرەب بەشەر هاتن لە زەمانی جاهیلی پێش ئیسلام بەکەمێك ، لە نێوانیاندا بریندارو کوژراو هەبوو ، تاکو بەندە و ئافرەتیان لەیەکدی کوشت ، هەندێکیان تۆڵەیان نەکردەوە تاکو موسڵمان بوون ، یەکێ لەو دوو تیرەیە بەهێزتر بوو سوێندیان خوارد لە جیاتی عەبد ئازاد بکوژنەوە ، وە لە جیاتی ژن پیاو بکوژنەوە ، خوا دەربارەی ئەوان ئەم ئایەتەی دابەزاند (الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى)

واتە : ئازاد لە بری ئازاد، بەندە لە باتی بەندە، مێینە لەتۆڵەی مێینە .

وەلە ئیبنو عەباسەوە هاتووە : قسەی خوا (والأنثى بالأنثى) واتە: ئەوان پیاویان لە جیاتی ژن نەدەکوشتەوە ، بەڵام پیاویان لە جیاتی پیاو دەکوشتەوە ، وە ژنیان لە جیاتی ژن دەکوشتەوە ، خوا ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاندن (النَّفْسُ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنُ بِالْعَيْنِ) واتە: ئازادەکان لە تۆڵدا یەکسان بوون لە ئەنقەستدا ، پیاوان و ئافرەتان لە روحدا ، وە لە جگە روحیشدا ، وە بەندەکانیش یەکسان بوون لە نیوان خۆیان

له روحدا و له جگه روحیشدا له پیاوان و ئافرەتان ، لە ئەبی مالیکەوە هاتووە ئەوە نەسخ بوتەوە بە ئایەتی (النَّفْسَ بِالنَّفْسِ)

٢-( قَالَ الشَّعْبِيُّ: كَانَ بَيْنَ حَيَّيْنِ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ قِتَالٌ، وَكَانَ لِأَحَدِ الْحَيَّيْنِ طُولٌ عَلَى الْآخَرِ، فَقَالُوا: نَقْتُلُ بِالْعَبْدِ مِنَّا الْحُرَّ مِنْكُمْ، وَبِالْمَرْأَةِ الرَّجُلَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ) أسباب نزول القرآن ، الواحدي، النيسابوري

واتە: لە ئیمامی شەعبیەوە هاتووە : دەڵێ لە نێوان دوو هۆزی عەرەب کوشتار هەبوو، وە یەکێکیان دەست رویشتی تر بوو ، گوتیان لە جیاتی عەبدێکی کوژراوی ئێمە ئازادێکی ئەوان دەکوژین ، وە لە جیاتی ئافرەتێکی ئێمە پیاوێك لەوان دەکوژین ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَى ۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰ )

٣-( وَعَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ الْقِصَاصُ وَلَمْ يَكُنْ فِيهِمْ الدِّيَةُ فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى لِهَذِهِ الْأُمَّةِ: (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ) (البقرة: ١٧٨) الْآيَةُ (فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ) (البقرة: ١٧٨) قَالَ: فَالْعَفْوُ أَنْ يَقْبَلَ فِي الْعَمْدِ الدِّيَةَ وَالِاتِّبَاعُ بِالْمَعْرُوفِ يَتْبَعُ الطَّالِبُ بِمَعْرُوفٍ وَيُؤَدِّي إِلَيْهِ الْمَطْلُوبُ بِإِحْسَانٍ (ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ) (البقرة: ١٧٨) فِيمَا كُتِبَ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ )رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ وَالنَّسَائِيُّ وَالدَّارَقُطْنِيّ) قال الالباني صحيح

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : لە ناو بەنی ئیسرائیل تۆڵە هەبوو بەڵام خوێن وەرگرتن نەبوو ، بەڵام خوای بەرز و بڵند بەم ئوممەتەی فەرموو (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ) واتە: **ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە پێویست کراوە لەسەر تان تۆڵە سەندن لە کوژراواندا** ، (فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ) واتە: ئینجا هەرکەسیش لەلایەن برای هاودینی خۆیەوە، واتە: لەلایەن کەس

وكاری كوژراوەوە عەفوو چاوپۆشی لێكرا ( دەڵێ عەفو بریتیە لەوەی لە جیاتی كوشتنی ئەنقەست پارەوشت وەربگری ،وە (الاتباع بالمعروف)واتە: خاوەن ماف كەس لێ كوژراو بە جوانی و شەرعی داوای حەقی خۆی بكات ، وە لایەنی بكوژیش بەجوانی ماف كوژراو بدەن (ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ) واتە: بۆ ئێوە ئاسان كراوە لە چاو گەلانی پێش ئێوە.

چەند زانیارێكی گرنك: لە(تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز) دا هاتووە:

١–قصاص لە ئایینەكان :

أ–لە شەریعەتی جوولەكەكان تەنها تۆلە (قصاص) هەیە ، خوێن و لێبوردن نیە

ب–لەشەریعەتی گاورەكان تەنها عەفو هەیە ، تۆلە ساندنەوە نیە

ج–بەلاّم لە شەریعەتی ئیسلام هەرسێكی داناوە (تۆڵە ، خوێن ، لێبوردن)

٢–عەرەبەكان ئەوەی بە دەستەلاّت بوایە دەیانگوت لە جیاتی یەك نەفەر ئەبێ دوو نەفەرمان تەسلیم بكەن ، یان (١٠) نەفەر یان سەرۆك عاشیرەتمان دەوێ

٣– سێ جۆر كوشتن هەیە ١–كوشتنی بەئەنقەست وەك بە (ئامێری كوشتن و نیەت هەبوون

٢– بەهەڵە كوشتن وەك بە ( گۆچان و زللە)

٣– بە ئەنقەست چوو وەك (بەتیر یان فیشەك بۆ نیچیر دەهاوێ ، بەلاّم بە كەسێ دەكەوی .

## ئایا خاوەن ماف چی بۆ هەیە (لە کوشتنی بە ئەنقەست) ؟

وەلأم : لە سێ شتان سەرپشکە

١-کوشتنەوەی بکوژ ٢ - خوێن وەرگرتن ٣- عەفوکردن

## ئایا مانای (الْحُرُّ بِالْحُرِّ) چییە؟

واتە ئەگەر ئازادتان لێ کوژرا هەر بۆتان هەیە ئازاد بکوژنەوە ، ئەگەر ئافرەتان لێ کوژرا تەنها بۆتان هەیە ئافرەت بکوژنەوە ، چونکە عەرەبەکان لە زەمانی جاهیلی ئەگەر ژنێکیان لێ کوژرابا دەیانگوت پیاو لە جیاتی دەکوژینەوە ، یان لە جیاتی کویلە ئازاد دەکوژینەوە.

## ئایا تۆڵە فەرزە لەم ئایەتە (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ) ؟

وەلأم : فەرزە بۆ کەسی بکوژ خۆی تەسلیم بکات ئەگەر عەفویان نەکرد ، بەلأم بۆ کەس وکاری کوژراو واجب نیە بکوژ بکوژنەوە، بەڵکو ئازادن لە نێوان (٣) بژاردە

## ئایا کافرو موسڵمان لە جیاتی یەکدی دەکوژرێنەوە ؟

لای ئەبو حەنیفە و دوو هاوەڵەکانی (ابو یوسف)و (محمد کوری حسن)و (سەوری) و(ابن ابی لیلی) و (داودی زاهیری) ، جیاوازی نیە (کویلەو ئازاد و موسڵمان و کافر) (أَقَادَ مُسْلِمًا قَتَلَ يَهُودِيًّا. وَقَالَ الرَّمَادِيُّ: أَقَادَ مُسْلِمًا بِذِمِّيٍّ وَقَالَ: أَنَا أَحَقُّ مَنْ وَفَى بِذِمَّتِي)رواه البيهقي

واتــه : پێغەمبــەر موسـڵمانێکی کوشـت لـه تۆڵـەی جوولەکەیـەك ، فـەرمووی مـن شایەستەترین کەسم ئەو پەیمانی داومە جێ بەجێی بکەم .

–وه عمرو عەلی (موسڵمانیان کوشتوە لە جیاتی زمی)

ئایا ئەو فەرموودەی دەڵـێ موسـڵمان ناکوژرێتـەوە لـە جیـانی کـافر (لَا يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ) مانای چییە؟

وەلآم : زانایان بەم شێوە (تاویل) یان کردوە ، ئەڵێن واتە (کافر) ی حەرەبی، ئەبێ ئەو فەرموودانەی لەگەڵ ئایەتەکان تێدەگیرین ئەبێ (تاویل ) بکرێن ، وەك ئایـەتی (ان النفس بالنفس)

–( عَن أبي جُحيفةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ؟ فَقَالَ: وَالَّذِي فَلَقَ الْحَبَّةَ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ مَا عِنْدَنَا إِلَّا مَا فِي الْقُرْآنِ إِلَّا فَهْمًا يُعْطَى رَجُلٌ فِي كِتَابِهِ وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ قُلْتُ: وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: الْعَقْلُ وَفِكَاكُ الْأَسِيرِ وَأَنْ لَا يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

–( عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ وَيَرُدُّ عَلَيْهِمْ أَقْصَاهُمْ وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ أَلَا لَا يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ وَلَا ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِه) رَوَاهُ أَبُو دَاوُد وَالنَّسَائِيّ قال الالباني صحيح

واتە: لە عەلیەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: موسڵمانان خوێنیان یەکسانە، ئەوەی لە ئەستویاندایە گەورەوبچوکیان جێ بـەجێی دەکـەن، هـەموویان جگـە لـە خۆیان یەك دەستن، ئاگاداربن ، موسڵمان لە جیاتی کافر ناکوژرێتـەوە، وە خـاوەن پەیمانیش لە کاتی هاوپیمانی ناکوژرێ.

## ئایا کۆمەڵێك کەس لە جیاتی یەك کەس دەکوژرێنەوە ؟

١-( عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ عُمَرَ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَتَلَ سَبْعَةً مِنْ أَهْلِ صَنْعَاءَ اشْتَرَكُوا فِي دَمِ غُلَامٍ، وَقَالَ: ( لَوْ تَمَالَأَ عَلَيْهِ أَهْلُ صَنْعَاءَ لَقَتَلْتُهُمْ جَمِيعًا)رواه البيهقي

تمالا عليه القوم: تمالا القوم على الأمر اجتمعوا عليه وقيل تعاونوا ، أَي اجْتمع رَأْيهمْ على ذَلِك الشَّيْء )

واتە : لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە ، کە عومەر خوای لێ رازی بێ ، حەوت کەسی کوشتەوە لە خەڵکی سەنعا لە تۆڵەی گەنجێك کە کوشتبویان ، عومەر گوتی ئەگەر هەموو خەڵکی سەنعا بەشدار بوایە ، هەمووم دەکوشتەوە.

٢-( عَن أبي سعيدٍ وَأبي هريرةَ عَن رسولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَوْ أَنَّ أَهْلَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ اشْتَرَكُوا فِي دَمِ مُؤْمِنٍ لَأَكَبَّهُمُ اللَّهُ فِي النَّارِ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ قال الالباني صحيح

واتە: لە ئەبو سەعید و ئەبی هوریرەوە هاتووە : کە پێغەمبەر فەرموویەتی (ئەگەر خەڵکی ئاسمان و زەوی بەشداربن لە رشتنی خوێنی ئیماندارێك ، خوا هەموویان ئەخاتە ئاگرەوە ) ئەگەر ئەهلی ئاسمان و زەوی لە قیامەت سزا وەربگرن ، کەواتە لە دونیاش شمولی هەموویان دەکات.

## ئایا واجبە کوژراو بە چی کوژراوە بەو شتەبکوژ بکوژرێتەوە؟

١-(مالك و شافعی) دەڵێن بەچی کوشتووە بەو شتە دەکوژێتەوە ، بەڵگەیان

(عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ يَهُودِيًّا رَضَّ رَأْسَ جَارِيَةٍ بَيْنَ حَجَرَيْنِ فَقِيلَ لَهَا: مَنْ فَعَلَ بِكِ هَذَا؟ أَفُلَانٌ؟ حَتَّى سُمِّيَ الْيَهُودِيُّ فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا فَجِيءَ بِالْيَهُودِيِّ فَاعْتَرَفَ فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى

اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فَـرُضَّ رَأْسُـهُ بِالْحِجَـارَةِ) مُتَّفـق عَلَيْـهِ (ش (رض) دق. (جاريـة) مـن الأنصار. (سمي) ذكر اسم القاتل. (فأومت) أشارت

واته: لەئەنەسەوە هـاتووە : جوولەكەيـەك سـەری ئـافرەتێكی بـە دوو بـەردان پـان كردەوە ، پێی گوترا كێ وای كردی ، فلانە كەس ؟ ناوی جوولەكەكە هێنرا، بەسـەر ئیشـارەتی كـرد گـوتی بـەڵێ ، جوولەكەكـەیان هێنـا دانـی پێـدا هێنـا ، پێغەمبـەر فەرمانی دا سەری پان بكرێتەوە بە بەرد (چونكە سەری كچێكی ئەنصاری لە نیـوان دوو بەرد پانكردبویەوە)

٢-(حەنەفیـەكان و حەنبەلیـەكان) و زۆربـەی زانایـان دەڵـێن وەك یـەك بـونی كوشتنەوەكە واجب نیە ، گرنگ ئەوەیە بكوژرێتەوە ، بەبەڵگەی

(عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ) رَوَاهُ مُسلم

واته: لـە شـەددادەی كـوڕی ئەوسـەوە هـاتووە: كـە پێغەمبـەر فەرموویـەتی ( خـوا چاكەی بۆ هەموو شتێك بڕیارداوە ، ئەگـەر شـتێكتان كوشـت بـە جـوانی بیكـوژن ، ئەگەر شتێكتان كوشتەوە بەجوانی بیكوژنەوە ، با چاك چەقوەكەی تیژ بكات ، بـا ئاژەڵەكە ئارام بكاتەوە . واتە : نەی ترسێنێ.

****************************************

## وتاری ژماره (١١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (البقرة:١٨٣)

واته: (ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە هەر وەك نووسراوە لەسەر ئەوانەی لەپێش ئێوە دا بوون بەڵکو خۆتان بپارێزن.

### هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٨٤ ) سورەتی ( البقره )چی بوو؟

(أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ۚ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ١٨٤) البقره

واته : ڕۆژووتان لەسەر دانرا بۆ چەند ڕۆژێکی دیاری کراوی ژمێراو جاهەر کەسێك لەئێوە نەخۆش بوو یان لەسەفەردا بوو(وە بەڕۆژوو نەبوو) ئەوە پێویستە بەئەندازە ئەو ڕۆژانەی (بەڕۆژوو نەبووە) قەزای بکاتەوە لەڕۆژانی تردا وە پێویستە لەسەر ئەوانە کە زۆر بەنارەحەتی ئەتوانن بەڕۆژوو بن (و بەڕۆژوو نابن) بریتی(یان لەسەره) ، کەخۆراکی هەژارێکە ئینجا هەرکەسێك زۆرتر بریتی بدات ئەوە باشترە بۆی و ئەگەر بەڕۆژوو بن بۆخۆتان باشترە ئەگەر بزانن.

-( فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَصُومُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ وَيَصُومُ يَوْمَ عَاشُورَاءَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ إِلَى قَوْلِهِ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَنْ شَاءَ أَنْ يَصُومَ صَامَ وَمَنْ شَاءَ أَنْ يُفْطِرَ وَيُطْعِمَ كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا أَجْزَأَهُ ذَلِكَ ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ إِلَى أَيَّامٍ أُخَرَ فَثَبَتَ

الصِّيَامُ عَلَى مَنْ شَهِدَ الشَّهْرَ وَعَلَى الْمُسَافِرِ أَنْ يَقْضِيَ وَثَبَتَ الطَّعَامُ لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ وَالْعَجُوزِ اللَّذَيْنِ لَا يَسْتَطِيعَانِ الصَّوْمَ ( سنن ابي داود ) قال الالباني صحيح بتربيع التكبير

واتە: پێغەمبەری خوا (٣) رۆژ لە هەموو مانگێك بە رۆژوو دەبوو ، وە عاشوراش بەرۆژوو دەبوو، جا خوای بەرز ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ١٨٣ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ) ...ئەوەی حەزی کردبایە بەرۆژووبێ بە رۆژوو دەبوو، ئەوەی حەزی کردبایە بە رۆژوو نەدەبوو خواردنی هەژارێکی دەدا بەبری رۆژوو دەکەوت ، دوای خوا ئەوە ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ) واتە: مانگی رەمەزان، ئەومانگەیە کە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارێ، واتە: لەرەمەزاندا (دەست بەناردنی کراوە) رێنمایی مەردم دەکا بۆ گشت کارێکی چاك و چەندین بەڵگەو نیشانەی زۆر روونی تێدایە بۆ شارەزای رێی هەق و، جیاکردنەوەی راست و ناڕاست ئینجا هەرکەسێکتان مانگی رەمەزانی بەسەرداهات، وەرێبوارو نەخۆش نەبووو، برِو بیانووی شەرعیشی نەبوو، دەبێ بەرۆژوو بێت ئینجا ئەوکەسەشتان نەخۆش و لەش بەبارە، یا لەسەفەرەو رێبوارەو، رۆژووەکەشی دەشکێنێ دەبێ لە رۆژانی دیکەدا، چەند رۆژێکی تر بەقەزا بگرێتەوە ، بەم شێوە جێگربوو ئەوەی ئامادەی مانگی رەمەزان بوو دەبێ بە رۆژوو بێ ، ئەوەی لەسەفەریش بێ دوای رەمەزان قەزادەکاتەوە ، بۆ پیاوی پیرو ئافرەتی پیر کە ناتوانن بە رۆژوو بن ، خوادنی ژەمێك دەدەنە فەقیرێك.

بەلام ئیبنو عەباس دەڵێ ئەم ئایەتە (نسخ) نەبۆتەوە وەك لەم دەقدا هاتووە

(عَنْ عَطَاءٍ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقْرَأُ وَعَلَى الَّذِينَ يُطَوَّقُونَهُ فَلَا يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ لَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ هُوَ الشَّيْخُ الْكَبِيرُ وَالْمَرْأَةُ الْكَبِيرَةُ لَا يَسْتَطِيعَانِ أَنْ يَصُومَا فَيُطْعِمَانِ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا) رواه البخاري

**واته: له عەتاوە هاتووە كە گوێی له ئيبنو عەباس بووە، بەم شێوە دەيخوێندەوە (وَعَلَى الَّذِينَ يُطَوَّقُونَهُ فَلَا يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) ئيبنو عەباس دەڵێ : ئەم ئايەتە نەسخ نەكراوە ، بەڵكو مەبەست پێی پياو وئافرەتی بەتەمەنن كە ناتوانن بە رۆژووبن ، لە جياتی هەر رۆژوو ێك خواردنی هەژارێك دەدەن.**

**ئەم دەقانەش لەم بارەوە هاتوون :**

١-( عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ:نَسَخَتْ هَذِهِ الْآيَةَ يَعْنِي (فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) (البقرة: ١٨٤) هَذِهِ الْآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا (فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ) (البقرة: ١٨٥) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ

٢-( عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، قَالَ: كُنَّا فِي رَمَضَانَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ شَاءَ صَامَ وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ وَافْتَدَى بِطَعَامِ مِسْكِينٍ حَتَّى أُنْزِلَتِ الْآيَةُ (فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ) (البقرة: ١٨٥) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە: لەسەلەمەی كوڕی ئەكوەعەوە هاتووە: دەڵێ : ئێمە لە رەمەزان لەسەردەمی پێغەمبەردا هەركەسێ ويستبای بە رۆژوو دەبوو ، ئەوەی ويستبای بە رۆژوو نەدەبوو لە جياتی خواردنی هەژارێكی دەدا ، تاكو ئەم ئايەتە دابەزی (فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ) واتە : ئەوەی ئامادەی مانگی رەمەزان بوو بابەرۆژوو بێ ، واتە : فەرز كرا

له تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز دەڵێ : ئەمەی خوارەوە هۆی دابەزینی ئەم ئایەتەیە

ئیبنو سەعد لە تەبەقاتی خویدا هێناویەتی:

( عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: هَذِهِ الآيَةُ نَزَلَتْ فِي مَوْلايَ قَيْسِ بْنِ السَّائِبِ: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) البقرة: (١٨٤) فَأَفْطَرَ وَأَطْعَمَ لِكُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا) الكتاب: الطبقات الكبرى

واتە: لە موجاهیدەوە هاتووە گوتویەتی : ئەو ئایەتە دەربارەی (مولای)من قەیسی کوڕی سابیت دابەزی (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) ئەو جا بەڕۆژوو نەبوو ، بۆ هەر ڕۆژووێك نەدارێکی ناندارە.

تێبینی : موجاهیدقوتابی عەبدولآی کوڕی عەباسە ، یەکێکە لە زانایانی تابیعی ، موجاهید کاتی خۆی کویلەی هاوەڵەی بەڕێز (قیسی کوری سابیت) بوو ، دواتر ئازادی کردوە ، دیارە تەمەنی زۆر بووە ، نەیتوانیوە بەڕۆژوو بێ لە رەمەزان ، بۆ هەر ڕۆژووێك خواردنی نەدارێکی داوە.

## چەند زانیارێك دەربارەی ڕۆژوو:

١-( من قبلکم) واتە : هیچ شەریعەتێك نەبووە ڕۆژگرتنی تێدا نەبووبێ ، وە هیچ شەریعەتێك نیە نوێژی تێدا نەبێ ، بەلآم هەر یەکە و بە جۆرێك بووە.

٢-(لعلکم تتقون) (لعل : واتە تاکو) بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن :

أ-تاکو خۆتان بپارێزن لە سزای خوا

ب- تاکو خۆتان بپارێزن لەو دەردو نەخۆشیانەی بەهۆی زۆر خۆریەوە پیدا دەبن

ج–تاكو خۆتان بپارێزن له گوناح و تاوان .

٣–(اياما معدودات) : لـه (١٢ ) مانگـان يـەك مانگـه ، لـه (٣٦٥) رۆژ (٣٠) رۆژه ، چەند سەعاتێكه ، له بەیانی تاكو ئێوارەیه ، له (٣) ژەمان یەك ژەم ناخۆین

٤–(فمن كان منكم.....فدیه) خوا روخسەتی (٣) جۆری داوه وەك:

أ–نـەخۆش ، ب– رێبـوار ، ج– ئەوانـەی بەزەحمـەت بـەرۆژوو دەبـن (نەخۆشـی بەردەوام و پیر)

٥–(لعلكم تشكرون) ئەبێ زۆر **مەمنونی** خوا بین كه رێگای داوین بپەرستین .

٦–(**یاایها الذین امنوا**) بەسه له سورەتی (البقره) (١١) جاران دووباره بوتەوه

## ئایا بۆچی رەمەزان گرنگه؟

وەڵام : ١– چونكه خوا فەرزی كردوه (كتب عليكم...

٢– یەكێكه له پێنج پایەكانی ئیسلام وەك پێغەمبەر فەرموویەتی :

(بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالْحَجِّ وَصَوْمِ رَمَضَانَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واته: پێغەمبەر فەرموویەتی : ئیسـلام لەسـەر پێـنج پایـه دامـەزراوه : شـایەتمان ، نوێژكردن ، زەكاتدان ، حەج كردن ، بە رۆژووبوون له رەمەزان.

تێبینی : جێ بەجێ كردنی ئەم روكنانه، شتی شەخصین ، بەم پێنجانـه دیـاره كـه دروشمەكان جێ بەجێ دەكات ، بەڵام شتی دیكه زۆرمـاون وەك (رەوشـتی جـوان و

هاوكاری و مافی دایك و باوك وجیران ، خزم ، سەرخستنی دینی خوا....) با كەس وانەزانیٚ موسڵمانەتی هەرئەوەندیە

## ئایا پاداشت و پلەی ڕۆژوو چییە؟

١-خوا خۆی پاداشتی دەداتەوە، واتە: هیٚندە زۆرە و دیار نیە.وەك لەم دەقدا هاتووە.

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ قال : قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلَّا الصِّيَامَ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ ، الصَّوْمُ جُنَّةٌ فَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلَا يَرْفُثْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَسْخَبْ فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ ، وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُ بِهِمَا إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ ، وَإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ) متفق عليه

ئەم فەرموودە دوو بەشە بەشیٚك قودسیە(واتە: قسەی خوایە) ، بەشیٚك هی خۆیەتی (واتە: قسەی پیٚغەمبەرە) (هی خۆی لە (**والذي**) دەست پیٚ دەكات) واتە: پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی، خوا دەفەرمویٚ : ڕۆژوو بۆ منە، وەمن خۆم پاداشتی دەدەمەوە، كەسی بە ڕۆژوو واز لە ئارەزوو و خواردن و خواردنەوە دەهیٚنیٚت لە پیٚناوی من، ڕۆژوو قەڵغانە، بۆ كەسی بە ڕۆژوو دوو خۆشی هەیە، خۆشییٚك كاتی ڕۆژوو شكاندنی ئیٚوارە، خۆشییٚك كاتیٚ دەگاتە من (واتە پاداشتی قیامەت)

٢-بەهۆی یەك ڕۆژوو (٧٠) ساڵ لە ئاگری دۆزوخ دوور دەكەویتەوە

(عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللهِ بَاعَدَ اللهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واته: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەوەی یەك ڕۆژ له پێناوی خـوا بـەڕۆژوو بـێ، خوا (٧٠) ساڵ ڕووی له ئاگری دۆزخ دور دەخاتەوه.

وفي رواية– عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:(مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ جَعَلَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ خَنْدَقًا كمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ) سنن الترمذي حكم الألباني حسن صحيح

واته: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەوەی یەك ڕۆژی له پێناوی خـوا بـەڕۆژوو بـێ، خوا خەندەقێك لێ دەدات له نێوان کەسی بەڕۆژوو و ئاگر بەئەنـدازی دووری نێـوان ئاسمان و زەوی.

٣– ئەوەی (١) مانگ به ڕۆژوو بێ خوا گوناهی رابردووی ڕەش دەکاتەوه:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واته: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی : هەر کەسێ به ڕۆژوو بـێ بـه ئیمانـەوه، وه بـۆ خوا بێ، خوا له گوناهەکانی ڕابردوی خۆش دەبێ.

٤– ئـەوەی (تـەراویح )ی مـانگی رەمـەزان بکـات ، خـوا گونـاحی رابـردووی رەش دەکاتەوه:

(مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) متفق عليه

٥- ئەوەی (شەوانی قەدر ) زیندوبکاتەوه خوا گوناحی رابردووی رەش دەکاتەوه:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ). رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی : هەر کەسێ شەوانی قەدر زیندوو بکاتەوە (واتە: تەراویح بکا) بە ئیمانەوە، وە بۆ خوا بێ، خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت.

٦–خوا دەرگاکانی بەهەشت دەکاتەوە ، و دەرگاکانی دۆزەخ دادەخات:

(إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ.)متفق عليه

واتە:پێغەمبەر فەرموویەتی: هەر کاتێ ڕەمەزان هات ، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، وە دەرگاکانی دۆزەخ دەکرینەوە، و شەیتانەکان دەبەسرێنەوە.

٧–ڕۆژوو چاو و داوێنی مرۆڤ دەپارێزی:

(يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ ) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ وَمُسْلِمٌ (واتە : (وِجَاءٌ) خەساندن)

واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان ئەو لە ئێوە ئەتوانێ با هاوسەگیری بکات، چونکە چاو دەگرێتەوە، و دامێن دەپارێزێ، وە ئەوەی دەستەلاتی نەبوو ، با بە ڕۆژووبێ، چونکە ڕۆژوو هەستی سیکسی لاواز دەکات.

## چەند پرسیارێك دەربارەی ڕۆژوو :

١–ئایا چ ریبوارو نەخۆشێك دەتوانن بەڕۆژوو نەبن؟

و : رێبـوار و نـەخۆش (٣)حالـەتیان هەیـە أ – یـان هـەر نـاتوانن بیگـرن ، ب– بەزەحمەت دەیگرن ج– یان بەئاسانی دەیگرن .

هی یەکەم حەرامـە بـەرۆژوو بـن ، لـە دووەم : سـوننەتە بـەرۆژوو نـەبێ ، سـێیەم : واباشە بە رۆژوو بێ

٢–ئایا پێغەمبەر لە چ سەفەرێك ڕۆژووی شکاندوە؟

و : (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: سَافَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَمَضَانَ فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِإِنَاءٍ مِنْ مَاءٍ فَشَرِبَ نَهَارًا لِيَرَاهُ النَّاسُ فَأَفْطَرَ حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ) متفق عليه

واتـە: لـەئیبنو عەباسـەوە هـاتووە دەڵـێ: پێغەمبـەر سـەفەری کـرد لـە رەمـەزان، بەڕۆژوو بـوو تـاکو گەیشـتە عوسـفان ، پاشـان داوای ئامـانێکی ئـاوی کـرد، بـە ڕۆژ خواردیەوە تـاکو خـەڵکی ببیـنن، بـە رۆژوو نـەبوو تـاکو گەیشـتە مەککە،کەواتـە : تاگەیشتۆتە عەسەفان بەرۆژوو بووە ، رۆژانی دیکە هیچی بە رۆژوو نەبووە.

٣–ئایا وا رێك کەوتووە لەسەفەر هەندێك صـەحابە بـە رژوو بـن هەنـدێك بـە رۆژوو نەبن ؟

و: بەڵێ هەروەك لەم دەقاندا هاتووە .

–( عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَمَضَانَ، فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلَا الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتـه: لـه ئەنەسـی کـوڕی مالیـك هـاتووه دەڵـێ : لـه ڕەمەزانـدا لەگـەڵ پێغەمبـەر سەفەرمان کرد ، هەندێ هاوەڵ بە ڕۆژوو بوون ، هەندێ هـاوەڵ بـە ڕۆژوو نـەبوون ، کەسیش ڕەخنەی لەکەس نەگرت.

-( عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِسِتَّ عَشْرَةَ مَضَتْ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ فَمِنَّا مَنْ صَامَ وَمِنَّا مَنْ أَفْطَرَ فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ وَلَا الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ) رَوَاهُ مُسلم

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: إِنَّا مَعَاشِرَ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُنَّا نُسَافِرُ فَمِنَّا الصَّائِمُ وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، وَمِنَّا الْمُتِمُّ وَمِنَّا الْمُقْصِرُ، فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ وَلَا الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ، وَلَا الْمُقْصِرُ عَلَى الْمُتِمِّ، وَلَا الْمُتِمُّ عَلَى الْمُقْصِرِ) رواه البيهقي

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیك هاتووه دەڵێ : ئێمەی کۆمەڵی هـاوەڵانی پێغەمبـەر ، سەفەرمان دەکرد ، هەبوو بە ڕۆژوو بوو ، هـەبوو بـێ ڕۆژوو ، هـەبوو نوێـژی کـورت دەکردەوە ، هەبوو نوێژی کورت نەدەکردەوە ، ئەوانەی بە ڕۆژوو بـوون ڕەخنـەیان لەوانە نەدەگرت کە بەڕۆژوو نین ، بێ ڕۆژوو وەکانیش ڕەخنەیان نەدەگرت لەوانـەی بـە ڕۆژوون، ئـەوەی نوێـژی کـورت دەکـردەوە ڕەخنـەی نـەدەگرت لـەوەی نوێـژی بەتەواوی کردوە ، وە ئەوەی نوێـژی بەتـەواوی دەکـرد ڕەخنـەی نـەدەگرت لـەوەی نوێژی کورتی کردۆتەوە.

٤-ئایا لە (چاکەکاریە) ڕۆژووشکاندن لەسەفەردا؟

(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْأَنْصَارِيِّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي سَفَرٍ فَرَأَى زِحَامًا وَرَأَى رَجُلًا قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقَالُوا: هَذَا صَائِمٌ ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ ) متفق عليه

واتـه: لـه جـابیری کـوڕی عەبـدوڵای ئەنصـاریەوە هـاتووه دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا لەسەرفدا بوو ، قەڵباڵغیەکی بینی ، لەسەر پیاوێك سێبەریان لێ کردبوو ، فەرمووی ئـەوە چـییە؟ گوتیـان : ئـەوە بـە ڕۆژووە ، فـەرمووی چـاکەکاری نیـە لەسـەفەر بەڕۆژوو بی.

معاني الكلمات : (زحاما) قوما مزحومين أي يضايق بعضهم بعضا في موضع. (رجلا) قيل هو أبو إسرائيل العامري. (البر) الطاعة والعبادة والإحسان والخير. (الصوم في السفر) إذا بلغ بالصائم هذا المبلغ من المشقة)

٥–ئایا وا ریکەوتووە پێغەمبەر بەڕۆژوو بێ ، بەڵام هاوەڵان بە ڕۆژوو نەبن؟

و : بەڵێ وەك لەم دەقدا هاتووە

(عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: (خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ فِي حَرٍّ شَدِيدٍ، حَتَّى إِنْ كَانَ أَحَدُنَا لَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ، وَمَا فِينَا صَائِمٌ، إِلَّا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ) متفق عليه

واتە: لە ئەبی دەرداوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ : دەرچوون لەگەڵ پێغەمبەر لە مانگی ڕەمەزان بەگەرمایەکی بـە هێـز ، تـاکو هەریـەك لـە ئێمـە دەسـتی لەسـەر سەری خۆی دانا بـوو لـە گـەرمان ، یـەك کـەس لـە ئێمـە بـە ڕۆژوو نـەبوو جگـە لـە پێغەمبەر و عەبدوڵای کوری رەواحە.

تێبینی : لێردا پێغەمبەر عەزیمەتی هەلبژاردوە ، لە فـەرموودەی پێشـوو ئیشـی بـە مۆڵەت کردوە.

٦–ئایا وا ریك کەوتووە پێغەمبەر بە هاوەڵانی گوتوبێ ڕۆژوو بشکێنن باشترە ؟

و : بەڵێ وەك لەم دەقەدا هاتووە.

(عَن أبي سعيد الْخُدْرِيّ رَضِي الله عَنهُ : فَقَالَ سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى مَكَّةَ وَنَحْنُ صِيَامٌ قَالَ فَنَزَلْنَا مَنْزِلًا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّكُمْ قَدْ دَنَوْتُمْ مِنْ عَدُوِّكُمْ وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ فَكَانَتْ رُخْصَةً فَمِنَّا مَنْ صَامَ وَمِنَّا مَنْ أَفْطَرَ ثُمَّ نَزَلْنَا مَنْزِلًا آخَرَ فَقَالَ إِنَّكُمْ مُصَبِّحُو عَدُوِّكُمْ وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ فَأَفْطِرُوا وَكَانَتْ عَزْمَةً فَأَفْطَرْنَا ...)رواه مسلم

واته: له ئەبی سەعیدی خودریەوە هاتووە خوا لێی رازی بێ دەڵێ : سەفەرمان کرد لەگەڵ پێغەمبەر بۆ مەککە ، ئێمەش بە ڕۆژوو بووین ، لە مەنزلگایەك دابەزین ، پێغەمبەر فەرمووی ئێوە لە دوژمنتان نزیك بوینەوە ، ڕۆژوو بشکێنن بە هێزتر دەبن ، ئەو قسەی پێغەمبەر روخسەت ومۆڵەت بوو ، جا هەندێکمان بە ڕۆژووبووین ، هەندێکمان ڕۆژووی شکاند ، دوای لە مەنزڵگایەکی دیکە دابەزین ، فەرمووی ئێوە بەیانی لەلای دوژمنتانن ، ڕۆژوو شکاندن بە هێزترتان دەکات ، و ڕۆژوو بشکێنن ، ئەوە عەزیمەت بوو ، ئێمەش ڕۆژوومان شکاند .

فەرمانی یەکەمی روخسەت بوو ، بەلاَم لە هی دووەم عەزیمەت بوو .

کەواتە : بە ڕۆژوو بون و بە ڕۆژوو نەبوون ، هەر حالەتەکە دەگەرێتەوە بۆ بارودۆخی سەفەرەکە ، ئەگەر زەحمەتی نەبوو دەتوانی بیگری.

٧-ئایا وا ریك دەکەوێ ئەوەی ڕۆژوو بشکێنێ پاداشتی زۆرتر بێ لەوەی بە ڕۆژووە ؟

و : بەڵێ وەك لەم دەقدا هاتووە :

عن أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي السَّفَرِ فَمِنَّا الصَّائِمُ وَمِنَّا الْمُفْطِرُ قَالَ فَنَزَلْنَا مَنْزِلًا فِي يَوْمٍ حَارٍّ أَكْثَرُنَا ظِلًّا صَاحِبُ الْكِسَاءِ وَمِنَّا مَنْ يَتَّقِي

الشَّمْسَ بِيَدِهِ قَالَ فَسَقَطَ الصُّوَّامُ وَقَامَ الْمُفْطِرُونَ فَضَرَبُوا الْأَبْنِيَةِ وَسَقَوْا الرِّكَابَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالْأَجْرِ) متفق عليه

واتـه : لـه ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە هـاتووە خـوا لێـی رازی بـێ دەڵـێ: لەگـەڵ پێغەمبەر بووین لەسەفەردا ، هەبوو بە ڕۆژوو بوو ، هەبوو بێ ڕۆژوو ، لە مەنزگایەك دابەزین لە ڕۆژێکی گەرم ، زۆربەمان سێیەری کرد بوو ، هەمان بوو بەدەست خـۆی لە خۆر دەپاراست ، ئەڵێ ئەوانەی بە ڕۆژوو بوون پەکیان کـەوت ، وە ئەوانـەی بـێ ڕۆژوو بوون هەڵسان جێگـاو ڕێگایـان ڕێـك خسـت ، و ئاژەڵانیـان ئـاودا ، پێغەمبـەر فەرمووی ئیمرۆ ئەوانەی بێ ڕۆژوون پاداشتیان بۆ خۆیان برد .

٨- ئایا ئەگەر ساڵ سوڕایەوە ڕۆژوو قـەرزاربوین ، گێرانـەوە و فیدیـەمان لەسـەرە، یان تەنها گێرانەوە

وەلام :زانایان دوو رایان هەیە:

١- (شافعی و احمدو اسحاق) دەڵێن مادام ساڵ سورایەوە ئەبێ کـەفارەتیش بـدات لەگەڵ گێرانەوەی ڕۆژووەکان .

٢-(ابـو حەنیفـە و الحسـن البصـری والنخعـی و داود والبخـاری) دەڵـێن نـەخێر کەفارەت نادات تەنها ڕۆژووەکان دەگێریتەوە ، چونکە خوا فەرموویەتی (**فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ**....)

تێبینی : (م/ علی بـاپیر لـە تەفسـیرکەیدا دەڵـێ : هـیچ فەرموودیـەکی صـحیح لـەم بارەوە نیە ، کە کەفارەت بدات)

٩- ئایا ڕۆژوو بۆ مردوو قەزا دەکرێتەوە ؟

و : بەڵێ (لەلایەن کور و کچ و خوشك وبراو خزمی نزیکی) بەبەڵگەی ئەم دەقە

١-(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

(واته :له عائیشەی دایکی ئیماندارن هاتووه خوا لێی رازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی : هەر کەسێ بمرێ و رۆژوو قەرزار بێ ، سەرپەرشتیاری لە جیاتی رۆژووی بۆ دەگرێتەوە .

مانای : (وَلِيُّهُ) واته: سەرپەرشتیارەکەی ، میراتگرەکەی ، ئەوەی لێ نزیکە)

٢-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ نَذْرٍ، أَفَأَصُومُ عَنْهَا؟ قَالَ: (أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ فَقَضَيْتِيهِ، أَكَانَ يُؤَدِّي ذَلِكِ عَنْهَا؟) قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: (فَصُومِي عَنْ أُمِّكِ) رواه مسلم

واته : له ئیبنو عەباسەوە هاتووه خوا له خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ : ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر ، گوتی ئەی نێرراوی خوا دایکم وەفاتی کردوە ، رۆژووی نەزری لەسەر بوو ، ئایا ئەبێ من له جیاتی بەرۆژوو بم ، فەرمووی ئەگەر دایکت قەرزاری خەڵکی بوایە ، قەرزەکەت بۆدابایەوە دەبوو ئافرەتەکە گوتی بەڵێ ، پێغەمبەر فەرمووی : بۆ دایکت بەرۆژووبە (واته: قەرزی بۆ بدەوە)

١٠- ئایا (وعلى الذين يطقونه )ئافرەتی (حامل)و (مرضع) دەگرێتەوە؟

و : دوو را هەن لەم بارەوە :

١- (حسن البصري و عَطَاء ابن ابي رَباح و الضَّحاك والنَخَعي والزُهري و رَبِيعَة و الاوزاعي و واصحاب الراى (ابو حنيفة و ابو يوسف و محمد بن حسن )وابو عبيدة و ابو ثورو ابن المُنذر)

ئەم زانایان دەڵێن ئافرەتی (حامل)و(مرضـع) سـکپڕ و شـیردەر تـەنها گێڕانـەویان لەسەرەو فیدیە نادەن .

تێبینی : بۆچی ناڵێن (مرضعة) و (حاملـة) چـونکە ئـەم وشـانەی لـەزمانی عـەرەبی تایبەتن بە ئافرەتانەوە پێویست ناکات (تاي تانیث) ی بۆ بەکاربێ .

وەهەروەها (مالیك)ش هـەمان را هەیـە بـۆ ئـافرەتی منـداڵی لـە زگدایـە ، بـەلام بـۆ ئافرەتی شیردەر ئەڵێ : ئەبێ بگێڕیتەوە و فیدیەش بدات.

٢-(شافعی و احمد و چەند زانایەك ) دەڵێن ئەبێ ڕۆژوەکانیش بگرێتەوە و فیدیەش بدات .

تێبینی: (م / علی باپیر لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ : رای ئەوانە بەهیزترە کـە دەڵـێن ئەم دووانە زگ پڕ و شیردەر) ئەگەر بۆیـان کـرا بـا بـەڕۆژبن ، بـەلاّم ئەگـەر بۆیـان نەکرا ، با تەنها ڕۆژوو بگێڕنەو بێ فیدیە .

١١-ئایا ئەم سێ ئایەتە هەرسێکی یەك مەبەستی هەیە؟

و : بەڵێ ، واتە لە مانگی ڕەمەزان لە شەوێکی موبارەك و بەقەدر قورئان دابەزیوە.

١-( شَهْرُ رَمَضَانَ الذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ) البقره

٢-( إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ (الدخان:٣)

٢-( إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ) القدر

١٢- ئایا بۆ بینینی (هلال) مانگ چەند شایەدی دەوێ ؟

و: ١- ئیمامی (مالك) دەڵێ ئەبێ دوو شایەدی دادگەربن .

٢–ئیمامی (ابو حنیفه و شافعی وزۆربەی زانایـان) دەڵـێن یـەك شـایەد بەسـە بـەڵام بەمەرجی دادگەرو مەتمانە پێکراو بێ . بەبەڵگەی ئەم فەرموودەی خوارەوە

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: تَرَاءَى النَّاسُ الْهِلَالَ، فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنِّي رَأَيْتُهُ، فَصَامَ وَأَمَرَ النَّاسَ بِصِيَامِهِ) رَوَاهُ أَبُو دَاوُد والدارمي قال الالباني صحيح

واتە :ئیبنو عومەر دەڵێ خەڵکی تەماشـای (هـلال) مـانگی یـەك شـەویان دەکـرد ، منیش هەواڵم بە پێغەمبەردا مانگی یەك شەوەم بینیوە ، دەڵێ: بـەخۆی بـە ڕۆژوو بوو ، وفەرمانیشی بە خەڵك کرد بە ڕۆژووبن .

<u>**تێبینی**</u> : (فمن شهد منكم الشهر) بەمانای (من حَضَرَ مـنكم الشـهر) نـەك بـە مانـای (مـن رای) ، واتـە هـەرکاتێ یـەکێك ئامـادەی مـاڵی خـۆی بـوو ، وە دەشـگونجی بەمانای بینین بێ بـەڵام بینـینی عـەقڵ ، واتـە بەعـەقڵ بزانـی ڕەمەزانـە (تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز)

تێبینی : شایەدی ئافرەت بۆ بابەتی زەواج و مارەکردن وەرناگیرێ .

١٣–ئایا بۆچی سەرفترە دەدرێ لە ڕەمەزاندا ؟

وەلام: ئەم دەقەی خوارەوە وەلامەکەی تێدایە

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: (فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ، وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ، فَمَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلَاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ ) رواه ابن ماجه قال الالباني حسن

واتە : لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەری خوا سەفیترەی واجـب کـرد ، تاکو ڕژووی ڕۆژووگر پاك بکاتەوە لە کەم و کوڕیەکان ، وە تاکو ببێتـە خـواردن بـۆ

هەژاران ، هەر كەسێك پێش نوێژی چەژن بیدات وەرگیراوە ، وە هەركەسێك پاش نوێژی چەژن بیدات ئەوە تەنها خێرێكە كردوێەتی

( عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاس إِلَى الصَّلَاة) مُتَّفق عَلَيْهِ

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر زەكاتی سەرفیترەی فەرز كرد ساعێك خورما، یان ساعێك جۆ ، لەسەر بەند وئازاد و نێرو مێ و بچوك و گەورە لە موسڵمانان، وە فەرمانی كرد پێش ئەوەی خەڵكی بچنە نوێژی چەژن بیدەن.

١٤–ئایا تەكبیرەكانی ڕۆژانی چەژن دەقیان لەسەر هەیە؟

وەڵام : بەڵێ

(عن عَبْد اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُكَبِّرُ يَوْمَ الْفِطْرِ مِنْ حِينِ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ حَتَّى يَأْتِيَ الْمُصَلَّى) رواه الحاكم و البيهقي قال الالباني صحيح

واتە: لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە هاتووە خوا لە خۆی وباوكی رازی بێ دەڵێ : پێغەمبەر ڕۆژی چەژن كە لەماڵ دەهاتە دەر تەكبیری لێ دەدا تاكو دەگەیشتە نوێژگا.

******************************

## وتاری ژماره (١٢) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٨٦ ) سورەتی ( البقره )**

﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ١٨٦ ﴾ البقره

واتە: (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بەندەكانم پرسیارت لێبكەن دەربارەم، ئەوە من نزیكم لێیانەوە، بە هاناو هاواری دوعا گۆیانەوە دەچم هەر كاتێك لێم بپاڕێنەوەو نزا بكەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بە من بهێنن، بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و ئاگایی بگرنەبەر (بۆ بەدەستهێنانی سەربەرزی و سەرفرازی هەردوو جیهان). (ئاسان)

تێبینی : ئەم ئایەتە كەوتۆتە نێوان دوو ئایەت كە باسی ڕۆژوو دەكەن.

**چەند ریوایەتێك لە بارەی هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە :**

١- رُوِيَ أَنَّ أَعْرَابِيًّا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقَرِيبٌ رَبُّنَا فَنُنَاجِيهِ أَمْ بَعِيدٌ فَنُنَادِيهِ؟ فَسَكَتَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الداع إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وليؤمنوا) (أخرجه ابن أبي حاتم)

واتە : گێردراوەتەوە كە عەرەبێكی بیابان نشین هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا گوتی ئایا خوای ئێمە نزیكە تاكو بە چرپە لێی بپارێنەوە یان دوورە تاكو هاواری لێ بكەین ، پێغەمبەریش بێ دەنگ بوو ، خواش ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاند و فەرمووی:

(وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ)

٢-وعن الْحَسَنِ قَالَ: سَأَلَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيْنَ رَبُّنَا؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ) الْآيَةَ. وقال عَطَاء أَنَّهُ بَلَغَهُ لَمَّا نَزَلَتْ (وَقَالَ رَبُّكُمُ ادعوني أَسْتَجِبْ لَكُمْ) قَالَ النَّاسُ: لَوْ نَعْلَمُ أَيَّ سَاعَةٍ نَدْعُو؟ فَنَزَلَتْ: (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الداع إِذَا دَعَانِ) مختصر تفسير ابن كثير

واته : لەحەسەنەوە هاتووە گوتویەتی : هاوەڵان خوایان لـێ رازی بـێ ، پرسـیاریان کردوە لە پێغەمبەر خوامان لە کوێیە؟ خواش ئەم ئایەتەی بۆ دابەزانـد و فـەرمووی (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ).

وە عەتا دەڵێ پێم گەیشتووە کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (وَقَالَ رَبُّكُمُ ادعوني أَسْتَجِبْ لَكُمْ) خەڵکی گوتیان خوزگە دەمانزانی چ کاتێك داوا لـە خـوا بکـەین ، جـا خـواش ئەم ئایەتەی دابەزانـد و فـەرمووی (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ)

### ئایا نزیکی خوا چۆنە؟

وەلاّم : (قَرِيبٌ بِعِلْمِهِ وَقُدْرَتِهِ ؛ فَإِنَّهُ عَالِمٌ بِكُلِّ شَيْءٍ قَادِرٌ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ) واتـە : خـوا نزیکە لێمان بە زانیاری ودەستەڵاتی خۆی ، ئەو زانایە بەهەموو شتێك ، بە توانایـە بەسەر هەموو شتێك .

**چەند فەرموودەیەك دەربارەی نزیكی ( قريب ) ی خوا :**

١– عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَكُنَّا إِذَا عَلَوْنَا كَبَّرْنَا فَقَالَ ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لَا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلَا غَائِبًا تَدْعُونَ سَمِيعًا بَصِيرًا قَرِيبًا ثُمَّ أَتَى عَلَيَّ وَأَنَا أَقُولُ فِي نَفْسِي لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ فَقَالَ لِي يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ قُلْ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ فَإِنَّهَا كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ أَوْ قَالَ أَلَا أَدُلُّكَ بِهِ ) رواه البخاري

وَعَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَجَعَلَ النَّاسُ يَجْهَرُونَ بِالتَّكْبِيرِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اِرْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إِنَّكُمْ لَا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلَا غَائِبًا إِنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعًا بَصِيرًا وَهُوَ مَعَكُمْ وَالَّذِي تَدْعُونَهُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُمْ مِنْ عُنُقِ رَاحِلَتِهِ) قَالَ أَبُو مُوسَى: وَأَنَا خَلْفَهُ أَقُولُ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ فِي نَفْسِي فَقَالَ: (يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ؟) فَقُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە : لە ئەبی موساوە هاتووە گوتویەتی لە سەفەرێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین ، كاتێ بەرزدەبوینەوە ، بەدەنگی بەرز دەمانگوت (الله اكبر) پێغەمبەریش فەرمووی هیواش بن ، ئێوە بانگی كەڕ و نادیار ناكەن بەڵكو بانگی یەكێكی بیسەروبینەر و نزیك دەكەن ، ئەبی موسی دەڵێ دوای هاتە لای من و منیش لە دڵی خۆم ئەم زیكرەم دەكرد(لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ) فەرمووی ئەی عەبدوڵای كوڕی قەیس بڵێ (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ) ئەم زیكرە گەنجینەیەكە لە گەنجینەكانی بەهەشت .

٢–( عن ابي هريرة، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا مَعَ عَبْدِي مَا ذَكَرَنِي وَتَحَرَّكَتْ بِي شَفَتَاهُ)رواه احمد وابن حبان قال الالباني حسن لغيره

واته : له ئەبی هوریرەوەهاتووە : دەڵێ ، پێغەمبەر فەرمووی ، خـوا دەفـەرمووی : من لەگەڵ بەندەی خۆم دام کاتێ یادم دەکات و لیوەکانی دەجولێنێ بۆ زیکر.

٣-( (یا أیُهَا النَّاسُ أرْبَعُوا عَلَی أنفُسِكُم، فَإنَّكُم لا تَدعُونَ أصَمَّ وَلا غَائِباً، إنَّ الَّذِي تدعُونَهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ، أقرَبُ إلى أحَدِكُم مِن عُنُقِ رَاحِلَتِهِ) رواه البخاري

واته: ئەی خەڵكینە لەسەر خۆبن ئێوە هاواری کەڕو نادیار ناکەن ، بەڵكو ئـەوەی ئێوە هاواری ئەکەن بیسەرو نزیکە، هەتا لە ملی ووشترەکانتان لێتانەوە نـزیکترە. (بەزاراوی ئەمڕۆ لە سوکانی ئۆتومبیل نزیکترە)

ئاگاداری : خوا لە قورئان لە (١٣) جێگا کاتێ پرسیار لە پێغەمبەر دەکرێ ، خواش وەڵامی بۆ دەنێرێ دەفەرمووی پێیان بڵێ (قل) ، تەنها لە دوعاو داواکار نەبێ خـوا یەکسـەر دەفـەرمووی (فـانی قریـب) واتـە مـن نـزیکم ، عەبـدێکی بـێ هێـز یەکسـەر پەیوەندی بەخوایەکی بەهێز و دەستەڵات دەکات و لێ دەپارێتەوە .

ئەوەش ئەم دەقانەیە کەباسمان کرد :

١- یَسْــأَلُونَكَ عَــنِ الْأَهِلَّــةِ ۖ قُــلْ هِــيَ مَوَاقِيــتُ لِلنَّــاسِ وَالْحَــجِّ..... ) (البقرة:١٨٩)

(بڵێ نشانەی کاتەکانە و بۆ حەج......)

٢- یَسْـأَلُونَكَ مَـاذَا يُنفِقُـونَ ۖ قُـلْ مَـا أَنفَقْـتُم مِّـنْ خَيْـرٍ فَلِلْوَالِـدَيْنِ وَالْأَقْـرَبِينَ وَالْيَتَـامَى وَالْمَسَـاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ ۗ وَمَـا تَفْعَلُـوا مِنْ خَيْرٍ فَـإِنَّ اللَّهَ بِـهِ عَلِـيمٌ (البقرة:٢١٥)

٣- یَسْـأَلُونَكَ عَنِ الشَّـهْرِ الْحَـرَامِ قِتَـالٍ فِيـهِ ۖ قُلْ قِتَـالٌ فِيـهِ كَبِيـرٌ ۖ وَصَـدٌّ عَـن سَـبِيلِ اللَّهِ وَكُفْـرٌ بِـهِ وَالْمَسْـجِدِ الْحَـرَامِ وَإِخْـرَاجُ أَهْلِـهِ مِنْـهُ أَكْبَـرُ عِنـدَ اللَّهِ ۚ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ ...) (البقرة:٢١٧)

٤- يَسْـأَلُونَكَ عَـنِ الْخَمْـرِ وَالْمَيْسِـرِ ۖ قُـلْ فِيهِمَـا إِثْـمٌ كَبِيـرٌ وَمَنَـافِعُ لِلنَّـاسِ وَإِثْمُهُمَـا أَكْبَـرُ مِـن نَّفْعِهِمَـا ۗ وَيَسْـأَلُونَكَ مَـاذَا يُنفِقُـونَ قُـلِ الْعَفْـوَ ...) (البقرة:٢١٩) (بلێ ئەوەی لێتان زیادە)

٥- (... وَيَسْـأَلُونَكَ عَـنِ الْيَتَـامَى ۖ قُـلْ إِصْـلَاحٌ لَّهُـمْ خَيْـرٌ ۖ وَإِن تُخَـالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ ) (البقرة:٢٢٠)

٦- وَيَسْـأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَـاعْتَزِلُوا النِّسَـاءَ فِـي الْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ ....) (البقرة:٢٢٢)

٧- يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ ۖ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ ...) (المائدة:٤)

٨-يَسْـأَلُونَكَ عَـنِ السَّـاعَةِ أَيَّـانَ مُرْسَـاهَا ۖ قُـلْ إِنَّمَـا عِلْمُهَـا عِنـدَ رَبِّـي ) (الأعراف:١٨٧)

٩- يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنفَالِ ۖ قُلِ الْأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ ..) (الأنفال:١)

١٠- وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ ۖ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا (الإسراء:٨٥)

١١- وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا (الكهف:٨٣)

١٢- وَيَسْـأَلُونَكَ عَـنِ الْجِبَـالِ فَقُـلْ يَنسِـفُهَا رَبِّـي نَسْـفًا (طـه:١٠٥) (خـوا وردخاشيان دەكات)

١٣- يَسْـأَلُونَكَ عَـنِ السَّـاعَةِ أَيَّـانَ مُرْسَـاهَا (النازعـات:٤٢) فِـيمَ أَنـتَ مِـن ذِكْرَىٰهَآ ٤٣)

شـــرح-(أي إذا سألك عبادى عنى فبماذا تجيبهم؟ ليس هذا الجواب بلسانك يا محمد، فأنت وإن كنت السفير بيننا وبين الخلق فهذا الجواب أنا أتولاه (فَإِنِّي قَرِيبٌ)

(رفع الواسطة من الأغيار عن القربة فلم يقل قل لهم إنى قريب بل قال جل شأنه: فإني قريب.

نموونــه : بۆیــان گێرامــەوە ڕۆژێـك كابرایــەكی گــاور دێتــە لای مامۆســتا (مــلا عبدالمجید)ی شـەقلاوە ، ئـەڵێ مـن موسـڵمان بویمـە لەبـەر ئـەوەی لـە دیـنی ئێـوە واستەی تێدا نیە بۆ داواكاری یەكسەر پەیوەندی بە خواوە دەكەی.

## ٢- هۆی دبەزینی ئایەتی (١٨٧) سورەتی (البقره)

(أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَٱلْـَٰٔنَ بَٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِي ٱلْمَسَٰجِدِ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ١٨٧) البقره

واتە : هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وایانـدەزانی لـە شـەوی ڕەمەزانـدا، پـاش ڕۆژوو شـكاندن و نوێـژی عیشـاو خـەوتن، ئەگـەر پـاش ماوەیـەك هەستنەوە بۆ خواردن و خواردنەوەو، نابێت بچنە لای خێزانـەكانیان، چـونكە ئـەوە قەدەغەیەو نابێت.. جا لەم بارەیەوە خودا دەفـەرموێت: لـە شـەوانی ڕەمەزانـدا تـا نزیك نوێژی بەیانی دەتوانن بچنە لای هاوسەرەكانتان و لەگەڵیان جووت بـبن، ژن و مێـرد هەریەكـەیان جلوبـەرگ و پەرژینـە بـۆ ئـەوی تریـان، خـودا دەزانێـت ئێـوە واتێدەگـەن كـە چـوونە لای خێزانـەكانتان لـە شـەوی ڕەمەزانـدا _پـاش خـەوتن و هەستانەوەتان_ قەدەغەیەو درووست نیە.. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا كـە واتانـدەزانی و باوەڕتان وابوو، كەچی هەر خۆتان ڕاناگرن و دەچنە لایان، خودا لـەو تێگەیشـتنە

هەڵەیەتان خۆشبوو، ئێستا بەبێ ئەوەی لە حەرام بوونی بترسن، بچنە لایان و ئەوەی خودا بۆی بڕیارداون بەئەنجامی بگەیەنن و، دەتوانن تا بەرەبەیان، کە ڕووناکیەکی باریکی ئاشکرا لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەوێت، بچنە لای هاوسەرەکانتان و، بخۆن و بخۆنەوە، ئینجا دوایی لەسەر ڕۆژوو گرتنەکەتان بەردەوام بن تا ڕۆژئاوا دەبێت .. بەڵام ئەگەر لە شەوانی ڕەمەزاندا بۆ خودا پەرستیی کاتێکی تایبەتیتان لە مزگەوتێکدا بردە سەر _ کە ئەوە (اعتکاف) ی پێ دەڵێن_ ئیتر لەو کاتانەدا نابێت بچنە لای خێزانەکانتان و لەگەڵیاندا جووت بن .. ئەوانە سنوورەکانی خودان و مەترازێن لێیان .. خودا ئا بەو شێوەیە شێوازی ڕۆژوو گرتنتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، تاوەکو بە چاکیی بەندایەتی بکەن و پارێزکار بن و خۆتان لە شوێنکەوتنی ئارەزووەکانتان دوور بخەنەوە. (رفث): لێرەدا بەمانای ئەنجامدانی کاری ژن و مێردایەتی یە، یاخود داواکردنی ئەوەیە بە قسە لە هاوسەر.

**هۆکاری دابەزینی بەشەکانی ئەم ئایەتە:**

**بەشی یەکەم لەم ئایەتە:**

**( أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ)**

١- ( عن الْبَرَاء رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ (لَمَّا نَزَلَ صَوْمُ رَمَضَانَ كَانُوا لَا يَقْرَبُونَ النِّسَاءَ رَمَضَانَ كُلَّهُ وَكَانَ رِجَالٌ يَخُونُونَ أَنْفُسَهُمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ (البقرة:١٨٧) رواه البخاري

واتە : لەبەراوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ :کاتێ ئایەتی واجب بوونی ڕەمەزان دابەزی ، خەڵکی لە ڕەمەزاندا هەمووی نزیکی ئافرەتان نەدەکەوتن ، وە هەندی

پیاو هەبوو خەیانەتیان لە خۆیان دەکرد بۆیە خوا ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد(عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ).

٢-( عَنْ الْبَرَاءِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَائِمًا فَحَضَرَ الْإِفْطَارُ فَنَامَ قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَ لَمْ يَأْكُلْ لَيْلَتَهُ وَلَا يَوْمَهُ حَتَّى يُمْسِيَ وَإِنَّ قَيْسَ بْنَ صِرْمَةَ الْأَنْصَارِيَّ كَانَ صَائِمًا فَلَمَّا حَضَرَ الْإِفْطَارُ أَتَى امْرَأَتَهُ فَقَالَ لَهَا أَعِنْدَكِ طَعَامٌ قَالَتْ لَا وَلَكِنْ أَنْطَلِقُ فَأَطْلُبُ لَكَ وَكَانَ يَوْمَهُ يَعْمَلُ فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ فَجَاءَتْهُ امْرَأَتُهُ فَلَمَّا رَأَتْهُ قَالَتْ خَيْبَةً لَكَ فَلَمَّا انْتَصَفَ النَّهَارُ غُشِيَ عَلَيْهِ فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ فَفَرِحُوا بِهَا فَرَحًا شَدِيدًا وَنَزَلَتْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمْ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنْ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ) رواه البخاري

**واتە : لەبەراوە هاتووە خوا لێی رازی بێ دەڵێ :** هاوەڵانی پێغەمبەر ئەگەر یـەکێك بەرۆژووبوایە ، ئێوار کاتی فتار خەوی لێکەوتبایە وفتاری نەکردبایـەوە ، نەدەبوایـە ئـەو شـەوە لەگـەڵ رۆژی دوای شـت بخـوات تـاکو ئێـوار دادێ ، وە قەیسـی کـوڕی صیرمەی ئەنصاری بە ڕۆژوو بوو ، کاتی فتار گوتیە خێزانی چیمان هەیە ، خێزانـی گوتی نەخێر ، بەلاَم وادەچم شتێکت بۆ پیدا دەکەم ، قەیس ئەو ڕۆژە کاری کردبوو ماندوو بوو ،تا خێزانـی هاتـەوە خـەوی لـێ کـەوتبوو ، خێزانـی گـوتی ، ئـەی زیـان بۆخۆت ، بۆ بەیانی لە نیوەی رۆژ قـەیس لـە خـۆ چـوو وهێـزی نـەما ، ئـەم هەواڵـە گەیشتەوە پێغەمبەر خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند و فـەرموو (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ) هاوەڵان زۆر دڵخۆش بوون ، وەهەروەها ئەوەش دابەزی (وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمْ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنْ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ)

**بەشی دووەم لەم ئایەتە:**

﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾

١-( عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ : لَمَّا نَزَلَتْ (كُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الفَجْرِ). الآيَةَ عَمَدْتُ إِلَى عِقَالَيْنِ عِقَالٍ أَبْيَضَ وَعِقَالٍ أَسْوَدَ فَجَعَلْتُهُمَا تَحْتَ وِسَادَتِي فَجَعَلْتُ أَقُومُ مِنَ اللَّيْلِ فَأَنْظُرُ فَلاَ يَتَبَيَّنُ لِي فَلَمَّا أَصْبَحْتُ غَدَوْتُ عَلَى النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- فَأَخْبَرْتُهُ فَضَحِكَ وَقَالَ (إِنْ كَانَ وِسَادُكَ لَعَرِيضًا ، إِنَّمَا ذَاكَ بَيَاضُ النَّهَارِ مِنْ سَوَادِ اللَّيْلِ) متفق عليه

واتە : لە عەدی کوڕی حاتیمەوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: کاتێ ئەو ئایەتە دابەزی (كُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الفَجْرِ) چووم دوو داوم (دەزووم) هێنا یەکی سپی ویەکی ڕەش ، لە ژێر بالیفم دانان ، شەوێ هەستامەوە تەماشام کردن بۆم لێك جیانەبونەوە ، کاتێ بەیانی بویەوە چووم بۆ لای پێغەمبەر، بۆم گێڕایەوە ، پێغەمبەریش پێکەنی وفەرمووی خۆ بالیفی تۆ شت بیشان نادات ، مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە خەتی سپی ڕۆژ لە شەو جیابێتەوە.

٢-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ فَكَانَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا صَلَّوْا الْعَتَمَةَ حَرُمَ عَلَيْهِمْ الطَّعَامُ وَالشَّرَابُ وَالنِّسَاءُ وَصَامُوا إِلَى الْقَابِلَةِ فَاخْتَانَ رَجُلٌ نَفْسَهُ فَجَامَعَ امْرَأَتَهُ وَقَدْ صَلَّى الْعِشَاءَ وَلَمْ يُفْطِرْ فَأَرَادَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَجْعَلَ ذَلِكَ يُسْرًا لِمَنْ بَقِيَ وَرُخْصَةً وَمَنْفَعَةً فَقَالَ سُبْحَانَهُ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ الْآيَةَ وَكَانَ هَذَا مِمَّا نَفَعَ اللَّهُ بِهِ النَّاسَ وَرَخَّصَ لَهُمْ وَيَسَّرَ) رواه ابوداود قال الالباني صحيح

واتە : عەبدولڵای کوری عەباسەوە هاتووە دەڵێ : ئەو ئایەتەی دەفەرمووی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ) خەڵکی لەسەردەمی پێغەمبەردا کاتێ نوێژی عیشاویان دەکرد ، قەدەغە بوو لەسەریان خواردن وخواردنەوەو چوونەلای ئافرەتان ، بەرۆژوو دەبونەوە تاکو ڕۆژی دواتر ، پیاوێك خەیانەتی لە خۆی کرد چووە لای خێزانی ، نوێژی عیشا کرد و ڕۆژووی نەشکاندبوو ، خواش ویستی ئەم کارە بۆ خەڵکی ئاسان بکات و مۆڵەتیان بدات و فەرمووی (عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ) ئەوەش خوا سوودی گەیاندە خەڵکی و مۆڵەتی دان .

**بەشی سێیەم لەم ئایەتە : هۆی دابەزینی ئەم ووشە (مِنَ الْفَجْرِ):**

**٣-( عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: أُنْزِلَتْ: (وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ) وَلَمْ يُنزلْ (مِنَ الْفَجْرِ) وَكَانَ رِجَالٌ إِذَا أَرَادُوا الصَّوْمَ، رَبَطَ أحدُهم فِي رِجْلَيْهِ الْخَيْطَ الْأَبْيَضَ وَالْخَيْطَ الْأَسْوَدَ، فَلَا يَزَالُ يَأْكُلُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُ رُؤْيَتَهُمَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ بَعْدُ: (مِنَ الْفَجْرِ) فَعَلِمُوا أَنَّمَا يَعْنِي: اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ) متفق عليه**

واتە: لە سەهلی کوری سەعدەوە هاتووە دەڵێ : ئەم ئایەتە دابەزی (وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ) بەلاّم وشەی (مِنَ الْفَجْرِ) تێدا نەبوو ، پیاوانێك هەبوون ، ئەگەر یەکێك لەوان ویستبای بە ڕۆژووبێ داوێکی سپی وداوێکی ڕەشی لە پێی خۆ دەبەست ، دەیخوارد تاکو لێکی جیادەکردنەوە ، جاخوا لەپاش ئەم کارەی ئەوان ئەم وشەی دابەزاند (مِنَ الْفَجْرِ) ئنجا زانیان مەبەستی ئەو ئایەتە شەو وڕۆژە نەك خەتی سپی و ڕەش.

****************************

## وتاری ژماره (١٣) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٨٩) سورەتی (البقره)**

(يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ۗ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ١٨٩) البقره

واته: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)! پرسیارت لێ دەکەن بۆچی کە مانگ دەردەکەوێت سەرەتا یەك شەوەیەو، ئینجا دەبێتە دوو شەوەو سێ شەوەو دواتر وورده وورده گەورەتر دەبێت؟! لە وەڵامیاندا پێیان بڵێ: مانگ کاتەکانتان بۆ دەردەخات، وەکو کاتی کشتوکاڵ کردن و کڕین و فرۆشتن و قەرزدانەوەو بەڕۆژوو بوون و کاتی چوون بۆ حەج و ... هتد. پاش ئەوەی ڕوونی کردەوە کە دەرکەوتنی مانگ و، بەرەبەرە گەورەبوونی و پاشان نەمانی، بۆ گەلێك کاروبار بەسوودە، لەوانە زانینی کاتەکان و هاتنی کاتی مانگی حەج .. ئینجا لێرەدا باسی دابێکی عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی و تەنانەت پاش هاتنی ئیسلام دەکات، ئەویش ئەوەبوو، ئەگەر عەرەبەکان_ جگە لە قوڕەیشیەکان_ ئیحرامیان بۆ حەج، یان بۆ عەمرە ببەستایە، وایاندەزانی ئیتر نابێت لە دەرگای ماڵەکانیانەوە بچنە ژوورەوە، بەڵکو دەبوو لە پشتەوە بچوونایەتە ژوورەوە، وادەبوو لە پشتەوە کونێکیان دەکردە ماڵەکەیان و، ئینجا لەوێوە دەڕۆیشتنە ژوورەوە!.. خۆ ئەگەر ڕەشماڵ نشین بوونایە ئەوە لە پشتەوە دەچوونە ناو ڕەشماڵەکەوە.. جا لەم بارەیەوە خودا دەفەرموێت: وەنەبێت لە پشتەوە ڕۆیشتنە ناو ماڵان، کارێکی باش و خواناسانەو چاکەبێت، بەڵکو چاکیی و خواپەرستیی لەوەدایە کە بە یەکتاپەرستیی و

چاکەکاریی خۆتان لە خراپە بپارێزن.. ئەگەر ویستتان بچنە هەرماڵێك ئەوە لە دەرگایەکەوە بچنە ژوورەوەو، بە کردەوەی چاك خۆتان لە خودا بپارێزن، تا بەهۆی کردەوە چاکەکانتانەوە سەرکەوتوو بن.) تەفسیری گوڵشەن

خودای گەورە لەبارەی نیعمەتی مانگ فەرموویەتی:

(هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِيَآءٗ وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٥ (يونس:٥ )

واتە : خوا زاتێکە کە خۆری گێڕاوە بە تیشك مانگیشی گێڕاوە بە ڕووناکی بۆ (گەڕانی) مانگ چەند قۆناغێکی دیاری کردووە بۆ ئەوەی ژمارەی ساڵەکان و حیسابی (مانگ و ڕۆژی) پێ بزانن خوا ئەوانەی دروست نەکردووە بە حەق و ڕاستی نەبێ ئایەتەکان شی دەکاتەوە بۆ کۆمەڵێك کە زانان و تێدەگەن.

چەند ریوایەتێك لەبارەی ئەم ئایەتەوە :

١-(قَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْيَهُودَ تَغْشَانَا وَيُكْثِرُونَ مَسْأَلَتَنَا عَنِ الْأَهِلَّةِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ ) اسباب النزول القران للواحدي

واتە : مەعازی کوری جەبەل گوتی : ئەی نێرراوی خوا ، جوولەکە زۆردێن بۆ لامان زۆر پرسیارمان لێ دەکەن دەربارەی مانگ ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ).

٢-( عن الْبَرَاء رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِينَا كَانَتْ الْأَنْصَارُ إِذَا حَجُّوا فَجَاءُوا لَمْ يَدْخُلُوا مِنْ قِبَلِ أَبْوَابِ بُيُوتِهِمْ وَلَكِنْ مِنْ ظُهُورِهَا فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ فَدَخَلَ مِنْ قِبَلِ بَابِهِ فَكَأَنَّهُ عُيِّرَ بِذَلِكَ فَنَزَلَتْ وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ اتَّقَى وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا) رواه البخاري

واتە: لە بەراوە هاتووە خوا لێی رازی بێ ، دەڵێ ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە دابەزی ، ئەنصاریەکان کاتێ حەجیان دەکرد ودەگەرانەوە لـە دەرگـای ماڵـەوە نەدەهاتنـە ژوورەوە ، لە پشتەوەی ماڵ دەهاتنـە ژوورەوە ، پیـاوێکی ئەنصـاری لـە حەجـەوە هاتەوە لـە دەرگـای خـۆی چـووە ژوورەوە ، خـەڵکی عەیبـداریان کـرد بـەم کـارە ، خـواش ئـەم ئایەتـەی دابەزاندوفـەرمووی (وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ اتَّقَى وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا) واتـە: چـاکە ئـەوە نیـە لـە دەرگـای پشتەوە بچیتە ژوورەوە ، بەلکو چاك ئەوەیە ئینسـان توقـوای هـەبێ ولـە دەرگـای خۆی بچێتە ژوورەوە.

٣- (عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَتْ قُرَيْشٌ يُدْعُونَ الْحُمْسَ، وَكَانُوا يَدْخُلُونَ مِنَ الْأَبْوَابِ فِي الْإِحْرَامِ، وَكَانَتِ الْأَنْصَارُ وَسَائِرُ الْعَرَبِ لَا يَدْخُلُونَ مِنَ الْأَبْوَابِ فِي الْإِحْرَامِ، فَبَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بُسْتَانٍ، فَخَرَجَ مِنْ بَابِهِ، وَخَرَجَ مَعَهُ قُطْبَةُ بْنُ عَامِرٍ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ قُطْبَةَ بْنَ عَامِرٍ رَجُلٌ فَاجِرٌ إِنَّهُ خَرَجَ مَعَكَ مِنَ الْبَابِ، فَقَالَ: (مَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟) قَالَ: رَأَيْتُكَ فَعَلْتَ فَفَعَلْتُ كَمَا فَعَلْتَ، فَقَالَ: (إِنِّي أَحْمَسِيٌّ) قَالَ: (إِنَّ دِينِي دِينُكَ) ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (لَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا، وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنِ اتَّقَى وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا) (البقرة: ١٨٩) رواه الحاكم هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ ،ووافقه الذهبي

واتە: لە جابیری کوڕی عەبدولاّوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بـێ ، گوتویـەتی : بە قوریشەکانیان دەگوت حومس ، لەکاتی ئیحـرام لـە دەرگـای خۆیـان دەچـوونە ژوورەوە ، وە ئەنصاریەکان و هەموو عەرەب لە دەرگای خۆیـان ناچـوونە ژوورەوە لە کاتی ئیحرام ، جارێك پێغەمبەر لە بێستانێك بـوو ، لـە دەرگـای خـۆی هاتـە دەر ،وە قوتبەی کوڕی عـامیری ئەنصـاری لەگـەڵ پێغەمبـەر هاتـە دەر ، گوتیـان ئـەی

نێرراوی خوا (قوتبەی کوڕی عامر) پیاوێکی دەرچووە لە ئاین ، چونکە لەگەڵ تۆ لە دەرگا هاتە دەر ، پێغەمبەر پێی فەرموو بۆچی وات کرد ، گوتی تۆ وات کرد منیش تۆ چیت کرد وامکرد ، پێغەمبەر فەرموو ئاخر من ئەحمەسیم ، قوتبە گوتی ئایینی من ئاینی تۆیە، جا خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (ولَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا، وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنِ اتَّقَى وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا)

## تێبینی توێژەرەوانی قورئان لەم بارەوە دەڵێن :

(قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: كَانَ النَّاسُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَفِي أَوَّلِ الْإِسْلَامِ إِذَا أَحْرَمَ الرَّجُلُ مِنْهُمْ بِالْحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ لَمْ يَدْخُلْ حَائِطًا وَلَا بَيْتًا وَلَا دَارًا مِنْ بَابِهِ، فَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْمُدُنِ نَقَّبَ نَقْبًا فِي ظَهْرِ بَيْتِهِ مِنْهُ يَدْخُلُ وَيَخْرُجُ، أَوْ يَتَّخِذُ سُلَّمًا فَيَصْعَدُ فِيهِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْوَبَرِ خَرَجَ مِنْ خَلْفِ الْخَيْمَةِ وَالْفُسْطَاطِ وَلَا يَدْخُلُ مِنَ الْبَابِ حَتَّى يَحِلَّ مِنْ إِحْرَامِهِ وَيَرَوْنَ ذَلِكَ دِينًا إِلَّا أَنْ يَكُونَ مِنَ الْحُمْسِ، وَهُمْ قُرَيْشٌ وَكِنَانَةُ وَخُزَاعَةُ وَثَقِيفٌ وَخَثْعَمُ وَبَنُو عَامِرِ بْنِ صَعْصَعَةَ وَبَنُو النَّضْرِ بْنِ مُعَاوِيَةَ سُمُّوا حُمْسًا لِشِدَّتِهِمْ فِي دِينِهِمْ ......)فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ.) اسباب النزول القران للواحدي /النيسابوري/ الشافعي

واتە : توێژەرەوانی قورئان دەڵێن : خەڵکی لە زەمانی جاهیلی و سەرەتای ئیسلام ، ئەگەر ئیحرامیان بەستابایە بۆ حەج و عومرە لە دەرگای راستەقینەی بێستان و خانو و ژوور نەدەچوونە ژوورەوە ، جا ئەگەر خەڵکی شارەکان بونایە کونێکیان لە پشتەوەی خانوەکە دەکرد ، پێدا دەهاتنە دەرەوەو ژوورەوە ، یان بە قادرمە بەسەر بانەوە دەچوونەوە ماڵەوە ، وە ئەگەر خەڵکی بیابان بونایە لە پشتەوەی چادر دەردەچوون ، لە دەرگای خۆی نەدەچوونە ژوورەوە تاکو ئیحرامیان

دەشكاند ، ئەوەيان بە ئـايين دەزانـی ، مەگـەر كەسـەكە لـە هـۆزی حـومس  بوايـە ئـەوانيش قـوريش و كينانـەو خوزاعـە وسـەقيف وخەسـعەم وبـەنو عـامیرو بـەنو صەعصەعەو بەنو نەزو بنو موعاويە پێيان دەگوتن حەمس  ، لەبەر ئەوەی ئاينيـان بە هێز وجيدی وەرگرتبوو.

## ٢- هۆی دابەزينی ئـايەتی ( ١٩٤ ) سورەتی ( البقره )

(ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ وَٱلۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٌۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩٤ )البقره

واتە: لە مانگە حەرامەكاندا بیٚ هۆ جەنگ نارەوايە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسـلم) و موسـڵمانەكان لـە سـاڵی شەشـەمی كۆچـييدا چـوون بـۆ عـومره ، بـەڵام موشريكەكان رێيان لێگرتن بچنە ناو شاری مەككەوە وعومرەكـەيان بكـەن، ئەمـەش لەمانگی (زيقەعدە)دا بوو، ديارە ئەميش يەكێكـە لەمانگـە قەدەغـەكراوەكان ونـابیٚ جەنگی تێدابكریٚ، بۆيە لەگەڵياندا رێككەوت كە ئەمسالٚ بگەرێتەوەو سـاڵی ئايينـدە بێتەوە عومرەكەی بكات، ئيمامی ئەحمەد دەڵیٚ: پێغەمبەر(صلى اللـه عليـە وسـلم) هەرگيز لەمانگە حەرامەكاندا جەنگی نەكردووە، مەگەر شەڕی پێفرۆشرا بیٚ، ئەوسـا خـوا فـەرمووی: مـانگی حـەرام بـەمانگی حـەرام و، شـكاندنی رێـزی هـەرخاوەن رێزێكيش تۆڵـەی هەيـە، واتـە: ئەگـەر ئـەوان لەمانگـە قەدەغەكراوەكانـدا لەگـەڵتان بەجەنگ بێن، ئێـوەيش بۆتـان هەيـە لەگـەڵيان بجـەنگێن وحـەقی بـەرگريتان هەيـە ئينجا هەركەسێك دەست درێژی كردەسەرتان ودەستی پێش خسـت ئێـوەش هەربـە ئەندازەی ئەو دەست بكەنەوە لێی، واتە: بیٚ زيـادە ڕەوی تۆڵـەی خۆتـان بكەنـەوە ئەگەرچی مانگی قەدەغـەكراويش بـیٚ وە لـە خـوا ترسـتان هـەبیٚ و پـارێز بكـەن و،

چاكيش بزانن كه بەراستيى خوا لەگەڵ پارێزكارانەو هەميشەيش پشتگيرييان لىٚ ئەكات، واتە: ئەگەر لەلايەن ئەوانەوە بەچەك وتەقەمەنى قورس وگارزى زەهراوى لێتان درا، ئێوەش بەناچارى بەهەمان چەك و تەقەمەنى وەڵاميان بدەنەوە زيادەرەو مەبن.(تەفسيرى رامان)

## ئايا هۆى دابەزينى ئەم ئايەتە پيرۆزە چى بوو؟

(قال ابن عباس: لَمَّا سَارَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُعْتَمِرًا فِي سَنَةِ سِتٍّ مِنَ الْهِجْرَةِ، وَحَبَسَهُ الْمُشْرِكُونَ عَنِ الدُّخُولِ وَالْوُصُولِ إِلَى الْبَيْتِ، وَصَدُّوهُ بِمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فِي ذِي الْقِعْدَةِ وَهُوَ شَهْرٌ حَرَامٌ حَتَّى قَاضَاهُمْ عَلَى الدُّخُولِ مِنْ قَابِلٍ، فَدَخَلَهَا فِي السَّنَةِ الْآتِيَةِ هو ومن كان مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَقَصَّهُ اللَّهُ مِنْهُمْ فَنَزَلَتْ فِي ذَلِكَ هَذِهِ الْآيَةُ: (الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ والحرمات قِصَاصٌ)تفسير ابن كثير

واتە: ئيبنو عەباس دەڵىٚ : كاتىٚ پێغەمبەر ساڵى شەشەمى كۆچى بۆ عومرە رۆيشت ، موشريكان رێگريان لىٚ كرد بچێتە ناو ماڵى خوا، قەدەغەيان كرد خۆى و موسڵمان لەمانگى زى لقەعدە ، ئەو مانگەش لە مانگە قەدەغەكراوەكانە، تاكو ساڵى داهاتوو نەيانتوانى بينە مەككە ، لە ساڵى داهاتوودا خۆى و موسڵمانان هاتن و خوا تۆڵەى بۆ كردنەوە ئەو ئايەتەى دابەزاند (الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ والحرمات قِصَاصٌ))

عَنْ جَابِرٍ قَالَ لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْزُو فِي الشَّهْرِ الْحَرَامِ إِلَّا أَنْ يُغْزَى أَوْ يُغْزَوْا فَإِذَا حَضَرَ ذَلِكَ أَقَامَ حَتَّى يَنْسَلِخَ (رواه احمد ) ١٤٦٢٣قال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح على شرط مسلم ، رجاله ثقات رجال الشيخين غير أبي الزبير –وهو محمد بن مسلم بن تدرس– فمن رجال مسلم .

واتـه: لـه جـابيرى كـوڕى عەبـدوڵاوە هـاتووە دەڵـێ : پێغەمبـەر هـەرگيز لـە مانگـە حەرامەكان شەڕى نەكردوە ، مەگەر شەڕى پێفرۆشابێ .

وَلِهَذَا لَمَّا بَلَغَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مُخَيِّمٌ بِالْحُدَيْبِيَةِ أَنَّ عُثْمَانَ قُتِلَ، وَكَانَ قَدْ بَعَثَهُ فِي رِسَالَةٍ إِلَى الْمُشْرِكِينَ، بَايَعَ أَصْحَابَهُ وَكَانُوا أَلْفًا وَأَرْبَعَمِائَةٍ تَحْتَ الشَّجَرَةِ عَلَى قِتَالِ الْمُشْرِكِينَ فَلَمَّا بَلَغَهُ أَنَّ عُثْمَانَ لَمْ يُقْتَلْ كَفَّ عَنْ ذَلِكَ وَجَنَحَ إِلَى الْمُسَالِمَةِ وَالْمُصَالِحَةِ) اخرجه ابن كثير

واتە : وەلەبەر ئەوە كاتێ هەواڵی كوژرانی عوسمان گەیشتە پێغەمبەر ، كـە نامـەی پێدا ناردبوو بۆ موشـریكان ، هـاوەڵان پـەیمانیان بـە پێغەمبـەردا لەسـەر مـردن بـۆ تۆڵەكردنەوەی عوسمان ، ئەو كات ژمارەی موسڵمانان (١٤٠٠) كەس بوون ، لـە ژێـر درختێك بوون ، بەڵام كاتێ هـەواڵ هـات عوسمـان نـەكوژراوە ، ئـەوانیش پەشـیمان بونەوە لەشەر كردن ، پێغەمبەر مەیلی كرد بۆ ئاشتی و ریكەوتن

**قەتـادە دەربـارەی ئەم ئـايەتە دەڵێ :**

-(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحِلُّواْ شَعَآئِرَ اللَّهِ وَلاَ الشَّهْرَ الْحَرَامَ )

-(قَوْلُهُ تَعَالَى: (الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ) الْآيَةَ (١٩٤) .

قَالَ قَتَادَةُ: أَقْبَلَ نَبِيُّ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – وَأَصْحَابُهُ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْحُدَيْبِيَةِ صَدَّهُمُ الْمُشْرِكُونَ. فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ دَخَلُوا مَكَّةَ، فَاعْتَمَرُوا فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَأَقَامُوا بِهَا ثَلَاثَ لَيَالٍ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ قَدْ فَخَرُوا عَلَيْهِ حِينَ رَدُّوهُ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ، فَأَقَصَّهُ اللَّهُ تَعَالَى منهم، فأنزل الله تعالى: (الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ) الْآيَةَ.) اسباب النزول للواحدي (خوا تۆڵەی لێ كردنەوە)

واته: پێغەمبەرو هاوەڵانی لە مانگی زی لقعدە ڕۆیشتن بۆ مەککە ، تاکو گەیشتنە حودیبیە موشریکان ڕێیان لێ گرتن ، لە ساڵی داهاتوودا چوونە مەککە ، عومرەیان کرد لەمانگی زی لقعدە ، و سێ شەوان لەوێ مانەوە ، موشریکان شانازیان دەکرد کە پێغەمبەریان قەدەغەکردوە لە ساڵی پار لە حودەیبیە ، خواش تۆڵەی بۆ کردنەوە لە موشریکان وئەم ئایەتەی دابەزاند (الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ)

## ٣-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٩٥) لە سورەتی البقره

﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ وَأَحۡسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥﴾ البقره

**واتە:** وە دارایی خۆتان بەخت بکەن لە ڕێ ی خوادا وە بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تیاچوونەوە وە چاکە بکەن بەڕاستی خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت.

-(عَنْ أَسْلَمَ أَبِي عِمْرَانَ التُّجِيبِيِّ قَالَ كُنَّا بِمَدِينَةِ الرُّومِ فَأَخْرَجُوا إِلَيْنَا صَفًّا عَظِيمًا مِنْ الرُّومِ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ مِنْ الْمُسْلِمِينَ مِثْلُهُمْ أَوْ أَكْثَرُ وَعَلَى أَهْلِ مِصْرَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ وَعَلَى الْجَمَاعَةِ فَضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ فَحَمَلَ رَجُلٌ مِنْ الْمُسْلِمِينَ عَلَى صَفِّ الرُّومِ حَتَّى دَخَلَ فِيهِمْ فَصَاحَ النَّاسُ وَقَالُوا سُبْحَانَ اللَّهِ يُلْقِي بِيَدَيْهِ إِلَى التَّهْلُكَةِ فَقَامَ أَبُو أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تَتَأَوَّلُونَ هَذِهِ الْآيَةَ هَذَا التَّأْوِيلَ وَإِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ فِينَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ لَمَّا أَعَزَّ اللَّهُ الْإِسْلَامَ وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ سِرًّا دُونَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ أَمْوَالَنَا قَدْ ضَاعَتْ وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعَزَّ الْإِسْلَامَ وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ فَلَوْ أَقَمْنَا فِي أَمْوَالِنَا فَأَصْلَحْنَا مَا ضَاعَ مِنْهَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرُدُّ عَلَيْنَا مَا قُلْنَا وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ فَكَانَتْ التَّهْلُكَةُ الْإِقَامَةَ عَلَى الْأَمْوَالِ وَإِصْلَاحِهَا وَتَرْكَنَا الْغَزْوَ فَمَا زَالَ أَبُو أَيُّوبَ شَاخِصًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ

حَتَّى دُفِنَ بِأَرْضِ الرُّومِ ) رواه أبو داود والترمذي والنسائي قال الالباني صحيح والواحدي (سەرۆكی هەموو سوپا)

واتە: لە ئەسلەمی كوڕی عیمرانی ئەلتوجیبی هاتووە ئەڵێ: ئێمە لە شاری رۆم بوین ، ریزێكی گەورە لە رۆمەكان بۆمان هاتن ، كۆمەلێكی زۆری موسڵماناتیش بۆیان چونە دەر هەندی ئەوان یان زیاتر ، وە سەرۆكی خەڵكی میصر (عوقبەی كوری عامیر بوو) ، وە سەرۆكی هەمووانیش (فوزالەی كوری عوبید) بوو پیاوێك لە موسڵمانان خۆی كرد بەناو سوپای رۆمەكان بەشەڕكردن تاكوبزربوو لە ناویان ، خەڵكی گوتیان پاكی بۆ خوا بەدەستی خۆی خۆی بەهیلاكدا ، ئەبو ئەیوبی ئەنصاری هەستاو گوتی خەڵكی ئێوە بەهەڵە ئەم ئایەتە لێك دەدەنەوە، ئەو ئایەتە لەسەر ئێمەی ئەنصاریەكان دابەزی ، كاتێ خوا ئیسلامی بەهێزكرد ، سەرخەرانی زۆر بوون ، هەندێكمان گوتیانە هەندێكان بەنهێنی بێ ئەوەی پێغەمبەر بزانێ ، ماڵمان تیاچوو ، خواش ئایینی بەهێزكردوە ، سەرخەرانی زۆر بووینە ، ئەگەر خەرێكی ماڵ و كاسبی بین قەربووی ئەوەی رابردوو بكەینەوە ، خواش ئەم ئایەتە بۆ دابەزاندین (وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ) بەڵكو تیاچوون ئەوەیە خەریكی ماڵ وسامان بی واز لە جیهاد بینی ، جا ئەبو ئەیوب تاكو وەفاتی كرد جیهادی كرد تەنانەت لە زەوی رۆم نێژرا.

## چەند دەقێك دەربارەی خۆتان بە هیلاك مەدەن:

١-(وَكَانَتِ الْأَنْصَارُ يتصدَّقون ، ويُعْطُون مَا شَاءَ اللَّهُ ، حَتَّى أَصَابَتْهُمْ سَنَةٌ ، فَأَمْسَكُوا ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ المحسنين) (البقرة: ١٩٥)رواه ابن حبان قال الالباني صحيح

واتە: ئەنصارەكان خێریان دەكرد ، ئەوەی خوا حەزی كردبایە دەیانبەخشی ، دوای توشی وشكە ساڵی و قات وقڕی بوون ، دەستیان گرتەوە لە بەخشین ، خواش ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاندو فەرمووی (وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ المحسنين) واتە: لە ڕێ و ڕێبازی خوادا بۆ ڕەزامەندی ئەو، ماڵ و سامانتان ببەخشن، بەدەستی خۆتان، خۆتان بەرەو تیاچوون مەبەن (چونكە ڕەزیلی و دەست نوقاوی مایەی تیاچوونە)، هەمیشە خێرو چاكە ئەنجام بدەن و چاكەخواز بن و (ماڵ و سامانتان لە پێناوی خوادا ببەخشن) چونكە بەڕاستی خوا ئەو چاكە كارانەی خۆشدەوێت.

٢-( عَنْ حُذَيْفَةَ (وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ) قَالَ نَزَلَتْ فِي النَّفَقَةِ) رواه البخاري

واتە: لە حوزیفەوە هاتووە (وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ) دەڵێ دەربارەی ماڵ بەخشین دابەزیوە .

٣-( عن النعمان بن بشير في قوله: (وَلا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ) قال: كان الرجل يذنب فيقول لا يغفر الله لي فأنزل الله تعالى( وَلا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) رواه الطبراني في الكبير والأوسط ورجالهما رجال الصحيح) الكتاب / الصحيح المسند من أسباب النزول ،المولف/ مُقْبلُ بنُ هَادِي

واتە: لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە هاتووە كە فەرموودەی خوا (وَلا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ) ئەڵێ كاتێ كەسێك گوناحێكی دەكرد دەیگوت خوا هەرگیز لێم خۆش نابێ ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (وَلا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)

٤-( عَنِ الْبَرَاءِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَبَا عُمَارَةَ: (وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ) (البقرة: ١٩٥) أَهُوَ الرَّجُلُ يَلْقَى الْعَدُوَّ فَيُقَاتِلُ حَتَّى يُقْتَلَ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ هُوَ الرَّجُلُ يُذْنِبُ الذَّنْبَ، فَيَقُولُ: لَا يَغْفِرُ اللَّهُ لِي) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ

واته: له بەرای کوڕی عازبەوه هاتووه : پیاوێك پێی گوتووه ئەی باوکی عومارە ئەو ئایەته (وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ) ئایا مەبەستی کەسێکە خۆی دەخاتە ناو سوپای دوژمن تاکو دەکوژرێ ؟ گوتی نەخێر ، بەڵکو مەبەستی کەسێکە گوناحێك دەکات و دەڵێ خوا لێم خۆش نابێ

٥-(عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ كُنَّا فِي غَزَاةٍ، فَتَقَدَّمَ رَجُلٌ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، فَقَالُوا: أَلْقَى هَذَا بِيَدَيْهِ إِلَى التَّهْلُكَةِ، فَكُتِبَ فِيهِ إِلَى عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَكَتَبَ عُمَرُ: لَيْسَ كَمَا قَالُوا، هُوَ مِنَ الَّذِينَ قَالَ اللَّهُ فِيهِمْ: وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ) تفسير القرآن العظيم لابن أبي حاتم

واته: له موغیرەی کوڕی شوعبەوه هاتووه ، دەڵێ : له جەنگێك بووین ، پیاوێك چووه پێشەوه له دوژمن نەگەرایەوه تاکو کوژرا، گوتیان ئەو پیاوه بەدەستی خۆی خۆی تیا برد، بۆ ئەم مەبەسته موسڵمان نامەیەکیان نوسی بۆ عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی رازی بێ ، ئایا راسته ئەم کەسه خۆی به هیلاك داوه ، ئەویش نووسی یەوه بۆیان ، نەخێر ، بەڵکو ئەو لەو کەسانەیه که خوا دەربارەیان فەرموویەتی (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ ) واته: کەسانێك هەن له خەڵکی خۆی دەفرۆشێ له پێناو رەزامەندی خوا.

*********************

## وتاری ژماره (١٤) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٩٦) سورەتی (البقره)

﴿وَأَتِمُّواْ ٱلۡحَجَّ وَٱلۡعُمۡرَةَ لِلَّهِۚ فَإِنۡ أُحۡصِرۡتُمۡ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۖ وَلَا تَحۡلِقُواْ رُءُوسَكُمۡ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡهَدۡيُ مَحِلَّهُۥۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ بِهِۦٓ أَذٗى مِّن رَّأۡسِهِۦ فَفِدۡيَةٞ مِّن صِيَامٍ أَوۡ صَدَقَةٍ أَوۡ نُسُكٖۚ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلۡعُمۡرَةِ إِلَى ٱلۡحَجِّ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۚ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ فِي ٱلۡحَجِّ وَسَبۡعَةٍ إِذَا رَجَعۡتُمۡۗ تِلۡكَ عَشَرَةٞ كَامِلَةٞۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمۡ يَكُنۡ أَهۡلُهُۥ حَاضِرِي ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ البقرة (١٩٦)

مانای ئایەتەکە: حەج و عومرە (تان کە دەست پێ کرد) تەنها بۆ خوا بە تەواوی بیکەن ئینجا ئەگەر هەر ڕێگە نەدران (قەدەغەکران) ئەوسا چیتان بۆ هەڵسوڕا لەقوربانی(سەری بڕن) وە سەرتان مەتاشن تا قوربانیەکە دەگاتە جێ ی دیاری کراوی خۆی ئینجا هەر کامێك لە ئێوە نەخۆش بوو یان ئازارێك لەسەریدا بوو (ئەگەر سەری تاشی) بریتی یەك بدات کە ڕۆژوو (ی سێ ڕۆژە) یان خێرێك یان قوربانییەك بکات جا کاتێك دڵنیا بوون(ترس نەبوو) ئینجا ئەو کەسەی بەهرەمەند بوو بە بەجێهێنانی عومرە تاکاتی حەج ئەوە چی بۆ هەڵسوڕا لە قوربانی(بیکات) وە ئەگەر یەکێك نەیبوو با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت لە کاتی حەجدا وە حەوت ڕۆژ کاتێ گەڕانەوە ئەمە دەبێتە دە ڕۆژی تەواو ئەمە بۆ کەسێکە کە (خۆی) و کەس و کاری دانیشتووی دەوروبەری (مسجد الحرام) نەبێت وە لەخوا بترسن وە بزانن کە بەڕاستی خوا خاوەنی تۆڵە و سزای سەختە.

**بەکورتی** : ......ئەگەر دوژمن ئابلوقەی دان یان نەخۆشی ریگەی نەدان...هەر لەو شوێنە ئاژەڵەکان سەرببڕن...ئەوەی نەخۆش بوو یان برین و ئازارێکی لەسەردا بوو پێش ئەوەی قوربانیەکان بگاتە جێگای خۆی (یەکێ لەم کەفارەتانە دەدات ١-سێ رۆژ بە رۆژوو بوون ٢-صەدەقەوخێرێك بکات (کە خۆراکی شەش هەژارە) ٣-یان مەڕێك یان بزنێك بکات خێر)

**تێبینی** : هەندی دەڵێن عومرە واجبە ، هەندێ دەڵێن سوننەتە

چەند ریوایەتێك لەم بارەوە هاتووە:

١- بەشی یەکەمی ئایەتەکە (وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ)

(عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُتَضَمِّخٌ بِالْخَلُوقِ، عَلَيْهِ مُقَطَّعَاتٌ، قَدْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ، فَقَالَ: كَيْفَ تَأْمُرُنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ فِي عُمْرَتِي؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ:(وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ) (البقرة: ١٩٦) ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنِ السَّائِلُ عَنِ الْعُمْرَةِ؟) فَقَالَ: أَنَا. فَقَالَ: (أَلْقِ ثِيَابَكَ، وَاغْتَسِلْ، وَاسْتَنْقِ مَا اسْتَطَعْتَ، وَمَا كُنْتَ صَانِعًا فِي حَجَّتِكَ فَاصْنَعْهُ فِي عُمْرَتِكَ) رواه الطبراني و اورده الشيخ مقبل الوادعي في الصحيح المسند في اسباب النزول

واتە: لە صەفوانی کوڕی یەعلای کوڕی ئومییە، ئەویش لە باوکیەوە هاتووە ، ئەڵێ پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەر خۆی بۆندار کردبوو چەند پارچە قوماشێکی بەسەرخۆدا دابوو، ئیحرامی بەستابوو بە عومرە ، گوتی ئەی نێرراوی خوا چ

فـەرمانێکم پـێ دەکـەی لـە کـاتی عـومرە کـردنم ؟ خـواش ئـەم ئایەتـەی دابەزانـدو فـەرمووی (وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ) جـا پێغەمبـەر فـەرمووی کوانی ئـەو کەسـەی پرسیاری کرد دەربارەی عومرە ، یەکی گوتی من بووم ، پێی فەرموو (جل وبـەرگت داکەنە ، وخۆت بشۆ، و تادەتوانی خۆت پاك کـەرەوە ، ئـەوەی لـە حـەج ئـەنجامی دەدەی بـە هـەمان شـێوە لـە عـومرەش ئـەنجامی بـدە. (مُتَضَمِّخٌ) خـۆی بۆداركردبوو(الْخَلُوقِ: جۆرێکە لە بۆن)

لەلای (بوخاری و مسلم) بەم شێوە هاتووە:

(عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بالجعرانة إِذْ جَاءَ رَجُلٌ أَعْرَابِيٌّ عَلَيْهِ جُبَّةٌ وَهُوَ مُتَضَمِّخٌ بِالْخَلُوقِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَحْرَمْتُ بِالْعُمْرَةِ وَهَذِهِ عَلَيَّ. فَقَالَ: (أَمَا الطِّيبُ الَّذِي بِكَ فَاغْسِلْهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ وَأَمَّا الْجُبَّةُ فَانْزِعْهَا ثُمَّ اصْنَعْ فِي عُمْرَتِكَ كَمَا تَصْنَعُ فِي حَجِّكَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

٢- بەشی دووەم لە ئایەتەکە (ابن كثير) دەڵێ :

( فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ) ذَكَرُوا أَنَّ هَذِهِ الْآيَةَ نَزَلَتْ فِي سَنَةِ سِتٍّ، أيْ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ، حِينَ حَالَ الْمُشْرِكُونَ بَيْنَ رسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبَيْنَ الْوُصُولِ إِلَى الْبَيْتِ، وَأَنْزَلَ اللَّهُ فِي ذَلِكَ سورةَ الْفَتْحِ بِكَمَالِهَا، وَأَنْزَلَ لَهُمْ رُخْصَةً: أَنْ يَذْبَحُوا مَا مَعَهُمْ مِنَ الْهَدْيِ وَكَانَ سَبْعِينَ بَدَنَةً، وَأَنْ يَتَحَللوا من إِحْرَامِهِمْ، فَعِنْدَ ذَلِكَ أَمَرَهُمْ عَلَيْهِ السَّلَامُ بِأَنْ يَحْلِقُوا رُؤُوسَهُمْ وَيَتَحَلَّلُوا. فَلَمْ يَفْعَلُوا انْتِظَارًا لِلنَّسْخِ حَتَّى خَرَجَ فَحَلَقَ رَأْسَهُ، فَفَعَلَ النَّاسُ وَكَانَ مِنْهُمْ مَنْ قَصّر رَأْسَهُ وَلَمْ يَحْلِقْهُ، فَلِذَلِكَ قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَحِمَ اللَّهُ الْمُحَلِّقِينَ. قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ:وَالْمُقَصِّرِينَ . وَقَدْ كَانُوا اشْتَرَكُوا فِي هَدْيِهِمْ ذَلِكَ، كُلُّ سَبْعَةٍ فِي بَدَنة، وَكَانُوا أَلْفًا وَأَرْبَعَمِائَةٍ، وَكَانَ مَنْزِلُهُمْ بِالْحُدَيْبِيَةِ خَارِجَ الْحَرَمِ، وَقِيلَ: بَلْ كَانُوا عَلَى طَرَف الْحَرَمِ، فَاللَّهُ

أَعْلَمُ) تفسير القرآن العظيم / أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي البصري ثم الدمشقي

واتە: دەڵێن ئەم ئایەتە دابەزیوە لە ساڵی شەشی کۆچی ، یانی ساڵی ریك کەوتنی حودیبیە، کاتێ موشریکان رێیان گرد پێغەمبەر بگاتە ماڵی خوا ، وەلەم بارەوە خوا سورەتی (الفتح) بە تەواوی ناردە خوارەوە ، جا کە رێیان لێ گیرا خوا مۆڵەتی دان ، ئەو ئاژەلانەی پێیان بوون سەرببڕن ، ژمارەیان حەفتا وشتر بوو، وە ئیحرامیان بشکێنن ، جا پێغەمبەر فەرمانی پێ کردن ، سەریان بتاشن و ئیحرام بشکێنن ، بەلاّم هاوەلاّن بەقسەیان نەکرد ، گوتیان بەڵکو نەسخ بێتەوە ، بەلاّم پێغەمبەر خۆی هاتە دەر سەری خۆی تاشی ،خەڵکێش سەرخۆیان تاشی ، هەبوو سەری کورتکردەوە ، لەبەر ئەوە پێغەمبەر فەرمووی (رەحمەتی خوا لەو کەسانە کە سەریان تاشی ،گوتیان: ئەی نێرراوی خوا رەحمەتی خوا لەو کەسانەش کە کورتیان کردەوە ، لە جاری سێیەم فەرمووی بەڵێ لەوانەش کە کورتیان کردەوە ، وە بە هەر حەوت کەس بەشدار بوون لە ئاژەلێك (وشتر)ێك.، ژمارەی موسڵمانان (١٤٠٠) کەس بوون ، مەنزڵگایان حودەیبیە بوو لە دەرەوەی حەرەم ، بەڵکو دەڵێن لە نزیك حەرەم بوون ، خوا زاناترە.

– بەندەکانی ریککەوتنی (حودەیبیە)

١–بۆ ماوەی (١٠) ساڵان شەر بوەستێ

٢–ئەو ساڵ موسڵمانان بگەرێنەوە ، سالێکی دیکە بێن عومرە بکەن.

٣–هەر کەسێك لە ناو کافران چووە ناو موسڵمانان بیگێرنەوە بۆ ناو کافران.

٤–هەرکەسێك لە ناو موسڵمانان چووە ناو کافران ، نابێ بگەرێتەوە بۆ ناو موسڵمانان .

**پێشنیاری (ام سلمه) خێزانی پێغەمبەر:**

بە کورتی : هاوەڵان زۆر دڵیان تەنگ بوو ، ئەم رێککەوتنەیان بە تەنازول دەزانی بۆیە کەس ئامادە نەبوو سەری خۆی بتاشی ، وحەزیان دەکرد بەهەر شێوەیەك بێ بچن عومرە بکەن ، پێغەمبەر لەو سەفەردا (ام سلمه) خێزانی لەگەلدا بوو ، راوێژی پێ کرد، ئەویش گوتی ئەی نێرراوی خوا تۆ برۆ بانگی سەرتاشی خۆت بکە وسەرت بتاشە ، دوای ئەوان چاو لە تۆ دەکەن ، ئەویش وایکرد، هەموو چاویان لەو کرد.

**٣-بەشی سێیەم لە ئایەتەکە (فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ)**

**(عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ قَالَ وَقَفَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحُدَيْبِيَةِ وَرَأْسِي يَتَهَافَتُ قَمْلًا فَقَالَ يُؤْذِيكَ هَوَامُّكَ قُلْتُ نَعَمْ قَالَ فَاحْلِقْ رَأْسَكَ أَوْ قَالَ احْلِقْ قَالَ فِيَّ نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ إِلَى آخِرِهَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ أَوْ تَصَدَّقْ بِفَرَقٍ بَيْنَ سِتَّةٍ أَوْ انْسُكْ بِمَا تَيَسَّرَ) رواه البخاري ومسلم ( (يَتَهَافَتُ قَمْلًا)سپێ داتنه خوایێ ، (هَوَامُّكَ) زیندەوەر)**

واتە: لە کەعبی کوڕی حوجرەوە هاتووە دەڵێ : لەڕۆژی حودەیبیە پێغەمبەر لەسەر سەرم وەستاو بوو ، وە سەرم ئەسپێی لێ دەکەوتە خوارەوە لەبەر زۆری ، فەرمووی ئەم زیندەوەرانت ئازارت نادەن ، گوتم بەڵێ ، فەرمووی سەرت بتاشە، جا دەڵێ ئەم ئایەتە دەربارەی من دابەزی (فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ إِلَى آخِرِهَا)جا پێغەمبەر فەرمووی بە رۆژووبە سێ رۆژان ، یان خێرێك بکە بۆ شەش هەژار یان قوربانێك سەربڕە.

### ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٩٧ ) سورەتی (البقره)

﴿ٱلۡحَجُّ أَشۡهُرٞ مَّعۡلُومَٰتٞۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلۡحَجِّۗ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٧﴾البقره

مانای ئایەتەکە: حەج کردن لە چەند مانگێکی دیاریکراودا دەبێت، کە مانگی (شەووال و زولقەعدەو زولحیججە) یە، واتە: لە هەر ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی مانگی یەکەم و دووەم و تا ڕۆژی نۆیەمی مانگی زولحیججە_ کە ڕۆژی عەرەفەی جەژنی قوربانە_ درووستە ئیحرام ببەسترێت بۆ حەج کردن.. پاش ئەو ڕۆژە، بە چوار ڕۆژ هەموو ئەوەی پێویستە لە حەجدا، بەجێ دەهێنرێت.. جا ئەو کەسەی کە بە ئیحرام بەستن بەجیهێنانی حەج لەسەر خۆی فەرز دەکات، دەبێ ئیتر نزیکی هاوسەرەکەی نەکەوێتەوەو خۆی لە هەموو بێ شەرعیەکی وەکو جنێودان، ئازاردانی خەڵك، ڕاوکردن، .. بپارێزێت، هەروەها خۆی لە بۆنی خۆش لە خۆدان، .. بپارێزێت.. هەروەها دەبێت خۆی لە (مجادەلە) و مشتومڕ دوور بخاتەوە .. ئێوە هەر چاکەیەك بکەن خودا ئاگای لێیەتی و پێی دەزانێت و، چاکترین توێشوویش پارێزکاریی و چاکەکاریی و خۆ لە خراپە پاراستنە .. کەواتە ئەی خاوەن بیرو هۆشیارەکان! بە چاکیی بمپەرستن و بەندایەتیم بۆ بکەن ( تەفسیری گوڵشەن)

## ئایا هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە چی بوو؟

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْيَمَنِ يَحُجُّونَ فَلَا يَتَزَوَّدُونَ وَيَقُولُونَ: نَحْنُ الْمُتَوَكِّلُونَ فَإِذَا قَدِمُوا مَكَّةَ سَأَلُوا النَّاسَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (وتزَوَّدُوا فإِنَّ خيرَ الزَّادِ التَّقوى) رَوَاهُ البُخَارِيّ

واتــە: لــە ئیبنــو عەباســەوە هــاتووە دەڵــێ : خــەڵکی یەمــەن دەچــوونە حــەج ، زادوزەخیرەیان لەگەڵ خۆ نەدەبرد ، و دەیانگوت : پەشتمان بەخوا بەستووە کاتێ دەگەیشــتنە شــاری مەککــە دەرۆزەیــان دەکــرد ، خــواش ئــەم ئایەتــەی دابەزانــدو فەرمووی (وتزَوَّدُوا فإِنَّ خيرَ الزَّادِ التَّقوى) واتە: زادو زەخیری سەفەر ئامادە بکـەن ، وەباشترین زادوخیرەش تەقوایە.

وَقَالَ عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ: كَانَ الرَّجُلُ يَخْرُجُ فَيَحْمِلُ كَلَّهُ عَلَى غَيْرِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى)

-عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لَقِيَ نَاسًا مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ؛ فَقَالَ: مَنْ أَنْتُمْ؟ قَالُوا: نَحْنُ الْمُتَوَكِّلُونَ. قَالَ: أَنْتُمُ الْمُتَوَاكِلُونَ، إِنَّمَا الْمُتَوَكِّلُ الَّذِي يُلْقِي حَبَّهُ فِي الأَرْضِ وَيَتَوَكَّلُ عَلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ ) جامع العلوم والحكم في شرح خمسين حديثا من جوامع الكلم/ زين الدين عبد الرحمن بن أحمد بن رجب بن الحسن، السَلامي، البغدادي، ثم الدمشقي

واتە: لە موعاویەیی کوڕی قوررەوە هاتووە : کە عومەر خوا لێی رازی بێ ، گەیشتە هەندێ خەڵکی یەمەن ، گوتی ئێوە چین ؟ گوتیان ئێمە ئەو کەسانەین کە پشـتمان بەخوا بەستاوە، عومەر گـوتی بـەڵکو ئێـوە لەسـەر خـەڵك دەخـۆن ، پشـت بەسـت بەخوا ئەو کەسەیە دانەویلە دادەچینێ و دەڵێ خوایە  بە تەمای تۆ.

**سێ فەرموودە دەربارەی حەقیقەتی (التوكل):**

١-( عن أنس بن مالك يَقُولُ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْقِلُهَا وَأَتَوَكَّلُ، أَوْ أُطْلِقُهَا وَأَتَوَكَّلُ؟ قَالَ: (اعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ قال الالباني حسن

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە دەڵێ : پیاوێك گوتی : ئەی نێرراوی خوا ئایا وشترەکەم ببەستمەوە و پشت بەخوا ببەستم یان بەرەڵای بکەم و پشت بەخوا ببەستم ؟ فەرمووی بیبەستەوەو پشت بەخوا ببەستە.

وفي رواية -قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُرْسِلُ نَاقَتِي وَأَتَوَكَّلُ؟، قَالَ: (اعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ) رواه ابن حبان قال الالباني حسن

-( عَن عمر بن الْخطاب قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : لَوْ أَنَّكُمْ تَتَوَكَّلُونَ عَلَى اللَّهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْرَ تَغْدُو خِمَاصًا وَتَرُوحُ بِطَانًا ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ وَابْنُ مَاجَهْ واحمد قال الالباني صحيح

واتە : لە عومەری کوڕی خەتابەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : ئەگەر ئێوە پشت بەخوا ببەستن ، بە پشت بەستنێکی راستەقینە ، خوا رۆزیتان دەدات ، هەروەك چۆن رۆزی باڵندە دەدات ، بەیانیان بە سکی (سیقە دانی )ی بەتاڵ دەڕوات ، و ئێواران بە سکی پڕ دەگەڕێتەوە .

تێبینی : ئیمامی (احمدی کوری حەنبەل) قسەیەکی زۆر جوانی هەیە ، دەڵێ بەلآم نابێ ئینسان بە ناوی (التوكل) واز لە هۆکارەکان بێنێ ، راستە خوا رزقی باڵندە دەدات ، بەلآم ئەگەر تەماشا بکەین باڵندە جوڵە دەکات و دێتە دەر لە هیلانە بۆ رزق.

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٩٨ ) سورەتی (البقره)

(لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ١٩٨) البقره

واتە : هیچ گوناهبار نابن ئەگەر لە کاتی حەجدا لە فەزڵی پەروەردگارتان، خۆتان بەهرەوەر بکەن (وەك بازرگانی و شت کڕین) هەر کاتێك لە عەرەفات دابەزین و گەڕانەوە، یادی خوا بکەن لەلای (مشعر الحرام کە: کێوێکە لە داوێنی مزدلفە دا) و یادیشی بکەن وەك چۆن ڕێنموویی کردوون و هیدایەتی داوون، چونکە بەڕاستی ئێوە پێش ئەم ئاین و ڕێنوومابیە سەرگەردان و گومڕا بوون.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَتْ عُكَاظٌ وَمَجَنَّةُ وَذُو الْمَجَازِ أَسْوَاقًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَلَمَّا كَانَ الْإِسْلَامُ تَأَثَّمُوا مِنَ التِّجَارَةِ فِيهَا فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ (لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُمْ فِي مَوَاسِمِ الْحَجِّ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : (عوکاز و موجەننە و زولمەجاز بازاری زەمانی جاهیلی بوون ، کاتێ ئیسلام هات موسڵمانان وایان زانی ئەگەر بازرگانی لەم بازارانە بکەن گوناحبار دەبن ، جا خوا ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاندن و فەرمووی (لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُمْ ) فِي مَوَاسِمِ الْحَجِّ

-(رواه البخاري عن ابن عباس) في مواسم الحج، وَلِبَعْضِهِمْ: فَلَمَّا جَاءَ الْإِسْلَامُ تَأَثَّمُوا أَنْ يَتَّجِرُوا فَسَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عن ذلك فأنزل الله هذه الآية. وروى أبو داود عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانُوا يَتَّقُونَ الْبُيُوعَ وَالتِّجَارَةَ فِي الْمَوْسِمِ وَالْحَجِّ يَقُولُونَ أَيَّامُ ذِكْرٍ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ) تفسير ابن كثير

-( عن أبي أمامة التَّيْمِيِّ قال: قَالَ : كُنْتُ رَجُلًا أُكَرِّي فِي هَذَا الْوَجْهِ وَكَانَ نَاسٌ يَقُولُونَ لِي : إِنَّهُ لَيْسَ لَكَ حَجٌّ ، فَلَقِيتُ ابْنَ عُمَرَ ، فَقُلْتُ : يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ ، إِنِّي رَجُلٌ أُكَرِّي فِي هَذَا الْوَجْهِ وَإِنَّ نَاسًا يَقُولُونَ لِي إِنَّهُ لَيْسَ لَكَ حَجٌّ ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ : أَلَيْسَ تُحْرِمُ وَتُلَبِّي وَتَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَتُفِيضُ مِنْ عَرَفَاتٍ وَتَرْمِي الْجِمَارَ ، قَالَ : قُلْتُ : بَلَى ، قَالَ : فَإِنَّ لَكَ حَجًّا ، جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهُ عَنْ مِثْلِ مَا سَأَلْتَنِي عَنْهُ ، فَسَكَتَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ : لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلا مِنْ رَبِّكُمْ ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَرَأَ عَلَيْهِ هَذِهِ الْآيَةَ ، وَقَالَ : لَكَ حَجٌّ) سنن ابي داود قال الالباني صحيح

الغريب من الحديث (الكراء) اي التاجر (أُكَرِّي ) تاجر، والمراد هنا سفر الحج

**واته: لەئەبو ئومامەی تەمیمییەوە هاتووە دەڵێ : پیاوێكی بازرگان بووم ، خەڵكی پێیان گوتم خێری حەجت پی ناگا چونكە بازرگانیت كرد ، ئیبنو عومەر گوتی ئایا تۆ ئیحرامت نەبەستووە ، تەلبیەشت كردوە ، تەوافیش دەكەی و لە عەرافات دیتەخوار و رەجمی جەمرات دەكەی ، ئەڵێ گوتم بەڵێ وادەكەم ، گوتی كەواتە تۆ حەجت دروستە ، پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر هەمان پرسیاری لێ كرد، كە تۆ ئاراستەی منت كرن ، ئەویش بێ دەنگ بوو ، وەڵام نەدایەوە ، ئەوجا ئەو ئایەتە هاتە خوار (لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلا مِنْ رَبِّكُمْ) پێغەمبەر بە دوای كابرای نارد و ئایەتەكەی بەسەردا خوێندەوە ، و فەرمووی حەجەكەت دروستە .**

**<u>تێبینی</u> : بەندێكی كوردی زۆر جوان هەیە دەڵێ (هەم زیارەت هەم تیجارەت)**

*****************************

# وتاری ژماره (١٥) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٩٩ ) سورەتی ( البقره )**

(ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٩٩) البقره

واته: لەوەودوا (روو بە قورەیش و سەرکردە و دەوڵەمەندان دەفەرموێت): خەڵکی لە کوێوە دابەزین و گەڕانەوە ئێوەش لەوێوە دابەزن و بگەڕێنەوەو (خۆتان جیامەکەنەوە) و داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەن، چونکە بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێخۆشبوو میهرەبانە.

**ئایا بۆچی ئەم ئایەتە دابەزی؟ وەڵام چونکە :**

قوریشیەکان دەیانگوت ئێمە جیاین لە خەڵکی ، خاوەن حەرەمین و ئەهلی خواین

١-(عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ قَالَ عُرْوَةُ كَانَ النَّاسُ يَطُوفُونَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ عُرَاةً إِلَّا الْحُمْسَ وَالْحُمْسُ قُرَيْشٌ وَمَا وَلَدَتْ وَكَانَتْ الْحُمْسُ يَحْتَسِبُونَ عَلَى النَّاسِ يُعْطِي الرَّجُلُ الرَّجُلَ الثِّيَابَ يَطُوفُ فِيهَا وَتُعْطِي الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ الثِّيَابَ تَطُوفُ فِيهَا فَمَنْ لَمْ يُعْطِهِ الْحُمْسُ طَافَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانًا وَكَانَ يُفِيضُ جَمَاعَةُ النَّاسِ مِنْ عَرَفَاتٍ وَيُفِيضُ الْحُمْسُ مِنْ جَمْعٍ قَالَ وَأَخْبَرَنِي أَبِي عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ هَذِهِ الْآيَةَ نَزَلَتْ فِي الْحُمْسِ ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ قَالَ كَانُوا يُفِيضُونَ مِنْ جَمْعٍ فَدُفِعُوا إِلَى عَرَفَاتٍ ) صحيح البخاري

(شرح الكلمات : يحتسبون على الناس) يعطونهم حسبة بدون مقابل. (يفيض) يدفع من عرفة. (جماعة الناس) باقي الناس غير قريش. (جمع) مزدلفة. (الآية) البقرة ١٩٩)

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە هاتووە: دەڵێ : عورووە دەڵێ : خەڵکی لە سەردەمی جاهیلی بە رووتی تەوافیان دەکرد ، تەنها حومسیەکان نەبێت ، حومسیەکانیش قوریش وئەوانە بوون کە لە قوریش کەوتۆنەوە ، حومسیەکان داوای پاداشتیان دەکرد، پیاو جل وبەرگی دەدایە پیاو ، ئافرەتیش جل وبەرگی دەدایە ئافرەت تاکو تەوافی پێ بکات ، ئەوەی حومسیەکان جل وبەرگی پێ نەدابایە بەرووتی تەوافی دەکرد ، جا لە ڕۆژی عەرەفات خەڵکی لە کێوی عەرەفات داهاتنە خوارێ ، بەلاَم حومس (قوریش) لە.موزدەلیفە دەهاتنە خوار ، لە عائیشەوە هاتووە دەڵێ ئەم ئایەتە لە بارەی حومس (قوریش ) دابەزیوە (ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ) دەڵێ چونکە ئەوانە لە موزدەلیفە دەهاتنە خوا (واتە : ئەوان لە موزدلیفە دەوەستان لە جیاتی عەرەفات )

٢-(عَنْ عَائِشَةَ كَانَتْ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَاتٍ فَلَمَّا جَاءَ الْإِسْلَامُ أَمَرَ اللَّهُ نَبِيَّهُ أَنْ يَأْتِيَ عَرَفَاتٍ ثُمَّ يَقِفَ بِهَا ثُمَّ يُفِيضَ مِنْهَا فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ ) صحيح البخاري

واتە: لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە دەڵێ : قوریش و ئەوانەی لەسەر دینی قوریش بوون ، لەسەر موزدلیفە دەوەستان ، ئەوانە پێیان دەگوتن حومس ، بەلاَم هەموو عەرەبەکان لە کێوی عەرەفات دەوەستان ، بەلاَم کاتێ ئیسلام هات خوا

فەرمانی کرد بە پێغەمبەر بچێتە عەرەفات وەکو خەڵکی ، ئەوە مانای ئەم ئایەتەیە (ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ)

تێبینی -(مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ)، والمراد بالإفاضة ههنا هِيَ الْإِفَاضَةُ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ إِلَى مِنًى لِرَمْيِ الجمار) تفسير ابن كثير

واتە: مەبەست لە مانای (ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ) یانی ڕۆیشتن وشۆڕبونەوەی خەڵکی لە موزدەلیفە بۆ مینا بۆ شەیتان ڕەجم کردن .

٣-وفي روايە (.....وَكَانَتْ قُرَيْشٌ لاَ تُجَاوِزُ الْحَرَمَ يَقُولُونَ نَحْنُ أَهْلُ اللَّهِ لاَ نَخْرُجُ مِنَ الْحَرَمِ فَكَانَ سَائِرُ النَّاسِ تَقِفُ بِعَرَفَةَ وَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ( ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ) رواه البيهقي

واتە: قوریش لە سنوری حەرەم دەرنەدەچوون ، دەیان گوت ئێمە ئەهلی خواین (واتە: دۆستی خواین) لەسنوری حەرەم (موزدەلیفە) زیاتر ناڕۆین ، خەڵکیش بەگشتی لە عەرەفات دەوەستان ، ئەوەمانای قسەی خوایە کە دەفەرمووی (ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ) .

مانای-(وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) كَثِيرًا مَا يَأْمُرُ اللَّهُ بِذِكْرِهِ بَعْدَ قَضَاءِ الْعِبَادَاتِ وَلِهَذَا ثَبَتَ فِي صَحِيحِ مُسْلِمٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا فرغ من الصلاة يستغفر الله ثَلَاثًا) ابن كثير

واتە : تۆبە بکەن لەو بۆچوونەی هەتانە خۆتان پێ لە خەڵکی باشتر بێ ، بە زۆری خوا فەرمان بە زیکر کردن دەکات لە دوای بەئەنجام گەیاندنی عیبادەتەکان ، وەك لە صەحیحی موسلیم هاتووە کاتێ پێغەمبەر نوێژی تەواو دەکرد سێ جاران دەیفەرموو (استغفرالله) وەك لەم دەقدا هاتووە

(عَنْ ثَوْبَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلَاتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلَاثًا، وَقَالَ اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

إِذَا انْصَرَفَ) ، أَيْ: فَرَغَ (مِنْ صَلَاتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلَاثًا) ، أَيْ: قَالَ: أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ، وَلَعَلَّ اسْتِغْفَارَهُ لِرُؤْيَةِ تَقْصِيرِهِ فِي طَاعَةِ رَبِّهِ ؛ فَإِنَّ حَسَنَاتِ الْأَبْرَارِ سَيِّئَاتُ الْمُقَرَّبِينَ، وَلِذَا قَالَتْ رَابِعَةُ: اسْتِغْفَارُنَا يَحْتَاجُ إِلَى اسْتِغْفَارٍ كَثِيرٍ، (وَقَالَ) ، أَيْ: بَعْدَ الِاسْتِغْفَارِ (اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ ) : فَطَاعَتُنَا لَا تَسْلَمُ مِنَ الْعُيُوبِ ( وَمِنْكَ السَّلَامُ) : بِأَنْ تَقْبَلَهَا وَتَجْعَلَهَا سَالِمَةً وَتَغْفِرَ تَقْصِيرَنَا الْمُعَدَّ مِنَ الذُّنُوبِ ( تَبَارَكْتَ) ، أَيْ: تَعَالَيْتَ أَنْ تُعْبَدَ حَقَّ عِبَادَتِكَ، وَأَنْ تُطَاعَ حَقَّ طَاعَتِكَ، (يَا ذَا الْجَلَالِ) ، أَيْ: صَاحِبَ الِانْتِقَامِ مِنَ الْفُجَّارِ ( وَالْإِكْرَامِ) ، أَيْ: صَاحِبَ الْإِنْعَامِ عَلَى الْأَبْرَارِ

**٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٠٠-٢٠١) سورەتی (البقره)**

**(فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ٢٠٠ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١) البقره**

واته : ئینجا کاتێك کردەوەکانی حەجتان تەواوکرد یادی خوا بکەن وەك ناوبردنتان بۆ باوو باپیرانتان یان زۆرتر لەناوی ئەوان ئینجا هی وا هەیە لەخەڵکی (هەر داوای دنیا دەکات و) دەڵێت خوایە بماندەرێ لەدنیادا وە (ئەوانە) هیچ بەشێکیان نی یە لەرۆژی دوایی دا.(٢٠٠)

وەهی واش هەیە دەڵێت خوایە هەم لەدنیا و هەم لە ڕۆژی دواییدا خێرو خۆشیمان پێ بدە وە بمان پارێزە لەسزای ئاگر.(٢٠١)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( قال ابْنِ عَبَّاسٍ: كَانَ قَوْمٌ مِنَ الْأَعْرَابِ يَجِيئُونَ إِلَى الْمَوْقِفِ فَيَقُولُونَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ عَامَ غَيْثٍ، وَعَامَ خِصْبٍ، وَعَامَ وَلَادٍ حَسَنٍ، لَا يَذْكُرُونَ مِنْ أَمْرِ الْآخِرَةِ شَيْئًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِمْ: (فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ) ولهذا مَدَحَ مَنْ يَسألُهُ الدنيا والأُخرى، فقال: (ومنهم من يقول رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) تفسير ابن كثير

واتە: ئیبنو عەباس دەڵێ : هەندی نەتەوە هەبوون لە عەرەبان کاتی حەج دەهاتنە شوێنی وەستان دوعایان دەکرد و دەپارانەوە دەیانگوت : خودایە ئەم ساڵ باران زۆر بباریێ، ساڵی گژوگیابێ، ساڵی منداڵی چاك بێ، هیچ باسی قیامەتیان نەدەکرد ، خواش ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاندن و فەرمووی (فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ) واتە: هەیە لە خەڵکی دەڵێ خوایە لە دونیا شتمان پێ ببەخشە، ئەوانە بەشیان لە قیامەت .

لەبەر ئەوە مەدحی ئەو کەسە کراوە کە دوعا بۆ دونیاو قیامەت دەکات ، وەخوا فەرمووی (ومنهم من يقول رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) واتە: خودایە لە دونیاو قیامەت باشەمان بە قیسمەت بکە و لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

قَالَ مُجَاهِدٌ: كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا اجْتَمَعُوا بِالْمَوْسِمِ ذَكَرُوا فِعْلَ آبَائِهِمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَأَيَّامِهِمْ وَأَنْسَابِهِمْ فَتَفَاخَرُوا فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا)

واته: موجاهید دەڵێ : خەڵكی زەمانی جاهیلی كاتێ كۆدەبونەوە لە وەرزی حەج ، باسی باب و باپیرانی خویان دەكرد لە زەمانی جاهیلی ، ڕۆژانی پاڵەوانی وشەڕو شۆر و پیاوەتی ، و باسی ڕەچەڵەكی خۆیان دەكرد، خۆیان پێ هەڵدەدایەوە ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا) واتە : یادی خوا بكەن ، وەك چۆن یادی باب وباپیرانتان دەكرد ، بەڵكو زۆر زیاتریش.

٢-(عن ابن عباس : وكان المشركون يجلسون في الحج فيذكرونَ أيامَ آبائِهم وما يَعُدُّونَ من أنسابِهم يومَهُم أجَمعَ، فأَنْزَلَ اللهُ عز وجلَ على رَسولِهِ في الإسلام (اذكروا الله كذكركم آباءكم أو أشد ذكرا) رواه البيهقي

واته: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە: دەڵێ : موشریكەكان لە حەج دادەنیشتن ، باسی باب و باپیرانی خۆیان دەكرد ، باسی نەسەبی خۆیان دەكرد لە كۆبونەوەی ئەوێ، خواش ئەم ئایەتی بۆ دابەزاندن وفەرمووی (اذكروا الله كذكركم آباءكم أو أشد ذكرا)

## ئایا ( حسنه )ی دونیا چییە و ( حسنه )ی قیامەت چییە؟

وەلاّم : هەندێ گوتویانە حەسەنەی دونیا بریتیە(١-لەش ساغی ٢-دەوڵەمەندی ٣-خزمی هەبێ ٤-سومعەی هەبێ ٥-ژنی باش و منداڵی صالح هەبێ ٦-خانوو جێگایەكی فراوانی هەبێ . ئەوانە هەموویان ڕاستن بەلام لە هەموویان چاكتر و

لەپێشترە لە(حسنە)دونیا بریتیە لە (ئیمان و خواپەرستی) چونکە ئەگەر ئەم دووانە نەبن ، ئەوانی دیکە هەمووی دەبنە بەلاَو (سیئە) لە جیاتی حەسەنە.

وە(حسنە)ی قیامەت (چاکەی دوا ڕۆژ) بریتیە لە (ڕەزامەندی خوا و بەهەشت) ، وە ئێمە پڕ بەدڵ دەڵێین (رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) ئامین (تەفسیری قورئانی بەرز بە پێز)

(بەندێکی کوردی هەیە دەڵێ : دوو شت خۆشن لە دونیایێ ئیمان و چاوی لیلایێ)

بەلاَم لیلایەکی بە حەلالی (واتە: خێزانێکی صالیحە)

٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٠٤-٢٠٥) سورەتی (البقرە)

تێبینی : ئەم چوار ئایەتە دەربارەی (٢) کەس دابەزیوە (ئەخنەس) و (صوهیب)

(وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُۥ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلْبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ ٢٠٤ )

واتە: وە هی واهەیە لەخەڵکی کە بە قسە سەرسامت دەکات لەم ژیانی دنیادا وە خوا دەکات بەشاهید لەسەر(ڕاستیی) ئەوەی لە دڵیایەتی کەچی ئەو دوژمنێکی سەر سەختە.

وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ٢٠٥

واتە: وەکاتێك پشتی هەڵکرد هەوڵ دەدات لە زەوی دا (لە وڵاتدا) بۆ ئەوەی خراپەی تێدا بکات وە کشتوکاڵ و وەچەو نەوە لەناو ببات وەخوا خراپەکاری خۆش ناوێت.

وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ ۚ فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ ۚ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ٢٠٦ )

واتە: وە کاتێك پێ ی بووترێت لەخوا بترسە دەمار دەیگرێ بۆ بەد کرداریی جا ئـەو دۆزەخی بەسە کە بەدترین جێگایە.

**<u>تێبینی</u> : خوا (٦) سیفەتیان باس دەکات**

**(١-( وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ)** بەقسە سەرسام دەبیت (قسە فەقیرە....

**٢- (فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا)** لە ژیانی دونیا

**٣-( وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ)** زۆر موناقشەوشەرە قسە دەکات (بشفری هەربزنە)

**٤-((وَإِذَا تَوَلَّىٰ)** کە پشتی هەلکرد (یان کە بۆیە بەرپرس ) چی خراپە دەکات

-( دوو مانای هەیە ١-کە پشتی هەڵکرد ٢-کەبۆیە بەرپرس

**٥-( سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَ)کشـتوکال و وەچـە تێك دەدات**

**٦-( أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِ)** ئەگەر پێ بگوترێ خۆت چاك بکە (دەمـاگیری و عینـاد )

تەفسیری قورئانی بەرز وبەپێز.

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

قَالَ السُّدِّيُّ: نَزَلَتْ فِي الْأَخْنَسِ بْنِ شَرِيقٍ الثَّقَفِيِّ، وَهُوَ حَلِيفُ بَنِي زُهْرَةَ أَقْبَلَ إلى النبي، إِلَى الْمَدِينَةِ فَأَظْهَرَ لَهُ الْإِسْلَامَ وأعجب النبي صلى اللَّه عليه وسلم ذَلِكَ مِنْهُ، وَقَالَ إِنَّمَا جِئْتُ أُرِيدُ الْإِسْلَامَ، وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنِّي لَصَادِقٌ، وَذَلِكَ قَوْلُهُ: وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ ثُمَّ خَرَجَ مِنْ عِنْدِ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، فَمَرَّ بِزَرْعٍ لِقَوْمٍ مِنَ

الْمُسْلِمِينَ وَحُمُرٍ، فَأَحْرَقَ الزَّرْعَ وَعَقَرَ الْحُمُرَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ: وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ ) اسباب النزول للواحدي ، وقال المحقق : كمال بسيوني زغلول أخرجه ابن جرير (٢/ ١٨١) بسنده عن السدي ، وذكره ابن كثير في تفسير هذه الآية- والسيوطي في لباب النقول (ص ٣٨) وفي الدر (١/ ٢٣٨) وزاد نسبته لابن المنذر وابن أبي حاتم.

واته: سودی دەڵێ ئەم ئایەتە دەربارەی (ئەخنسی كوڕی شەریق) دابەزیوە ، هاوپەیمانی نەوەی زوهرە بوو، هاتە لای پێغەمبەر بۆ مەدینە خۆی وا پیشاندا موسڵمان بووە، پێغەمبەر پێی سەرسام بوو (چونكە زمان لوس و قسە شیرین بوو) گوتی هاتووم موسڵمان بم ، خواش دەزانێ راست دەكەم، ئەوەیە كە خوا دەفەرموێ (وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ) دوای كە لەلای پێغەمبەر دەرچوو ، گەیشتە كشتوكاڵی موسڵمانان كەرێكی لەلای كشتوكاڵەكە بوو ، كشتوكاڵی سوتاند و كەرەكەشی كوێر كرد ، خواش ئەم ئایەتەی دەربارە دابەزاند وفەرمووی (وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ) واتە: كە دەرچوو لای پێغەمبەر هەولیدا فەسادی لە زەوی بلاوبكاتەوە ، و كشتوكاڵ و وەچەش لەناوبباتـ.

٤- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٠٧) سورەتی (البقره)

(وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلْعِبَادِ ٢٠٧) البقره

واتە : لەناو خەڵكی مرۆڤی وا هەیە لەبەر رەزامەندی خوای گەورە گیانی خۆی دەبەخشێ خوداش لەتەك بەندەكانی خۆیدا بەبەزەیی ودلۆڤانە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، قَالَ: لَمَّا أَقْبَلَ صُهَيْبٌ مُهَاجِرًا نَحْوَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَاتَّبَعَهُ نَفَرٌ مِنْ قُرَيْشٍ نَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ وَانْتَثَلَ مَا فِي كِنَانَتِهِ ثُمَّ قَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ لَقَدْ عَلِمْتُمْ أَنِّي مِنْ أَرْمَاكُمْ رَجُلًا، وَايْمُ اللهِ لَا تَصِلُونَ إِلَيَّ حَتَّى أَرْمِيَ بِكُلِّ سَهْمٍ مَعِي فِي كِنَانَتِي، ثُمَّ أَضْرِبُ بِسَيْفِي مَا بَقِيَ فِي يَدِي مِنْهُ شَيْءٌ، افْعَلُوا مَا شِئْتُمْ، دَلَلْتُكُمْ عَلَى مَالِي وَثِيَابِي بِمَكَّةَ وَخَلَّيْتُمْ سَبِيلِي، قَالُوا: نَعَمْ، فَلَمَّا قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ قَالَ: رَبِحَ الْبَيْعُ أَبَا يَحْيَى رَبِحَ الْبَيْعُ أَبَا يَحْيَى ، قَالَ: وَنَزَلَتْ: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللهِ) (البقرة: ٢٠٧) الْآيَةَ ) حلية الأولياء وطبقات الأصفياء أبو نعيم

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسییبەوە هاتووە : دەڵێ کاتێ سوهیب هیجرەتی کرد بۆ لای پێغەمبەر چەند کەسێك لە قوریشیەکان دوای کەوتن ، ئەویش دابەزی لە ولآخەکەی تیروکەوانەکەی دەرهێنا و گوتی: ئەی کۆمەڵی قوریش ، ئێوە دەزانن من لە هەمووتان چاکترم لە تیرهاوێژی ، سوێند بەخوا دەستتان پێم ناگات تاکو یەك تیر لە کاڵانێ ماوە ، دوایش کە تیرەکان تەواو بوون ، پاشان بە شمشێر شەڕتان لەگەڵ دەکەم ، جا ئێوە چی دەکەن بیکەن ، ئەگەر خەزیش دەکەن ، رێگام بەربدەن ، منیش پارو سامانی خۆم لە مەککە نیشانتان دەدەم ، جا ریکەوتن نیشانی دان ئەوانیش رێگاندا ، کاتێ گەیشتە مەدینە پێغەمبەر فەرمووی (باوکی یحیی قازانجی کرد، باوکی یحیی قازانجی کرد) خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللهِ)

٢-وفي رواية (....فَقُلْتُ لَهُمْ: هَلْ لَكُمْ أَنْ أُعْطِيَكُمْ أَوَاقِيَّ مِنْ ذَهَبٍ وَتُخَلُّونَ سَبِيلِي، وَتَفُونَ لِي فَتَبِعْتُهُمْ إِلَى مَكَّةَ؟ فَقُلْتُ لَهُمْ: احْفِرُوا تَحْتَ أُسْكُفَّةِ الْبَابِ فَإِنَّ تَحْتَهَا

الْأَوَاقَّ، وَاذْهَبُوا إِلَى فُلَانَةَ فَخُذُوا الْحُلَّتَيْنِ، وَخَرَجْتُ حَتَّى قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ أَنْ يَتَحَوَّلَ مِنْهَا – يَعْنِي قُبَاءَ –، فَلَمَّا رَآنِي قَالَ: (يَا أَبَا يَحْيَى، رَبِحَ الْبَيْعُ) ثَلَاثًا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا سَبَقَنِي إِلَيْكَ أَحَدٌ، وَمَا أَخْبَرَكَ إِلَّا جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ) والطبراني

واته : له ریوایەتیدا هاتووه: صوهیب دەڵێ پێم گوتن ئایا زیرەکانم پیشانتان بدەم ، برۆنه لای فلانه ئافرەت دوو بازنی زێری لایه ، دوای رۆیشتم تاکو گەیشتمه لای پێغەمبەر پێش ئەوەی بگاته قوبا کاتێ منی بینی ، فەرمووی (ئەی باوکی یحیی له کرین وفرۆشتنەکەت قازانج کرد) سێ جاران فەرموو ، گوتم ئەی نێرراوی خوا کەس پێش من نەکەوتوو هەواڵت پێ بدا، مەگەر جوبریل هەواڵی پێدابی.

٣-( عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، أَنَّ صُهَيْبًا حِينَ أَرَادَ الْهِجْرَةَ إِلَى الْمَدِينَةِ، قَالَ لَهُ كُفَّارُ قُرَيْشٍ: أَتَيْتَنَا صُعْلُوكًا، فَكَثُرَ مَالُكَ عِنْدَنَا، وَبَلَغْتَ مَا بَلَغْتَ ثُمَّ تُرِيدُ أَنْ تَخْرُجَ بِنَفْسِكَ وَمَالِكَ، وَاللَّهِ لَا يَكُونُ ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُمْ: أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَعْطَيْتُكُمْ مَالِي أَتُخَلُّونَ سَبِيلِي؟ فَقَالُوا: نَعَمْ، فَقَالَ: أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ جَعَلْتُ لَهُمْ مَالِي، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (رَبِحَ صُهَيْبٌ، رَبِحَ صُهَيْبٌ) رواه ابن حبان قال الالباني صحيح

واته: له ئەبی عوسمانی نەهدیەوه هاتووه دەڵێ : کاتێ صوهیب ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینه ، کافرانی قوریش گوتیان تۆ به فەقیری هاتیه لای ئێمه دەتەوێ به دەوڵەمەندی برۆی ، صوهیب گوتی: ئایا ئەگەر سەروەت و سامانی خۆمتان بدەمێ رێگام دەدەن برۆم بگەمه پێغەمبەری خوا ، گوتیان بەڵێ، گوتی: دە ئێوه شاهیدبن ئەوا ماڵی خۆم هەموو دایه ئێوه، ئەم هەواڵه گەیشتەوه پێغەمبەر ، ئەویش فەرمووی : صوهەیب قازانجی کرد، صوهەیب قازانجی کرد.

***************************

## وتاری ژماره (١٦) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢١٩ ) سورەتی ( البقره )

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ٢١٩ ﴾ البقره

واته : پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی عەرەق و قومار بڵێ: لەم دوانەدا گوناهی گەورەو چەند قازانجێك هەیە بۆ خەڵکی بەڵام گوناهەکەیان گەورەترە لە قازانجەکەیان وە پرسیارت لێ دەکەن چی ببەخشن بڵێ: ئەوی لێتان زیادە، ئاوەها خودا بەڵگەکان ڕوون دەکاتەوە بۆتان تا بیربکەنەوە.

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێرانەوە هەیە ، ١-عومەری کوڕی خەتان ٢- سەعیدی کوڕی ئەبی وەقاص خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ، دەگونجێ بۆ هەردوکیان دابەزی بێ، زانایان دەڵێن : زۆر جار هۆکاری دابەزین بۆ شتان بووە.

١-(عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ لَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ قَالَ اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانًا شَافِيًا فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ الَّتِي فِي سُورَةِ الْبَقَرَةِ ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا....(٢١٩)﴾قَالَ فَدُعِيَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ فَقَالَ اللَّهُمَّ

بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانًا شَافِيًا فَنَزَلَتْ الْآيَةُ الَّتِي فِي سُورَةِ النِّسَاءِ (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ...(٤٣) فَكَانَ مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَقَامَ الصَّلَاةَ نَادَى أَنْ لَا يَقْرَبَنَّ الصَّلَاةَ سَكْرَانُ فَدُعِيَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ فَقَالَ اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانًا شَافِيًا فَنَزَلَتْ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْمَائِدَةِ (إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ (المائدة: ٩١) فَدُعِيَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ فَلَمَّا بَلَغَ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ قَالَ فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ انْتَهَيْنَا انْتَهَيْنَا (رواه احمد ) ٣٧٨قال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح ، والنسائي و الترمذي قال الالباني صحيح

واته: له ئەبی میسەرەوە هاتووە ، ئەویش له عومەری کوڕی خەتاب دەگێڕێتەوە گوتویەتی : کاتێ ئایەتی حەرام بوونی ئارەق دابەزی گوتم خودایە بۆمان روونبکەوە دەربارەی ئارەق روونکردنەوەیەکی دیار، جا ئەو ئایەتە دابەزی لە سورەتی البقره (يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَا....(٢١٩)

واته (پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی عەرەق و قومار بڵێ: لەم دوانەدا گوناهی گەورەو چەند قازانجێك هەیە بۆ خەڵکی بەڵام گوناهەکەیان گەورەترە لە قازانجەکەیان)جا بانگی عومەر کرا خوا لێی رازی بێ ، ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندرایەوە ، دوای ئەم ئایەتە ، دووبارە دوعای کردەوە گوتی خودایە بۆمان روونکەوە بەروونکردنەویەکی دیارتر ، دەربارەی ئارەق ، ئەوجارە ئەم ئایەتە دابەزی لە سورەتی النسا (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ...(٤٣)) واته: ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە نزیکی نوێژ مەبنەوە کاتێك ئێوە سەرخۆش بن هەتا بزانن چی دەڵێن ، جا بانگدەری

پێغەمبەر کاتی قامەتی دەکرد دەیگوت با کەسی سەرخۆش نزیکی نوێژ نەکەوێ ، جا بانگی عومەر کراو ئەو ئایەتەی بەسەردا خوێندرایەوە ، دیسان دوعای کردەوە وپاڕرایەوە گوتی خودایە دەربارەی ئارەق بۆمان روونکەرەوە بە روونیەکی تەواو، جا ئایەتی سورەتی المائدە دابەزی و فەرمووی (**إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ** (المائدة: ٩١) واتە: بێگومان شەیتان هەر ئەوەی ئەوێ کە دوژمنایەتی و کینە و ڕق بخاتە ناوتانەوە بەهۆی ئارەق و قومارەوە وە بەرگریتان بکات لە یاد و باسی خوا و لە نوێژ کردن دەی ئایا ئێوە واز دەهێنن(لەو خراپان) ە.

جا بانگی عومەر کرا ئایەتەکیان بەسەردا خوێندەوە ، گوتی کۆتایمان پێ هێنا، کۆتایمان پێ هێنا .

٢-( عَنْ سَعْدٍ ، أَنَّهُ نَزَلَتْ فِيهِ آيَاتٌ مِنَ الْقُرْآنِ قَالَ: حَلَفَتْ أُمُّ سَعْدٍ أَنْ لَا تُكَلِّمَهُ أَبَدًا حَتَّى يَكْفُرَ بِدِينِهِ، وَلَا تَأْكُلَ وَلَا تَشْرَبَ، قَالَتْ: زَعَمْتَ أَنَّ اللهَ وَصَّاكَ بِوَالِدَيْكَ، وَأَنَا أُمُّكَ، وَأَنَا آمُرُكَ بِهَذَا. قَالَ: مَكَثَتْ ثَلَاثًا حَتَّى غُشِيَ عَلَيْهَا مِنَ الْجَهْدِ، فَقَامَ ابْنٌ لَهَا يُقَالُ لَهُ عُمَارَةُ، فَسَقَاهَا، فَجَعَلَتْ تَدْعُو عَلَى سَعْدٍ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي الْقُرْآنِ هَذِهِ الْآيَةَ: (وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي) وَفِيهَا (وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا) (لقمان: ١٥) قَالَ: وَأَصَابَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَنِيمَةً عَظِيمَةً، فَإِذَا فِيهَا سَيْفٌ فَأَخَذْتُهُ، فَأَتَيْتُ بِهِ الرَّسُولَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: نَفِّلْنِي هَذَا السَّيْفَ، فَأَنَا مَنْ قَدْ عَلِمْتَ حَالَهُ، فَقَالَ: (رُدَّهُ مِنْ حَيْثُ أَخَذْتَهُ) فَانْطَلَقْتُ، حَتَّى إِذَا أَرَدْتُ أَنْ أُلْقِيَهُ فِي الْقَبَضِ لَامَتْنِي نَفْسِي، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: أَعْطِنِيهِ، قَالَ فَشَدَّ لِي صَوْتَهُ (رُدَّهُ مِنْ حَيْثُ أَخَذْتَهُ) قَالَ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ) (الأنفال: ١) قَالَ: وَمَرِضْتُ فَأَرْسَلْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

فَأَتَانِي، فَقُلْتُ: دَعْنِي أَقْسِمْ مَالِي حَيْثُ شِئْتُ، قَالَ فَأَبَى، قُلْتُ: فَالنِّصْفَ، قَالَ فَأَبَى، قُلْتُ: فَالثُّلُثَ، قَالَ فَسَكَتَ، فَكَانَ، بَعْدُ الثُّلُثُ جَائِزًا. قَالَ: وَأَتَيْتُ عَلَى نَفَرٍ مِنَ الْأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرِينَ، فَقَالُوا: تَعَالَ نُطْعِمْكَ وَنَسْقِكَ خَمْرًا، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تُحَرَّمَ الْخَمْرُ، قَالَ فَأَتَيْتُهُمْ فِي حَشٍّ – وَالْحَشُّ الْبُسْتَانُ – فَإِذَا رَأْسُ جَزُورٍ مَشْوِيٌّ عِنْدَهُمْ، وَزِقٌّ مِنْ خَمْرٍ. قَالَ فَأَكَلْتُ وَشَرِبْتُ مَعَهُمْ، قَالَ فَذَكَرْتُ الْأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرِينَ عِنْدَهُمْ. فَقُلْتُ: الْمُهَاجِرُونَ خَيْرٌ مِنَ الْأَنْصَارِ. قَالَ فَأَخَذَ رَجُلٌ أَحَدَ لَحْيَيِ الرَّأْسِ فَضَرَبَنِي، بِهِ فَجَرَحَ بِأَنْفِي فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَخْبَرْتُهُ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيَّ – يَعْنِي نَفْسَهُ – شَأْنَ الْخَمْرِ: (إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ) (المائدة: ٩٠) صحيح مسلم

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هاتووە دەڵێ چەند ئایەتێك دەربارەی من دابەزیون لە قورئان لەوانە دایکم (واتە: دایکی سەعد) سوێندی خوارد نەبخوا نەبخواتەوە تاکو سەعد لە ئایینی ئیسلام پاشگەزنەبێتەوە ، وە گوتیە سەعد ئەدی ئایینی تۆ ناڵێ لەگەڵ دایکی باوك باش بە ، من دایکی تۆم فەرمانت پێ دەکەم واز لەم ئایینە بێنە، سێ ڕۆژان مایەوە هیچی نەخوارد لە هۆش خۆی چوو ، سەعد برایەکی هەبوو ناوی عەمارە ئاوی دایە دایکی و دایکیشی دوعای لە سەعد دەکرد، ئەڵێ خواش ئەم ئایەتەی دەربارەی من دابەزاند (وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي) وَفِيهَا (وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا) (لقمان: ١٥) واتە: وە فەرمانمان داوە بە ئادەمی (بە چاکی هەڵس و کەوت کردن) لەگەڵ دایك و باوکی دا، دایکی هەڵی ئەگرێ بە دووگیانی (پێ ی لاواز دەبێ) لاوازی لە دوای لاوازی و بڕینەوەی لە شیر لە (دوا تەمەنی) دوو ساڵیەوە (وە فەرمانمان بە ئادەمی دا) کە سوپاس گوزاری من (خوا) و باوك و دایکت بکە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان.(١٤) وە ئەگەر (باوك و دایکت) ئەوپەڕی هەوڵیان دا لەگەڵت بۆ ئەوەی شتێ بکەیت بە

هاوبەشی من کە هیچ زانیاری یەکت پێی نی یە ئـەوە گوێڕایـەڵییان مەکـە بـەڵام لـە دنیادا زۆر بەچاکی هاوڕێ یەتیان بکە و شوێن ڕێگای کەسێك بکەوە کە بە دڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆ لای من (لەدوا ڕۆژدا) گەڕانەوەتان تەنها بۆ لای منە ئینجا هـەواڵتان دەدەمێ بەو کردەوانەی کە کردووتانە.(١٥)

ئایەتی دووەم : پیغەمبەر جارێك دەسـتکەوتی زۆر دەسـت کـەوتبوو لـە جـەنگێك ، منیش شمشـرێکم گرتبـوو ، چـوومە لای پێغەمبـەر گـوتم: ئـەم شمشـێرەم بـدەرێ، ئـەویش فــەرمووی لــە کوێــت هێنــاوە لــە جێگــای خــۆی داینێــەوە (واتــە لــەناو دەستکەوتەکان) ویستم داینێم بەلاَم دووبارە پێم لە نەفسی خۆم نا داوام کردەوە ، ئەوجا بە دەنگی بەرز فەرمووی لـە جێگـای خـۆی داینێـەوە ، جـا ئـەو ئایەتـەم بـۆ دابەزی و فەرمووی (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ) (الأنفال: ١) واتە: ئەی موحەممەد(صـلی الله علیه وسلم) پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بە دەستکەوتەکان(ی جەنگی بـەدر) تۆش بڵێ: ئەو دەستکەوتانە هەر بۆ خواو پێغەمبەرن(صلی الله علیه وسلم) کەواتە خۆتـان بپـارێزن و لـە خـوا بترسـن وە پەیوەنـدی نێـوان خۆتـان چـاك بکەنـەوە و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بن ئەگەر ئێوە بڕوادارن.

وە ئایەتی سێەم : کاتێ نەخۆش بووم ناردم بە دوای پێغەمبەر کـە بەکـەیفی خـۆم هەڵسوکەوت لـە ماڵەکـەم دا بکـەم ، قەدەغـەی کـردم ، گـوتم نیـوەی دەکـەم خێـر قەدەغەی کردم ، گوتم سێەکی پێ دەنگ بوو ، جا لەپاشان سێیەکی ماڵ دروسـت بوو ،

وەهەروەها ڕۆژێك چوومە لای ئەنصارو موهاجیرەکان ، گوتیـان فـەرموو خـواردن و ئارەق بحۆ پێش حەرام بوونی ، لەناو بیستانێك بووین ، منیش لەگەڵیان خـواردم و خواردمـەوە ، منـیش باسـی ئەنصـار و موهـاجیرم کـرد لەلایـەن و گـوتم موهـاجیر باشـترن لـە ئەنصـار ، پیاوێـك لـە لـوتی دام و برینـداری کـرد و منـیش چـوومە لای

پێغەمبەر خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ) (المائدة: ٩٠) واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بێگومان ئارەق و قومار و ئەو بەردانەی کە کراون بە بت و ئەو پارچە دارانەی( کە بەکارئەهێنرێن بۆ دیاری کردنی بەش و چارەنووس) ئەوانە پیسن و لە کردەوەی شەیتانن کەواتە دوور کەونەوە لێ ی تا ڕزگاربن.

## ئایا ئارەق بە چەند قۆناغ حەرام کراوە؟

وەلاّم بە (٤) قۆناغان حەرام کراوە .

١-(سورەتی النحل) (وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (النحل:٦٧)

لێردا فەرمووی (شەراب و ڕزقی باش (ڕزقی باش واتە سرکەومێوژ و دۆشاو) مەدحی شەراب نەکرا، ناراستەوخۆ زەمی کرد.

٢-(سورەتی البقره (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا....(٢١٩) لێرە زەمی کرد ، (منافع)واتە قازانجی بازرگانی و کەمێك بێ ئاگابوون لە دونیا ، ئەلێن سەرخۆش بەخەیاڵ خۆی پێ پاشایە

٣-(سورەتی النسا((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنتُمْ سُكَارَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ ...(٤٣) (لەناو نوێژ قەدەغەکرا)

٤-(سورەتی المائده (إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ (المائدة: ٩١)

لێرە بە یەکجاری قەدەغە کرا

واتـە: بێگومـان شـەیتان هـەر ئـەوەی ئـەوێ کـە دوژمنایـەتی و کینـە و ڕق بخاتـە ناوتانەوە بەهۆی ئارەق و قومارەوە وە بەرگریتان بکات لـە یـاد و باسـی خـوا و لـە نوێژ کردن دەی ئایا ئێوە واز دەهێنن(لەو خراپان) ە.

## ئایا زیانەکانی شەراب چیینە؟

١-نەخۆشی لێ دەکەوێتەوە ٢-منداڵەکانی نا تەندروست دەردەچن ٣-دڵ ڕەق و بێ شەخصیەت دەبێ ٤-هۆکارە بۆ جیابونەوەی لە خێزانی ٥-کارەسات و شەرە چەقوی لێ دەکەوێتەوە ٦-هەموو سەرەوەت و سامانی لەسەر دادەنی خوی پێوە دەگرێ.

## ئایا زیانەکانی قومار چیینە؟

١-هەڵچوون و دڵە ڕاوکێ ٢-ئیفلاس بوون ٣-زۆر جاران ژنیان دۆراندوە ٤-شەرە قسەو شەرە چەقویان کردوە ، سووک و چروکن لەناو کۆمەڵگا ٥-گوناه وتاوانە خوا قەدەغەی کردوە.

## ئایا پێناسەی شەراب چییە؟

وەلاّم : (عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ وَمَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا فَمَاتَ وَهُوَ يُدْمِنُهَا لَمْ يَتُبْ لَمْ يَشْرَبْهَا فِي الْآخِرَةِ) رَوَاهُ مُسلم) (خمر : واته داپۆشین)

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە خوا لـە خـۆی وبـابی رازی بـێ دەڵـێ : پێغەمبـەر فەرمووی (هەموو سەرخۆشکەرێك ئارەقە ، وە هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامـە ، وە ئەوەی لە دونیا ئارەق بخواتەوە ولەسـەری رابـێ و تۆبـە نـەکات ، لـە قیامـەت بـێ بەشە لە خواردنەوەی شەرابی حەڵاڵی بەهەشت.

هــەموو سەخۆشــیکەرێك حەرامــە چ بەشــێوەی (حــەب ، دەرزی ، خــواردن ، خواردنەوە، دوکەڵ

## ئایا ئەگەر کەمێك بخورێتەو بێ سەرخۆش بوون حەرامە؟

وەلآم (وَعَنْ جَابِرٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ وَأَبُو دَاوُدَ وَابْنُ مَاجَهْ قال الالباني صحيح

واتە: ئەوەی بە زۆرەکەی ئینسان سەرخۆش دەکات ، کەمیشی هەر حەرامە.

**تێبـینی** : هەیـە دەڵـێ خـوا نەیفـەرموو مەخۆنـەوە ، بـەڵکو فەرموویـەتی نزیکـی مەکەونەوە ، لە راستیدا کە دەڵێ توخونی مەکەون بە قووەتترە لـە مەیخۆنـەوە ( واتــە: توخــونی مەکــەون لــە کــرین وفرۆشــتن ومــەجلیس و بــارکردن و بــۆ دانــان .....................)

## هۆی دابەزینی بەشی دووەمی ئەم ئایەتە :

پرسیاریان کردوە لە پێغەمبەر ئایا چی ببەخشن؟(وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ)

خوا وەلآمی بۆ ناردوە فەرمووی (قُلِ ٱلۡعَفۡوَ) واتە بلێ ئەوەی لێتان زیادە

لـەم بـارەوە فەرموودیـەك هەیـە (ابْدَأْ بِنَفْسِكَ فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ فَلِأَهْلِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شَيْءٌ فَلِذِي قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِي قَرَابَتِكَ شَيْءٌ فَهَكَذَا وَهَكَذَا) رواه مسلم

واتـە: سـەرەتا خێـر بـەخۆت بکـە ، ئەگـەر زیـاد بـوو بـۆ خانـەوادەت ، ئەگـەر لـە خانەوادە زیاد بوو ، بۆ خزمە نزیکەکانت ، ئەگەر لـە خزمـە نزیکـەکان زیـاد بـوو ، پلە پلە برۆخوارێ.

**٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٢٠ ) سورەتی ( البقره )**

(...وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٢٢٠) البقره

واتە : .... وە پرسیارت لێ دەکەن لەبارەی هەتیوان(کە چۆن بن لەگەڵیاندا) بڵـێ چاکسـازی (تێکـەڵاوی کـردن) بـۆ ئـەوان چـاکترە وە ئەگـەر تێکـەڵ بـبن لەگەڵیاندا(قـەیناکات چـونکە) براتـانن وەخـوا دەزانـێ کـێ خراپـەکارو کـێ چاکەکارە(لەگەڵ هەتیوان) ئەگەر خوا بیویستایە دوچاری ڕەنجی دەکردن بەڕاستی خوا زاڵ و کار دروستە.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

## (وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ)

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا أَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ) (الأنعام: ١٥٢) وَ (إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا) (النساء: ١٠)، انْطَلَقَ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ يَتِيمٌ فَعَزَلَ طَعَامَهُ مِنْ طَعَامِهِ، وَشَرَابَهُ مِنْ شَرَابِهِ، فَجَعَلَ يَفْضُلُ الشَّيْءَ مِنْ طَعَامِهِ وَشَرَابِهِ فَيَحْبِسُ حَتَّى يَأْكُلَهُ أَوْ يَفْسَدَ، فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَى قُلْ إِصْلَاحٌ لَهُمْ خَيْرٌ وَإِنْ تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ) (البقرة: ٢٢٠)، فَخَلَطُوا طَعَامَهُمْ بِطَعَامِهِمْ، وَشَرَابَهُمْ بِشَرَابِهِمْ) رواه البيهقي والحاكم وابو داود قال الالباني حسن

واتە: ئیبنو عەباس دەڵێ کاتێ ئایەتی (وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ) واتە: نزیك ماڵ و سامانی هەتیو مەکەون مەگەر بەچاکی و لە قازانجی نەبێت.

و (إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا)واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی کە ماڵی هەتیوەکان دەخۆن بەستەم و ناڕەوا بەڕاستی ئەوانە بەس لە سکی خۆیان ئاگر دەخۆن وە لەمەو پاش دەچنە ئاگرێکی بەتین و هەڵگیرساوەوە.) جا بەهۆی

دابەزینی ئەم ئایەتە خەڵکی ترسان خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵ یەتیم جیاکردوە ، وە ئەوەی لە خواردن وخواردنەوەی یەتیم زیاد دەبوو بۆیان هەڵدەگرتن تاکو بیخۆن یان خراپ دەبوو ، ئەوەش بۆیان قورس بوو ، بۆ پێغەمبەریان باس کرد ، خواش ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاندن وفەرمووی (يَسْأَلُونَكَ عَنِ

الْيَتَامَى قُلْ إِصْلَاحٌ لَهُمْ خَيْرٌ وَإِنْ تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ) (البقرة: ٢٢٠) جا خەڵكی خواردن وخواردنەوەی لەگەڵ ئەوان (یەتیمان) تێکەڵ کرد.

## فەزل وگەورەیی بەخێوکردنی (یەتیم)

١-( أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ كَهَاتَيْنِ) البخاري (وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ يَعْنِي: السَّبَّابَةَ وَالوُسْطَى)

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : من و بەخێوکەری بێ باوك بەیەکەوین لە بەهەشتدا، وە ئاماژەی کرد بە پەنجەی شایەتمان وناوەراست.

هەردووك لە بەهەشتن ئەگەر پەنجەی شایتمان کابرا بێ ، وپەنجەی ناوەراست پێغەمبەرە ، چونکە پلەی ئەو بەرزترە لەبەهەشت.

٢-( السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ وَالْمَسَاكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَكَالَّذِي يَصُومُ النَّهَارَ وَيَقُومُ اللَّيْلَ) رواه البخاري ومسلم

واتە: ئەو کەسەی یارمەتی بێوەژن (دایکە یەتیم) وهەژاران دەدات ، پاداشتی وەك موجاهیدە لە پێناوی خوا ، وە وەکو کەسێکە کە بە شەو شەونوێژە بکات وبەرۆژ بە رۆژووبێ.

## ئایا دروستە لە ماڵی یەتیم چایەکی بخۆیتەوە؟

وەڵام : بەڵێ دروستە ئەگەر بۆ سوود گەیاندن بچیتە لایان ، سوودیش دوو جۆرە (سوودی مادی و مەعنوی) وەك ئامۆژگاری ، دڵدانەوە ، وە دەوتوانی شتێك لەگەڵ خۆت ببەی ویان شتێك بدیتە منداڵەکە، جا چایەکیان لەلا بخۆیتەوە.

## وتاری ژماره (١٧) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٢٢) سورەتی (البقره)

(وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ٢٢٢) البقره

واتــه : وه پرســیارت لــێ دەکــەن دەربــارەی حــەیز بڵــێ: حــەیز ئــازارە کەواتــه دووربکەونەوە لە هاوسەرەکانتان لەکاتی حەیزا وە نزیکیان لەگەڵدا مەکـەن تـا پـاك دەبنەوە کە خۆیان شوشت(دوای پاك بوونەوە) ئینجا بچنە لایان لـەو شـوێنەوە کـە خوا فەرمانی پێداوون بەڕاسـتی خـوا تۆبـە کـارانی خـۆش دەوێـت و پاکـانی خـۆش دەوێت.

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنْ أَنَسٍ أَنَّ الْيَهُودَ كَانُوا إِذَا حَاضَتِ الْمَرْأَةُ فِيهِمْ لَمْ يُؤَاكِلُوهَا، وَلَمْ يُجَامِعُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ فَسَأَلَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ) (البقرة: ٢٢٢) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إِلَّا النِّكَاحَ) فَبَلَغَ ذَلِكَ الْيَهُودَ، فَقَالُوا: مَا يُرِيدُ هَذَا الرَّجُلُ أَنْ يَدَعَ مِنْ أَمْرِنَا شَيْئًا إِلَّا خَالَفَنَا فِيهِ، فَجَاءَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ، وَعَبَّادُ بْنُ بِشْرٍ فَقَالَا يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ الْيَهُودَ تَقُولُ: كَذَا وَكَذَا، فَلَا نُجَامِعُهُنَّ؟ فَتَغَيَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنْ قَدْ وَجَدَ

عَلَيْهِمَا، فَخَرَجَا فَاسْتَقْبَلَهُمَا هَدِيَّةٌ مِنْ لَبَنٍ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَرْسَلَ فِي آثَارِهِمَا فَسَقَاهُمَا، فَعَرَفَا أَنْ لَمْ يَجِدْ عَلَيْهِمَا ) رواه مسلم

واته: ئەنەسی کوری مالیك دەڵێ جوولەکەکان عادەتیان وابوو، کاتێ ئافرەت توشی حەیز دەبوو ، نانیان لەگەڵ نەدەخواردن ، وە لەگەڵیاشیان دانەدەنیشتن لە ماڵێ ، بۆ ئەم بابەتە هاوەڵان خوا لێیان رازی بێ پرسیاران لە پێغەمبەر کرد، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ) واتە : وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی حەیز بڵێ: حەیز ئازارە کەواتە دووربکەونەوە لە هاوسەرەکانتان لەکاتی حەیزا وە نزیکیان لەگەڵدا مەکەن تا پاك دەبنەوە کە خۆیان شوشت(دوای پاك بوونەوە) ئینجا بچنە لایان لەو شوێنەوە کە خوا فەرمانی پێداوون بەڕاستی خوا تۆبە کارانی خۆش دەوێت و پاکانی خۆش دەوێت، جا پێغەمبەر فەرمووی هەموو شتێك لەگەڵ ئافرەتان بکەن جگە لە جیماع ، ئەم هەواڵە گەیشتەوە جوولەکەکان گوتیان ئەو پیاوە هەموو شتێ پێچەوانەی ئێمە دەکات ، ئوسیدی کوڕی حوزیرو عوبادی کوڕی بیشر گوتیان: ئەی نێرراوی خوا جوولەکە واو وا دەڵێن ،ئایا ئێمە لەگەڵ ئافرەتات تێکەڵ بین ، پێغەمبەر توڕەبوو و رەنگی گۆڕا، هەتا وا حاڵی بوون لێیان تۆڕبووە ، دوای چوونە دەرێ ، هەندێ شیر بەدیاری بۆ پێغەمبەر هات ، ئەوانیش بۆیان وەرگرت ، پێغەمبەریش بانگی کردن بۆ شیر خوارد ئەوجا زانیان لێیان توڕە نەبووە.

-( وَقَالَ الْمُفَسِّرُونَ: كَانَتِ الْعَرَبُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا حَاضَتِ الْمَرْأَةُ (مِنْهُمْ) لَمْ يُؤَاكِلُوهَا وَلَمْ يُشَارِبُوهَا، وَلَمْ يُسَاكِنُوهَا فِي بَيْتٍ، كَفِعْلِ الْمَجُوسِ، فَسَأَلَ أَبُو الدَّحْدَاحِ رسول اللّه

صلى اللَّه عليه وسلم، عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا نَصْنَعُ بِالنِّسَاءِ إِذَا حِضْنَ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ هَذِهِ الْآيَةَ.) اسباب النزول القران للواحدي

واتـه: توێـژەرەوانی قورئـان دەڵـێن : عەرەبـەکان لـە سـەردەمی نەزانیـدا (پـێش ئیسلام) ئەگەر ئافرەتێك کەوتبایە سوڕی مانگانـە (حیـن) خـواردن و خواردنـەوەیان لەگەڵ نەدەخواردن و لە ماڵیش لەگەڵی نەدەبوون ، چاویان لە ئاگرپەرستان دەکرد ، جا ئەبو دەحداح لەم بـارەوە پرسـیاری کـرد لـە پێغەمبـەر ئایـا چ لـەو ئافرەتانـە بکەین کە دەکەونە حەیزەوە ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزانـدو فـەرمووی (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ.....)

بەکورتی: جوولەکە و عەرەبەکانی زەمانی جاهیلی لـەکاتی حـەیزدا لەگـەڵ ئـافرەت نانیـان نـەدەخوارد و لەگـەلیان نـە دەخـوتن و لەگـەلیان دانەدەنیشـتن ، دەسـتیان کردبایە شتێك دەیانگوت ئەو شتە پیسە) ئیسلام هات ئەو شتانەی لادا.

## هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٢٣ ) سورەتی البقره

(نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٢٢٣ ) البقره

واتە : ژنـەکانتان کێڵگـەی خۆتـانن جـا تـۆو بوەشـێننە نـاو کێڵگەکەتانـەوە لەهـەر کوێوە دەتانەوێ وە پێش بخەن بۆخۆتان(کردەوەی باش) لـەخوا بترسـن وە بـزانن دڵنیا بن کەبەخزمەتی دەگەن وە مژدە بدە بە بڕواداران .

**ئایا (الْحَرْثُ)چی دەگرێتەوە ؟**

**وەلاَم : ( فَإِنَّمَا الْحَرْثُ حَيْثُ يَنْبُتُ الْوَلَدُ وَيَخْرُجُ مِنْهُ)**

واتە: كێلگە ئەو شوێنەیە كە منداڵی لێ دەبێ و منداڵی لێ دەێتە دەر.

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

**١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: إِنَّ ابْنَ عُمَرَ وَاللهُ يَغْفِرُ لَهُ وَلَهُمْ، إِنَّمَا كَانَ هَذَا الْحِيُّ مِنَ الْأَنْصَارِ، وَهُمْ أَهْلُ وَثَنٍ مَعَ هَذَا الْحِيِّ مِنْ يَهُودَ، وَهُمْ أَهْلُ كِتَابٍ كَانُوا يَرَوْنَ لَهُمْ فَضْلًا عَلَيْهِمْ، فَكَانُوا يَقْتَدُونَ بِكَثِيرٍ مِنْ فِعْلِهِمْ، وَكَانَ مِنْ أَمْرِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَنْ لَا يَأْتُوا النِّسَاءَ، إِلَّا عَلَى حَرْفٍ وَاحِدٍ، وَذَلِكَ أَسْتَرُ مَا تَكُونُ الْمَرْأَةُ، وَكَانَ هَذَا الْحِيُّ مِنَ الْأَنْصَارِ قَدْ أَخَذُوا بِذَلِكَ مِنْ فِعْلِهِمْ، وَكَانَ هَذَا الْحِيُّ مِنْ قُرَيْشٍ يَشْرَحُونَ النِّسَاءَ شَرْحًا مُنْكَرًا، وَيَتَلَذَّذُونَ مِنْهُنَّ مُقْبِلَاتٍ وَمُدْبِرَاتٍ وَمُسْتَلْقِيَاتٍ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ الْمَدِينَةَ تَزَوَّجَ رَجُلٌ مِنْهُمُ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ، فَذَهَبَ يَصْنَعُ بِهَا ذَلِكَ، فَأَنْكَرَتْ عَلَيْهِ وَقَالَتْ: إِنَّمَا كُنَّا نُؤْتَى عَلَى حَرْفٍ، فَاصْنَعْ ذَلِكَ وَإِلَّا فَاجْتَنِبْنِي حَتَّى شَرَى أَمْرُهُمَا، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) (البقرة: ٢٢٣) مُقْبِلَاتٍ وَمُدْبِرَاتٍ وَمُسْتَلْقِيَاتٍ يَعْنِي بِذَلِكَ مَوْضِعَ الْوَلَدِ)رواه البيهقي و ابو داود قال الالباني حسن**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وباوكی رازی بێ ، دەڵێ ئیبنو عومەر خوالێی خۆش بێ ، وە لەوانیش خۆش بێ، ئەو گەرەكەی ئەنصاری لێ بوون ، كە ئەو كات بت پەرست بوون ، لەگەڵ گەرەكی جوولەكە نشین ، كە ئەهلی كیتاب بوون ، وایان دەزانی لەوان چاكترن ، لە زۆر شت چاویان لە جوولەكە دەكرد ، وە ئەهلی كیتابیش نەدەچوونە لای ئافرەتان تەنها بە یەك جۆر نەبایە ، ئەو گەرەكەی

ئەنصـاریەکان چـاویان لـە ئـەهلی کیتـاب دەکـرد ، بـەلاّم گـەرەکی قوریشـیەکان دەچوونە لای ئافرەتان و چێژیان لیّ وەردەگـرتن لـە پێشـەوە ، لـە دواوە ، لەسـەر پشت ، جا کاتی موهاجیرەکان چوونە مەدینە یەکیّ ژنێکی ئەنصاری هێنا ، ویستی لەلای پشتەوە بچێتە لای ئافرەتەکە قـەبوولی نـەکرد ، گـوتی ئێمـە تـەنها بەیـەك شێوە ئەم کارە دەکەین ، ئەگەر بەم شێوە دیتە لام باشە ئەگەر نا نزیکم مەکـەوە، ئەو قسـە بلاّوبویـەوە تـاکو گەیشـتەوە پێغەمبـەر ، خـواش ئـەم ئایەتـەی دابەزنـدو فەرمووی (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) لە پشتەوە و لە پێشەوە وە لە سەر پشتەوە ،چۆن حەز دەکـەن برۆنـە لای ئافرەتـەکانتان بـەلاّم واتـە : شـوێنی مندالّ بوون ، نەوەك کۆم

٢-(عن جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: كَانَتِ الْيَهُودُ تَقُولُ فِي الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ مِنْ دُبُرِهَا فِي قُبُلِهَا: إِنَّ الْوَلَدَ يَكُونُ أَحْوَلَ، فَنَزَلَ: نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) مُتَّفق عَلَيْهِ

واتـە : لـە جـابیری کـوڕی عەبـدولاّوە هـاتووە: دەڵـیّ جوولەکـەکان دەیـانگوت ئـەو کەسەی لە پشتەوە بچێتە لای خێزانی منداڵەکەی خێـل دەردەچـیّ ، جـا خـوا ئـەم ئایەتەی دابەزاند و فەرمووی (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ)

وفي رواية–( نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ هَذَا الْحَيَّ مِنْ قُرَيْشٍ كَانُوا يَشْرَحُونَ النِّسَاءَ بِمَكَّةَ وَيَتَلَذَّذُونَ بِهِنَّ مُقْبِلَاتٍ وَمُدْبِرَاتٍ، فَلَمَّا قَدِمُوا الْمَدِينَةَ تَزَوَّجُوا مِنَ الْأَنْصَارِ، فَذَهَبُوا لِيَفْعَلُوا بِهِنَّ كَمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ بِمَكَّةَ، فَأَنْكَرْنَ ذَلِكَ وَقُلْنَ: هَذَا شَيْءٌ لَمْ نَكُنْ نُؤْتَى عَلَيْهِ، فَانْتَشَرَ الْحَدِيثُ حَتَّى انْتَهَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِي ذَلِكَ: (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) قَالَ: إِنْ شِئْتَ مُقْبِلَةً وَإِنْ شِئْتَ مُدْبِرَةً وَإِنْ شِئْتَ بَارِكَةً، وَإِنَّمَا يَعْنِي

بِذَلِكَ مَوْضِعَ الْوَلَدِ لِلْحَرْثِ يَقُولُ: ائْتِ الْحَرْثَ حَيْثُ شِئْتَ) رَوَاهُ الْحَاكِمُ و اسباب النزول القران للواحدي

وفي رواية–( عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَتِ الْيَهُودُ( إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا أَتَى امْرَأَتَهُ وَهِيَ مُجَبِّيَةٌ(خلف) جَاءَ وَلَدُهُ أَحْوَلَ فَنَزَلَتْ (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) (البقرة: ٢٢٣) إِنْ شَاءَ مُجَبِّيَةً وَإِنْ شَاءَ غَيْرَ مُجَبِّيَةٍ إِذَا كَانَ فِي صِمَامٍ وَاحِدٍ) رواه ابن حبان قال الالباني صحيح

–( قَالَ لِنَافِعٍ : قَدْ أَكْثَر عَلَيْك الْقَوْل أَنَّك تَقُول عَنْ اِبْن عُمَر : إِنَّهُ أَفْتَى بِأَنْ يُؤْتَى النِّسَاء فِي أَدْبَارهنَّ . قَالَ نَافِع : لَقَدْ كَذَبُوا عَلَيَّ ، وَلَكِنْ سَأُخْبِرُك ، كَيْفَ كَانَ الْأَمْر ؟ إِنَّ اِبْن عُمَر عَرَضَ الْمُصْحَف يَوْمًا ، وَأَنَا عِنْده ، حَتَّى بَلَغَ (نِسَاؤُكُمْ حَرْث لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ) قَالَ : يَا نَافِع ، هَلْ تَعْلَم مَا أَمْر هَذِهِ الْآيَة ؟ إِنَّا كُنَّا مَعْشَر قُرَيْش نَجْبِي النِّسَاء ، فَلَمَّا دَخَلْنَا الْمَدِينَة وَنَكَحْنَا نِسَاء الْأَنْصَار أَرَدْنَا مِنْهُنَّ مِثْل مَا كُنَّا نُرِيد مِنْ نِسَائِنَا ، فَإِذَا هُنَّ قَدْ كَرِهْنَ ذَلِكَ وَأَعْظَمْنَهُ ، وَكَانَتْ نِسَاء الْأَنْصَار إِنَّمَا يُؤْتَيْنَ عَلَى جُنُوبهنَّ ، فَأَنْزَلَ اللَّه عَزَّ وَجَلَّ ( نِسَاؤُكُمْ حَرْث لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) رواه النسائي و البيهقي صححه حافظ ابن كثير

–( عَنْ عَبْد اللَّه بْن عُمَر : أَنَّ رَجُلًا أَتَى اِمْرَأَته فِي دُبُرهَا فِي عَهْد رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدَ مِنْ ذَلِكَ وَجْدًا شَدِيدًا ، فَأَنْزَلَ اللَّه عَزَّ وَجَلَّ ( نِسَاؤُكُمْ حَرْث لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ )  رَوَاهُ النَّسَائِيُّ

(وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمْ) واته : نيەتى منداڵ و خێر بێنن .

**لە تەفسیری تەبەریدا هاتووە:** (أَنَّ مَسْرُوقًا، رَكِبَ إِلَى عَائِشَةَ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَى النَّبِيِّ وَعَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَبُو عَائِشَةَ مَرْحَبًا فَأْذِنُوا لَهُ، فَدَخَلَ، فَقَالَ: إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكِ عَنْ شَيْءٍ وَأَنَا أَسْتَحْيِي، فَقَالَتْ: إِنَّمَا أَنَا أُمُّكَ وَأَنْتَ ابْنِي. فَقَالَ، مَا

لِلرَّجُلِ مِنَ امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ؟ قَالَتْ لَهُ: كُلُّ شَيْءٍ إِلَّا فَرْجَهَا) تفسير الطبري / جامع البيان

واته: تەبەری لە مەسروقەوە دەگێڕێتەوە کە مەسروق یەکێکە لە زانایانی تابیعی ، سواری وەڵاخ دەبێ دەچێتە لای عائیشە دەڵێ سەلامی خوا لە پێغەمبەر و ئەهل و بەیتی پێغەمبەر ، عائیشەش دەڵێ ئەی باوکی عائیشە (دیارە مەسروق کچێکی هەبووە بەناوی عائیشە) فەرموو وەرە ژورەوە (دیارە لەپشت پەردەوە بووە ) دەڵێ پرسیارێکم هەیە بەڵام شەرم دەکەم ، عائیشە دەڵێ من دایکی تۆم و ئەتۆش کوڕی منی و بڵێ ، مەسروق دەڵێ : کاتێ ژن دەکەوێتە حەیز پیاو چی بۆ هەیە لەگەلی بکات ؟ ئەویش ئەڵێ هەموو شتێکی بۆ هەیە جگە لە داوین (واتە: ماچ و دەست بازی و لەگەڵ خەوتن وخواردن...........)

سوننەتە ئینسان کاتێ دەچێتە لای خێزانی ئەم دوعایە بخوێنی تاکو شەیتان لێیان دوورکەوێتەوە، وەکو لەم دەقدا هاتووە:

(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ فَقَالَ (بِاسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا) فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ لَمْ يَضُرُّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا) مُتَّفق عَلَيْهِ

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ ،دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی: ئەگەر یەکێ لە ئێوە ویستی بچێتە لای خێزانی با بڵێ (بِاسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا) واتە:(بەناوی خوا، خودایە شەیتانمان لێ دوورخەرەوە ، وە ئەوەی پێمان دەبەخشی لە منداڵ شەیتان لەویش دوورخەرەوە ، ئەگەر قەدری خوا وابوو لەم جیماعە منداڵ بوو ، هەرگیز شەیتانی نزیك ناکەوێتەوە .

## ئایا کەسێ بچێتە لای خێزانی خۆی خێرە؟

وەلاّم : بەڵێ بە بەلگەی ئەم فەرموودەی خوارەوە:

( وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟ قَالَ: (أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهِ وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ كَانَ لَهُ أجر) رَوَاهُ مُسلم

واتە: پێغەمبەر فەمووی چوونە لای خێزانی خۆت خێرە ، هاوەلاّن گوتیان ئەی نێرراوی خوا ، ئایا ئێمە زەوق و کەیفی خۆمان دەکەین ئەوجا خێرشمان دەگاتێ؟ فەرمووی ئایا ئەگەر ئەم تۆیە لە جێگای حەرام دابنێن گوناحتان ناگاتێ ؟ بەم شێوەش ئەگەر لە جێگای حەلاڵی دابنێن خێرتان دەگاتێ .

## ئایا ئافرەتی حەیزدار نوێژ دەگێرێتەوە؟

(عَنْ مُعَاذَةَ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ عَائِشَةَ فَقَالَتْ: أَتَقْضِي إِحْدَانَا الصَّلَاةَ أَيَّامَ مَحِيضِهَا؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قَدْ (كَانَتْ إِحْدَانَا تَحِيضُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ لَا تُؤْمَرُ بِقَضَاءٍ) رواه مسلم

واتە: لە موعازەوە هاتووە ، ئەڵێ ئافرەتێك لە عائیشەی پرسی گوتی ئایا ئێمە نوێژەکانی کاتی حەیز بگێرینەوە؟ عائیشە گوتی ئایا تۆ خەواریجی ؟ بیگومان ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا دەکەوتینە بێ نوێژی ، فەرمانمان پێ نەدەکرا نوێژەکان بگێرینەوە.

شرح الكلمات :( (أحرورية أنت) نسبة إلى حروراء وهي قرية بقرب الكوفة ، كان أول اجتماع الخوارج به ، فمعنى قول عائشة رضي الله عنها إن طائفة من الخوارج يوجبون

على الحائض قضاء الصلاة الفائتة في زمن الحيض وهو خلاف إجماع المسلمين وهذا الاستفهام الذي استفهمته عائشة هو استفهام إنكاري أي هذه طريقة الحرورية وبئست الطريقة

**ئايا كەسێك لە پشتەوە (واتە: كۆم) بچێتە لای خێزانی گوناحی دەگاتیٚ؟**

وەلاٌم : بەلٌیٚ تاوانێكی گەورەیە بەم بەلٌگانەی خوارەوە

١-( قَالَ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَى رَجُلٍ جَامَعَ امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا) رواه ابن ماجه قال الالباني صحيح

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : خوا بە چاوی رەحمەت سەیری پیاوێك ناكات ، لە پشتەوە بچێتە لای خێزانی .

٢-( مَنْ أَتَى حَائِضًا أَوِ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا أَوْ كَاهِنًا فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ وَابْنُ مَاجَهْ قال الالباني صحيح

**واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی :** هەركەسێك بچێتە لای ئافرەتێكی حەیزدار یان لە پشتەوە بچێتەلای یان بچێتە لای فالٌچی ، ئەو كوفری كردوە بەوەی بۆ (محمد) هاتووە.

**هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٢٤ ) سورەتی البقره**

(وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَٰنِكُمْ أَن تَبَرُّوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَتُصْلِحُوا۟ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٢٤ )البقره

واتە : بۆ واز هێنان لەكاری چاكە سوێند بەخوا ناخورێت وە سوێندەكانتان بەخوا مەكەنە كۆسپ و بەرهەلٌست بۆ كردنی چاكەو رێخستنی نێوانتان و خۆپاریزیی و

تەقواتان  واتە: ئەگەر سوێندتان خوارد بۆ نەکردنی هەر کارێکی چاك  با ئەو سوێندە نەبێتە لەمپەرو مانیع بۆ نەکردنی ئەوکارە خێرە، بەڵکو سوێندەکەتان بشکێنن و کەفارەتی بدەن و بچن ئەوکارە چاکانە ئەنجام بدەن   خوا زۆر بیسەرو زانایە ئاگاداری هەموو نیازو نیەتێکتانە

**هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

١-( عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: (وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِأَيْمَانِكُمْ) (البقرة: ٢٢٤) الْآيَةَ، نَزَلَتْ فِي أَبِي بَكْرٍ فِي شَأْنِ مِسْطَحٍ)  اخرجه الطبري في (جامع البيان)

واتە: لە ئیبنو خوریجەوە هاتووە دەڵێ : (وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِأَيْمَانِكُمْ) دابەزی دەربارەی (ابوبکر) لەبارەی میستەحەوە (کاتی بەشدار بوو لە بوختانی عائیشە)

٢-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِهِ:  (وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِأَيْمَانِكُمْ أَنْ تَبَرُّوا وَتَتَّقُوا وَتُصْلِحُوا بَيْنَ النَّاسِ) (البقرة: ٢٢٤) قَالَ: هُوَ أَنْ يَحْلِفَ الرَّجُلُ أَنْ لَا يُكَلِّمَ قَرَابَتَهُ، وَلَا يَتَصَدَّقُ، أَوْ يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ إِنْسَانٍ مُغَاضَبَةٌ، فَيَحْلِفُ لَا يُصْلِحُ بَيْنَهُمَا وَيَقُولُ: قَدْ حَلَفْتُ، قَالَ: يُكَفِّرُ عَنْ يَمِينِهِ (وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِأَيْمَانِكُمْ) (البقرة: ٢٢٤) جامع البيان

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: فەرمایشتی  خوا کە دەفەرموێ (وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِأَيْمَانِكُمْ أَنْ تَبَرُّوا وَتَتَّقُوا وَتُصْلِحُوا بَيْنَ النَّاسِ) دابەزیوە دەبارەی کەسێك کە سوێند بخوات کە قسە لەگەڵ خزمانی نەکات ، وە خێریان پێ نەکات ، یان لەگەڵ کەسێك تورەبووە ، جا سوێند بخوات ئاشت نەبێتەوە ، بڵێ سوێندم خواردوە ، ئیبنو عەباس دەڵێ : ئەو کەسە کەفارەتی سوێندەکەی دەدات ، ئەوەیە خوا فەموویەتی با سوێندەکان رێگر نەبن لە چاکەکردن.

لەم بارەوە فەموودە زۆرە لەوانە :

١-اِحْلِفُوا بِاللَّه وَبِرُّوا واصْدقُوا فإِنَّ الله يُحِبُّ أن يَحْلِفَ بِه) ابو نعيم في حيلة الاولياء قال الالباني صحيح

واتە: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی (ئەگەر پێویست بوو سوێند بخۆن بەخوا، وەچاکە بکەن ، وە راست بڵێن ، خوا حەز دەکات سوێندی پێ بخورێت.

٢-( مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ وَلْيَفْعَلْ الذي هو خير ) رواه مسلم

واتە: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : هەرکەسێك سوێندی خوارد کارێك نەکات ، بەڵام بینی خێر لەودایە بکات ، با کەفارەت بدات و ئەو کارە بکات کە خێرە.

٣-( مَا ثَبَتَ فِي الصَّحِيحَيْنِ عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَا أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلَّا أَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ وَتَحَلَّلْتُهَا)

واتە: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : من سوێند بەخوا ئەوەی خوا حەز بکا سوێند دەخۆم ، ئەگەر بینیم چاکترەو خێرترە سوێندەکەم دەشکێنم و کەفارەت دەدەم ، کارەخێرەکە دەکەم

---

# وتاری ژماره (١٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٢٥) سورەتی (البقره)**

**(لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتۡ قُلُوبُكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ٢٢٥ ) البقره**

واتــه : خــوای گــەورە ئــەو ســوێندانەتان لێناگرێــت کــە لــە دەمتــان دەردەچــێت و لەسەری ڕاهاتوون، بەڵکو لەسـەرئەوە لێتـان دەگرێـت و موحاسـەبەتان دەکـات کـە نیەتی دڵتانی لەسەرە و خـوا لێخۆشـبووە (لـە گوناهەکـەتان) و ئـارامگرو خـۆڕاگرە (زوو تۆڵە لە یاخی و سوێند خۆران ناسێنێت).

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

لەم بارەوە دوو گێرانەوە هەیە.

**١-(عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ) فِي قَوْلِ الرَّجُلِ: لَا وَاللَّهِ وَبَلَى وَاللَّهِ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ**

واتە: لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە خوا لێی ڕازی بێ دەڵـێ : ئـەم ئایەتـە دابەزیوە (لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ) بۆ ئەو کەسانەی دەڵێن ( نەبە خوا ، بەخوا،) بۆ نموونە یەکێ بە یەکێ دەڵێ بۆ کوێ دەچی دەڵێ (والله ) دەچـمە بـازار ، یان دەڵێ وەزعت چۆن ئەڵێ بەخوا باشم ، ئەمانە سوێند نین .

٢-(وقال الْمُفَسِّرُونَ: جَلَسَ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم يَوْمًا، فَذَكَّرَ النَّاسَ، وَوَصَفَ الْقِيَامَةَ، وَلَمْ يَزِدْهُمْ عَلَى التَّخْوِيفِ، فَرَقَّ النَّاسُ وَبَكَوْا، فَاجْتَمَعَ عَشَرَةٌ مِنَ الصَّحَابَةِ فِي بَيْتِ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ الْجُمَحِيِّ، وَهُمْ: أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ، وَعَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو، وَأَبُو ذَرٍّ الْغِفَارِيُّ، وَسَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَالْمِقْدَادُ بْنُ الْأَسْوَدِ، وَسَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ، وَمَعْقِلُ بْنُ مُقَرِّنٍ. وَاتَّفَقُوا عَلَى أَنْ يَصُومُوا النَّهَارَ، وَيَقُومُوا اللَّيْلَ، وَلَا يَنَامُوا عَلَى الْفُرُشِ، وَلَا يَأْكُلُوا اللَّحْمَ، وَلَا الْوَدَكَ (وَلَا يَقْرَبُوا النِّسَاءَ وَالطِّيبَ، وَيَلْبَسُوا الْمُسُوحَ وَيَرْفُضُوا الدُّنْيَا وَيَسِيحُوا فِي الْأَرْضِ) ويترهبوا ويَجُبُّوا الْمَذَاكِيرَ. فَبَلَغَ ذَلِكَ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، فَجَمَعَهُمْ، فَقَالَ:

أَلَمْ أُنَبَّأْ أَنَّكُمُ اتَّفَقْتُمْ عَلَى كَذَا وَكَذَا؟ فَقَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا أَرَدْنَا إِلَّا الْخَيْرَ، فَقَالَ: لَهُمْ : إِنِّي لَمْ أُومَرْ بِذَلِكَ، إِنَّ لِأَنْفُسِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا، فَصُومُوا وَأَفْطِرُوا، وَقُومُوا وَنَامُوا، فَإِنِّي أَقُومُ وَأَنَامُ، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَآكُلُ اللَّحْمَ وَالدَّسَمَ، وَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي. ثُمَّ خَرَجَ إِلَى النَّاسِ وَخَطَبَهُمْ فَقَالَ: مَا بَالُ أَقْوَامٍ حَرَّمُوا النِّسَاءَ وَالطَّعَامَ، وَالطِّيبَ وَالنَّوْمَ، وَشَهَوَاتِ الدُّنْيَا؟ أَمَا إِنِّي لَسْتُ آمُرُكُمْ أَنْ تَكُونُوا قِسِّيسِينَ وَلَا رُهْبَانًا، فَإِنَّهُ لَيْسَ فِي دِينِي تَرْكُ اللَّحْمِ وَالنِّسَاءِ، وَلَا اتِّخَاذُ الصَّوَامِعِ، وَإِنَّ سِيَاحَةَ أُمَّتِي الصَّوْمُ، وَرَهْبَانِيَّتَهَا الْجِهَادُ، وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَحُجُّوا وَاعْتَمِرُوا، وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَآتُوا الزَّكَاةَ، وَصُومُوا رَمَضَانَ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِالتَّشْدِيدِ، شَدَّدُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ فَشَدَّدَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ، فَأُولَئِكَ بَقَايَاهُمْ فِي الدِّيَارَاتِ وَالصَّوَامِعِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ نَصْنَعُ بِأَيْمَانِنَا الَّتِي حَلَفْنَا عَلَيْهَا؟ وَكَانُوا حَلَفُوا عَلَى مَا عَلَيْهِ اتَّفَقُوا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ الْآيَةَ) اسباب النزول للواحدي /زغلول أخرجه ابن جرير (٧/ ٧) عن قتادة. وعزاه في الدر (٢/ ٣٠٧) لابن جرير وابن أبي حاتم وابن مردويه. وذكره في لباب النقول

واتە: توێژەرەوانی قورئان دەڵێن : رۆژێك پێغەمبەر دانیشت وتاری بۆ خەڵكی دا، باسی قیامەتی كرد، هاوەڵان گریان ، دوای دە كەس لەوان لەماڵی (عوسمانی كوری مەزعوم كۆبونەوە كە ئەمانە بوون (١-ابوبكری صدیق ، ٢-علی كوری ئەبی تالیب ٣-عبدالله كوری مەسعود،٤-عبدالله كوری عەمر ،٥-ئەبو زەری غەفاری ، ٦-سالمی خزمتكاری ئەبی حوزیفە ، ٧-مقدادی كوری ئەسود ، ٨-سلمانی فارسی ، ٩-مەعقیلی كوری موقررن ، ١٠- عوسمان كوری مەزعون) لە نێوان خۆیان رێككەوتن (سوێندیان خوارد) كە بەردەوام بە رۆژ بە رۆژووبن ، شەوانیش شەو نوێژ بكەن ، وە لەسەر فەرش و رایەخ نەخەون ، وە گۆشتیش نەخۆن (حیوان) ، وە گوشتی مریشكیش نەخۆن ، وە(نزیكی ئافرەتان نەكەون ، بۆن لە خۆیان نەدەن، وە جل وبەرگی سادە دەبەر بكەن ، واز لە دونیا بهێنن و ببنە گەریدە لەسەر زەوی ، ئەم هەواڵە گەیشتەوە پێغەمبەر ، ئەویش بەدوای ناردن كۆیكردنەوە ، پێ فەرموون هەواڵم پیدراوە ئێوە لەسەر ئەو شتانە ریك كەوتوون ؟ گوتیان ئەی نێرراوی خوا ، بەلاَم مەبەستما چاك بووە، ئەویش پێ گوتن ، من بەم شێوە فەرمانم پێ نەكراوە ، ئێوە نەفسی خۆتان حەقی لەسەرتان هەیە، بە رۆژووبن ، وە بەرۆژووش مەبن ، شەونوێژ بكەن و بشخەون، چونكە من شەونوێژ دەكەم و دەشخەوم ، بە رۆژوو دەبم و بەرۆژوش نابم ، وە گۆشت دەخۆم و چەوری دەخۆم ، ئەوەی لە رێبازی من لابدات لەمن نیە، دوای چووە لای خەڵكی وتاری بۆ خوێندنەوە و فەرمووی : كەسانێك هەنە ژن و بۆن و خواردن وخەوتن وئارەزوەكانی دونیا لە خۆیان حەرام دەكەن ، بەلاَم من فەرمانم پێ نەكروون خۆیان بكەنە (راهیب) لە ئایینی من دانیە ، واز لە گۆشت و ئافرەت بێنێ ، وە نە بەردەوام لە پەرستگادابی ، گەڕانی ئوممەتی من رۆژووە ، گۆشگیریەكەی جیهادە ، خواپەرستن و هاوبەشی بۆ بریارمەدەن ، حەج بكەو عومرە بكەن ، وە نوێژ بەر

پابکەن ، وە زەکات بدەن ، وەرۆژووی مانگی رەمەزان بگرن ، بەڵکو گەلانی پێش ئێوە لە ناو چوون بە هۆی توند گرتنی ئایین ، ئەوان لەسەر خۆیان توند کرد خواش لەسەری توند کردن ، ئەوان پاشماوەیان لە پەرستگاکانن ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە ، ئەوانیش گوتیان ئەی نێرراوی خوا ئەدی چی بکەین چونکە ئێمە سوێندمان خواردوە و لەسەریان رێك کەوتووین ؟ ئەوان سوێندیان خوارد بوو لەسەر ئەوەی لەسەری پێکهاتبوون ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ الْآيَةَ)

**چەند فەرموودیەك لەسەر سوێند خواردن:**

١- قال رسولُ الله ( إِنِّي وَاللهِ إِنْ شَاءَ اللهُ، لَا أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ ، ثُمَّ أَرَى خَيْرًا مِنْهَا، إِلَّا كَفَّرْتُ يَمِينِي، وَأَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتە : پێغەمبەر فەرموویەتی : من سوێند بەخوا دەخۆم ، ئەوەی خوا حەز بکات ، دوای کە دەبینم خێر لەوەدایە سوێند دەشکێنم ، و کەفارەتەکە دەدەم .

**ئایا کەفارەتی سوێند چەندە وچی یە؟**

(لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ٨٩)

البقره

واته: کەفارەت و بارتەقای سوێند: خوا بەسوێندی سەرزارەکیی و بێ مەبەست و بێ نیاز ، وەك بڵێیت (نا واللە ، بەڵێ واللە) نا تانگرێ و جەزرەبەتان نادا بەڵام بەو سوێندانە دەتانگرێ و سزاتان دەدا، کە بەدڵ گرێیان دەدەن و لەناخی دڵتانەوەن و نایشیانبەنە سەر جا دەبێ لە کەفارەتی ئەم جۆرە سوێندانەدا خۆراك بە دەکەسی بێ نەواو هەژاربدەن لەو خۆراکە مام ناوەندیە، کە ئێوە رۆژانە بەماڵ و منداڵ و خێزانی خۆتانی دەدەن یان دەبێ دە هەژار پۆشتە بکەن یان دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکەن ئینجا هەرکەسێك ئەوانەی نەبوو، دەبێ سێ رۆژان بە رۆژوو بێ ئەوسێ جۆرەیە باسکران، کەفارەت و تۆڵەی ئەوسوێندانەیە بەئەنقەست خواردوتانن ودەیانشکێنن دەسا سوێندەکانتان ڕاگرن و بیانپارێزن، بەناچاری نەبێت مەیانشکێنن ئا بەوشێوەیە خوا یاساکانی خۆی رووندەکاتەوە بۆتان بەشکو سوپاسگوزاری پەروەردگارتان بکەن.

تێبینی : مرۆڤ لەوکەفارەتەدا (موخەییەر) و سەرپشکە، هەرکامێکیان هەڵبژێرێ دەتوانێ. پۆشاکیش: ئەوی لەناوخەڵکانی ماقووڵدا پێی بڵێن (پۆشاك) دەبێ. خۆراکەکەش: یان دەبێ (٦٠٠) گرام بێت، یان دەبێ نرخەکەی بدات، رۆژووەکەش: مەرج نیە هەر سێ رۆژەکە بەسەریەکەوە بێت.

چەند رێنمایەکی ئەم ئایەتە: ١- دەبێ کەفارەتی سوێند پاش خستنی بدرێت.

٢- زۆر سوێندخواردن، ئەگەر لەسەر هەقیش بێ کارێکی ناپەسەندو(مەکروه)ـە.

٣- سوێند بەغەیرەز خوا حەرامە، بە بەڵگەی ئەم فەرموودە پێغەمبەر فەرموویەتی:

(مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ أَشْرَكَ أو كَفَرَ ) ترمزی ریوایەتی کردووە. یان دەفەرموێ: ( ألا إن الله ينهاكم أن تحلفوا بآبائكم، فمن كان حالِفاً فَلْيَحْلِفْ بالله أو لِيَصْمُتْ ).

٤- سوێند خواردن بۆکردنی هەرکارێکی (مەندوب)، یـان بـۆ رێگـرتن لەهـەرکارێکی ناپەسەندو (مەکروە)، لە شەریعەتی ئیسلامدا رێی پێدراوە بشکێندرێ و، کەفارەتی بـدرێت، ئەگـەر بەرژەوەنـدی لـەوەدابوو، بـەڵام ئەگـەر سـوێندەکە بـۆ تـەرکی (واجیب)ێك بوو، یان بۆ کردنی (حـەرام)ێـك بـوو، ئـەوە لـەم حاڵەتـەدا خسـتنەکەی واجیبە.

٥- سوێند سێ جۆری هەیە:

یەکەم : سوێندی (باتڵ / لەغوو) ئەوە کەفارەتی بـۆ نـادرێ، وەکـو ئـەوە کەسـێك بڵێ: (ئەرێ وەڵڵا، ناوەڵڵا) جا لەبەرئـەوە کـە ئـەم جـۆرە سـوێنانە لـەناخی دڵـەوە نایەن، نەگوناحیان هەیەو نەکـەفارەت، دووەم : سـوێندی درۆو (غـەمووس): واتـە: درۆکـردن و سـوێند خـواردن، بـەدەس ئەنقـەس، ئـەم جۆرەشـیان لەبـەر گـەورەیی گونـاح و تاوانەکـەی، کـەفارەتی نیـە، مەگـەر هەرتـەنها تەوبـە لای ببـا. ئیمـامی (بوخاریی) لەبارەی سوێندی (غەمووس)ـەوە ئەم فەرموودەیە ی هێناوە

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْكَبَائِرُ قَالَ الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ قَالَ ثُمَّ مَاذَا قَالَ ثُمَّ عُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ قَالَ ثُمَّ مَاذَا قَالَ الْيَمِينُ الْغَمُوسُ قُلْتُ وَمَا الْيَمِينُ الْغَمُوسُ قَالَ الَّذِي يَقْتَطِعُ مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ هُوَ فِيهَا كَاذِبٌ ) رواه البخاري

واتـە: سـوێندی (غـەمووس) یەکێکـە لـە تاوانـە گـەورەکان و لەبـەر گـەورەیی گوناحەکەی کەفارەتی بۆنادرێ، دەسا ئێوە خۆتانی لێ لادەن

سێیەم : سـوێندێکە کـەفارەتی بـۆ دەدرێ، ئەمـەیش ئەوەیـە کەکەسـێك بـەدەس ئەنقەس سـوێند ئـەخوا بـۆ کردنـی کارێـك یـا بـۆ نـەکردنی، لەپاشـان سـوێندەکەی ئەشکێنێ، دیارە ئەم جۆرە سوێندەیان لەم سوورەتەدا باسکراوە(رامان)

## ئایا چ جۆرە سوێندێك شەرعی یە؟

وەلاَم : دوو جۆرە سوێند خواردن ، سوێندی شەرعی و ناشەرعی

## ئایا ئەوەی سوێندی ناشەرعی بخوا كافر دەبیٚ؟

وەلاَم : كافر نابیٚ بەلاَم سیفەت و كردەوەی كافرانی لیٚ هاتووتە جیٚ ، وە ئەگەر كەسێك لە بیری چوو سوێندی بە غەیری خوا خوارد ، ئەبیٚ زوو پەشیمان بێتەوە و بلێ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) وەك لەم دەقدا هاتووە:

(مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ وَاللَّاتِ وَالْعُزَّى فَلْيَقُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ تَعَالَ أُقَامِرْكَ فَلْيَتَصَدَّقْ) صحيح البخاري

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : ئەوەی سوێندی خوارد ، لە سوێندەكەی گوتی سوێند بە (لات وعوززا) با پەشیمان بێتەوە وبلێ ( هیچ پەرستراوێك بەحەق نیە بپەرسترێت جگە لە خوا) وە هەر كەسێك بە برادەرەكەی بلێ وەرە با قومار بكەین، با خێرێك بكات و پەشیمان بێتەوە.

## هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٢٦ ) سورەتی البقره

(لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ ۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٢٢٦) البقره

واتە : سوێند دەخۆن لەگەلٚ ژنەكانیان نەنوون: ئەو كەسانەی سوێند دەخۆن لەگەلٚ ژنەكانیان دەس تێكەلٚ نەكەن و نەخەون هەتا چوار مانگ مۆلەتیان دەدریٚ بۆشكاندنی سوێندەكانیان و گەرانەوە بۆسەر جێگەی خەوتنیان ئینجا ئەگەر لەو

ماوەیـەدا گەرانـەوە لایـان و سـوێندەکانیان شـکاندو رێککـەوتن و چـوونەوە لای ژنـەکانیان، ئـەوە بێگومـان خـوا زۆر لێبـوردەو چاوپۆشـیکارو دلۆڤانـە، دەبـورێ لەوماوەیە.(رامان)

## ئایا (ئیلا) چییە؟

(الْإِيلَاءُ: الْحَلِفُ، فَإِذَا حلف الرجل أن لا يُجَامِعَ زَوْجَتَهُ مُدَّةً .....)

واتە: ئـیلا : ئـەو سـوێدەیە کـە پیاوێـك سـوێند دەخـوات بـۆ ماوەیـەك نەچـێتە لای خێزانی...

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ إِيلَاءُ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ وَأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، فَوَقَّتَ اللَّهُ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ، فَمَنْ كَانَ إِيلَاؤُهُ أَقَلَّ مِنْ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَلَيْسَ بِإِيلَاءٍ، وَقَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ: كَانَ الْإِيلَاءُ مِنْ ضِرَارِ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ، كَانَ الرَّجُلُ لَا يُرِيدُ الْمَرْأَةَ وَلَا يُحِبُّ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا غَيْرُهُ فَيَحْلِفُ أَنْ لَا يَقْرَبَهَا أَبَدًا، وَكَانَ يَتْرُكُهَا كَذَلِكَ لَا أَيِّمًا وَلَا ذَاتَ بَعْلٍ، فَجَعَلَ اللَّهُ تَعَالَى الْأَجَلَ الَّذِي يَعْلَمُ بِهِ مَا عِنْدَ الرَّجُلِ فِي الْمَرْأَةِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ) الْآيَةَ.) اسباب النزول القران للواحدي

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە ئەڵێ : سوێند خواردنی ئیلای سـەردەمی جـاهیلی سالێك و دوو ساڵ و زیاتریش بوو ، خواش کاتێکی بۆ دیاری کردن بریتی بوو لە (٤) مـانگ ، هـەر کەسـێك ئیلایەکـەی لـە چـوار مانگـان کـەمتر بـوو ئـەو ئـیلا نیـە، وە سەعیدی کوری موسـیب دەڵـێ (ئـیلا )لـە زیانـەکانی سـەردەمی نەزانییـە ، پیاوێـك

ئـافرەتێکی نەدەویسـت و حەزیشـی نـەدەکرد کەسـێکی دیکـە مـارەی بکاتـەوە ، سوێندی دەخوارد هەتا هەتایێ نزیکی نەکەوێتەوە ، ئەو ئافرەتەش نـەخاوەن مێـرد بوو ، نە پێوەژن ، خواش کاتێکی بۆ پیاوەکە دیاری کرد سەبارەت بە ئافرەتەکـەی کە چوار مانگە ، جا ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ)

## ئایا فەرقی سوێندی ( ایلا ) و ئەوانی دیکە چییە؟

کەمتر لە (٤) مانگ بە ایلا حساب ناکرێ ، بەلام (٤)مانگ وبەسەرەوە ایلایـە ، ئنجـا ئەگەر چوار مانگ تێپەری ، پیاوەکە پەشیمان نەبویەوە ، ئافرەتەکەی نەهێناوە،

ئافرەتەکە بۆی هەیـە جیابێتەوە،ئەگـەر دەسـت بـەرداری نـەبوو، قـازی پـێ تـەلاق دەدات ، ئەگەر ژنەکە سوو بوو لەسەر جیابونەوە

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٢٨ ) سورەتـی ( البقره )

(وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكۡتُمۡنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ أَرۡحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤۡمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنۡ أَرَادُوٓاْ إِصۡلَٰحٗاۚ وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٢٢٨) البقره

واتە: عیددەی ژنی تەڵاقدراو: ئەو ژنانـەی – پـاش چـوونە لایـان– تـەڵاق دران، تـا سێ پاکیی دەبـێ خۆیـان بگـرن ومێـرد نەکەنـەوە. (قـورء) لەسـەر قسـەی ئیمـامی شافیعی و ئیمامی مالیك پاکیە، یان دەڵێن: تـا سـێ حـەیز دەبیـنن ئەگـەر خـاوەن حـەیز بـوون لەسـەر وتـەی (ئـەبو حەنیفـە) و ئیمـامی (ئەحمـەد) دەبـێ دانیشـن، لەپاشان ئارەزووی خۆیانە شوو بکەنەوە، یان نا بۆ ئەو ژنە تەڵاقدراوانـە ڕەوا نییـە

ئەوەی خـوا خسـتوویەتە منداڵدانیانـەوە بیشـارنەوە، واتـە: ئەگـەر سـکیان پڕبـوو، وەیان لەحەیزدا بوون، نابێ کیتمـانی بکـەن، بـەڵکو دەبـێ هـەر راسـتییەکەی بڵێن ئەگەر باوەڕیان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە دەبێ کیتمانی هەق نەکەن مێردەکانیان لە پیاوانی تر خاوەن هەق ترن بۆ دیسان گەڕانەوە لایان، لەماوەی عیدەدا، تا ئەوە کە شوو بە یەکێکی تریکەن ئەگەر لەو ماوەیەدا بیانەوێ ئاشتیی بکەن و کاروبـاری خۆیان رێك وپێك بکەن، دیارە هەقی گەڕانەوە، بـۆ تەڵاقێکـە، کـە مـافی گەڕانـەوەی تێدا هەبێ ژنان هەرچـۆنێ ئـەرکی ژنانـەیان لەسـەرە، مـافی رەوای خۆشـیان لەسـەر پیاوان بەشێوەیەکی پەسەندی کۆمەڵگەی ئیسـلامیی هەیـە، واتـە: دەبـێ هـەردوولا مافـەکانی یـەکتر بپـارێزن و، کەسـێکیان سـتەم لـەویتریان نـەکات، ئەگـەر پیـاوان لەسەریان بێت مارەییان بدەن و، ژیان و ژیـواری باشـیان بـۆ پەیداکـەن و، قـەتیش ئەزیەت وئازاریان نەدەن، هەروایش دەبێ ژنان ریعایەتی حاڵ و ژیانی مێردەکانیـان بکەن و، ڕووخۆش و، ڕوو گەشبن لەتەکیانـداو، زیـادەرەوو(موسـریف) نـەبن لـەهیچ کارێکیاندا زیاد لەمەیش پیـاوان پلەیـەکیان بەسـەر ژنانـەوە هەیـە. (سـەید قوتـب) ئەڵێ: ئەو پلە زیادەیە کە بۆ پیاوان هەیە ئەوەیە کە دەتوانێ دوای تەڵاقدان ژنەکـە بگێڕێتەوە ژێر رکێفی خۆی، بەڵام ئافرەتەکـە نـاتوانێ ئـەو کـارە بکـات، ئەگەرچـی هەندێ لـەزانایان دەڵـێن ئەوپلەیـە هەرئـەو(قەووامـە)یـە کەلـە سـوورەتی (نیسـا)دا باسکراوە، خۆئەگەر گریمان ئەمەیش بێت، دیارە کە ئەوپلەیە پلەی (تـەکلیف)ــە نەك (تەشریف)، وەخواش دەسەڵاتدارو زاڵە، لە کارزان و کار بەجێیە. چـونکە مـافی بە ژنان بەخشیی، پاش ئەوەی کە وەك کوتاڵ و کەل و پەل سەیر ئەکران (رامان)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ بْنِ السَّكَنِ الْأَنْصَارِيَّةِ، أَنَّهَا طُلِّقَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَكُنْ لِلْمُطَلَّقَةِ عِدَّةٌ فَأَنْزَلَ اللهُ جَلَّ ثَنَاؤُهُ حِينَ طُلِّقَتْ أَسْمَاءُ بِالْعِدَّةِ لِلطَّلَاقِ فَكَانَتْ أَوَّلَ مَنْ أُنْزِلَ فِيهَا الْعِدَّةُ لِلطَّلَاقِ)رواه البيهقي وابوداود وقال الالباني حسن

واتە : لە ئەسمای کچی یەزیدی کوڕی سەکەنەی ئەنصاریەوە هاتووە : کە ئەویان تەلاّق داوە لە سەردەمی پێغەمبەر ،وەبۆ ئافرەتی تەلاق دراو ماوە نەبوو ، جا کاتێ تەلاّق درا، خوا ئایەتی بۆ دابەزاند ، ئەو ئافرەتە یەکەمین کەسە کە ئایەتی بۆ دابەزی بۆ دیاریکردنی عیددە

### ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٢٩) سوڕەتی (البقرە)

(ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ............ ٢٢٩)

واتە: تەڵاق سیانەو، ژن دوو کەڕەت دەهێنرێتەوە: ئەو تەڵاقە کەمێرد بتوانێ تێیدا ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆلای خۆی تەنها دووکەڕەتە ئینجا دوایی (بۆ سێیەم جار) یائەبێ بەیاسایەکی چاك و قەشەنگ و، بە گوزەرانێکی پەسەند رابگیردرێ و، ئیتر تەڵاق بەدەمیا نەیەت، یان بەشێوەیەکی باش و بێهەرا دەس لێك بەردانە...... )

## ئايا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١ –(عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثُمَّ ارْتَجَعَهَا قَبْلَ أَنْ تَنْقَضِيَ عِدَّتُهَا كَانَ ذَلِكَ لَهُ، وَإِنْ طَلَّقَهَا أَلْفَ مَرَّةٍ، فَعَمَدَ رَجُلٌ إِلَى امْرَأَةٍ لَهُ فَطَلَّقَهَا ثُمَّ أَمْهَلَهَا حَتَّى إِذَا شَارَفَتِ انْقِضَاءَ عِدَّتِهَا ارْتَجَعَهَا ثُمَّ طَلَّقَهَا، وَقَالَ: وَاللَّهِ لَا آوِيكِ إِلَيَّ وَلَا تَحِلِّينَ أَبَدًا. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) الواحدي ، وقال المحقق كمال بسيوني زغلول : أخرجه الترمذي في كتاب الطلاق (١١٩٢ مكرر) وأخرجه مالك في الموطأ ص ٥٨٨ وأخرجه ابن جرير (٢/ ٢٧٦) – وذكره ابن كثير في تفسير هذه الآية. وزاد السيوطي نسبته في الدر (١/ ٢٧٧) للشافعي وعبد بن حميد وابن أبي حاتم والبيهقي في سننه.

واتە: هیشامی کوڕی عوروەوە هاتووە دەڵێ : ئەگەر پیاوێك ژنی تەلاق دابایە ، دوای گێرابایەوە پێش عیددە تەواو بوون ئەمەی بۆ هەبوو ئەگەر سەد جار تەلاقی دابایە ، پیاوێك ژنی خۆی تەلاقدا تاکو نزیکی عیددە تەواو بوون دوای گێرایەوە ، دووبارە تەلاقی دایەوە، وە گوتی سوێند بەخوا نەدەت گێرمەوە لای خۆم ، وەهەرگیز بەرەڵاَت ناکەم ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)

٢ –( عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا أَتَتْهَا امْرَأَةٌ فَسَأَلَتْهَا عَنْ شَيْءٍ مِنَ الطَّلَاقِ، قَالَتْ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لرسول الله – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – قال: فَنَزَلَتْ: (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) الواحدي : وقال المحقق كمال بسيوني زغلول أخرجه الترمذي في الطلاق (١١٩٢) وسياقه أتم، وأعقبه بحديث مثله عن هشام بن عروة ولم يذكر فيه عن عائشة وقال: وهذا أصح من حديث يعلى بن شبيب ا. هـ. وأخرجه الحاكم في المستدرك (٢/ ٢٧٩– ٢٨٠) وصححه ووافقه الذهبي قلت: في تصحيح هذا

الحديث نظر لأن في إسناده عند الحاكم يعلى بن شبيب، وقد قال الحافظ في التقريب (٢/ ٣٧٨) : لين الحديث، والحديث أخرجه البيهقي في السنن (٧/ ٣٣٣) ، وذكره السيوطي في لباب النقول (ص ٤٤) ، وزاد نسبته في الدر (١/ ٢٧٧) لابن مردويه.

واته: له عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووه دەڵێ: ئافرەتێکم هاته لام، پرسیاری تەلاقی لێ کردم ، منیش بۆ پێغەمبەرم باس کرد ، جا ئەم ئایەتە دابەزی (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)

*********************************

## وتاری ژماره (١٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٣٢) سورەتی (البقره)**

**(وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ٢٣٢) البقره**

**(عضل :اي منع)**

واتە : ئەگەر پیاو تەڵاقێکی ژنەکەی داو عیددەی ئافرەتەکە تەواو بوو، ئیتر ئەو پیاوە ناتوانێت ژنەکەی بگێڕێتەوە _وەکو لە تەڵاقی (رجعی)دا وایە_ بەڵکو دەبێت سەر لەنوێ بە مارەییەکی تازەوە مارەی بکاتەوە.. ئینجا وا بووە کەسێك ژنەکەی تەڵاقداوە، دوای بەسەر چوونی عیددەکەی هەردوولا ویستویانە بە مارەییەکی تازەوە بگەنەوە بەیەك، بەڵام کەسوکاری ئافرەتەکە قایل نەبوون، جا لەم بارەیەوە خودا دەفەرموێت: کە ژنتان تەڵاقداو عیددەیان تەواو بوو، ئەگەر ویستیان شوویکەنەوە بە مێردی پێشوویان _ بەو مەرجەی خۆیان لەگەڵ یەك ڕێکەوتبن_ ئێوە ڕێگایان لێ مەگرن.. کەسێك شوێنی ئەم بڕیارو فەرمانە دەکەوێت کە باوەڕی بە خوداو و بە ڕۆژی دوایی هەبێت و، پابەند بوون بەو بڕیارو ڕێنماییانە خێری خۆتانی تێدایە.. خودا دەزانێت کەچی باشەو چی باش نیە، ئێوە نازانن. تەڵاقدانی ژن بە تەڵاقێك و گێڕانەوە(موراجەعە)ی پێش تەواو بوونی کاتی عیددەکەی پێی دەوترێت: تەڵاقی(رجعی) .. بەڵام ئەگەر هاتوو عیددەکە تەواو بوو ئیتر پێی دەوترێت: تەڵاقی (بائنە)ی گچکەو، بە مارەکردنێکی تازە نەبێت، ئەو پیاوو ژنە لە یەکتر حەڵاڵ نابن.

....ڕێیان لێ مەگرن ....تەلاقی یەکەم یان دووەم

تێبینی : ڕێگا گرتن لە ئافرەتی تەلاقدراو حەرامە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-عَنْ مَعْقِلِ بْنُ يَسَارٍ الْمُزَنِيُّ أَنَّهَا نَزَلَتْ فِيهِ قَالَ: كُنْتُ زَوَّجْتُ أُخْتًا لِي مِنْ رَجُلٍ، فَطَلَّقَهَا حَتَّى إِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهَا جَاءَ، فَخَطَبَهَا، فَقُلْتُ لَهُ: زَوَّجْتُكَ وَأَفْرَشْتُكَ وَأَكْرَمْتُكَ، فَطَلَّقْتَهَا، ثُمَّ جِئْتَ تَخْطُبُهَا، لَا وَاللهِ لَا تَعُودُ إِلَيْهَا أَبَدًا قَالَ: وَكَانَ رَجُلًا لَا بَأْسَ بِهِ وَكَانَتِ امْرَأَتُهُ تُرِيدُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ قَالَ: فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ هَذِهِ الْآيَةَ، فَقُلْتُ: الْآنَ أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللهِ فَزَوَّجْتُهَا إِيَّاهُ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتە: لە مەعقیلی کوڕی یەساری موزنی هاتووە ئەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی من دابەزیوە

ئیمامی (بوخاریی) لە(مەعقەلی کوڕی یەسار)ـە وە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: مەعقەل خوشکەکەی خۆی لە پیاوێکی موسڵمان مارە کرد، ئەوجا پاش ماوەیەك تەڵاقی داو، عیدەیشی بەسەرچوو، پاشان حەزیان لەیەککردەوەو پیاوەکە ڕۆیشت لە (مەعقەل)ی برای ژنەکە خوازبێنی کردەوە، ئەویش پێیگوت: بڕۆ ئەی ڕژدو چروك! من وەختی خۆی ژنم پێدایت تۆ تەڵاقت دا! سوێند بەخوا هەرگیز ناگەڕێتەوە لات، ئەوسا خوای گەورەش ئایەتی:ی نارد، چونکە خوای گەورە دەیزانی کەئەو ژن وپیاوە پێویستیان بەیەکتر هەیە، جاکاتێکیش (مەعقەل) ئایەتەکەی بیست وتی: خوایە ئەوا بیستم و فەرمانتم بەجێ هێنا، لەپاشان کابرای بانگکردو خوشکەکەی بۆ مارەکردەوە.

٢-وفي روايه ( عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّهُ زَوَّجَ أُخْتَهُ رَجُلًا مِنَ المُسْلِمِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَانَتْ عِنْدَهُ مَا كَانَتْ، ثُمَّ طَلَّقَهَا تَطْلِيقَةً لَمْ يُرَاجِعْهَا حَتَّى انْقَضَتِ العِدَّةُ، فَهَوِيَهَا وَهَوِيَتْهُ، ثُمَّ خَطَبَهَا مَعَ الخُطَّابِ، فَقَالَ لَهُ: (يَا لُكَعُ أَكْرَمْتُكَ بِهَا وَزَوَّجْتُكَهَا فَطَلَّقْتَهَا، وَاللَّهِ لَا تَرْجِعُ إِلَيْكَ أَبَدًا آخِرُ مَا عَلَيْكَ ، قَالَ: (فَعَلِمَ اللَّهُ حَاجَتَهُ إِلَيْهَا، وَحَاجَتَهَا إِلَى بَعْلِهَا)، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: تَبَارَكَ وَتَعَالَى (وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ) (البقرة: ٢٣١)- إِلَى قَوْلِهِ – (وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ) (البقرة: ٢١٦) فَلَمَّا سَمِعَهَا مَعْقِلٌ قَالَ: (سَمْعًا لِرَبِّي وَطَاعَةً)، ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ: (أُزَوِّجُكَ وَأُكْرِمُكَ) (رواه أبو داود والترمذي وابن ماجه واللفظ للترمذي). قال الالباني صحيح

تێبینی : ١-(لكع) واته : ناكەس بەچە ٢-مەعقيل كەفارەتی سوێندی دا خوشكەكەی دايەوە

## هۆی دابەزینی ژماره ( ٢٣٦ ) له سوره‌تی ( البقره )

**﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِن طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمۡ تَمَسُّوهُنَّ أَوۡ تَفۡرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلۡمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلۡمُقۡتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعَۢا بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٢٣٦﴾ البقره**

واته: گوناهتان لەسەر نی یە ئەگەر ژنانێك تەڵاق بدەن كە هێشتا نەچووبنە لایان یا مارەیتان بۆ دانەنەبن وە بەهرەمەندیان بكەن (شتێكیان لەماڵی خۆتان بدەنێ) دەوڵەمەند بەپێ ی خۆی وە هەژار بەپێ ی خۆی بەهرەو یارمەتی دانێك كە باو و نەریت بێت ئەوە پێویستە لەسەر چاكەكاران.(پوختەی تەفسیر)

(عن ابن زيد قال لما نزلت ومتعوهن على الموسع قدره وعلى المقتر قدره متاعا بالمعروف حقا على المحسنين قال رجل إن أحسنت فعلت وإن لم أرد ذلك لم أفعل

فأنزل الله وللمطلقات متاع بالمعروف حقا على المتقين) لباب المنقول والعجاب والدر المنثور

واته: كاتێ ئەم ئایەتە دابەزی پیاوێك گوتی : ئەگەر كاركارم ئەم كارە دەكەم ، وە ئەگەر وەلامی نەدەمەوە كارەكە ناكەم، جا ئەم ئایەتە دابەزی (وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعُۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ٢٤١) واتە: بۆ تەلاق دراوان هەیە(بەسەر مێردەكانیانەوە) بەهرەمەند كردن بەباشی (ئەوە) پێویستە لەسەر پارێزكاران.

**٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٣٨ ) سورەتی ( البقره )**

(حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨) البقره

واتە : ئاگاداری نوێژەكانتان بكەن وە(بەتایبەتی) نوێژی ناوەڕاست(كە نوێژی عەسرە) وە لە نوێژدا بوەستن بۆ خوا بەگەردن كەچی واتە بێ قسەكردن.

<u>تێبینی</u> : واتە نوێژان بپارێزن لە رووی ١-كاتەوە ٢- لە رووی رواڵەتەوە ٣-لە رووی ناوەرۆكەوە ٤- لە رووی داخوازیەكانی نوێژە كە چاكەیە .

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِي الصَّلَاةِ يُكَلِّمُ أَحَدُنَا أَخَاهُ فِي حَاجَتِهِ حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ) رواه البخاري

واتە: لە زەیدەی كوڕی ئەرقەمەوە هاتووە دەڵێ: ئێمە لە ناو نوێژدا قسەمان لەگەڵ یەكتری دەكرد ، بۆ ئیش وكارەكان تاكو ئەو ئایەتە دابەزی وفەرمووی (حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ) واتە: پارێزگاری نوێژەكانتان

بکەن ، بەتایبەتی نوێژی عەسر ، وە بۆ خـوا ملکـەچ بـن ،  جـا فـەرمانمان پـێ کـرا لەناو نوێژدا بێ دەنگ بین. لەبەر ئەوەی پێغەمبەر لەبارەی نوێژ فەرموویەتی:

(إِنَّ هَذِهِ الصَّلَاةَ لَا يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلَامِ النَّاسِ، إِنَّمَا هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ ) رواه مسلم

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : ئەو نوێژە دروست نیـە خـەڵکی قسـەی تێـدا بکـات ، چونکە ئەو نوێژە بریتیە لە تەسبیحات و (الله اكبر) و خوێندنی قورئان.

## ئایا نوێژی ناوەراست کامە نوێژە؟

(عن عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ، فَقَالَ: (مَلَأَ اللَّهُ بُيُوتَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا كَمَا شَغَلُونَا عَنْ صَلَاةِ الْوُسْطَى حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ) وَهِيَ صَلَاةُ الْعَصْرِ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ ومُسْلِمٌ

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هـاتووە خـوا لێـی رازی بـێ دەڵـێ: لـە جـەنگی خەندەق لەگەڵ پێغەمبەردا بـووین ، بەخەنـدەق لێـدان سـەرقاڵ بـووین ، پێغەمبـەر فـەمووی خـودا گۆریـان پـڕ ئـاگر بکـات ، چـۆن ئێمـەیان بـێ ئاگـا کـرد لـە نوێـژی ناوەراست تاکو رۆژ ئاوا بوو) ئەو نوێژەش نوێژی عەسر بوو.

وە راش هەیە دەڵێ نوێژی نیوەرۆیە : وەك لەم دەقدا هاتووە

وَعَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ وَلَمْ يَكُنْ يُصَلِّي صَلَاةً أَشَدَّ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهَا فَنَزَلَتْ (حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى) وَقَالَ إِنَّ قَبْلَهَا صَلَاتَيْنِ وَبَعْدَهَا صَلَاتَيْنِ) رَوَاهُ أَحْمد وَأَبُو دَاوُد قال الالباني (صَحِيح)

واتە: لە زیدی کوڕی سابیتەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر نوێژی نیوەڕۆی کرد لە (هاجیرە) نوێژێکی زۆر سەختە بوو لەسەر هاوەڵان ، جا ئەم ئایەتە دابەزی (حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى) وە گوتی ئەم نوێژە دوو نوێژی لە پێشن و دوو نوێژی لە پاشن.

وقيل: إنها (صلاة العصر) وهو قول أكثر علماء الصحابة وجمهور التابعين) ابن كثير

وە گوتراوە :ئەو نوێژە نوێژی عەسرە ، ئەوە قسەی زۆربەی زانایانی صەحابەیە و قسەی جەماوەری تابیعینە.

## گرنگی نوێژی عەسر:

ئەوەی نوێژی عەسر بفەوتێنێ کردەوەکان پوچەڵ دەبنەوە ، وەك لەم دەقدا هاتووە

١-(مَنْ تَرَكَ صَلَاةَ الْعَصْرِ حَبِطَ عَمَلُهُ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : هەرکەسێ نوێژی عەسر بفەوتێنێ کردەوەکانی پوچەڵ دەبنەوە

٢-(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ الَّذِي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ) رواه البخاري ومسلم

واتە: لە عەبدولای کوڕی عومەرەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی : ئەوەی نوێژی عەسری بفەوتیَ وەکو کەسێکە کە کەس وکارو سامانی لە ناو چووە

قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ يَتِرَكُمْ وَتَرْتُ الرَّجُلَ إِذَا قَتَلْتَ لَهُ قَتِيلًا أَوْ أَخَذْتَ لَهُ مَالًا ) البخاري

باوکی عبدالله دەڵێ (يَتِرَكُمْ) واتە: پیاوێکت لێ کوشتوە یان ماڵ وسامانت لێ ساندوە.

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٥٥ ) سورەتی ( البقره )

(ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ) البقره

واتە : (الله) كە بێ وێنەو بێ هاوتایەو خاوەنی هەموو سیفاتی كامڵە، جگە لەو هیچ پەرستراوێكی تری ڕاستەقینە نیە، هەر ئەوە هەمیشە زیندووی ڕاستە قینەو، ڕاگیركاری بوونەوەرو بەڕێوەبەری كاروباری دوروستكراوەكانی خۆیەتی و ڕاوەستاوە بەزاتی خۆیەوە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عن ابْنِ عَبَّاسٍ قال : أَنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ قَالُوا: يَا مُوسَى هَلْ يَنَامُ رَبُّكَ؟ قَالَ: اتَّقُوا اللَّهَ، فَنَادَاهُ رَبُّهُ عزَّ وجلَّ: يَا مُوسَى سَأَلُوكَ هَلْ يَنَامُ رَبُّكَ؟ فَخُذْ زُجَاجَتَيْنِ بِيَدَيْكَ فَقُمِ اللَّيْلَ، فَفَعَلَ مُوسَى صَلَّى اللَّهُ عَلَى نَبِيِّنَا وَعَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَلَمَّا ذَهَبَ مِنَ اللَّيْلِ ثُلُثٌ نَعَسَ، فَوَقَعَ لِرُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ انْتَعَشَ فَضَبَطَهُمَا، حَتَّى إِذَا كَانَ آخِرُ اللَّيْلِ نَعَسَ، فَسَقَطَتِ الزُّجَاجَتَانِ فَانْكَسَرَتَا، فَقَالَ: يَا مُوسَى، لَوْ كُنْتُ أَنَامُ لَسَقَطَتِ السَّمَاوَاتُ عَلَى الْأَرَضِينَ فَهَلَكَتْ كَمَا هَلَكَتِ الزُّجَاجَتَانِ بِيَدَيْكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ) (رواه ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ) تفسير ابن كثير ، (وهذا موقوف حسن الاسناد ، اسباب النزول للشيخ محمود المصري

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : نەوەی ئیسرائیل گوتیان ئەی موسى ئایا خوای تۆ دەخەوێ ؟ موسى گوتی لە خوا بترسن ، خواش بانگی موسى كرد فەمووی ئەی موسى پرسیاریان لێ كردی ئایا خوای تۆ دەخەوێ؟ تۆش دوو شووشە لە دەست بگرە وشەو هەستەوە شەونوێژ بكە، موساش وایكرد سەلات و سەلامی خوا لە پێغەمبەری ئێمەوموسى بێت، كاتێ سێیەكی شەو ڕۆیشت موسى بۆرژا(خەوی هات) بەسەرچۆكدا هات ، وخۆی گرتەوە وبەئاگا هاتەوە توند شووشەكانی گرتنەوە ، تاكو گەیشتە كۆتایی شەو بۆرژا ، هەردوو شووشەكەی لە دەست كەوتنە خوارەوە وشكان ، خوا فەرمووی ئەی موسى ئەگەر من بخەوم ، ئاسمانەكان دەكەونە سەر زەوی لەناو دەچن وەك چۆن شووشەكان لە ناو چوون وشكان . خوا (ایە الكرسى) دابەزاند بۆ پێغەمبەرەكەی .

**دوو فەرموودە لەم بارەوە:**

عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَنَامُ وَلَا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ يَخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ حِجَابُهُ النُّورُ لَوْ كَشَفَهَا لَأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ كُلَّ شَيْءٍ أَدْرَكَهُ بَصَرُهُ ثُمَّ قَرَأَ أَبُو عُبَيْدَةَ أَنْ بُورِكَ مَنْ فِي النَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) سنن ابن ماجه قال الالباني صحيح

( عَنْ أَبِي مُوسَى، قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَرْبَعٍ: (إِنَّ اللهَ لَا يَنَامُ وَلَا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، يَرْفَعُ الْقِسْطَ وَيَخْفِضُهُ، وَيُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ النَّهَارِ بِاللَّيْلِ، وَعَمَلُ اللَّيْلِ بِالنَّهَارِ) روه مسلم

واتە: هەرگیز دەست نادا خوای گەورە بخەوێ، خوا هەندێ جار تەرازووی دادی خۆی بەرەو خوار نەوی دەكا (بەرزق و رۆزی بۆ زەویی) هەندێ جاریش هەڵی

دەبڕێ بەرەولای خۆی (بە بەرزکردنەوەی کردەوەی مرۆیەکان) وە کاروکردەوەی شەو، پێش کاروکردەوەی ڕۆژ بڵند دەکرێ و سەر دەخرێ، هی ڕۆژیش پێشکردەوەی شەو، وەتەنیا پەردەو لەمپەرێك هەبێ بۆدیتنی خوا، هەر ئەوەیەکە ئەگەر ئەو پەردەیە لابدرێ بۆ بینینی خوا، ئەوا نووری روخساری خوای گەورە دەیسووتێنێ

**فەزل وگەورەیی ( ایە الكرسی ) :**

١-ئەم ئایەتە باسی گەورەیی ناو وسیفاتەکانی خوا دەکات .

٢-ئەوەی شەوان ئەم ئایەتە بخوێنی خوا پاسەوانێکی بۆ دادەنێ تاکو بەیانی ، وە لەشەڕی شەیتان پارێزراو دەبێ. (دەقەی ئەم فەرموودە لە وتارەی ژمارە (٣)

٣-ئەوەی دوای نوێژە فەرزەکان ئەم ئایەتە بخوێنێ ، پێغەمبەر فەموویەتی دەچێتە بەهەشت.

**********************

## وتاری ژماره (٢٠) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٥٤) سورەتی (البقره)

(لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٥٦) البقره

واته : بەهیچ جۆرێك زۆر كردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا (دینداری بەزۆر نابێت بكرێت و دین بەزۆر نادرێت بەسەر كەسدا)، چونكە بەڕاستی ڕێبازی چاك و دروست ڕوون و ئاشكرا بووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەركەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغوت ـ (كە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێك)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوكەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆكاری ڕزگاریەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ كەوتووە، كە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەكی بۆ نی یە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە.(ئاسان)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

### یەكەم : بۆ ئەو منداڵانەی لەلای جوولەكەكان بوون:

١-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَتْ الْمَرْأَةُ تَكُونُ مِقْلَاتًا فَتَجْعَلُ عَلَى نَفْسِهَا إِنْ عَاشَ لَهَا وَلَدٌ أَنْ تُهَوِّدَهُ فَلَمَّا أُجْلِيَتْ بَنُو النَّضِيرِ كَانَ فِيهِمْ مِنْ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ فَقَالُوا لَا نَدَعُ أَبْنَاءَنَا

فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنْ الْغَيِّ) قَالَ أَبُو دَاوُد الْمِقْلَاتُ الَّتِي لَا يَعِيشُ لَهَا وَلَدٌ) (أخرجه ابو داود والنسائي) قال الالباني صحيح

واته: لەئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: هەندێ ئافرەت منداڵیان بۆ نەدەژیا ، ئەوانیش لەسەر خۆیان پێویست دەکرد ئەگەر منداڵیان بۆ بژی بیکەنە جوولەکە ، جا کاتێ جوولەکەی بەنو نەزیریان وەدەرنا ، منداڵی ئەنصارەکانیان لەگەڵ بوو ، گوتیان لێ ناگرێن منداڵی ئێمە لەگەڵ ئەوان بڕوات ، جا خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنْ الْغَيِّ) واتە : تۆبزی لە ئایین نیە، ڕێگای ڕاست لە هی چەوت جیابۆتەوە.

(أُجْلِيَتْ) واتە : وەدر نران لە مەدینە

وفي رواية، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِهِ: (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) (البقرة: ٢٥٦)، قَالَ: كَانَتَ الْمَرْأَةُ مِنَ الْأَنْصَارِ لَا يَكَادُ يَعِيشُ لَهَا وَلَدٌ، فَتَحْلِفُ: لَئِنْ عَاشَ لَهَا وَلَدٌ لَتُهَوِّدَنَّهُ، فَلَمَّا أُجْلِيَتْ بَنُو النَّضِيرِ إِذَا فِيهِمْ نَاسٌ مِنْ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ، فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَبْنَاؤُنَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ هَذِهِ الْآيَةَ: (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) (البقرة: ٢٥٦) قَالَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ: فَمَنْ شَاءَ لَحِقَ بِهِمْ، وَمَنْ شَاءَ دَخَلَ فِي الْإِسْلَامِ.) رواه ابن حبان قال شعيب الأرنؤوط إسناده صحيح على شرطهما.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: مانای ئایەتی (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) ئافرەتی ئەنصاریەکان ئەگەر منداڵیان بۆ نەژیابایە ، سوێندیان دەخوارد ، ئەگەر منداڵیان بۆ بژێ، ئەیکەنە بە جوولەکە، کاتێ جوولەکەی بەنو نەزیر دەکران، چەند کوڕێکی ئەنصارەکانیان لابوون، ئەنصارەکان گوتیان : ئەی نێرراوی خوا منداڵەکانمان لەلای ئەوانن چی بکەین جا ئەم ئایەتە دابەزی (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) سەعیدی کوڕی

جـوبير دەڵـێ: منداڵـەکان ئـازاد کـران ئـەوەی حـەزی کـرد لەگـەڵ ئـەوان ڕۆیشـت ، ئەوەی حەزی کرد هاتەوە ناو ئیسلام.

**دووەم: بۆ منداڵانەی لەلای گاوران بوون:**

٢-( وَقَالَ مَسْرُوقٌ: كَانَ لِرَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ مِنْ بَنِي سَالِمِ بْنِ عَوْفٍ ابْنَانِ فَتَنَصَّرَا قَبْلَ أَنْ يُبْعَثَ النَّبِيُّ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - ثُمَّ قَدِمَا الْمَدِينَةَ فِي نَفَرٍ مِنَ النَّصَارَى يَحْمِلُونَ الطَّعَامَ فَأَتَاهُمَا أَبُوهُمَا فَلَزِمَهُمَا وَقَالَ: وَاللَّهِ لَا أَدَعُكُمَا حَتَّى تُسْلِمَا فَأَبَيَا أَنْ يُسْلِمَا فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله أَيَدْخُلُ بَعْضِي النَّارَ وَأَنَا أَنْظُرُ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ - عَزَّ وَجَلَّ - (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ) فَخَلَّى سَبِيلَهُمَا) اسباب النزول /للواحدي ،و رَوَاهُ ابْنُ جَرِيرٍ والسدي ، ما أخرجه ابن جرير (٢/١٠) من طريق ابن إسحاق بسنده عن ابن عباس رضي الله عنهما: أنها نزلت في رجل من الأنصار من بني سالم بن عوف يقال له "الحصين" كان له ابنان نصرانيان وكان هو رجلا مسلما فقال للنبي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ألا أستكرههما؟ فإنهم قد أبيا إلا النصرانية فأنزل الله الآية. وسنده حسن وبذا يثبت أصل الرواية ويكون لهذه الآية سببا نزول.

واتە: مەسروق دەڵێ : پیاوێکی ئەنصار لە بەنی سالیمی کوڕی عـەوف دوو منـداڵی ببوونـە گـاور پـێش ئـەوەی پێغەمبـەر ڕەوانـە بکـرێ، دوای هاتنـە مەدینـە لەگـەڵ گاورەکان خواردنیان هێنابوو بۆ فرۆشتن ، باوکیـان چـوو هـەردوکی گـرتن ، گـوتی سوێند بەخوا وازتان لێ ناهێنم تاکو موسڵمان دەبـن ، ئـەوانیش گوتیـان موسـڵمان نابین ، کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەر ، باوکیان گوتی ئەی نێرراوی خوا ئایا چۆن دەبێ من بەشێکم بچێتە ناو ئاگر و منیش تەماشایان بکەم ، جا خـوا ئـەم ئایەتـەی

دابەزاندو فەرمووی (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ) جا باوکیان رێگای بردان ووازی لیٚ هێنان.واتە: تۆبزی لە ئایین نیە

## هۆی دابەزینی ژمارە (٢٦١) لە سورەتی (البقرە)

**(مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٢٦١)**

واتە: وێنەی(خێری) ئەوانەی کە ماڵی خۆیان بەخت دەکەن لە ڕیٚ ی خوادا وەك دەنکێك(تۆو) وایە (ڕوابێت) و حەوت گوڵی گرتبێت لەهەر گوڵێك سەد دانەی تێدا بێت وە خوا لەمەش زیاتری دەکات بۆ هەر کەسێك کە خۆی بیەوێت وە خوا خاوەن بەهرەی فراوانی ئاگادارە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(حَدَّثَنَا أَبُو عُمَرَ الدُّورِيُّ حَفْصُ بْنُ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ الْمُقْرِئُ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْمَاعِيلَ الْمُؤَدِّبُ، عَنْ عِيسَى بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ مِثْلُ: (مَثَلُ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ) (البقرة:٢٦١) قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَبِّ زِدْ أُمَّتِي فَنَزَلَتْ: (مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافاً كَثِيرَةً) (البقرة:٢٤٥) قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "رَبِّ زِدْ أُمَّتِي فَنَزَلَتْ: (إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ) (الزمر:١٠) رواه ابن حبان قال المحقق: شعيب الأرنؤوط حفص بن عمر بن عبد العزيز لا بأس به، وأبو إسماعيل المؤدب –وهو إبراهيم بن سليمان بن رزين– صدوق يغرب، وعيسى بن المسيب ذكره

المؤلف في "الثقات" ٧/٢٣٢، وقال: من أهل مكة،وأخرجه ابن أبي حاتم فيما ذكره ابن كثير ١/٤٤٢ عن أبي زرعة، عن إسماعيل بن إبراهيم بن بسام، عن أبي إسماعيل المؤدب، بهذا الإسناد.،وأخرجه ابن مردويه فيما قاله ابن كثير أيضاً ١/٤٦٩ عن عبد الله بن عبيد الله بن العسكري البزار، عن الحسن بن علي بن شعيب، عن محمود بن خالد الدمشقي، عن أبيه، عن عيسى بن المسيب، به.وأورده السيوطي في "الدر المنثور" ١/٧٤٧، وزاد نسبته إلى ابن المنذر والبيهقي في "شعب الإيمان". ، واما الالباني قال ضعيف

واتە: کاتێ فەرمایشتی خوا (مَثَلُ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ) دابەزی پێغەمبەر فەرمووی : خوا بۆ ئوممەتم زیاد بکە، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافاً كَثِيرَةً) جادیسان پێغەمبەر فەرمووی خوا بۆ ئوممەتەکەم زیاد بکە جا ئەو ئایەتە دابەزی (إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ)

تێبینی : پێم باش بوو قسەی هەردوو (محقق) نەقل بکەم

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٦٧ ) سورەتی ( البقرە )

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ٢٦٧) البقرە

واتە : لەماڵی پاك و حەڵاڵ ببەخشن: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ! لەو ماڵە چاك وپاکە کە لە ڕێگەیەکی پەسەندوو حەڵاڵەوە بەدەستتان هێناوە، لەوەش کە

لەزەوی دەرمانخستووە بۆتان ببەخشن وە هەروەها لەو بەروو بووانەش لەزەوییـدا بۆمان رواندون بەدوای بەخشینی شتێکی ناپوخت و بیّ کەڵکی وادا مەگەڕێن، واتـە: مەچن خراپەکەی لیّ جیا بکەنەوەو بیدەن لەرێگەی خوادا لەکاتێکدا –خۆخۆشـتان بن– لـەباتی ئەوهـەژارە گـەر چاوپۆشـی نەکـەن وەری نـاگرن، باشـە! ئـەی خـوای گـەورە– کـە لەهـەموو شـتێك بێنیـازە – چـۆن وەری دەگـریٚ؟ چـاك بشـزانن کـە بەراستیی خوا لەگشت بەخشینێکی ئێوە دەوڵەمەندو بیّ نیـازەو، کەڵکەکەیشـی بـۆ خۆتان دەگەڕێتەوە، سوپاس کراویشە، تەنها هەر ئەویش شـایەنی سوپاسـە، واتـە: بوونەوەر گشت پێویستی بەوە

تێبینی: (کسبتم)له رێگای بازرگانی (اخرجنا) له رێگای کشـتوکال. (وَلَا تَيَمَّمُواْ) ولا تقصدوا)مەبەستان نەبیّ لیّ مەخەفتن واتە لە هی خراپ مەگەڕێن ....

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە سیّ گێرانەوە هەیە

١–( عَنِ البَرَاءِ، (وَلاَ تَيَمَّمُوا الخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ) قَالَ: نَزَلَتْ فِينَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ، كُنَّا أَصْحَابَ نَخْلٍ فَكَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي مِنْ نَخْلِهِ عَلَى قَدْرِ كَثْرَتِهِ وَقِلَّتِهِ، وَكَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي بِالقِنْوِ وَالقِنْوَيْنِ فَيُعَلِّقُهُ فِي الْمَسْجِدِ، وَكَانَ أَهْلُ الصُّفَّةِ لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ، فَكَانَ أَحَدُهُمْ إِذَا جَاعَ أَتَى القِنْوَ فَضَرَبَهُ بِعَصَاهُ فَيَسْقُطُ مِنَ البُسْرِ وَالتَّمْرِ فَيَأْكُلُ، وَكَانَ نَاسٌ مِمَّنْ لاَ يَرْغَبُ فِي الخَيْرِ يَأْتِي الرَّجُلُ بِالقِنْوِ فِيهِ الشِّيصُ وَالحَشَفُ وَبِالقِنْوِ قَدْ انْكَسَرَ فَيُعَلِّقُهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَلاَ تَيَمَّمُوا الخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلاَّ أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ) قَال: لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أُهْدِيَ إِلَيْهِ مِثْلُ مَا أَعْطَى، لَمْ يَأْخُذْهُ إِلاَّ عَلَى إِغْمَاضٍ أَوْ حَيَاءٍ. قَالَ:

فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ يَأْتِي أَحَدُنَا بِصَالِحِ مَا عِنْدَهُ) رواه الترمذي وابن ماجه والواحدي في اسباب النزول القران  قال الالباني صحيح

واته: له بەراوه هاتووه دەڵـێ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَلاَ تَيَمَّمُوا الخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلاَّ أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ) ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمەی ئەنصارەکان دابەزیوە ، ئێمە خاوەن دارخورما بووین ، وە خەڵكی خێری دەكرد بە خورما زۆری هەبوایە بە زۆری دەكردە خێر و كەمی هەبوایە كەم ، جا پیاو هەبوو یەك هێشوی دەهێنا ، هەبوو دوو هێشوی دەهێنا بە مزگەوتی هەڵدەواسی ، وە ئەهلی صوفەش هیچ خواردنیان نەبوو، ئەگەر برسیان دەبوو ، دەچوون بە گۆچان لە هێشوە خورمایەكیان دەدا خورمای فەریك و پێگەیشتوو دەكەوتە خوارەوە دەیانخوارد، جا كەسانێك هەبوون ئارەزوویان لە خێر نەبوو ، خورمای خراپ ورەق وتەقیان دەهێنا هەڵیاندەواسی ، جا خواش ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاندن و فەرمووی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَلاَ تَيَمَّمُوا الخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلاَّ أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ)

دەڵێ : ئەگەر ئێوە ئەوەتان بەدیاری بۆبێ وەریناگرن ، مەگەر بە چاوچوقاندن یان لەشەرمان ، ئەڵێ پاش ئەم ئایەتە كامەی چاك بوو دەمان كردە خێرە.

**ماناى هەندێ ووشە :**

(القنو) : العنقود من التمر ، (الشيص) تمر النخل غير المفلح بێ کەلك (الحشف) تمر يابيس فاسد، رەق و تەق ونەگەيشتوو ، (الْبُسْرِ)فەريکە خورما (التَّمْرِ) خورماى گەيشتوو

٢-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَشْتَرُونَ الطَّعَامَ الرَّخِيصَ فَيَتَصَدَّقُونَ بِهِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ على نبيه صلى الله عَلَيْهِ وَسلم (يَا أَيهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ) الأحاديث المختارة أو المستخرج من الأحاديث المختارة مما لم يخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما / ضياء الدين أبو عبد الله محمد بن عبد الواحد المقدسي ، ولباب المنقول للسيوطي (حسن)

واتە: ئيبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : هاوەڵانى پێغەمبەر خواردنى خراپەيان دەکرى ، خێريان پێ دەکرد جا خوا ئەم ئايەتەى دابەزاند وفەرمووى (يَا أَيهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ)

٣-( عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: أَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ، بِصَاعٍ مِنْ تَمْرٍ، فَجَاءَ رَجُلٌ بِتَمْرٍ رَدِيءٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَوَاحَةَ: (لَا تَخْرُصْ هَذَا التَّمْرَ) فَنَزَلَ الْقُرْآنُ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَلَا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ) (البقرة: ٢٦٧)رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ

واتە: لە جابيرەوە هاتووە خوا لێى رازى بێ دەڵێ : پێغەمبەر فەرمانى پێکردين بەدانى سەرفيترە ، بە ساعێك خورما ، پياوێك خورمايەکى خراپى هێنا ، پێغەمبەر فەرمووى بە عبدالله کوڕى رەواحە ئەو خورمايە خراپە وەرمەگرە جا خوا ئەم ئايەتەى دابەزاندوفەرمووى (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا

أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَلَا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ) واتــە: ئـەی ئیمانـداران شـتی چاك ببەخشن ، و شتی خراپ وبیٚ کەلك مەبەخشن.

### ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٧٢) سورەتی (البقره)

(لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ٢٧٢) البقره

واته: ئـەی پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) هیدایـەت و ڕێنمـوویی و موسـوڵمان کردنی ئەو خەڵکە لەسەر تۆ نیە (چونکە تۆ تـەنها گەیانـدنی پەیامەکـەت لەسـەرە) بەڵام خـوا هیدایـەت و ڕێنمـوویی هـەر کەسـێکی بوێـت دەکـات، (بـە مـەرجێك ئـەو کەسەش ڕووی دڵی بکاتە ئیمان) هەر خێرێکیش ئەنجام بـدەن، ئـەوە قازانجەکـەی بۆ خۆتانە، ئێوە (ئەی بڕواداران) هیچ شتێك نابەخشـن مەگـەر بـۆ ڕەزامەنـدی خـوا نــەبێت و هـــەر خێـــرو چـــاکەیەکیش ئـــەنجام بـــدەن پاداشـــتەکەیتان دەســـتتان دەکەوێتەوە، ئەوسا ئێوە بەهیچ شێوەیەك ستەمتان لێناکرێت.(تەفسیری ئاسان)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێرانەوە هەیە:

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ أُنَاسٌ مِنَ الْأَنْصَارِ لَهُمْ أَنْسِبَاءُ وَقَرَابَةٌ مِنْ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ، فَكَانُوا يَتَّقُونَ أَنْ يَتَصَدَّقُوا عَلَيْهِمْ، يُرِيدُوهُمْ أَنْ يُسْلِمُوا، فَنَزَلَتْ: (لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ، وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ، وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنْفُسِكُمْ) (البقرة: ٢٧٢) اخرجه ابن جرير في جامع البيان ، قال الشيخ محمود المصري صحيح في اسباب النزول.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : هەندێ لە ئەنصاریەکان خزمایەتیان هەبوو لەگەڵ جوولەکەی بەنو قوریزەو بەنو نەزیر ، جا خێریان پێ نەدەکردن ، دەیان ویست موسڵمان بن ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ، وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ، وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنْفُسِكُمْ) واتە: هیدایەت لەسەر تۆ نیە ، بەڵکو خوا ئەوەی حەزی لێ بێ هیدایەتی دەدات ، وە ئەوەی دەیکەنە خێر بۆ خۆتانە وپاداشت وەردەگرنەوە.

٢-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانُوا يَكْرَهُونَ أَنْ يَرْضَخُوا لِأَنْسِبَائِهِمْ وَهُمْ مُشْرِكُونَ، فَنَزَلَتْ (لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَكِنَّ اللهَ يَهْدِي مَنْ يشَاءُ) (البقرة: ٢٧٢) حَتَّى بَلَغَ (وَأَنْتُمْ لَا تُظْلَمُونَ) (البقرة: ٢٧٢) قَالَ: فَرَخَّصَ لَهُمْ ) رواه النسائي والبيهقي اسناده حسن

واتە : لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لەخۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: هاوەڵان خوا لێیان رازی بێ پێیان ناخۆش بوو ، لە خێر ماڵ ببەخشن بە خزمە کافرەکانیان جا ئەو ئایەتە دابەزی (لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ) جا ئیبنو عەباس دەڵێ مۆڵەتیان دراو خێر بە خزمی کافر بکەن.

مانای ئەم ووشە : (يَرْضَخُوا) واتە: هەندێ ماڵیان بدەنێ ((رضخ) اعطاء قليل من الكثير)

**************************

# وتاری ژماره (٢١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٨٤ تاکو ٢٨٦) سورەتی (البقره)**

**(لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا۟ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ٢٨٤)** البقره

واتە: هەر چیتان لەدڵ گرتبێ خوا لێتانی دەپرسێ: هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لەزەویدایە، هەموو هی خوایە تەنها ئەو دروستی کردووە، تەنها ئەویش خاوەنیەتی، کەواتە: دەبێ تەنها شەریعەت و بەرنامەی ئەویش پیادە بکرێ ئەگەر ئەوەی لەناو دڵ ودەروونتاندایە، ئاشکرای بکەن یان بیشارنەوەو دەری نەخەن، لە هەردوو حاڵەتەکەدا خوا لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکات. (ئیبن عەباس) دەڵێت: پاش لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە لەو شتانەی کە لەدڵ و دەروونا ئەیشارنەوە، خوای گەورە لە بڕواداران خۆش ئەبێ و سزای بێبڕوایان دەدات، بۆیە (ئیبن عەباس) بەلایەوە وایە کە ئایەتی: **(إن تبدوا ما في أنفسكم أو تخفوه يحاسبكم بە الله )** نەسخ نەبۆتەوە. تەفسیرەکان لەم جیگایەدا جۆرەها قسەیان هەیە، بەڵام ئەم مانایەی مامۆستا خاڵ بەلامەوە لە هەموان جوانترە کە دەڵێ ئەگەر ئەوەی لە دڵتاندایە لە سیفاتی نەفسیی، وەکو بێ بڕوایی و، حەسوودیی و، ناپاکیی و بەخیلی، ئاشکرایان بکەن، یان بیانشارنەوە، خوا بۆی هەیە حیسابتان لەگەڵ بکات، چاك بە چاك و خراپ بە خراپ. ئینجا لە هەرکەسێك کەخۆی بیەوێ خۆش ئەبێ هەر کەسێکیش ئەو خۆی بیەوێ وشیاویش بێ – بە سزا – سزای دەدات واتە: ئەگەر کردەوەو خەیاڵات گەیشتبێتە رادەیەك کە بووبێ بە شتێکی نەفسیی و

سرووشتی، ئەوە هەرگیز تەوبەو پەشیمانی بەدوایا نایەت. والله علی کل شئ قدیر خواش بەسەر هەموو شتێکدا دسەڵاتدارە توانای لێبوردن و سزادانیشی هەیە)
ڕامان

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێرانەوە هەیە:

١-(عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، قَالَ فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ بَرَكُوا عَلَى الرُّكَبِ فَقَالُوا أَيْ رَسُولَ اللَّهِ كُلِّفْنَا مِنْ الْأَعْمَالِ مَا نُطِيقُ الصَّلَاةَ وَالصِّيَامَ وَالْجِهَادَ وَالصَّدَقَةَ وَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيْكَ هَذِهِ الْآيَةُ وَلَا نُطِيقُهَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتُرِيدُونَ أَنْ تَقُولُوا كَمَا قَالَ أَهْلُ الْكِتَابَيْنِ مِنْ قَبْلِكُمْ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا بَلْ قُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ فَلَمَّا اقْتَرَأَهَا الْقَوْمُ ذَلَّتْ بِهَا أَلْسِنَتُهُمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِي إِثْرِهَا آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ نَسَخَهَا اللَّهُ تَعَالَى فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا، قَالَ نَعَمْ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا ، قَالَ نَعَمْ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ ، قَالَ نَعَمْ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ قَالَ نَعَمْ ) صحيح مسلم

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە دەڵێ : کاتێ ئایەتی (لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) دابەزی لەسەر هاوەڵان قورس وگران بوو ، بۆیە چونە لای پێغەمبەر لەسەر ئەژنۆ دانیشتن بەرێزەوە ، گوتیان : ئەی پێغەمبەری خوا کردەوەی وامان لەسەر پێویست کراوە کە دەتوانین ئەنجامیان بدەین وەکو نوێژ و رۆژوو جیهاد و ماڵ بەخشین ، بەلاَم ئەم ئایەتت لەسەر هاتۆتە خوارێ بۆمان جێ بەجێ ناکرێ ، پێغەمبەر فەرمووی ئایا دەتانەوێ وەکو خاوەن دوو کیتابەکان (جوولەکەوگاوەر) بڵێن (سمعنا وعصينا) بیستمان بەلاَم سەرپێچیمان کرد ، بەڵکو ئێوە بڵێن (سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ) واتە: پەروەردگارمان ئەوە فەرمانی تۆمان وەرگرت و فەرمانبەریش دەکەین (جێ بەجێی دەکەین) جا لێبوردنت داوا دەکەین ، وە سەرنجامیش بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە ، ئەوانیش وایانگوت ، جا دوای ئەوەی ئەم ئایەتیان زۆر خوێندەوە ودوعایان کردو زمانیان لەسەر راهات ، ئنجا خوا بەدوای ئەم ئایەتە، ئەو ئایەتەی ناردەخوارەوە(امن آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ) جاخوا ئەو ئایەتەی پێشووی کە دەفەرموێ : ئەوەی لە دڵتاندایە پەنهانی بکەن یان ئاشکرای بکەن ، خوا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات ، لای برد ونەسخی کردوە، ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە (لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا، قَالَ نَعَمْ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا ، قَالَ نَعَمْ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ ، قَالَ نَعَمْ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ قَالَ نَعَمْ )

٢-( عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ دَخَلْتُ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ يَا أَبَا عَبَّاسٍ كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ فَقَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ فَبَكَى قَالَ أَيَّةُ آيَةٍ قُلْتُ إِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ إِنَّ هَذِهِ الْآيَةَ حِينَ أُنْزِلَتْ غَمَّتْ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَمًّا شَدِيدًا وَغَاظَتْهُمْ غَيْظًا شَدِيدًا يَعْنِي وَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكْنَا إِنْ كُنَّا نُؤَاخَذُ بِمَا تَكَلَّمْنَا وَبِمَا نَعْمَلُ فَأَمَّا قُلُوبُنَا فَلَيْسَتْ بِأَيْدِينَا فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا قَالَ فَنَسَخَتْهَا هَذِهِ الْآيَةُ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَى لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ فَتُجُوِّزَ لَهُمْ عَنْ حَدِيثِ النَّفْسِ وَأُخِذُوا بِالْأَعْمَالِ) (رواه احمد) حسن قال ارنؤط إسناده صحيح على شرط الشيخين

واتە: لە موجاهیدەوە هاتووە دەڵێ : چوومە لای ئیبنو عەباسەوە گوتم ئەی باوکی عەباس لەلای ئیبنو عومەر بووم ، ئەم ئایەتەی خوێندەوە وگریا، گوتی کام ئایەت گوتم (إِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ) ئیبنو عەباس گوتی ئەو ئایەتە کاتێ دابەزی ، هاوەڵان زۆر دڵتەنگ و خەمبار بوون ، گوتیان ئەی نێرراوی خوا تیاچووین ، ئێمە ئەگەر قسەمان کرد و کردەوەمان ئەنجامدا لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێ ، بەڵام ئێمە ناودڵمان بەدەستی خۆ نیە ، پێغەمبەر فەرمووی بڵێین (سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا) جا ئایەتی (آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَى لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ) ئەم ئایەتەی نەسخ کردەوە. جا شتی ناو دڵ چاوپۆشی لێکراو کردەوەش لێپرسینەوەی لەسەرمایەوە.

## چەند فەرمایشتێك دەربارەی (خەیاڵی ناودڵ):

١-( عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُحَدِّثُ نَفْسِي بِالْحَدِيثِ لَأَنْ أَخِرَّ مِنْ السَّمَاءِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَتَكَلَّمَ بِهِ قَالَ ذَلِكَ صَرِيحُ الْإِيمَانِ ) مسند أحمد حديث صحيح، وهذا إسناد قوي، وهو على شرط مسلم

واتە: لە ئەبو هوریرەوە هاتووە دەڵێ : پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر گوتی ئەی نێرراوی خوا من شتی وام بەدڵدا دێت ، ئەگەر لە ئاسمان بکەومە خوارەوە پێم خۆشترە نەوەك ئەو قسە بکەم ، پێغەمبەر پێی فەرموو : ئەوە نیشانەی روونی ئیمانە .

٢-( عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِي عَن أُمَّتِي مَا وَسْوَسَتْ بِهِ صُدُورُهَا مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَكَلَّمْ ) صحيح البخاري

واتە: لە ئەبو هوریرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی خوا چاوپۆشی کردوە بۆم لە ئوممەتەکەم لە وەی بەناو دڵیان دادێ ، مادام نای کردە کردوە و نای کەن قسە.

٣-( عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَن النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ عَن أُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَتَكَلَّمْ) صحيح البخاري

٤-( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِسَيِّئَةٍ فَلَا تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا سَيِّئَةً، وَإِذَا هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا عَشْرًا) رواه مسلم

واتە: لە ئەبو هوریرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : خوا فەرموویەتی : ئەگەر بەندەکەم شتێکی خراپی بەدڵدا هات ، لەسەری مەنوسن ،

ئەگەر كردەوەكەی ئەنجامدا یەك كردەوەی بۆ بنوسن ، وە ئەگەر بەدڵیدا هات چاكەیەك بكات ، بەلاّم ئەنجامی نەدا ، یەك چاكەی بۆ بنوسن ، ئەگەر كردەوەكەی ئەنجامدا بە دە قات بۆی بنووسن.

٥-( عَن أَبِي هُرَيْرَةَ عَن رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِحَسَنَةٍ وَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبْتُهَا لَهُ حَسَنَةً فَإِنْ عَمِلَهَا كَتَبْتُهَا عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ وَإِذَا هَمَّ بِسَيِّئَةٍ وَلَمْ يَعْمَلْهَا لَمْ أَكْتُبْهَا عَلَيْهِ فَإِنْ عَمِلَهَا كَتَبْتُهَا سَيِّئَةً وَاحِدَةً) صحيح مسلم

واتە: لە ئەبو هوریرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : خوا فەرموویەتی : ئەگەر بەندەكەم شتێكی چاكی بەدڵدا هات و بەلاّم نەیكردوە كردوە ئەوا چاكەیەكی بۆ دەنوسم ، بەلاّم ئەگەر بە كردەوە ئەنجامیدا بۆی بە دە چاكە دەنوسم تاكو حەوت سەد ، بەلاّم ئەگەر خراپەیەكی بەدڵدا هات و نەیكردە كردوە بۆی نانوسم ، ئەگەر كردیە كردوە یەك خراپەی بۆ دەنوسم.

٦-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ) رَوَاهُ ابْن مَاجَه وَالْبَيْهَقِيّ قال الالباني صحيح

واتە: لەئیبنو عەباسەوە هاتووە كە پێغەمبەر فەرموویەتی : خوا گەورە عەفوی داوە لە ئوممەتی من لە هەڵە ولەبیركردن و بە تۆبزی پێ كردن.

## پێنج فەرمووده لەسەر گەورەیی (٢) ئايەتی كۆتـايی البقره

١-(مَنْ قَرَأَ بِالْآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واته: پێغەمبەری خوا فەرموويەتی : ئەوەی دوو ئايەتی كۆتايی سورەتی (البقـره) بخوێنیّ لە شەواندا ئەو بەسيەتی.

ئايا بەسيەتی (كفتاه) مانای چیيه؟ وەلاّم زانايـان بـەم شـێوەی خـوارەوە لێكيـان داوەتەوە

كفتاه) حفظتاه من الشر ووقتاه من المكروه قيل أغنتاه عن قيام الليل وذلك لما فيهما من معاني الإيمان والإسلام والالتجاء إلى الله عز وجل والاستعانة به والتوكل عليه وطلب المغفرة والرحمة منه) ، قِيلَ: كَفَتَاهُ الْمَكْرُوهَ تِلْكَ اللَّيْلَةَ، وَقِيلَ: كَفَتَاهُ مِنْ قِيامِ اللَّيْلِ.

واته : ئەم دوو ئايەتە پاريزراوت دەكەن لە شەڕو خراپەی ئەو شەوە، وەگـوتراوە : جێگای شەونوێژ دەگرێتەوە بۆ خوێنەرەكەی .

٢-( عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: لَمَّا أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْتُهِيَ بِهِ إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى وَهِيَ فِي السَّمَاءِ السَّادِسَةِ إِلَيْهَا يَنْتَهِي مَا يُعْرَجُ بِهِ مِنْ الْأَرْضِ فَيُقْبَضُ مِنْهَا وَإِلَيْهَا يَنْتَهِي مَا يُهْبَطُ بِهِ مِنْ فَوْقِهَا فَيُقْبَضُ مِنْهَا قَالَ إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى قَالَ فَرَاشٌ مِنْ ذَهَبٍ قَالَ فَأُعْطِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلَاثًا أُعْطِيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ وَأُعْطِيَ خَوَاتِيمَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَغُفِرَ لِمَنْ لَمْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ مِنْ أُمَّتِهِ شَيْئًا الْمُقْحِمَاتُ) رواه مسلم

واته: لەعبدالله كوری مەسعودەوە هاتووە دەڵێ : كاتێ شەورەوی بە پێغەمبـەر كـرا ، كە گەيشتە لای (سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى) كە لە ئاسمـانی شەشـەمە لـەوێوە كۆتـايی دێـت

بەسەرکەتن لە زەوی ، لەویێ وەردەگریێ ، وە لەویێ کۆتایی دێت بەدابەزین لەسەروی خۆی ، لەویێ وەردەگرێ ئەوی لەسەرەوە دیێ ، دەڵێ سیدەر دایدەپۆشی ئەوەی دادەپۆشێ ، دەڵێ پەپولەکان لە زێرن ، دەڵێ جا سێ شت بەخشران بە پێغەمبەر (پێنج نوێژەکانی پێ بەخشرا ، وە کۆتایی سورەتی البقرە ، و ئەوەی شرك بۆ خوا بریار نەدات لەئوممەتەکەی خوا لێی خۆش دەبێ.

(الْمُقْحِمَاتُ)أَيِ الْكَبَائِرُ الْمُهْلِكَاتُ الَّتِي تُقْحِمُ صَاحِبَهَا النَّارَ إِنْ لَّمْ يَتَجَاوَزْ عَنْهُ الْمَلِكُ الْغَفَّارُ

٣-( عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فُضِّلْنَا عَلَى النَّاسِ بِثَلَاثٍ: جُعِلَتْ لَنَا الْأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدًا، وَجُعِلَ تُرَابُهَا لَنَا طَهُورًا إِذَا لَمْ نَجِدِ الْمَاءَ، وَجُعِلَتْ صُفُوفُنَا كَصُفُوفِ الْمَلَائِكَةِ، وَأُوتِيتُ هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مِنْ بَيْتِ كَنْزٍ تَحْتَ الْعَرْشِ لَمْ يُعْطَ مِنْهُ أَحَدٌ قَبْلِي وَلَا أَحَدٌ بَعْدِي ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ فِي الصَّحِيحِ و احمد والنسائي

واتە: لەحوزیفەی یەمانی هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرمووی : گەورەییمان پێدراوە بەسەر خەڵکی لە سێ شتان ، هەموو زەوی بۆ ئێمە مزگەوتە ، خاکەکەی بۆ ئێمە پاکە ئەگەر ئاو نەبوو ، وە ریزەکانمان گێردراوە وەکو ریزەکانی فریشتە ، وە ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی البقرەم پێ بەخشراوە ، لە ماڵی گەنجینە لە ژێر عەرش ، بە کەس نەدراوە لە پێش من ، وە بەکەس نادرێ لە دوای من .

٤-( عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ كِتَابًا قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ بِأَلْفَيْ عَامٍ أَنْزَلَ مِنْهُ آيَتَيْنِ خَتَمَ بِهِمَا سُورَةَ الْبَقَرَةِ وَلَا يُقْرَأَانِ فِي دَارٍ ثَلَاثَ لَيَالٍ فَيَقْرَبُهَا شَيْطَانٌ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

٥-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: بَيْنَمَا جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، سَمِعَ نَقِيضًا مِنْ فَوْقِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: هَذَا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ الْيَوْمَ لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إِلَّا الْيَوْمَ، فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ، فَقَالَ: هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الْأَرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلَّا الْيَوْمَ، فَسَلَّمَ، وَقَالَ: أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةُ الْكِتَابِ، وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، لَنْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلَّا أُعْطِيتَهُ ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ والنسائي والحاكم

واته: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: لە كاتێكدا جبریل سەلامی خوا لێ بێ، لە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، دەنگێكی لە سەرووی خۆیەوە بیست، جبریل سەلامی خوای لەسەر بێ، چاوی بەرەو سەری هەڵبڕیو گوتی: ئەوە دەرگایەكە لە ئاسمان كرایەوە، كە هەرگیز نەكراوەتەوە، وە فریشتەیەك لێیەوە دابەزیو هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ)، گوتی: موژدەت لێ بێ بە دوو ڕۆشنایی كە پێت دراونو پێش تۆش بە هیچ پێغەمبەرێك نەدراون، سوورەتی (فاتیحە)و كۆتایی یەكانی سوورەتی بەقەرە، هیچ پیتێكیان لێ ناخوێنی مەگەر ئەوەی داوای دەكەی پێت دەبەخشرێ.

٦-( عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: لَا أَرَى أحداً عقل الْإِسْلَامُ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ وَخَوَاتِيمَ سورة البقرة فإنها من كَنْزٌ أُعْطِيَهُ نَبِيُّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ من تحت العرش) قَالَ ابْنُ مَرْدَوَيْهِ

واته : لە (عەلی)یەوە هاتووە دەڵێ: نابینم كەسێك لە ئیسلام حاڵی بێ بخەوێ تاكو ئایەتی (الكرسی) و كۆتایی سورەتی البقرە دەخوێنێ ، چونكە گەنجینەن بەخشراون بە پێغەمبەرەكەتان لە ژێر عەرشەوە .

*********************************

# وتاری ژماره (٢٢) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سوڕەتی (ال عمران)

ئەم سورەتە بە کورتی :

سوڕەتی (ال عمران ) له ریزبەندا ژماره (٣)یە ، لەسوڕەتە درێـژەکانی مەدینەیـە ، باسی دوو شتە دەکات ، ١- وحدانییەتی خودا ، ٢-قانون و تەشریعات (وەك حـەج و جیهاد ، مەنعی کردنی ریبا.......) ، ژمارەی ئایەتەکانی (٢٠٠) ئایەتە

ئایـا بۆچـی نـاوی (ال عمـران) لـیٚ نـراوە ؟ چـونکە باسـی چـیرۆکی عائیلـەی (ال عمران) دەکات ، (عمران) باوکی (مریم) ی دایکی عیسـایە، سـەلامی خـوای لەسـەر بیٚ .

## فەزل و گەورەیی ئەم سوڕەتە؟

(عَن النواس بن سمْعَان قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ : يُؤْتَى بِالْقُرْآنِ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَهْلِهِ الَّـذِينَ كَـانُوا يَعْمَلُونَ بِـهِ تَقْدُمُـهُ سُـورَةُ الْبَقَـرَةِ، وَآلُ عِمْـرَانَ)، وَضَـرَبَ لَهُمَـا رَسُـولُ اللهِ صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ ثَلَاثَـةَ أَمْثَـالٍ مَـا نَسِـيتُهُنَّ بَعْـدُ، قَـالَ: (كَأَنَّهُمَـا غَمَامَتَانِ، أَوْ ظُلَّتَانِ سَوْدَاوَانِ بَيْنَهُمَا شَرْقٌ، أَوْ كَأَنَّهُمَا حِزْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ، تُحَاجَّانِ عَنْ صَاحِبِهِمَا) رواه مسلم (روناکی)

واتە: نەواسی کوڕی سەمعانەوە هاتووە دەڵیٚ : گوێم لە پێغەمبەر بوو دەیفـەرموو : ڕۆژی قیامەت قورئان و ئەهلی قورئان دێنن، ئەوانەی کاریان پیٚ کـردوە ، سـورەتی (البقره) و(ال عمران) پێشیان دەکەویٚ ، جا پێغەمبـەر سـیٚ نموونـەی بـۆ هێنانـەوە

فەرمووی وەکو دوو هەورن یان وەکو دوو سێبەرن یان وەکو دوو پۆلە باڵندن ، بەرگری لە خاوەنەکەیان دەکەن .

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٣) سورەتی (ال عمران)

(الٓمٓ ١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ٢ نَزَّلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ٣)ال عمران

واتە : (ألم) واتە: قورئان هەرلەم پیتانەی: (ئەلیف، لام، میم) و، وێنەیان پێکهاتووە، جا ئەگەر ئێوە باوەڕتان پێی نیە، دەسا فەرموون وێنەی بێنن (١)؟ خوا ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێك نی یە ئەو نەبێت زیندووی ڕاگری بونەوەرە.(٢) ناردوویە تیە خوارەوە بۆت قورئان بەڕاستی و دروستی، بەڕاست دانەری هەموو ئەو (کتێب) انە یە لەپێشیدا بوون وە تەورات و ئینجیلی ناردە خوارەوە.(٣)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: قَدِمَ وَفْدُ نَجْرَانَ، وَكَانُوا سِتِّينَ رَاكِبًا، عَلَى رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، وَفِيهِمْ أَرْبَعَةَ عَشَرَ رَجُلًا مِنْ أَشْرَافِهِمْ، وَفِي الْأَرْبَعَةَ عَشَرَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ إِلَيْهِمْ يَؤُولُ أَمْرُهُمْ، الْعَاقِبُ: أَمِيرُ الْقَوْمِ وَصَاحِبُ مَشُورَتِهِمُ الَّذِي لَا يُصْدِرُونَ إِلَّا عَنْ رَأْيِهِ، وَاسْمُهُ عَبْدُ الْمَسِيحِ. وَالسَّيِّدُ: ثِمَالُهُمْ وَصَاحِبُ رَحْلِهِمْ، وَاسْمُهُ الْأَيْهَمُ. وَأَبُو حَارِثَةَ بْنُ عَلْقَمَةَ أُسْقُفُهُمْ وَحَبْرُهُمْ، وَإِمَامُهُمْ وَصَاحِبُ مِدْرَاسِهِمْ، وَكَانَ قد شرف فيهم وَدَرَسَ كُتُبَهُمْ، حَتَّى حَسُنَ عِلْمُهُ فِي دِينِهِمْ، وَكَانَتْ مُلُوكُ الرُّومِ قَدْ شَرَّفُوهُ وَمَوَّلُوهُ، وَبَنَوْا لَهُ الْكَنَائِسَ

لِعِلْمِهِ وَاجْتِهَادِهِ. فَقَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، وَدَخَلُوا مَسْجِدَهُ حِينَ صَلَّى الْعَصْرَ، عَلَيْهِمْ ثِيَابُ الْحِبَرَاتِ جِبَابٌ وَأَرْدِيَةٌ، فِي جَمَالِ رِجَالِ بَنِي الْحَارِثِ بْنِ كَعْبٍ، يَقُولُ بَعْضُ مَنْ رَآهُمْ مِنْ أَصْحَابِ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم: مَا رَأَيْنَا وَفْدًا مِثْلَهُمْ، وَقَدْ حَانَتْ صَلَاتُهُمْ، فَقَامُوا فَصَلَّوْا فِي مَسْجِدِ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، فَقَالَ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم: دَعُوهُمْ. فَصَلَّوْا إِلَى الْمَشْرِقِ. فَكَلَّمَ السَّيِّدُ وَالْعَاقِبُ رسولَ اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، فَقَالَ لَهُمَا رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم: أَسْلِمَا، فَقَالَا: قَدْ أَسْلَمْنَا قَبْلَكَ، قَالَ: كَذَبْتُمَا، مَنَعَكُمَا مِنَ الْإِسْلَامِ دُعَاؤُكُمَا لِلَّهِ وَلَدًا، وَعِبَادَتُكُمَا الصَّلِيبَ، وَأَكْلُكُمَا الْخِنْزِيرَ. قَالَا: إِنْ لَمْ يَكُنْ عِيسَى وَلَدًا لِلَّهِ، فَمَنْ أَبُوهُ؟ وَخَاصَمُوهُ جَمِيعًا فِي عِيسَى، فَقَالَ لهما النبي صلى اللَّه عليه وسلم: أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّهُ لَا يَكُونُ ولد إلا و (هو) يُشْبِهُ أَبَاهُ؟

قَالُوا: بَلَى، قَالَ: أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَبَّنَا حَيٌّ لَا يَمُوتُ، وَأَنَّ عِيسَى يَأْتِي عَلَيْهِ الْفَنَاءُ؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَبَّنَا قَيِّمٌ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ يَحْفَظُهُ وَيَرْزُقُهُ؟

قَالُوا: بَلَى، قَالَ: فَهَلْ يَمْلِكُ عِيسَى مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا؟ قَالُوا: لَا، قَالَ: فَإِنَّ رَبَّنَا صَوَّرَ عِيسَى فِي الرَّحِمِ كَيْفَ شَاءَ، وَرَبُّنَا لَا يَأْكُلُ وَلَا يَشْرَبُ وَلَا يُحْدِثُ. قَالُوا: بَلَى، قَالَ: أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّ عِيسَى حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كَمَا تَحْمِلُ الْمَرْأَةُ، ثُمَّ وَضَعَتْهُ كَمَا تَضَعُ الْمَرْأَةُ وَلَدَهَا، ثُمَّ غُذِّيَ كَمَا يُغَذَّى الصَّبِيُّ، ثُمَّ كَانَ يَطْعَمُ وَيَشْرَبُ وَيُحْدِثُ؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: فَكَيْفَ يَكُونُ هَذَا كَمَا زَعَمْتُمْ؟ فَسَكَتُوا فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فيهم صدر صورة آلِ عِمْرَانَ إِلَى بِضْعٍ وَثَمَانِينَ آيَةٍ مِنْهَا.) الواحدي ،و تفسير الطبري

واته: توێژەرەوانی قورئان دەڵێن وەفدی نەجران هاتنە مەدینە ، (٦٠) کەس بوون ، لەوانە (١٤) پیاو گەورەکانیان بوون ، لەو چواردە کەسە (٣) کەسیان کارەکان بۆ لای ئەوان دەگەڕایەوە لەوانەش (العاقب) ئەمیری قەومەکە بوو کەناوی (عَبْدُ

الْمَسِيحِ) بوو ، و (السيد) و (وَأَبُو حَارِثَةَ بْنُ عَلْقَمَةَ)، هاتنه لای پێغەمبەر چوونه مزگەوتی پێغەمبەر کاتێ نوێژی عەسری کرد، جل وبەرگی زۆر جوانیان دەبەردابوو ، هەندێ لە هاوەلانی پێغەمبەر گوتیان هەرگیز وەفدی وامان نەبینیوە ، کاتی نوێژی ئەوان هات ، لە مزگەوتی پێغەمبەر نوێژیان کرد بەرەو رۆژهەلات پێغەمبەر فەرمووی لێیان گەرێن ، جا پێغەمبەر قسەی لەگەلْ (السید والعاقب) کرد پێی فەرموون موسلْمان بن ، گوتیان پێش تۆ ئێمە موسلْمان بووینە ، فەرمووی درۆدەکەن ئەوەی رێگریتان لێ دەکات موسلْمان بن ئەوەیە مندالْتان بۆ خوا بریار داوە ، وە خاچ دەپەرستن ، و گوشتی بەرزا دەخۆن، گوتیان ئەگەر (عیسی) کوری خوا نەبێ کی باوکیەتی ؟ هەموویان رووبەروی بونەوە دەربارەی (عیسی) پێی گوتن ئایا نازانن مندالْ بە باوکی دەچێ؟ گوتیان بەلْێ ، فەرمووی ئایا نازانن خوا زیندووەو نامرێ و (عیسی) لەناو دەچێ ؟ گوتیان بەلْێ ، فەرمووی نازانن پەروەردگارمان هەموو شتێکی راگرتووە و دەپارێزی و رزقی هەموو شت دەدات، گوتیان بەلْێ ، فەرمووی ئایا عیسی ئەو شتانەی پێ دەکرێ ؟ گوتیان نەخێر

فەرمووی پەروردگاری ئێمە (عیسی) وێنا کردوە لە رەحمی دایکی چۆن حەزی کردوە، وە فەرمووی پەروەردگارمان ناخوا و ناخواتەوە و شتی لێ رونادا، گوتیان بەلْێ ، فەرمووی ئایا نازانن دایکی عیسی ، عیسای لەسك دابووە وەکو ئافرەتان ، دوای دای ناوە وەکو ئافرەتان ، دوای شیری خواردوە وەك چۆن مندالْ شیر دەخوات ، دوای خواردن وخواردنەوەی خواردن و شتی لێ رووداوە؟ گوتیان بەلْێ ، فەرمووی ئەدی چۆن دەبێ ئەوەی ئێوە گومان دەبەن ؟ جا بێ دەنگ بوون ، خواش سەرەتای سورتی (ال عمران) دابەزاند تاکو نزیکەی (٨٠) ئایەت .

**وه پێغەمبەر داوای (موباهەلەی) کرد لەو وەفد: واتە (ملاعنە):**

**(إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٥٩) الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَلَا تَكُنْ مِنَ الْمُمْتَرِينَ (٦٠) فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنْفُسَنَا وَأَنْفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَلْ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ (٦١) ال عمران**

واتــە: هەرکەسـێك لـەبارەی عیسـاوە موجادەلـەی لەگـەڵ کـردی و دەمـەدەمێی کرد_پاش ئەوەی حەقیقەتەکەی بۆ ڕوون کرایەوە_ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە لە بیرو باوەڕی خۆتاندا ڕاست دەکـەن ، وەرن بـا هـەموومان کـۆ ببینـەوە، منـداڵی ئێمـە و منداڵانی ئێوە، ئافرەتانی ئێمەو ئافرەتانی ئێوە، خۆمان و خۆتـان، پاشـان داوا لـە خودا بکەین کە لەعنەتی خۆی لـەو لایەنـە بکـات کـە درۆزنـە.نبتهـل... واتـە: دوعـا بکـەین و بپاڕێینـەوە. ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە پێـی دەوترێـت (ئایـەتی موباهەلـە). دەگێڕنەوە وەفدێك لە مەسیحیەکانی (نەجران) لەوڵاتی یەمەنەوە هاتن بۆ خزمـەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بـۆ مناقەشـەو گفتوگۆ لەسـەر ئـەوەی کـە عیسـا کوڕی خودایـە، پێغەمبـەری خـودا(صـلی اللـە علیـە وسـلم) پێـی فـەرموون: ئەگـەر باوەڕتان قایمە لەسەر ئەوەی دەیڵێن، وەرن با (موباهەلە) بکەین، بـەڵام وەفدەکـە نەیان وێرا.(تەفسیری ئایەتی ٦١)

## هۆی دابەزینی ژمارە (٢٣) لە سورەتی (ال عمران)

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُدۡعَوۡنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ وَهُم مُّعۡرِضُونَ ٢٣﴾ ال عمران

واتە: ئایا ورد نابیتەوە لەوانەی پێیان دراوە بەشێك لە تەورات بانگ دەکرێن بۆ لای کتێبی خوا(تەورات) بۆ ئەوەی بڕیاربدات لە نێوانیاندا لە پاشان دەستەیەك لەوان پشت هەڵدەکەن لە حاڵێکدا ئەوان ڕوو وەرگێڕن.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(وَرَوَى سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ، وَعِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْتَ الْمِدْرَاسِ عَلَى جَمَاعَةٍ مِنَ الْيَهُودِ فَدَعَاهُمْ إِلَى اللَّهِ، فَقَالَ لَهُ نُعَيْمُ بْنُ عَمْرٍو، وَالْحَارِثُ بْنُ زَيْدٍ: عَلَى أَيِّ دِينٍ أَنْتَ يَا مُحَمَّدُ؟ فَقَالَ: عَلَى مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ، قَالَا: إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ يَهُودِيًّا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَهَلُمُّوا إِلَى التَّوْرَاةِ فَهِيَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ. فَأَبَيَا عَلَيْهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ) أخرجه ابن جرير (٣/ ١٤٥) من طريق محمد بن إسحاق قال حدثني محمد بن أبي محمد مولى زيد بن ثابت عن سعيد بن جبير وعكرمة به. وعزاه السيوطي في الدر (٢/ ١٤) لابن إسحاق وابن جرير وابن المنذر وابن أبي حاتم.

واتە: پێغەمبەر چووە قوتابخانەی جولەکان بانگی کردن بۆ ئیسلام، نوعیم و حاریس گوتیان : تۆ لەسەر ئایینەکەی ئەی (محمد) ؟ ئەیش فەرمووی : لەسەر ئایینی ابراهیم، گوتیان: ابراهیم جوولەکە بوو، پێغەمبەر فەرمووی : بڕۆن تەورات بێنن بزانین ڕاست دەکەم، نەوێران وابکەن، جا ئەو ئایەتە دابەزی

**هۆی دابەزینی ژمارە ( ٢٨ ) لە سورەتی ( ال عمران )**

**﴿لَا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةٗۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨﴾** ال عمران

واتە: نابێ بڕواداران بێ باوەڕان بگرن بە دۆستی خۆیان لەجیاتی بـڕواداران وە هـەر کەسێك وابکات ئیتر پەیوەستی لەگەڵ خوادا نامێنێ مەگەر بـۆ خۆپاراسـتنتان بێـت لێ یان وە خوا دەتان ترسێنێت لە سـزای خـۆی وە هـەر بـۆ لای خوایـە گەڕانـەوە. (پوختەی تەفسیر)

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَانَ الْحَجَّاجُ بْنُ عَمْرٍو، وَكَهْمَسُ بْنُ أَبِي الْحُقَيْقِ، وَقَيْسِ بْنِ زَيْدٍ– وَهَؤُلَاءِ كَانُوا مِنَ الْيَهُودِ– يُبَاطِنُونَ نَفَرًا مِنَ الْأَنْصَارِ لِيَفْتِنُوهُمْ عَنْ دِينِهِمْ فَقَالَ رِفَاعَةُ بْنُ الْمُنْذِرِ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ جُبَيْرٍ، وَسَعِيدُ بْنُ خَيْثَمَةَ لِأُولَئِكَ النَّفَرِ: اجْتَنِبُوا هَؤُلَاءِ الْيَهُودَ، وَاحْذَرُوا لُزُومَهُمْ وَمُبَاطَنَتَهُمْ لَا يَفْتِنُوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ. فَأَبَى أُولَئِكَ النَّفَرُ إِلَّا مُبَاطَنَتَهُمْ وَمُلَازَمَتَهُمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ) الواحدي (قال المحقق كمال بسيوني زغلول: أخرجه ابن جرير (٣/ ١٥٢) ، وذكره السيوطي في لباب النقول (ص ٥٤) . وعزاه في الدر (٢/ ١٦) لابن إسحاق وابن جرير وابن أبي حاتم.

## هۆی دابەزینی ژمارە ( ٥٩ ) لە سورەتی ( ال عمران )

( إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٥٩ ) ال عمران

واتە: بەڕاستی وێنەی(دروست بوونی) عیسا لای خوا وەك وێنەی ئادەم وایە كە دروستی كرد لە گڵ لە پاشان پێ ی وت ببە، ئەویش بوو.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنْ مُبَارَكٍ، عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: جَاءَ رَاهِبَا نَجْرَانَ إلى النبي صلى اللّه عليه وسلم، فَعَرَضَ عَلَيْهِمَا الْإِسْلَامَ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا: إِنَّا قَدْ أَسْلَمْنَا قَبْلَكَ، فَقَالَ: كَذَبْتُمَا، إِنَّهُ يَمْنَعُكُمَا عَنِ الْإِسْلَامِ ثَلَاثَةٌ: عِبَادَتُكُمُ الصَّلِيبَ، وَأَكْلُكُمُ الْخِنْزِيرَ، وَقَوْلُكُمْ: لِلَّهِ وَلَدٌ. قَالَا: مَنْ أَبُو عِيسَى؟ وَكَانَ لَا يَعْجَلُ حَتَّى يَأْمُرَهُ رَبُّهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: إِنَّ مَثَلَ عِيسى عِنْدَ اللَّهِ الْآيَةَ) الواحدي قال كمال بسيوني ( عزاه السيوطي في اللباب (ص ٥٥) لابن أبي حاتم.)

واتە: وەفدی نجران هاتنە مەدینە پێغەمبەر بانگی كردن بۆ ئیسلام ، ئەوانیش گوتیان : ئێمە پێش تۆ موسڵمان بوینە، ئەویش فەرمووی : ڕاست ناكەن ، چونكە سێ شت ڕێگریان لێ دەكات موسڵمان بن ١-صەلیب دەپەرستن ٢- گۆشت خواردنی بەرزاز ٣- هاوبەش بۆ خوا دانێن ، گوتیان باشە كێ باوكی (عیسیا) یە ، ئەویش پەلەی نەكرد تاكو ئایەتی بۆ دابەزی فەرمووی (إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ................)

## هۆی دابەزینی ئایەتی (٧٧) سورەتی (ال عمران)

٢-(إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٧٧ ) ال عمران

واتە : بێگومان ئەوانەی دەیفرۆشن پەیمانی خواو سوێندەکانی خۆیان بە نرخێکی کەم ئەوانە بێ بەشن(لە بەهرەی خوا) لە ڕۆژی دوایی دا وە خوا قسەیان لەگەڵ ناکات وە تەماشایان ناکات لە ڕۆژی قیامەت دا و لە گوناهیان خۆش نابێت وە بۆ ئەوان هەیە سزای بە ئازار..(پوختەی تەفسیر)

تێبینی: خوای گەورە لەم ئایەتە (٥) جۆرە سزای بۆ ئەو کەسانە داناوە.

١-لە قیامەت هیچ بەشیان نیە ومایە پوچن ٢-خوا قسەی میهرەبانیان لەگەڵ ناکات ٣-بەچاوی رەحمەت تەماشایان ناکات ٤-گوناحیان پاك ناکاتەوە ٥-سزایەکی پڕ ئێشیان بۆی هەیە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێرانەوە هەیە:

١-(عَنْ أَبِي وَائِلٍ ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مسعود ، قَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ يَسْتَحِقُّ بِهَا مَالًا وَهُوَ فِيهَا فَاجِرٌ لَقِيَ اللهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ ، وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللهِ: (إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَئِكَ لَا خَلَاقَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ) (آل عمران: ٧٧) الْآيَةَ ، قَالَ: ثُمَّ إِنَّ الْأَشْعَثَ بْنَ قَيْسٍ خَرَجَ إِلَيْنَا ، فَقَالَ: مَا يُحَدِّثُكُمْ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ؟ فَحَدَّثْنَاهُ بِمَا قَالَ ، فَقَالَ: صَدَقَ ، لَفِيَّ نَزَلَتْ ، كَانَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ

ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ١٩٣ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا
عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ١٩٤ فَٱسْتَجَابَ
لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ
بَعْضٍ ۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُوا۟
وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا
مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
فِي ٱلْبِلَٰدِ ١٩٦ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ١٩٧ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ
ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ
ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ١٩٨ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ
وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ
أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ١٩٩ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ٢٠٠ )

واتە: بەڕاستی لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی دا و لە جیاوازی و گۆڕانی شەوو ڕۆژدا چەندەها بەڵگە هەیە بۆ خاوەن ژیری یەکان. (١٩٠) ئەوانەی کە یادی خوا دەکەن بە پێوەو بە دانیشتنەوە بە ڕاکشانەوە وە بیر دەکەنەوە لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی(ئەڵێن) ئەی پەروەردگارمان ئەمە(جیهان) ت دروست نەکردوە بە بێهودە پاك و بێ گەردی بۆتۆ دەسا تۆش بمان پارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ. (١٩١) ئەی پەروەردگارمان هەرکەس تۆ بیخەیتە ئاگری دۆزەخەوە ئەوە بێگومان ڕیسوات کردووە، وە هیچ پشتیوانێك نی یە بۆ ستەمکاران. (١٩٢) ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگخوازێك بوو بانگی ئەکرد بۆ بڕوا هێنان(دەی وت) بڕوا بێنن بە پەروەردگارتان دەست بەجێ بڕوامان هێنا ئەی پەروەردگارمان دەی لە گوناهەکانمان خۆش ببە و بسڕەوە لێمان خراپەکانمان و بمان مرێنە لەگەڵ چاکاندا. (١٩٣) ئەی پەروەردگارمان پێمان ببەخشە(لە پاش مردن) ئەوەی بەڵێنت پێداین لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکانت و ڕیسوامان مەکە لە ڕۆژی دوایی دا(هەستانەوە) بێگومان تۆ بەڵێن ناشکێنیت. (١٩٤)ئینجا

پـەروەردگاریان وەڵـامی(نزاکـانی) دانـەوە (فـەرمووی) بێگومـان مـن زایـە ناکـەم کردەوەی (هیچ) خاوەن کردەوەیەك لە ئێوە لە نێر یان مێ هەندێکتان لە هەنـدێکی ترتان بوون جا ئەوانـەی کـە کۆچیان کـرد و دەرکـران لـە جـێ و شـوێنی خۆیـان و ئەشـکەنجەو ئـازار دران لـە ڕێ ی منـدا و جـەنگیان کـرد و کـوژران سـوێند بـەخوا دەسـڕمەوە لێیـان خراپـەکانیان وە بێگومـان دەیـان خەمـە بەهەشـتانێکەوە کـە ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا ئەمە پاداشت دانەوەیەکە لە لای خواوە، وە لای خوایـە جـوانترین(چـاکترین) پاداشـت. (١٩٥) لـە خشـتەت نـەبات(فریـوت نـەدا) هاتووچۆی ئەوانەی بێ بڕوان(بەخۆشی و ئاسوودەیی یەوە) لە وڵاتدا. (١٩٦) ئـەو ئاسوودەییەی ئەوان خۆشی یـەکی کەمـە پاشـان جـێ و شـوێنیان دۆزەخـە ئـای چ شوێنێکی بەدە. (١٩٧) بـەڵام ئەوانـەی لـە پـەروەردگاریان دەترسـن بۆیـان هەیـە بەهەشتانێك کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا تیایدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی ئامادە کراوە لە لایەن خواوە، وە ئەوەی کـە لای خوایـە چـاکترە بـۆ پیـاو چـاکان. (١٩٨) بێگومان لەناو نامە دارەکاندا هەیە کەسانێك کە بڕوا دەهێنن بـەخوا و ئـەو نامەیەی کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ ئێوە، وە بەو نامەی کە نێرراوەتـە خـوارەوە بـۆ خۆیان مل کەچن بۆ خوا بەڵگەکانی خوا نافرۆشن بە نرخێکی کەم ئـەو نامـە دارانـە بۆیان هەیە پاداشتی خۆیان لە لای پەروەردگاریانەوە بێگومـان خـوا لێپرسـینەوەی خێرایە. (١٩٩) ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێنـاوە خـۆ گـرین و(لـە خـۆگری دوژمـن) خۆگرتر بن و لـە سـەنگەردا ئێشـك بگـرن و لـە خـوا بترسـن بـۆ ئـەوەی ڕزگـار بـن. (٢٠٠) (پوختەی تەفسیر)

**ئەم ( ١١ ) ئایەتە باسی بیرکردنەوە دەکات لە دورستکراوەکانی خوا.**

ئایا بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی خوا پاداشتی هەیە؟

( في بعض الآثار بينما رجلٌ مستلق على فراشه إذْ رفع رأسه فنظر إلى السماء والنجوم، فقال: (أشهد أن لك ربًّا وخالقًا اللَّهُمَّ اغفر لي) فنظر الله إليه فغفر له) تطريز رياض الصالحين

واتە: لە هەندێك شوێنەوار هاتووە پیاوێك لەسەر پشت راکشاوە ، سەرخۆی بەرزکردوە و تەماشای ئاسمان و ئەستێرەکانی کرد ، گوتی : ئەی ئاسمان شاهێدی دەدەم تۆ پەروەردگارو دروستکراوێکت هەیە، خودایە لێم خۆشبە ، جا خواش بەچاوی رەحمەت تەماشای کردو لیّ خۆش بوو .

وەخوای گەورە لە باسی بیرکردنەوە دەفەرموویّت :

(أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ١٧ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ١٨ وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ١٩ وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ٢٠ ) الغاشيه

واتە: دەی بۆ ورد نابنەوە لە حوشتر کە چۆن دروست کراوە.وە لە ئاسمان کە چۆن بەرز کراوەتەوە.وە لە شاخەکان کە چۆن داکوتراون و دامەزرێنراون؟ .وە لە زەوی کە چۆن ڕاخراوە.

( وَعَنِ الْحَسَنِ الْبَصْرِيِّ أَنَّهُ قَالَ: تَفَكُّرُ سَاعَةٍ خير من قيام ليلة، وقال: الحسن: الفكرة مرآة تريك حسناتك وسيئاتك) تفسير ابن كثير

واته: له حەسەنی بەصریەوە هاتووه : دەڵێ بیرکردنەوەی کاتژمێرێك چاکتره لە شەونوێژی شەوێك (کە بێ ئاگای بکرێ ) ، وەهەروەها ئیمامی حەسەن دەڵێ : بیرکردنەوە چاکە و خراپەکانت نیشان دەدات .

-( ذَكَرَ السُّيُوطِيُّ فِي الْجَامِعِ الصَّغِيرِ: (فِكْرَةُ سَاعَةٍ خَيْرٌ مِنْ عِبَادَةِ سِتِّينَ سَنَةً) ، رَوَاهُ أَبُو الشَّيْخِ فِي الْعَظَمَةِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.) مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح

واته: ئیمامی سیوتی له جامع الصغیر دا دەڵێ : بیرکردنەوەی کاتژمێرێك چاکتره له خواپەرستی شێست ساڵ (واته: به بێ ئاگای و بیرکردنەوە)

تێبینی : له فەموودەی پێغەمبەردا هاتووه پیاوێك (٦٠) ساڵ نوێژان دەکات بەلاًم هیچی قەبوول نەبووە ، چونکە سوجدەو رکوعی تەواو نەبووینە. ئەمەش دەقەکەیەتی:

(عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال( إِنَّ الرَّجُلَ لَيُصَلِّي سِتِّينَ سَنَةً مَا تُقْبَلُ لَهُ صَلَاةٌ، لَعَلَّهُ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَلَا يُتِمُّ السُّجُودَ، وَيُتِمُّ السُّجُودَ وَلَا يُتِمُّ الرُّكُوعَ) رواه أبو القاسم الأصبهاني وينظر سنده قال الشيخ : قد وقفت على سنده في كتابه الترغيب فوجدته حسنا ولذلك خرجته في الصحيحة ( ٢٥٣٥ ) من المجلد السادس

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٩٥ ) سورەتی ( ال عمران )

(فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥ )ال عمران

واته: ئینجا پەروەردگاریان وەڵامی(نزاکانی) دانەوە (فەرمووی) بێگومان من زایە ناکەم کردەوەی (هیچ) خاوەن کردەوەیەك لە ئێوە لە نێر یان مێ هەندێکتان لە هەندێکی ترتان بوون جا ئەوانەی کە کۆچیان کرد و دەرکران لە جێ و شوێنی خۆیان و ئەشکەنجەو ئازار دران لە ڕێ ی مندا و جەنگیان کرد و کوژران سوێند بەخوا دەسڕمەوە لێیان خراپەکانیان وە بێگومان دەیان خەمە بەهەشتانێکەوە کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا ئەمە پاداشت دانەوەیەکە لە لای خواوە، وە لای خوایە جوانترین(چاکترین) پاداشت ) پوختەی تەفسیر.

ڕێنمایەکانی ئایەتی (١٩٠-١٩٥): ١- بۆ بەهێز بوونی ئیمان و بڕوا، پێویستە لە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی تێرامانین بکەین. ٢- خوێندنی ئەم ئایەتانەی: ( إن في خلق السموات والأرض..) تاکۆتایی سوورەتەکە، بەتایبەتی لەکاتی هەڵسان بۆ شەو نوێژ سوننەتە، لەبەر ئەو فەرموودە (متفق عليه)یە کە(ئیبن عەباس) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ ماوەیەك لەگەڵ خانەوادەی خۆیدا قسەی دەکردو پاشان تابەشی سێیەمی شەو دەنووست، ئەوسا هەڵدەسا لەئاسمانەکان ورد دەبوویەوەو دەیگوت: (إن في خلق السموات والارض...) جا هەڵدەساو دەست نوێژی دەگرت و سیواکی دەکردو، یانزە ڕکات نوێژی دەکرد، ئەوجا (بیلال) بۆ بەیانی بانگی گوت، پاشان دوو ڕەکات سوننەتی بەرلە نوێژی بەیانی دەکرد، ئەوجا لەماڵ دەردەهات و بەر نوێژی بۆ دەکردن. ٣- هەمووکات یادی خوا بەپێوە، بە دانشیتن، بەراکشان ، لەسەر تەنیشت سوننەتە، وەك خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ: (انّ النبيَّ كان يَذْكُرُ اللهَ في كل أَحيانِهِ)، واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەمیشە یادی خوای دەکرد. ٤- داوای پەنادان لەئاگری دۆزەخ بە بڕواو ئاکاری چاك و پاڕانەوە لەخوا سوننەتە. ٥- فەزیلەتی هیجرەت و جیهاد

لەبەر خـوا. ٦– ژن و پیـاو لـە پـاداش و تۆڵـەدا یەکسـانن. ٧– هـەوڵ بـدرێ ژیـان لەگەڵ چاکاندا بەڕێ بکرێ (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أنها قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَا أَسْمَعُ اللَّهَ ذَكَرَ النِّسَاءَ فِي الْهِجْرَةِ بِشَيْءٍ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ) (آل عمران: ١٩٥) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الْبُخَارِيِّ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ) ووافقه الذهبي و الواحدي في اسباب النزول والسيوطي في لباب المنقول

واتە: لە ئوم سەلەمەی دایکی ئیمانداران هاتووە خوا لێی ڕازی بێ : کە گوتویەتی ئەی نێرراوی خوا ، نابینم خوا لە قورئان باسی ئافرەتان بکات لە کۆچ کردن ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ)

## ٤- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٩٩) سورەتی (ال عمران)

(وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ١٩٩ )ال عمران

واتە : خاوەن نامەکانیش باوەڕداریان تێدایە: لە(ئەنەس)ـەوە دەگێڕنەوە کاتێ کە (نەجاشیی) مرد، پێغەمبەر (صلى الله علیە وسلم) فەرمووی: (إستغفروا لأخیکم ) داوای لێخۆشبوون بۆ براکەتان (نەجاشی) بکەن، کەچی خەڵکەکە وتیان: سەیرە فەرمانمان پێدەدا، داوای لێخۆشبوون بکەین بۆ کافرو خوانەناسێ کە لەوڵاتی

حەبەشەدا مردووە؟! ئەوجا ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: (وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ) بەراستیی لەخاوەننامەكاند واهەیە، باوەڕی بەخوا بەو بەقورئانە بۆئێوە نێردراوەو، بەو كتێبانەیش بۆ خۆیان رەوانەكراون هەیە، بۆ نموونە: (عەبدوڵای كوڕی سەلام) و هاوەڵەكانی و، (نەجاشی) و شوێنكەوتووەكانی باوەڕیان بەوانە هەبوو (خاشعين لله) خاكەڕان لەبەرامبەر خواداو لێیدەترسن و ملكەچی فەرمانەكانی ئەون (لا يشترون بآيات الله ثمنا قليلا) هەرگیز بەئایەتەكانی خوا بەهایەكی كەم ناكڕن ، هەرچی لەتەورات و ئینجیلییشدا هاتووە نایشارنەوە (أولئك لهم أجرهم عند ربهم) ئا ئەوانە لای پەروەردگاریان مزەو پاداشیان بۆهەیە (إن الله سريع الحساب) بێگومان خوا زۆر زوو بەكارو حیسابدا دەگات ، هیچی لێ ون نابێت، چونكە ئاگای لەهەمووشتێكە) (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ لَمَّا جَاءَ نَعْيُ النَّجَاشِيِّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلُّوا عَلَيْهِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ نُصَلِّي عَلَى عَبْدٍ حَبَشِيٍّ قَالَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لمن يُؤمن بِاللَّه وَمَا أنزل إِلَيْكُم) رواه النسائي قال الالباني صحيح و اورده السيوطي في لبان المنقول

واتە : لەئەنەسی كوڕی مالیكەوە هاتووە دەڵێ : كاتێ هەواڵی كۆچی دوایی (نەجاشی ) هات پێغەمبەر فەرمووی نوێژی لەسەر بكەن ، گوتیان ئەی نێرراوی خوا نوێژ بكەین لەسەر عەبدێكی حەبەشی ، ئەنەس دەڵێ : خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی : (وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ.

٢-عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى الله عَلَيهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَاتَ الْيَوْمَ عَبْدٌ صَالِحٌ أَصْحَمَةُ، فَقُومُوا فَصَلُّوا عَلَيْهِ، فَقَامَ فَأَمَّنَا فَصَلَّيْنَا عَلَيْهِ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ و مُسْلِمٌ

واتـه: لـهجابیری کـوڕی عهبـدولاّوه هـاتووه : کـه پێغهمبـهر فهرموویـهتی : ئیمـڕۆ بهندیهکی صالیح که ناوی (اصحمه) یه وهفاتی کرد ، ههڵسن نوێژی لهسهر بکـهن ، ئێمهش ههڵساین له دوای پێغهمبهر نوێژمان لهسهری کرد . (واته: صلاه الغائب)

٣-عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أُخْرُجُوا فَصَلُّوا عَلَى أَخٍ لَكُمْ) فَصَلَّى بِنَا، فَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ، فَقَالَ: (هَـذَا النَّجَاشِيُّ أَصْحَمَةُ) ، فَقَالَ الْمُنَافِقُونَ: انْظُرُوا هَذَا يُصَلِّي عَلَى عِلْجٍ نَصْرَانِيٍّ لَمْ يَرَهُ قَطُّ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَنْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ) (آل عمران: ١٩٩) تفسير الطبري

واته: له جابیری کوڕی عهبدولاّوه هاتووه : پێغهمبهر فهرموویهتی : وهرنـه دهرهوه نوێژ بکهن ، لهسهر براکهتان ، جا پێش نوێژی بۆ کردین ، چوار (الله اکبر) کـردن ، و فهرمووی (ئهوهی نهجاشی ئهصحهمهیه) ، جا مونافیقـهکان گوتیـان تهماشـاکه ، نوێژ لهسهر کهسێکی گاور دهکات کـه هـهرگیز نـهیبینیوه ، جـا خـوا ئـهم ئایهتـهی دابهزاندو فـهرموو(وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ) .

بۆ زانیاری : ئهم پادشای حهبهشه ناوی (اصحمه) بووه ، بهلاّم

١-پاشاکانی حهبهشه پێیان گوتونه (نجاشی)

٢- پاشاکانی فارس پێیان گوتونه (کیسرا )

٣-پاشاکانی ڕۆم پێیان گوتونه (هرقل )

**دەرسێك لەم ئایەتە : ( نموونەی دونیا ویستان و پێغەمبەر )**

(لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ١٩٦ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ١٩٧) ال عمران.

واتە: هاتووچۆی بێ باوەڕان لە ناو وڵاتداو بە دڵنیایی و بێ ئەوەی بترسن، نەتانخەڵەتێنێت و فریوی پێ نەخۆن و، وابزانن ئیتر هەروا ئەوەیان بۆ دەچێتە سەر، بێ ئەوەی شکست ڕوویان تێ بکات ، ئەو ئاسوودەییەی ئەوان خۆشی یەکی کەمە پاشان جێ و شوێنیان دۆزەخە ئای چ شوێنێکی بەدە.

**شوێنەواری حەسیر بە لاشەی موبارەکەی دیارە:**

(.....عن عُمَر بْن الْخَطَّابِ قال : فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى حَصِيرٍ فَجَلَسْتُ فَأَدْنَى عَلَيْهِ إِزَارَهُ وَلَيْسَ عَلَيْهِ غَيْرُهُ وَإِذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ فَنَظَرْتُ بِبَصَرِي فِي خِزَانَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا أَنَا بِقَبْضَةٍ مِنْ شَعِيرٍ نَحْوِ الصَّاعِ وَمِثْلِهَا قَرَظًا فِي نَاحِيَةِ الْغُرْفَةِ وَإِذَا أَفِيقٌ مُعَلَّقٌ قَالَ فَابْتَدَرَتْ عَيْنَايَ قَالَ مَا يُبْكِيكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ قُلْتُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ وَمَا لِي لَا أَبْكِي وَهَذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِكَ وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ لَا أَرَى فِيهَا إِلَّا مَا أَرَى وَذَاكَ قَيْصَرُ وَكِسْرَى فِي الثِّمَارِ وَالْأَنْهَارِ وَأَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصَفْوَتُهُ وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ فَقَالَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ أَلَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَنَا الْآخِرَةُ وَلَهُمْ الدُّنْيَا قُلْتُ بَلَى ....) مسلم

واتە : لەعومەری کوڕی خەتتابەوە هاتووە دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ، پاڵیدابویەوە لەسەر حەسیرێك ، دانیشتم لای کراسەکەی بەسەرخۆی دادایەوە ، لەوە زیاتری بەسەرەوە نەبوو ، شوێنەواری حەسیری بەسەر تەنشتیەوە دیار بوو ، وە تەماشای عەمبارەی زەخیرەی ماڵی پێغەمبەرم کرد ، چەند مستێك جۆی

تێدابوو ، نزیکەی صاعێك (صاع چوار مستە ، دەکاتە نزیکـەی دوو کیلـو) ، لەگـەڵ هێندێ مازوو (مازوو دیار بۆ پێست وشت خۆشکردن بەکاری دێ ) دەڵـێ چـاوەکانم پڕبوون لە ئاو ، فەرمووی ئەی عومەر بۆچی دەگری، گوتم ئەی نێـرراوی خـوا چـۆن نەگریم ، قەیسرەو کیسرا (پادشای ڕۆم و فارس) لە نازو نیعمەتدان لەباغ وروویـاری کۆشکەکاندان ، تۆش هەڵبژێردراوی خوای ، مەخزەن و کەندوەکەت ئـەوەی تێدایـە ، فەرمووی ئەی کوڕی خەتتاب ئایا ناتـەوێ قیامـەت بـۆ ئێمـە بـێ ، و دونیـاش بـۆ ئەوان ، گوتم بەڵێ......)

## من پاشا نیم کوڕی ئافرەتێکی هەژارم:

(عَنْ جَرِيرٍ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَاسْتَقْبَلَتْهُ رِعْدَةٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَوِّنْ عَلَيْكَ، فَإِنِّي لَسْتُ بِمَلِكٍ إِنَّمَا أَنَا ابْنُ امْرَأَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ، كَانَتْ تَأْكُلُ الْقَدِيدَ) الطبراني في الاوسط والحاكم قال الالباني صحيح

واتـە:ڕۆژێك پیاوێـك دیتـە لای پێغەمبـەر پیاوەکـە لـە ترسـان و هیبـەتی پێغەمبـەر دەلـەرزێ، ئـەویش پێـی دەفـەرمووی : مەلـەرزە خـۆ مـن پاشـا نـیم، مـن کـوڕی ئافرەتێکی قوریشیم هێنـدە هـەژار بـوو ، کوشـتە ڕەقـەی دەخـوارد (واتـە: هێنـدە هەژار بووین کۆشـتمان لەسـەر بـەرد دادەنـا تـاکو بەگـەرمای ڕۆژ سـۆر بێتـەوەئنجا بیخۆین) خۆزگە هەموو بەرپرسان ئاویان دەگوت.

**************************

# وتاری ژماره (٢٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (النساء) :

ئـەم سـورەتە لـە ریزبەنـدا (٤) چـوارەم سـورەتە ، و ژمـارەی ئایەتـەکانی (١٧٦) ئایەتە

بە کورتی ئەم سـورەتە : لـە سـورەتە دەرێـژەکانی مەدینەیـە ، پـڕە لـە ئـەحکامی شەرعی کە ژیانی موسڵمانان لە دەرەوە و ناوەوە رێك دەخـات ، باسـی ئافرەتـان دەکات و باسی ماڵ و خێزان و دەوڵەتداری دەکات.

–ئایا بۆچی ناوی لێنراوە سورەتی (النساء) چونکە زۆربەی ئەحکامـەکانی تایبـەتن بە ئیش و کاری ئافرەتان ، وەك (مارەیی ، و میرات ، چاکە کردن لەگـەڵ ئافرەتـان ، باسی مافی ئافرەت دەکات لەسەر پیاو ، وەمافی پیاو لەسەر ئافرەت .

–وە بە سوەڕتی (النسـاء) دەگـوترێ (النسـاء الکـبري) وە بـە سـورەتی تـەلاقیش دەگوترێ (النساء الصغرى) چونکە ئەویش باسی ئافرەتان دەکات.

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢) سورەتی (النسا)

(وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ٣) النساء

واتـە: وە ئەگـەر ترسـان دادپـەروەر نـەبن لـە(مـارەیی) ئـەو ئافرەتـە بـێ باوکانەدا(مارەیان مەکەن) ئەوە مارە بکەن لەو ئافرەتانەی حـەڵاڵن بۆتـان دوو دوو یا سیان سیان یا چوار چوار جا ئەگەر ترسان دادگەر نەبن ئەوە یەك ئـافرەت(مـارە

بکەن لە ئازادان) یان ئەو کەنیزەکانەی کە موڵکتانن ئەوە نزیکترە کە ستەم نەکەن یا هەژار نەکەون.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عن عُرْوَة أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى) قَالَتْ يَا ابْنَ أُخْتِي هَذِهِ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا فَيَرْغَبُ فِي جَمَالِهَا وَمَالِهَا وَيُرِيدُ أَنْ يَنْتَقِصَ صَدَاقَهَا فَنُهُوا عَنْ نِكَاحِهِنَّ إِلَّا أَنْ يُقْسِطُوا فِي إِكْمَالِ الصَّدَاقِ وَأُمِرُوا بِنِكَاحِ مَنْ سِوَاهُنَّ قَالَتْ وَاسْتَفْتَى النَّاسُ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ إِلَى وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ فَأَنْزَلَ اللَّهُ لَهُمْ أَنَّ الْيَتِيمَةَ إِذَا كَانَتْ ذَاتَ جَمَالٍ وَمَالٍ رَغِبُوا فِي نِكَاحِهَا وَنَسَبِهَا وَسُنَّتِهَا فِي إِكْمَالِ الصَّدَاقِ وَإِذَا كَانَتْ مَرْغُوبَةً عَنْهَا فِي قِلَّةِ الْمَالِ وَالْجَمَالِ تَرَكُوهَا وَأَخَذُوا غَيْرَهَا مِنْ النِّسَاءِ قَالَتْ فَكَمَا يَتْرُكُونَهَا حِينَ يَرْغَبُونَ عَنْهَا فَلَيْسَ لَهُمْ أَنْ يَنْكِحُوهَا إِذَا رَغِبُوا فِيهَا إِلَّا أَنْ يُقْسِطُوا لَهَا وَيُعْطُوهَا حَقَّهَا الْأَوْفَى فِي الصَّدَاقِ )رواه البخاري

(واتە: عوروەی کوڕی زوبەیر) مانای ئەم ئایەتەی (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى)ی لە خاتوو عایشەی پووری پرسیی و ئەویش گوتی: خوشکەزاکەم! لەسەردەمی جاهیلییەتدا کچۆڵەی هەتیوو بێ باب دەکەوتە لای کەسێك کە سەرپەرشتیاری بکا، هەتا گەورە دەبوو، ئەوجا هەرچی هەبوو تێکەڵیماڵەکەی خۆی دەکرد، پاشان لە بەرماڵەکەی حەزی لێدەکردو، دەیویست بەمارەیەکی کەمتر لە ژنانی تر مارەی بکاو بەشووی بدات، جا بۆ راستکردنەوەی ئەو هەڵەیەو، لابردنی ئەوستەمە لەژنان، خوا رێی لێگرتن و فەرمووی: یا ئەوەیە کەمارەیی شیاوی خۆیانیان بدەنێ، ئەوسا مارەیان بکەن، وەیان بچن ژنانی تر مارەبکەن، جا عائیشە

دەڵێ لەپاش دابەزینی ئەم ئایەتە خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەر دەکرد ، و ئـەم ئایەتـەش دابـەزی (وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا ١٢٧ (النساء)

واتە: وە(ئەی موحەممەد(صلى اللـه عليـه وسـلم) پرسـیارت لـێ دەکـەن دەربـارەی ئافرەتـان بڵـێ خـوا وەڵامتـان دەداتـەوە دەربارەیـان وە ئـەوەی بەسـەرتاندا دەخوێنرێتەوە لە قورئاندا(وەڵامێکە) لە بارەی کچانی هەتیووەوە ئەوانـەی پـێ یـان نـادەن ئـەوەی نووسـراوە بۆیـان(واتـە میراتـی باوکیـان) وە حـەز ناکـەن مارەیـان بکەن(لەبەر میراتەکەشیان نـاهێڵن شـوو بکـەن) وە لـەبارەی ئـەو منداڵانـەی کـە بـێ دەسەڵاتن وە(خوا فەرمان دەدات) بـە دادگـەری لەگـەڵ هـەتیوان دا بجوڵێنـەوە وە هـەر کردەوەیـەکی بـاش بکـەن ئـەوە بێگومـان خـوا بـە ئاگایـە لـێ ی) (پوختـەی تەفسیر)

جا بێگومان ئەگەر یەتیمەکە جوان و خـاوەن مـاڵ بوایـە ماریـان دەکـرد و ئەگـەر جوانیش نەبوایە وازیان لێ دەهێنا ، لەپاش ئەم ئایەتە بۆیان نـەبوو ماریـان بکـەن مەگەر حەق و مافی تەواویان بدەنێ .

## بۆ زانین :

١- ئایا دادگـەری لـە چـیدا دەکرێـت ؟ شـەرعزانان دەڵـێن (فی السـكنی و والكسـوه والنفقـه والمبیـت) لـەم چـوارە ئینسـان دەتـوانی دادگـەری بکـات ، بـەلام لـە خۆشەویستی لە نێوانیان ئافرەتان ناتوانرێت دادگەری بکرێت .

٢-مانای ئەم ئایەتە (وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ) النساء(١٢٧) واتـە رەغبـەتیان لێ نیە بیان هێنن

له ئایەتی (٤) خوا باسی مارەیی ئافرەتان دەكات

﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ٤﴾ النساء

واته: بیدەن بە ئافرەتان(نەك كەس وكاریان) مارەییەكانیان وەك بەخشین نەك وەك كرێ ئینجا ئەگەر بە دڵ پێیان خۆش بوو بەخشینی شتێك لەو(مارەیی یە) بە ئێوە ئەوە ئێوە بیخۆن بە خۆشی و حەڵاڵی نۆشی گیانتان بێ.(واتە: وەك دیاری بێ بەرامبەر) .

پ/ جاری وایە پیاوەكە ئاتاجە ئایا دروستە پیاوەكە لە مارەیەكەی بخوات (بۆ نمونە ژنەكە پارەی و زەوی هەیە ؟ وەلاّم : ئەگەر ژنەكە لە شەرمان بوو حەلاّل نیە بیخوات.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٦) سورەتی (النسا)

﴿وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَأۡكُلُوهَآ إِسۡرَافٗا وَبِدَارًا أَن يَكۡبَرُواْۚ وَمَن كَانَ غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِذَا دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ فَأَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ٦﴾ النساء

واته: هەتیوان تاقی بكەنەوە هەر كاتێك گەیشتنە(تەمەنی) ژن هێنان و شووكردن ئینجا ئەگەر هەستان كرد لەواندا ژیری(و پێگەیشتن) ئەوە سامان و ماڵەكانیان پێ بدەنەوە ماڵەكانیان مەخۆن بە زیادەڕەوی و بەپەلە نەوەك گەورە ببن (و لێتان وەرگرنەوە) وە هەر كەس لەسەرپەرشتیاری هەتیوان دەوڵەمەند بوو با خۆی بگرێتەوە لە(خواردنی ماڵیان) وە هەر كەس لەوان هەژار بوو با(لێ ی) بخوات بە

ئەندازەی پێویست ئینجا هەر کات ماڵی هەتیوەکانتان دایەوە پێیان ئەوە شایەتیان لەسەر بگرن بەسە خوا بۆ لێپرسینەوەو(بەسەرتان)ەوە

ئایا دروستە لەماڵی یەتیم بەکاربێنی ؟

وەڵام : زانایان دوو رایان هەیە :١- لیٚ بەکاربێنی بەقەرز دوای بیداتەوە

٢- لێی بەکاربێنیٚ چونکە سەرپەرشتیان دەکات و کارکاسبی لەسەر دادەنیٚ

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ (مَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ) (النساء: ٦): إِنَّهَا نَزَلَتْ فِي وَالِي الْيَتِيمِ ، إِذَا كَانَ فَقِيرًا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهُ مَكَانَ قِيَامِهِ عَلَيْهِ بِالْمَعْرُوفِ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ و مُسْلِمٌ

واتە: لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە خوا لێی رازی بیٚ دەربارەی قسەی خوا (مَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ) دەڵیٚ ئەم ئایەتە دابەزیوە دەربارەی سەرپەرشتیاری یەتیم ، ئەگەر هەژار بوو ، لە ماڵەکەی دەخوات بەرامبەر ئەوەی سەرپەرشتی دەکات و ئاگای لێیە و کاروکاسبی لەسەر دەدەنیٚ ، بەڵام بە پێی پێویستی دەیخوات.

**وفى روايه**(( نَزَلَتْ فِي ثَابِتِ بْنِ رِفَاعَةَ وَفِي عَمِّهِ وَذَلِكَ أَنَّ رِفَاعَةَ تُوُفِّيَ وَتَرَكَ ابْنَهُ ثَابِتًا وَهُوَ صَغِيرٌ، فَأَتَى عَمُّ ثَابِتٍ إلى النبي صلى اللَّه عليه وسلم، فقال له: إِنَّ ابْنَ أَخِي يَتِيمٌ فِي حِجْرِي فَمَا يَحِلُّ لِي مِنْ مَالِهِ، وَمَتَى أَدْفَعُ إِلَيْهِ مَالَهُ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ.) اخرجه الواحدي ،قال زغلول، اخرجه السيوطي في الدر (٢/ ١٢٢) وعزاه لعبد بن حميد وابن جرير عن قتادة.

واته:دەربارەی سابیتی کوڕی ریفاعە ومامی دابەزیوە ، ریفاعە وەفات دەکات ، کوڕێکی لە پاش بەجێ دەمێنێ ناوی سابیتە، مامی دێتە لای پێغەمبەر پێ دەڵێ: کوڕی برام یەتیمە لە ماڵی منە، ئایا چ لەماڵی ئەو بۆ من حەلالە، وە کەی ماڵەکەی بدەمەوە دەست خۆی، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند

## چەند فەرموودەیەك دەربارەی (یەتیم) :

١-(أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: لَيْسَ لِي مَالٌ، وَلِي يَتِيمٌ؟ فَقَالَ: كُلْ مِنْ مَالِ يَتِيمِكَ، غَيْرَ مُسْرِفٍ وَلَا مُبَذِّرٍ ، وَلَا مُتَأَثِّلٍ مَالًا، وَمِنْ غَيْرِ أَنْ تَقِيَ مَالَكَ – أَوْ قَالَ – تَفْدِيَ مَالَكَ بِمَالِهِ) رواه احمد قال ارنؤط صحيح لغيره ، فال الالباني (حسن) والترمذ والنسائي والبيهقي عن ابن عمرو. الإرواء

واتە: پیاوێك لە پێغەمبەری پرسیارکرد گوتی : هیچ ماڵ وسامانم نیە، و یەتیمم هەن ، پێی فەرموو بخۆ لە ماڵی یەتیمەکانت ، بەلأم زێدەڕۆی نەکەی . واتە: ئەوەندی موحتاجی.

(وَالتَّأَثُّلُ: اتِّخَاذُ أَصْلِ الْمَالِ حَتَّى كَأَنَّهُ عِنْدَهُ قَدِيمٌ ، غير متأثل أي غير جامع يقال مال مؤثل أي مجموع ذو أصل وأثلة الشيء أصله

٢-(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مِمَّا أَضْرِبُ يَتِيمِي؟ قَالَ: (مِمَّا كُنْتَ ضَارِبًا مِنْهُ وَلَدَكَ غَيْرَ وَاقٍ مَالَكَ بِمَالِهِ ، وَلَا مُتَأَثِّلٍ مِنْ مَالِهِ مَالًا) المعجم الضغير للطبراني

واته: لەجابیری کوڕی عەبدوڵاوە هاتووە دەڵێ : گوتم ئەی نێرراوی خوا چۆن لەماڵە یەتیمەکانم بدەم ، فەرمووی چۆن لەماڵەکانی خۆت دەدەی بەم شێوەش لەوان بدە.

## هۆی دابەزینی ژمارە ( ٧ ) لە سورەتی ( النساء)

﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنۡهُ أَوۡ كَثُرَۚ نَصِيبًا مَّفۡرُوضًا ٧﴾ النسا

واتە: بۆ پیاوان هەیە بەشێك لە ئەو(میراتەی) بەجێ ی دێڵن دایك و باوك و خزمە نزیکەکان وە بۆ ئافرەتانیش هەیە بەشێك لە ئەو(میراتەی) بەجێ ی دێڵن دایك و باوك و خزمە نزیکەکان لە ئەوەی(بەجێ ی دێڵن) کەم بێت یان زۆر بەبەشێکی بڕیار دراو.(پوختەی تەفسیر)

( قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: إِنَّ أَوْسَ بْنَ ثَابِتٍ الْأَنْصَارِيَّ تُوُفِّيَ وَتَرَكَ امْرَأَةً يُقَالُ لَهَا: أُمُّ حُجَّةَ وَثَلَاثَ بَنَاتٍ لَهُ مِنْهَا، فَقَامَ رَجُلَانِ: هُمَا ابْنَا عَمِّ الْمَيِّتِ وَوَصِيَّاهُ، يُقَالُ لَهُمَا: سُوَيْدٌ وَعَرْفَجَةُ، فَأَخَذَا مَالَهُ وَلَمْ يُعْطِيَا امْرَأَتَهُ وَلَا بَنَاتَهُ شَيْئًا، وَكَانُوا فِي الْجَاهِلِيَّةِ لَا يُوَرِّثُونَ النِّسَاءَ وَلَا الصَّغِيرَ وَإِنْ كَانَ ذَكَرًا، إِنَّمَا يُوَرِّثُونَ الرِّجَالَ الْكِبَارَ، وَكَانُوا يَقُولُونَ: لَا يُعْطَى إِلَّا مَنْ قَاتَلَ عَلَى ظَهْرِ الْخَيْلِ وَحَازَ الْغَنِيمَةَ. فَجَاءَتْ أُمُّ حُجَّةَ إِلَى رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَوْسَ بْنَ ثَابِتٍ مَاتَ وَتَرَكَ عَلَيَّ بَنَاتٍ وَأَنَا امْرَأَتُهُ، وَلَيْسَ عِنْدِي مَا أُنْفِقُ عَلَيْهِنَّ، وَقَدْ تَرَكَ أَبُوهُنَّ مَالًا حَسَنًا وَهُوَ عِنْدَ سُوَيْدٍ وَعَرْفَجَةَ، لَمْ يُعْطِيَانِي وَلَا بَنَاتِهِ مِنَ الْمَالِ شَيْئًا، وَهُنَّ فِي حِجْرِي، وَلَا يُطْعِمَانِي وَلَا يَسْقِيَانِي وَلَا يَرْفَعَانِ لَهُنَّ رَأْسًا. فَدَعَاهُمَا رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، فَقَالَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلَدُهَا لَا يَرْكَبُ فَرَسًا، وَلَا يَحْمِلُ كَلًّا، وَلَا يُنْكِي عَدُوًّا. فَقَالَ رسول اللَّه صلى اللَّه

عليه وسلم انْصَرِفُوا حَتَّى أَنْظُرَ مَا يُحْدِثُ اللَّهُ لِي فِيهِنَّ. فَانْصَرَفُوا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ.) الواحدي قال كمال بيسوني : اخرجه السيوطي في الدر (٢/ ١٢٢) ، لباب النقول ص ٧٠.وقد ذكر هذه القصة الحافظ ابن حجر في الإصابة (١/ ٨٠) في ترجمة أوس بن ثابت.

واته: توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەوسی کوڕی سابیتی ئەنصاری وەفاتی کرد، ئافرەتێکی لەپاش بەجێ ما، بەناوی دایکی (حوججە) و سێ کچی ، دوو پیاوی ئامۆزای مردوەکە بەناوی (سوید و عەرفەجە) ماڵەکەیان هەموو برد هیچیان نەدایە ژنەکەو دوو کچەکەی ، لە زەمانی جاهیلی ئافرەت و منداڵ میراتیان نەدەگرت، منداڵ ئەگەر نێرش بوایە میراتی نەدەگرت، تەنها پیاوە گەورەکان میراتیان دەگرت، جا ئافرەتەکە هاتە لای پێغەمبەر گوتی: ئەی نێرراوی خوا ئەو وەفاتی کردوە کچی لە دوا بەجێ ماوە و منیش خێزانی ئەوم، هیچم نیە بەخێویان بکەم، بابیان ماڵێکی زۆری بەجێهێشت بەڵام (سوید و عەرفەجە) هەموویان برد، ئەوان نەخوارد و خواردنەوەیان نادەنێ، پێغەمبەر بانگی هەردووکیان کرد، ئەوانیش گوتیان: ئەی نێرراوی کوڕی ئەو ژنە ناتوانی سواری وەلاخ بێ و باری پێ بارناکرێ، و شەڕی پێ ناکرێ لەگەڵ دوژمن (لەزەمانی میرات نادرایە منداڵ) پێغەمبەر فەرمووی : بڕۆن بزانن خوا چ بریارێك دەربارەیان دەدات ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند

**هۆی دابەزینی ژمارە (١٠) لە سورەتی (النسا)**

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ١٠﴾

واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی کە ماڵی هەتیوەکان دەخۆن بەستەم و ناڕەوا بەڕاستی ئەوانە بەس لە سکی خۆیان ئاگر دەخۆن وە لەمەوپاش دەچنە ئاگرێکی بەتین و هەڵگیرساوەوە.

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

( قَالَ مُقَاتِلُ بْنُ حَيَّانَ: نَزَلَتْ فِي رَجُلٍ مِنْ غَطَفَانَ يُقَالُ لَهُ: مَرْثَدُ بْنُ زَيْدٍ، وَلِيَ مَالَ ابْنِ أَخِيهِ وَهُوَ يَتِيمٌ صَغِيرٌ فَأَكَلَهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ هَذِهِ الْآيَةَ.)اخرجه الواحدي ، إصابة (٣/ ٣٩٧) في ترجمة مرثد بن زيد الغطفاني.

واتە: موقاتیلی کوڕی حەییبان دەڵێ: دەربارەی پیاوێکی غەتەفانی دابەزیوە بەناوی (مەرسەدی کوڕی زەید) سەرپەشتیاری ماڵی یەتیمەکانی براکەی بوو، بەلاَم ماڵی خواردن ، جا ئەو ئایەتەی لەسەر دابەزی

**٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (١١) سورەتی (النسا)**

﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ

يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١١) النساء

واته: خوا ئامۆژگاریتان دەكات دەربارەی(كەلەپوری) ڕۆڵەكانتان بۆ نێرێك هەیە (لە میرات) بـە وێنـەی بەشـی دوو مـێ خـۆ ئەگـەر(منداڵـەكانتان) تـەنها ئـافرەت بـوون (دووان و) زیاد لەدووان ئەوا بۆیان هەیە دوو بەش لە سێ بەشی ئـەوەی مردووەكـە بەجێ ی هێشتوە بەڵام ئەگەر یەك ئافرەت بوو ئەوە نیوەی (میراتەكـەی) بـۆ هەیـە وە بۆ هەر كام لە دایك و باوكی مردووەكـە هەیـە شـەش یـەك لـەوەی كـە بـەجێ ی هێشتوە ئەگەر مردووەكە منداڵی هەبوو بەڵام ئەگەر مردوەكە منداڵی نەبوو، و دایك و بـاوكی مـیرات گـری بـوون ئـەوە سـێ یـەك بـۆ دایكەكەیـەتی لـەپاش دەزكردنـی وەسیەتێك وەسێتی پێ كرابێ (لە لایـەن مردووەكـەوە) یـان دانـەوەی قـەرزێك (كـە لەسەری بێت) باوكەكانتان و كوڕەكانتان نـازانن كامـەیان بەسـوود تـرن بۆتـان ئـەو دابەش كردنە لە لایەن خواوە پێویست كراوە بەڕاستی خوا هەمیشە زانای دانایە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە چوار گێرانەوە هەیە:

١-( عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ عَادَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبُو بَكْرٍ فِي بَنِي سَلِمَةَ مَاشِيَيْنِ فَوَجَدَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا أَعْقِلُ شَيْئًا فَدَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهُ ثُمَّ رَشَّ عَلَيَّ فَأَفَقْتُ فَقُلْتُ مَا تَأْمُرُنِي أَنْ أَصْنَعَ فِي مَالِي يَا رَسُولَ اللَّهِ فَنَزَلَتْ يُوصِيكُمْ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ .......) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ ومسلم

واتە: لە جابیرەوە هـاتووە :خـوا لێـی رازی بـێ دەڵـێ: نـەخۆش بـووم پێغەمبـەرو ئەبوبوبكر سەردانیان كردم ، لەبەنی سـەلەمە بە پیـادەبوون ، پێغەمبـەر بینیمـی

ئاگام له خۆ نییه، داوای کرد ئاوێکیان بۆ هێنا ودەستنوێژێکی لێ گرت و پرژاندییه دەم وچاوم ، به ئاگا هاتمەوه ، گوتم فەرمانی چیم پێ دەکەی ئەی نێرراوی خوا لـه ماڵ و سامانم ، جا ئەم ئایەتـه دابەزی (يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ..............)

٢-( عَنْ جَابِرٍ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةُ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَاتَانِ ابْنَتَا سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ قُتِلَ أَبُوهُمَا مَعَكَ فِي يوم أُحد شَهِيدًا، وَإِنَّ عَمَّهُمَا أَخَذَ مَالَهُمَا فَلَمْ يَدَعْ لَهُمَا مَالًا وَلَا يُنْكَحَانَ إِلَّا وَلَهُمَا مال، فقال:(يَقضي اللهُ في ذلكَ) فَنَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى عَمِّهِمَا فَقَالَ: (أَعْطِ ابْنَتَيْ سَعْدٍ الثُّلُثَيْنِ، وَأُمَّهُمَا الثُّمُنَ، وَمَا بَقِيَ فهو لك) (رَوَاهُ أَحْمَدُ وَأَبُو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِيُّ وَابْنُ مَاجَهْ) (الثُّلُثَيْنِ) دوو لەسەر سێ

واته: له جابیرەوه هاتووه : دەڵێ خێزانی سەعدی کوڕی ڕەبیع هاته لای پێغەمبەر ، گوتی ئەی نێرراوی خوا ئەوانه دوو کچی سەعدن بابیان لەشەڕی ئوحد لەگەڵ تۆدا بوو شەهید بووە، مامیان هات هەموو ماڵی بردن ، کەسیش مارەیان ناکات چونکه ماڵیان نیه، پێغەمبەر فەرمووی خوا بڕیاریان بۆ دەدات ، جا ئایەتی میرات دابەزی ، پێغەمبەر ناردی به دوای مامیان ، فەرمووی (دوو سێیەك بدە کچەکانی سەعد ، وه هەشتێك بدە دایکیان ، ئەوەی مایەوه بۆ خۆت .

٣-( عَنِ السُّدِّيِّ قَوْلَهُ: يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ قَالَ:

كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ لَا يُوَرِّثُونَ الْجَوَارِيَ وَلا الضُّعَفَاءَ مِنَ الْغِلْمَانِ، لَا يَرِثُ الرَّجُلَ مِنْ وَلَدِهِ إِلا مَنْ أَطَاقَ الْقِتَالَ. فَمَاتَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ أَخُو حَسَّانَ الشَّاعِرِ، وَتَرَكَ امْرَأَةً لَهُ يُقَالُ لَهَا: أُمُّ كَجَّةَ، وَتَرَكَ خَمْسَ جِوَارٍ، فَجَاءَتِ الْوَرَثَةُ فَأَخَذُوا مَالَهُ، فَشَكَتْ أُمُّ كَجَّةَ ذَلِكَ

إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ هَذِهِ الآيَةَ: (فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ) تفسير ابن ابي حاتم

واته: لـه سـوودی تابیعیـەوە هـاتووە دەڵێ ئـەم ئایەتـە (يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ) خـەڵکی سـەردەمی نـەزانی میراتیـان نەدەدایـە ژنـان و مندالأن ، مندال میراتی لە باوکی ناگرت مەگەر شەری پێ کرابـا، جـا (عبـدالرحمن ) برای حەسسانی شاعیر وەفاتی کـرد ، ژنێکـی لـە پـاش بـەجێما پێیـان دەگـوت (ام کجـە) لەگـەل (٥) کچـان ، میراتگرانـی هـاتن هـەموو مالەکـەیان بـرد ، (ام کجـە) سکالای برد لای پێغەمبەر جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفـەرمووی : (فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ)

٤-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ (يُوصِيكُمُ اللهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ) (النساء: ١١)، قَالَ: كَانَ الْمِيرَاثُ لِلْوَلَدِ، وَكَانَتِ الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ، فَنَسَخَ اللهُ مِنْ ذَلِكَ مَا أَحَبَّ، فَجَعَلَ لِلْوَلَدِ الذَّكَرِ مِثْلَ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ، وَجَعَلَ لِلْوَالِدَيْنِ السُّدُسَيْنِ، وَجَعَلَ لِلزَّوْجِ النِّصْفَ أَوِ الرُّبُعَ، وَجَعَلَ لِلْمَرْأَةِ الرُّبُعَ أَوِ الثُّمُنَ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : دەربارەی ئـەو ئایەتـەی (يُوصِيكُمُ اللهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ) دەڵێ : میرات بۆ کوڕان بوو ، وەسیەتیش بۆ دایك وباوك بوو، جا خوا ئەمەی نەسخ کردەوە ، دووبەشی بۆ کوڕ داناو ، و شەشێکی بۆ دایك وباب، و بۆ مێرد نیوە یان وچوارێکی دانا ، بۆ ژنـیش چـوارێك یـان هەشـتێکی دانا.

## هەندێ زانیاری دەربارەی میرات:

١-ئەگەر میراتگرەکان کچ بوون بێ برا ، دوو لەسەر سێیان بۆ هەیە ، بەلام ئەگەر کچ بەتەنیا بوو نیوەی دەبات ، باوکی و دایکی یەك لەسەر شەش ، بەلام ئەگەر مردو منداڵی نەبوو (دایکی یەك لەسەر سێ ، بابیش دوو لەسەر سێ دەگرن )

٢-(ئەگەر ژن مرد، مێرد نیوەی میراتی دەگرێ مادام مندالی نیە ، بەلام ئەگەر مندالی هەبوو چوارێکی بۆ هەیە)

# وتاری ژماره (٢٩) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٩) سورەتی (النساء)

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ١٩)النساء

واتە: بە زۆرداریی ژنان مەكەنە ماڵە میرات: (ئیبن عەباس) دەڵێت: لەسەردەمی نەفامییدا ئافرەت هەروەكو كەلەپوور ئەم دەست و ئەودەستی پێدەكرا، ئەر كەسێك مردبا، خزم وكەس وكارەكەی، دەهاتن یا ژنەكەیان مارە دەكرد، وە یان ئەیاندا بە كابرایەكی تر، یان نەیان دەهێشت جارێكی تر مێرد بكاتەوە، ئەوجا خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئەوكەسانەی بڕواتان هێناوە! بۆئێوە ڕەوانییە بە زۆرداری ژنان بكەنە میرات و دەستیان بەسەرابگرن نابێ تەنگەتاویان بكەن و ئازاریان بدەن، لەبەرئەوە كە لەهەندێ لەومارەییەی پێتانداون دەسهەڵگرن جامەگەر بەئاشكرا داوێن تەڕیی و زینا بكەن، یان هەركارێكی تری نابەجێ بكەن، دیارە ئەوكاتە ڕەوایە ناچار بكرێن و تەڵاق بدرێن بە باوونەریتێكی پەسەند و جوان هاوكارییان بكەن و مامەڵەتان چاك بێت لەگەڵیاندا، وەكو ئێوە چاوەڕوانی چاكە لەوانە دەكەن ئینجا ئەگەر بەهۆی لاسارییانەوە ژیان لەگەڵیاندا نەدەگونجا ددان بەخۆتاندا بگرن و ئێوە هەرچاك بن چونكە گەلێ شتی واهەیە ئێوە خۆشتان لێنایە، كەچی خوا خێرو چاكەیەكی زۆری تیا داناوە.(ڕامان)

بــه كــورتى : ناچــاريان مەكــەن تــاكو خۆيــان داوى جيابونــەوه بكــەن و ماريەكــەى بداتەوه ،١- پياوەكه مارەيەكەى لىٚ حەرامە ، ٢- ئافرەتەكه بۆى هەبــه شــكايەت بكــات مارەيەكــەى لــىٚ وەرگريٚتــەوه، هەنــدىٚ دەلٚــيٚن :(فاحشــه مبينــه)ليٚردا واتــه نەگوجان لەگەل ميٚردا.

## ئايا بۆچى ئافرەت ويٚناكراوه به پەراسوو؟

دوو فەرموودە دەربارەى (تشبيه) ئافرەت به بەپەراسوو:

١-( عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ الْمَرْأَةَ كَالضِّلَعِ إِذَا ذَهَبْتَ تُقِيمُهَا كَسَرْتَهَا وَإِنْ تَرَكْتَهَا اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَفِيهَا عِوَجٌ) صحيح مسلم

واته: له ئــەبو هــوريرەوه هــاتووه دەلٚــىٚ: پيٚغەمبــەر فەرموويــەتى : ئــافرەت وەكــو پەراسوو وايه ، ئەگەر بچى راستى كەيتەوه دەشكىٚ ، ئەگەر بەم شيٚوه لىٚ گەريٚى ، سوودى لىٚ دەبينى ، بەخوارى دەمينيٚتەوه لەگەلٚى دەگوزەيٚى.

٢-( عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ لَنْ تَسْتَقِيمَ لَكَ عَلَى طَرِيقَةٍ فَإِنْ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَبِهَا عِوَجٌ وَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهَا كَسَرْتَهَا وَكَسْرُهَا طَلَاقُهَا )صحيح مسلم

واته: ئافرەت دروستكراوه لــه پەراســوو (واتــه: لــه شــيٚوەى پەراســووه بــۆت راســت ناكريٚتەوه) ، ئەگەر بتەوىٚ سوودى لــىٚ دەبــينى و خواريشــى هەيــه ، ئەگــەر بتــەوىٚ راستى بكەيتەوه دەشكىٚ ، شكانەكەشى تەلاقدانيەتى .

تيٚبينى : ئافرەت بەخوارى خۆى جوانه ، چونكه پەراسوو به خوارى خۆى قەفەســى سينگ دەپــاريزى ، ئــافرەتيش بــەم شروشــتەى هەيــەتى ئــەتوانى كارەكــانى خــۆى

ئەنجام بدات ، وەك دایكایەتی و جیّ بەجیّ كردنی كاری سەرجیّ ی و مـالّ و میـوان و سۆز ، ناسكی ............)

## ئافرەت مەبوغزێنن:

(قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَا يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ) رَوَاهُ مُسلم (لَا يَفْرَكْ) واتە: نەی بوغزێنیّ

واتـە: بـا هـیچ پیـاوێكی ئیمانـدار هـیچ ئـافرەتێكی ئیمانـدار نـەبوغزێنیّ ، (دیـارە بائـافرەتیش پیـاو نـەبوغزینیّ ) ئەگـەر رقـی لـە سـیفەتێكی خراپـی بـوو ، ئـەوە سیفەتێكی دیكەی باشی هەیە .

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە سیّ گێرانەوە هەیە:

١-(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ قَالَ كَانُوا إِذَا مَاتَ الرَّجُلُ كَانَ أَوْلِيَاؤُهُ أَحَقَّ بِامْرَأَتِهِ إِنْ شَاءَ بَعْضُهُمْ تَزَوَّجَهَا وَإِنْ شَاءُوا زَوَّجُوهَا وَإِنْ شَاءُوا لَمْ يُزَوِّجُوهَا فَهُمْ أَحَقُّ بِهَا مِنْ أَهْلِهَا فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي ذَلِكَ ) رواه البخاري

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەربارەی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ) دەلّیّ ئەگەر پیاوێـك مردبایـە ، كەس وكاری لە پێشتر بوون لە ژنەكەی ، ئەگەر حەزیان كردبایە خۆیـان مارەیـان دەكـردەوە ، ئەگـەر حەزیشـیان كردبایـە لـە خـەڵكیان مـارە دەكـردەوە ، ئەگـەر حەزیشیان كردبایە مارەیان نەدەكردەوە ، جا ئەم ئایەتە دابەزی .

٢-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَوْلَهُ: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهاً قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا مَاتَ وَتَرَكَ جَارِيَةً، أَلْقَى عَلَيْهَا حَمِيمَةً ثَوْبِهِ، فَمَنَعَهَا، فَإِنْ كَانَتْ جَمِيلَةً تَزَوَّجَهَا، وَإِنْ كَانَتْ ذَمِيمَةً حَبَسَهَا حَتَّى تَمُوتَ فَيَرِثُهَا) تفسير ابن ابي حاتم

واته: له ئیبنـو عەباسـەوە هـاتووە دەربـارەی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ) دەڵـێ ئەگـەر پیاوێـك مردبایە و ئافرەتێکی لە پاش بەجێمابایە ، ئەوە پارچە پەڕۆیـەکیان بەسـەر دادەدا ، قەدەغە دەکرا و بـۆ خـۆی داگـیری دەکـرد ، ئەگـەر جـوان بوایـە مـاری دەکـرد و ئەگەر ناشیرین بوایە دەیهێشتەوە تاکو دەمرد و میراتی لێ دەگرت.

٣-(قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: كَانَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَفِي أَوَّلِ الْإِسْلَامِ إِذَا مَاتَ الرَّجُلُ وَلَهُ امْرَأَةٌ، جَاءَ ابْنُهُ مِنْ غَيْرِهَا أَوْ قَرِيبُهُ مِنْ عَصَبَتِهِ، فَأَلْقَى ثَوْبَهُ عَلَى تِلْكَ الْمَرْأَةِ فَصَارَ أَحَقَّ بِهَا مِنْ نَفْسِهَا وَمِنْ غَيْرِهِ، فَإِنْ شَاءَ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا تَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ صَدَاقٍ إِلَّا الصَّدَاقَ الَّذِي أَصْدَقَهَا الْمَيِّتُ، وَإِنْ شَاءَ زَوَّجَهَا غَيْرَهُ وَأَخَذَ صَدَاقَهَا وَلَمْ يُعْطِهَا شَيْئًا، وَإِنْ شَاءَ عَضَلَهَا وَضَارَّهَا لِتَفْتَدِيَ مِنْهُ بِمَا وَرِثَتْ مِنَ الْمَيِّتِ، أَوْ تَمُوتُ هِيَ فَيَرِثُهَا، فَتُوُفِّيَ أَبُو قَيْسِ بْنُ الْأَسْلَتِ الْأَنْصَارِيُّ، وَتَرَكَ امْرَأَتَهُ كُبَيْشَةَ بِنْتَ مَعْنٍ الْأَنْصَارِيَّةَ فَقَامَ ابْنٌ لَهُ مِنْ غَيْرِهَا يُقَالُ لَهُ: حِصْنٌ، وَقَالَ مُقَاتِلٌ: اسْمُهُ قَيْسُ بْنُ أَبِي قَيْسٍ، فَطَرَحَ ثَوْبَهُ عَلَيْهَا فَوَرِثَ نِكَاحَهَا، ثُمَّ تَرَكَهَا فَلَمْ يَقْرَبْهَا وَلَمْ يُنْفِقْ عَلَيْهَا، يُضَارُّهَا لِتَفْتَدِيَ مِنْهُ بِمَالِهَا، فَأَتَتْ كُبَيْشَةُ إِلَى رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا قَيْسٍ تُوُفِّيَ وَوَرِثَ ابْنُهُ نِكَاحِي، وَقَدْ أَضَرَّ بِي وَطَوَّلَ عَلَيَّ، فَلَا هُوَ يُنْفِقُ عَلَيَّ وَلَا يَدْخُلُ بِي، وَلَا هُوَ يُخْلِي سَبِيلِي. فَقَالَ لَهَا رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم: اُقْعُدِي فِي بَيْتِكَ حَتَّى يَأْتِيَ فِيكِ أَمْرُ اللَّهِ. قَالَ: فَانْصَرَفَتْ، وَسَمِعَتْ بِذَلِكَ النِّسَاءُ فِي الْمَدِينَةِ، فَأَتَيْنَ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم وَقُلْنَ: مَا نَحْنُ إِلَّا كَهَيْئَةِ كُبَيْشَةَ غَيْرَ أَنَّهُ لَمْ يَنْكِحْنَا

الْأَبْنَاءُ، وَنَكَحَنَا بَنُو الْعَمِّ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ ) ذكره السيوطي في لباب النقول (ص ٧٢) وعزاه لابن جرير وابن أبي حاتم بإسناد حسن

واته: توێژەرەوانی قورئان دەڵێن : خەڵکی مەدینە لە زەمانی جاهیلی و سەرەتای ئیسلام ئەگەر پیاوێك مردبایە و ژنی لەپاش بەجێمابایە ، زڕ کوڕی دەهات یان خزمێکی پیاوەکە پارچە قوماشێکی بەسەر دادەدا بۆخۆی دەستی بەسەردا دەگرت ، جا ئەگەر حەزی کردبایە مارەی دەکردەوە بە بێ مارەیی ، وە ئەگەر حەزی کردبایە بەمێردی دەدایەوە مارەیەکەی بۆ خۆی وەردەگرت ، هیچی نەدەدایە ژنەکە ، وە ئەگەر حەزیشی کردبایە ئەوها دەیهێشتەوە ، جا کابرایەك مرد ناوی (ابو قیس کوڕی ئەسلەتی ئەنصاری بوو ، خێزانێکی لە پاش بەجێما ناوی (کبیشەی کچی مەعنی ئەنصاری) بوو ، جا زڕ کوڕەکەی بەناوی (حیصن) بوو ، موقاتیل دەڵێ : ناوی (قەیسی کوری ئەبی قەیس) بوو ، قوماشەکەی بەسەردادا و مارەکردنی بە میرات گرت ، بەم شێوە هێشتیەوە نەنزیکی کەوتەوە ، نە مەسروفی دەکرد ، تاکو ناچاری بکات دەستبەرداری ماڵەکەی بێ ، جا (کبیشە) چووە لای پێغەمبەر گوتی ئەی نێرراوی خوا ، ئەبا قەیس مردوە کوڕەکەی مارەکردنی منی بە میرات گرتووە ، زیانی لێداوم لە مێژە ، نەمەسروفم دەکات ، نە سەرجێی ، نە لێم دەگەڕێ بۆ خۆم ئازادبم ، پێغەمبەر فەرمووی لە ماڵی خۆت دانیشە تاکو خوا بڕیاێکت بۆ دەردەکا، جا ڕۆیشت و ژنەکانی مەدینە ئەوەیان زانی ، ئەوانیش چوونە لای پێغەمبەر گوتیان ئێمەش هەمان گرفتی (کبیشە)مان هەیە ، بەلاّم کوڕە مامی مێرد ئێمەی مارەکردۆتەوە ، جاخوا ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗا﴾

**حەفتا ( ٧٠ ) ئافرەت شکایەت دەکەن لەلای پێغەمبەری خوا :**

(عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَا تَضْرِبُنَّ إِمَاءَ اللَّهِ فَجَاءَ عُمَرُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ ذَئِرَ النِّسَاءُ عَلَى أَزْوَاجِهِنَّ فَأْمُرْ بِضَرْبِهِنَّ فَضُرِبْنَ فَطَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَائِفُ نِسَاءٍ كَثِيرٍ فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ لَقَدْ طَافَ اللَّيْلَةَ بِآلِ مُحَمَّدٍ سَبْعُونَ امْرَأَةً كُلُّ امْرَأَةٍ تَشْتَكِي زَوْجَهَا فَلَا تَجِدُونَ أُولَئِكَ خِيَارَكُمْ) رواة ابن ماجه قال الالباني صحيح، (ذَئِرَ) واته : استعد للمخاصمة ، غضب)

واته: له ئەیاسی کوڕی عەبدولاّی کوڕی ئەبی زیبابەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرمووی لە ئافرەتان مەدەن ، جا عومەر هات گوتی ئەی نێرراوی خوا ئافرەتان بەرامبەر پیاوان راوەستاونەتەوە ، فەرمان بکە با لێیان بدرێ ، و لێیان دان ، جا ئافرەتێکی زۆر هاتنە ماڵی پێغەمبەر ، کاتێ بەیانی بویەوە ، پێغەمبەر فەرمووی ئەم شەو (٧٠) ئافرەت هاتبونە ماڵی ئێمە هەموو سکالایان لە مێردەکانیان دەکرد ، ئەوانە چاکەکانتان نین کە لە ئافرەتان دەدەن، (واتە: لە ئافرەتان مەدەن)

تێبینی : پێغەمبەر (٩) خێزانی هەبوو ، جاریواش هەبووە کێشەی خێزانی هەبوو ، بەلاّم لە هەموو ژیانی لە خێزانەکانی نەداوە ، بە شایەدی خێزانەکانی ، وەك لەم دەقەدا هاتووە

(عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: (مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا قَطُّ بِيَدِهِ، وَلَا امْرَأَةً، وَلَا خَادِمًا، إِلَّا أَنْ يُجَاهِدَ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَمَا نِيلَ مِنْهُ شَيْءٌ قَطُّ، فَيَنْتَقِمَ مِنْ صَاحِبِهِ، إِلَّا أَنْ يُنْتَهَكَ شَيْءٌ مِنْ مَحَارِمِ اللهِ، فَيَنْتَقِمَ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ) رواه مسلم

واتە: عائیشە دەڵێ : پێغەمبەر بەدەستی خۆی لە هیچ شتێکی نەداوە، وەهەرگیز لە ئافرەتانی نەداوە ، وە لە خزمتکارەکانی نەداوە ، مەگەر لە جیهاد لە رێگای

خوا، هەرکەس شتێکی دەربارە کردبێ تۆڵەی لێ نە کردۆتەوە، مەگەر کەسێك سنوری خوای بەزاندبێ تۆڵەی لێ کردبێتەوە.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٢) سورەتی (النساء)

﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ٢٢﴾ النساء

واتە: ژنی بابتان نەخوازن و مارەی مەکەن: (قەیس) کەبابی مرد ویستی -لەسەر باوی جاهیلییەت- باوەژنەکەی مارەبکا، جا باوەژنەکەشی خۆی بەدەستەوە نەداو گوتی: من بەکوڕی خۆمت ئەزانم، شتی واچۆن دەبێ، بۆیە ملی پێنەداو، دەرەنجام چوون لەپێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) یان پرسی، ئەوسا ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ئەو ژنانە مەخوازن کە باوکتان مارەی کردوون بۆخۆیان، واتە: ژنی باوکت (باوەژن) یاساغە لێت، لەبەر حورمەت و رێزی باوکایەتی. لەم ئایەتەدا روون نەکراوەتەوە: ئاخۆ مەبەست بەنیکاح تەنها (عەقد)ـە، یان (عەقد) و (وطء)یشە؟ بەڵام لەسوورەتی (ئەحزاب: ٤٩)دا هاتووە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا﴾ کە مەبەست پێی تەنها (عەقد)ـە، واتە: هەر بەمارەکردنی بۆ باوك لەکوڕ حەرام دەبێ، ئیجماعی زانایان لەسەر ئەوەیە کە بۆکوڕەکەیش هەروایە. مەگەر ئەوەی کەلەسەردەمی نەفامییدا بووە، بۆئەوە گوناهتان لەسەر نابێ، چونکە تێپەریوە، ئیمامی (تەبەری) دەڵێ: خەڵکانی پێش ئیسلام باوەژنی خۆیانیان لەخۆ مارەئەکرد ! چونکە بێگومان مارەکردن و سەرجێیی ئەمانە کارێکی زۆر ناپەسەندو، زۆر نابەجێ و بێزراوە رێبازێکی زۆر خراپ و ناشیرینیشە ئەو یاسایە(رامان)

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

**١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: (كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يُحَرِّمُونَ مَا يُحَرَّمُ إِلَّا امْرَأَةَ الْأَبِ، وَالْجَمْعَ بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ) قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (وَلَا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ) (النساء: ٢٢) (وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ) (النساء: ٢٣) اخرجه الطبري في جامع البيان**

**واتە : لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : خەڵكی سەردەمی نەزانی ئەو شتانەیان پێ حەرام بوو كەخوا حەرامی كردبوو ، وەك دایك و خوشك و ئەوانەی خوا حەرامی كردبوون ، جگە لە ژنی باب و دوو خوشك بەیەكەوە مارەكردن ، ئەو دووانەیان مارە دەكردن جا خوا ئایەتی دابەزاندو قەدەغەی كردن (وَلَا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ) (النساء: ٢٢) (وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ) (النساء:٢٣)**

**پاش دەرچوونی ئەم حوكمە یەكێ سەرپێچی دەكا :**

**(عَنْ الْبَرَاءِ قَالَ لَقِيتُ خَالِي وَمَعَهُ الرَّايَةُ فَقُلْتُ أَيْنَ تُرِيدُ قَالَ أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبِيهِ مِنْ بَعْدِهِ أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ أَوْ أَقْتُلَهُ (رواه النسائي ) قال الالباني صحيح**

**واتە: لە بەراوە هاتووە دەڵێ : گەیشتمە خاڵم وە ئاڵایەكی بەدەستەوەبوو ، گوتم بۆكوێ دەچی ، گوتی : پێغەمبەر ناردوومی بۆ لای پیاوێك زڕ دایكی خۆی مارەكردۆتەوە پاش مردنی باوكی ، كە لە ملی بدەم یان بیكوژم. (دیارە كابرا زانیویەتی حەرام كراوە، ئەم كارەی بەنەزانی نەكردوە، دەرچوونی ئەم یاسایە بۆ بەرگرییە لە ئافرەتان)**

### ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٣٢) سورەتی (النساء)

﴿وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ٣٢﴾

واتە: وە ئاوات مەخوازن بۆ ئەو پلەیەی کە خوا باوی هەندێکتانی داوە بەسەر هەندێکی ترتاندا بۆ پیاوان بەش هەیە لەوەی بەدەستی ئەهێنن وە بۆ ئافرەتانیش بەش هەیە لەوەی بەدەستی ئەهێنن وە داوا لەخوا بکەن لە بەهرەو بەخششی خۆی بەڕاستی خوا هەمیشە بە هەموو شتێك زانایە.

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ، قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ يَغْزُو الرِّجَالُ وَلَا نَغْزُو، وَلَنَا نصف الميراث؟ فأنزل الله: ﴿وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ على بعض﴾ (رواه أحمد والترميذي)

واتە: ئیمامی (ئەحمەد) لە (موجاهید)ـەوە ئەگێڕێتەوە: کە (ئوم سەلەمە –خوای لێی رازی بێت) وتی: ئەی پەیامبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) پیاوان دەچنە گۆڕەپانی جیهادەوە ژنان ناچن، لەمیراتیشدا دووئەوەندەی ژنان دەبەن! ئینجا خوای گەورە فەرمووی ﴿وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ على بعض﴾

وفي رواية–وقال عبد الرزاق عن معمر قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي قَوْلِ النِّسَاءِ لَيْتَنَا الرِّجَالُ فَنُجَاهِدَ كَمَا يُجَاهِدُونَ، وَنَغْزُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عزَّ وجلَّ. وَقَالَ ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي الآية، قال: أتت امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ، وَشَهَادَةُ امْرَأَتَيْنِ برجل، ونحن

في العمل هكذا، إن فعلت امرأة حسنة كتب لَهَا نِصْفُ حَسَنَةٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ هَذِهِ الْآيَةَ: (وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ) الآية (أخرجه ابن أبي حاتم) تفسير ابن كثير

واته: عبدالرزاق دەڵێ : ئەم ئايەتە دابەزی دەربارەی قسەی ئافرەتان ، گوتيان خۆزگە وەكو پياوان دەبووين ، جيهادمانكردبايە وەك ئەوان جيهاد دەكەن، وە غەزامان كردبايە لە پێناوی خوا، وە ئيبنو ئەبی حاتيم لە سەعيدی كوڕی جوبيرەوە دەگێرێتەوە دەڵێ : ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر گوتی ئەی نێرراوی خوا ، بۆ پياوان هەيە دوو هێندەی ئافرەتان ، شايەدی دوو ژن بە پياوێكە، ئايا ئێمە لە كردەوەكان ئاواين ، ئەگەر ئافرەتێك خێرێكی كرد ئايا نيو خێری بۆ دەنوسرێت، جا خوا ئەم ئايەتەی دابەزاند(وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ)

## ٤- هۆی دابەزينی ئايەتی (٤٣) سورەتی (النساء)

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغۡتَسِلُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ٤٣)

النساء

واته: بەلەش قورسيی و سەرخۆشی نزيكی نوێژ مەبنەوە: (يا أيها الذين آمنوا لا تقربوا الصلاة وأنتم سكارى) ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتان هێناوە ! لەكاتێكدا سەرخۆشن ، نزيكی نوێژ مەكەونەوە، ديارە ئەم ئايەتە لەپێش ياساغكردنی شەراب و عەرەقەوە هاتۆتە خوارەوە، وە ئەمە يەكەم هەنگاوە دەهاوێژرێ بۆ حەرامكردنی شەراب، چونكە پاش ئەم ئايەتە بەدوو قۆناغی تر ئينجا بەيەكجاری حەرام دەكرێ

هەتا دەزانن چی دەڵێن ! ئەوەتە لـەباتی ئـەوە لەنوێژەکانتانـدا بڵـێن: ( قل يا أيها الكافرون لا أعبد ما تعبدون )، دەڵێن: (قل يا أيها الكـافرون، أعبـد مـا تعبـدون). وە لەکاتی لەشگرانیدا –تاخۆتان ئەشۆن– نزیکی مزگەوت مەبنەوە، مەگەر ڕێبـوار بـن و لەسەفەردابن،. جائەگەر ڕێبوار بوون و ئاویش نەبوو و لەشیشـتان بـێ نوێـژ بـوو، لەباتی خۆشتن تەیەممومم بکـەن، ئـەوجا نوێژەکـەتان بکـەن، وەك دەفـەرموێ: خـۆ ئەگەر نەخۆش بوون، یا لەسەفەردا بوون یان یەکێکتان لەسەر پێش ئاو هاتەوە یان تخوونی ژنەکانتان کـەوتن. زاناکـان لـەمانای (أولامستم النساء) دا نـاکۆکن ، بـەلای ئەم بەڕێزانەوە: (عـەلی کـوڕی ئـەبووتالیب و، ئوبـەی کـوڕی کـەعب و، موجاهیـدو، تـاوس و، حەسـەن و، عوبەیـدی کـوڕی جوبـەیر) و هەنـدیکی تـریش، لـە(ئـیبن عـەباس)ـەوە دەگێڕنـەوە: کەمەبەسـت پێـی تێکـەڵیکردنی ژن و پیـاوە، کـەوابوو: بەلێککـەوتنی هـەر ئەنـدامێکی ژن وپیـاو لەیـەکتر، دەسـتنوێژ ناشـکێ، مەگـەر سەرجێیی بکەن. ئیمامی (تەبەریی) یش لەتەفسـیرکردنەوەیدا دەڵـێ: (أي عاشرتم النساء بالجماع). واتە: لەگەڵ ژنانتاندا جووتبوون، ئەوکاتە دەستنوێژتان دەشـکێ. بەڵگەیشیان ئەم فەرموودە سەحیحەیە کە دەڵێ: (أنه قبل بعض نسائه ثم صلي ولم يتوضأ ) واتـە: پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) بـڕێ لەخێزانـەکانی خـۆی مـاچ دەکردو، بێ دەسنوێژ گرتنەوەش نوێژی دەکرد. (وقالت عائشة –رضي الله عنها–: كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يتوضأ ثم يقبل، ثم يصلي ولا يتوضأ ). خـاتوو عایشە (خ) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستنوێژی دەگـرت و وادەبـوو یـەکێ لەخێزانـەکانی مـاچ دەکـردو، پاشـان بـێ دەسـنوێژگرتنەوە نوێـژی دەکـرد. بەخاتوو عائیشەیان گـوت: دەبـێ غـەیرەز تـۆ کێـی مـاچ کردبێـت؟! ئـەویش هاتـە پێکـەنین. (وحدث عروة عن عائشة: أن رسول الله(صلي اللة علية وسلم) قبل بعض نسـائه ثـم خـرج الي الصـلاة ولـم يتوضـأ، قلـت مـن هـي إلا أنـت؟ فضـحكت ) رواه

ابوداود والترمذي وإبن ماجه. (بەندە) یش پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر قەناعەتم هاتە سەر ئەم رایەی دواییە، خوایش بۆ خۆی زاناترە و چاکتر دەزانێ. خاوەنی (في ظلال القرآن) –پاش هێنانی چوار ڕاوبۆچوونی لێك جیا– ئەڵێت: (والذي نرجحه في معني (أو لامستم النساء)أنه كناية عن الفعل الذي يستوجب الغسل، وبذلك نستغني هنا عن كل الخلافات في مسألة الوضوء). واتە: ئەوی پەسەند بێ بەلامانەوە لەمانای (أولامستم النساء ..)دا ئەوەیە کە(کینایە)یە لەشتێکدا خۆشۆرین پێویست دەکات. ئێمەش هەر ئەم مانایەمان دەچێتە دڵەوە کەدەڵێ: مەبەست بە (لامستم النساء) تێکەڵی ژن و پیاوە. ئەڵبەت بێجگە لەوکۆمەڵە زانایانە، کۆمەڵە زانایەکی تر هەن کەدەڵێن: مەبەست پێی لەیەك کەوتنی پێستی ژن و پیاوە، نەك جیماع و تێکەڵی. (فلم تجدوا ماء) جا لەوحاڵەتانەدا هیچ ئاوێکتان دەست نەکەوت، بۆ دەستنوێژ، یان بۆ خۆ شۆرین (فتيمموا صعيدا طيبا) ئینجا گڵێکی پاك پەیدا بکەن (فامسحوا بوجوهكم وأيديكم) و بەدەم چاوو دەستەکانتانی بهێنن ، لەباتی دەسنوێژو خۆشتن بەئاو (إن الله كان عفوا غفورا) بەراستیی خوا زۆر لێبوردەیە، ڕێگەتان بۆئاسان ئەکات، زۆریش بپۆشە لەکاری هەڵەو نەزانین. ڕێنماییەکانی ئایەتی (٤٣): ١– لەش قورس نابێ لەمزگەوتدا بمینێتەوە، بەڵام دەتوانێ بەپەلە بەنێویدا تێپەڕێ، وە ناشتوانێ قورئان بخوێنێ، وەکو دەفەرموێ: (لا يقرأ الجنب ولا الحائض شيئا من القرآن) (ئیبن ماجه). ٢– لەشگران دەبێ بەئاو خۆی بشۆرێ، خۆئەگەر ئاونەبوو تەیەمموم بکاو ئینجا ئەگەر گڵ دەست نەکەوت بۆ تەیەمموم، – وەکو کۆمەڵە زانایەکی زۆر دەڵێت– بەهەمووشتێکی تر، (وەك بەرد، زیخ، لم..) دروست و ڕەوایە. چونکە عەرەبەکان لەمانای (صعيداً ..)دا دەڵێن: (المراد بالصعيد هنا هو كل ما صعد علي وجه الأرض ولم تدخله صنعة البشر كالتراب والحجر والرمل والشجر والنبات ) (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

هۆی دابەزینی بەشی یەکەمی ئەم ئایەتە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ..............﴾ النساء(٤٣)

واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە ! لەکاتێکدا سەرخۆشن ، نزیکی نوێژ مەکەونەوە........)

١-( عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ صَنَعَ لَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ طَعَامًا فَدَعَانَا وَسَقَانَا مِنْ الْخَمْرِ فَأَخَذَتْ الْخَمْرُ مِنَّا وَحَضَرَتْ الصَّلَاةُ فَقَدَّمُونِي فَقَرَأْتُ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ وَنَحْنُ نَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ قَالَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ) رواه الترمذي و أبو داود والنسائي والحاكم قال الالباني صحيح

و اتە: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هاتووە دەڵێ : (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف خواردنێکی بۆ دروست کردین ، و بانگی کردین ئارەقمان خواردەوە ، کاتی نوێژ هاتە پێشەوە ، منیان پێش خست ، ئەو سورەتەم بەم شێوە خویندەوە(قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ وَنَحْنُ نَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ) واتە: (بەڵێ ئەی کافرەکان ناپەرستم ئەوەی ئێوە دەیپەرستن، وە ئێمە دەپەرستین ئەوەی ئێوە دەیپەرستن (بەبێ ئاگای خوێندیەوە ئەگەر نا ئەمە کوفرە) دەڵێ جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ) ئەی برواداران توخنی نوێژ مەکەون ، کە ئێوە سەرخۆشن ، تاکو دەزانن چی دەڵێن.

**هۆی دابەزینی بەشی دووەمی ئەم ئایەتە :**

**﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُمۡ ......﴾**
**النساء(٤٣)**

واتە: ئینجا ئاوتان دەست نەکەوت ئەوە بە خۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن جا بەو تۆزو خۆڵە ڕووخسار و دەستەکانتان تەیەموم بکەن ............) (پوختەی تەفسیر)

**٢-( عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْتِمَاسِهِ وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ فَأَتَى النَّاسُ أَبَا بَكْرٍ فَقَالُوا أَلَا تَرَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبِالنَّاسِ مَعَهُ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ فَقَالَ حَبَسْتِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالنَّاسَ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ قَالَتْ فَعَاتَبَنِي وَقَالَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ وَجَعَلَ يَطْعُنُنِي بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي فَلَا يَمْنَعُنِي مِنْ التَّحَرُّكِ إِلَّا مَكَانُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى فَخِذِي فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ فَتَيَمَّمُوا فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ الْحُضَيْرِ مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ فَقَالَتْ عَائِشَةُ فَبَعَثْنَا الْبَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ فَوَجَدْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ ) صحيح البخاري**

واتە: عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە دەڵێ : لەگەڵ پێغەمبەردا بۆ سەفرێك رۆیشتین ، تاکو گەیشتینە بیابانێك ، گرێی ملوانکەکەم پچڕا، پێغەمبەر و خەڵکی مانەوە بۆ دۆزینەوەی ، وە لەسەر هیچ ئاوێك نەبووین ، و ئاویشمان پێ نەمابوو،

خەڵکی دەچوونە لای ئەبوبەکر دەیانگوت نابینی عائیشە چی کردوە؟ پێغەمبەری خوای ڕاگرت لە ڕویشتن و خەڵکیش لەگەل ئەو ، نە لەسەر ئاوین و نەئاومان پێیە ، جا ئەبوبەکر هات ، لەو کاتە پێغەمبەری خوا سەری بەسەر ڕانم کردبوو خەوی لێ کەوتبوو، گوتی ئەوە بۆچی؟ پێغەمبەر و خەڵکیت ڕاگرتووە، نەلەسەر ئاون و نەئاویان پێیە، عائیشە دەڵێ لۆمەی کردم و قسەی پێ گوتم ، بە دەستی قورینجی لە کەلەکەم (تەنیشت) دەدا ، منیش لەبەر پێغەمبەر خۆم نە دەجولآند چونکە خەوتبوو، لەسەر ڕانم ، پێغەمبەر خەوت تاکو بەیانی بەبێ ئاوی ، جا خوا ئەم ئایەتی تەیموومی دابەزاند ئوسیدی کوڕی ئەلحەزیر گوتی : ئەی ئال و بەیتی ئەبوبەکر ئەوە یەکەم بەرەکەتی ئێوە نیە ، عائیشە دەڵێ کە ویستمان بڕۆین وشترمان هەڵساند ئەوەی من سواری ببووم دەبینین ملوانکەکە لە بن وشترەکە کەتووە

-وفی روایه (.....وَنَزَلَتْ آيَةُ التَّيَمُّمِ ، وَوُجِدَتِ الْقِلَادَةُ فِي مُنَاخِ الْبَعِيرِ ، فَقَالَ النَّاسُ: مَا رَأَيْنَا امْرَأَةً أَعْظَمَ بَرَكَةً مِنْهَا) تفسير الطبري

واتە:لە گێرانەویکدا .......ئایەتی تەیمووم دابەزی ، وە ملوانکە دۆزرایەوە لەو شوێنەی وشتر یەخ دەکرێت ، خەڵکی گوتیان نەمان بینیوە لەم ئافرەتە بەخێرتر بۆ موسڵمان (واتە: عائیشە ).

**********************************

# وتاری ژماره (٣٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٤٨) سورەتی (النسا)

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ٤٨﴾النساء

واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگەلەوە خۆش ئەبێت لەهەر گوناهێکی تر بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت، وە هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت ئەوە بێگومان گوناهێکی زۆر گەورەی هەڵبەستووە.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: مَازِلْنَا نُمْسِكُ، عَنِ الاِسْتِغْفَارِ لِأَهْلِ الْكَبَائِرِ حَتَّى سَمِعْنَا مِنْ نَبِيِّنَا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ) وَأَنَّهُ قَالَ (إِنِّي ادَّخَرْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لِأَهْلِ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ) قَالَ: فَأَمْسَكْنَا عَنْ كَثِيرٍ مِمَّا كَانَ فِي أَنْفُسِنَا وَنَطَقْنَا بِهِ وَرَجَوْنَا) رواه احمد و ابوداود والنسائي و ابن حبان و الحاكم قال الالباني حسن في ظلال الجنة

واتە : لە عەبدوڵای کوڕی عەمەرەوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ : ئێمە نەدەوێراین دوعا بۆ ئەوانە بکەین گوناحی گەورەیان کردبوو ، تاکو گوێمان لە پێغەمبەر بوو، ئەو ئایەتەی خوێندەوە (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ) واتە: بەراستی خوا لەو کەس خۆش نابێ هاوەڵی بۆ بڕیاربدات ،

بەلاَم جگە لە (شیرك) ئەوەی حەز بكات لێی خۆش دەبێ ، جا پێغەمبەر فەرمووی : من تكای خۆم هەڵگرتووە بۆ خاوەن گوناحە گەورەكان لە ڕۆژی قیامەت ، عەبدولاَ دەڵێ پاش ئەم ئایەتەو قسەی پێغەمبەر زۆر شتمان واز لێ هێنا كە لە دلَماندا بوو ، و دەرمان بڕی بە زوبان و ئومێدەواربووین.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٥١+٥٢) سورەتی (النساء)

**﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ٥١ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ٥٢﴾**

**مانای ئەم دوو ئایەتە:** خاوەن نامەكان بتەكان و تاغووت دەكەنە حەكەم: (ئیبن عەباس) دەڵێ: (كەعبی كوڕی ئەشرەف) هاتە مەككە، قورەیش پێیانگوت: تۆ كە لەخاوەننامەكانی، ڕاتان بەرامبەر بە ئێمەو (موحەممەد) چییە؟ ئەوە ئێمە پەیوەندی خزمایەتیمان نەپچڕاندووە، وشتر و ماڵات سەردەبڕین بۆهەژاران، ئاوو شیر دەدەینە حاجییەكان..؟ (موحەممەد)یش كەسێكی وەجاخ كوێرەو، بۆتە مایەی لێكترازانی خزمان و، شوێنكەوتووەكانی ،جا دەبێ ئەوچاك بێت، یان ئێمە ؟ (كەعب)یش گوتی: دیارە ئێوە لەخۆی و لەشوێنكەوتووەكانیشی باشترن، لەوەلاَمی ئەوقسەو باسەدا ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: **﴿ألم تر إلي الذين أوتوا نصيبا من الكتاب﴾** ئاخۆ سەیری ئەوانەت نەكردووە كە بەشێك لەكتێبی (تەورات)یان پێدراوە؟ **(یؤمنون بالجبت والطاغوت)** كەچی باوەڕیان بەبت و، تاغووت و فاڵگرتنەوەو جادوو و شەیتان هەیە، واتە: پەیڕەوی لەبەرنامە دنیاییەكان دەكەن! **﴿ویقولون للذین كفروا﴾** بەموشریك و بێ باوەڕەكان ئەڵێن: **﴿هؤلاء أهدي من**

**الـذين آمنـوا سـبيلا)** ڕێ و ڕێبـازی ئەوانـە (موشـریك وكافرەكـان) لـەڕێی باوەڕدارەكان نمایان ترە (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێرانەوە هەیە:

ئەوان وەجاغ كوێرن وئەوان ناحەقن:

١-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ كَعْبُ بْنُ الْأَشْرَفِ مَكَّةَ أَتَوْهُ، فَقَالُوا: نَحْنُ أَهْلُ السِّقَايَةِ وَالسِّدَانَةِ، وَأَنْتَ سَيِّدُ أَهْلِ يَثْرِبَ، فَنَحْنُ خَيْرٌ أَمْ هَذَا الصُّنَيْبِيرُ الْمُنْبَتِرُ مِنْ قَوْمِهِ، يَزْعُمُ أَنَّهُ خَيْرٌ مِنَّا، فَقَالَ: أَنْتُمْ خَيْرٌ مِنْهُ، فَنَزَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ) (الكوثر: ٣) ، وَنَزَلَتْ: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلَاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا) (النساء: ٥١ ) رواه ابن حبان قال ارنؤط إسناده صحيح على شرط الصحيح ،وأخرجه الطبري (٩٧٨٦) ، والبزار كما في "تفسير ابن كثير" ٥٩٨/٤ من طريقين عن ابن أبي عدي، به، وقال ابن كثير: وهو إسناد صحيح. ، وقال الالباني صحيح الاسناد

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هـاتووە دەڵـێ : كـاتێ (كـەعبی كـوڕی ئەشـرەف) چـووە مەككە ، موشریكانی مەككە پرسیاریان لێ كرد گوتیان ئێمە ئاو دەدەینـە حاجیـان وخێرخـوازین وە تـۆش گـەورەی خـەڵكی مەدینـەی ، ئایـا ئێمـە باشـترین یـان ئـەو وەجاغ كوێرە ، كەوا گومان دەبات ئەو لە ئێمە باشـترە ، ئـەویش گـوتی ئێـوە لـەو چـاكترن ، جـا خـوا ئـەو ئایەتـەی دابەزانـد و فـەرمووی (إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ)) واتە(ئەوەی دژایەتیت دەكات ئەو وەجاغ كوێرە) وە ئەو ئایەتەش دابەزاند (أَلَمْ تَرَ

إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلَاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا) واتـه : نـابينى ئەوانـەی بەشـیان پـێ دراوە لـە خاوەن نامەکان ، باوەڕ بە بت و تاغوت دەهێنن و دەڵێنە کافران ئێوە چاکترن لە موسڵمانان .

خوا (١٢٤) هەزار پێغەمبەر بۆ دوو شتی سەرەکی ناردوە ١-خواپەرستی ٢-دوور کەوتنەوە لە تاغوت وبێ دینی و زاڵم وشەیتان.......) بەبەڵگەی ئەم ئایەتە

(وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ ۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٣٦) النحل

واتە: ولقد بعثنا فى كل امە رسولا بەراستی بۆناو هەموو ئوممەت و نەتەوەیەك لەهەموو سەردەمێكدا پەیامبەرێکمان ناردووە بۆ ئەوە پێیان بڵێ: تەنها خوا بپەرستن و، لە(تاغووت) و یاسا پوچەڵەکان دووربن. بەڵێ ئەو دووخاڵە: (خوا پەرستن و، وەلانانی تاغووت) کەهەر پێغەمبەرەی داویەتی بەگوێی ئوممەتەکەی خۆیدا ئەساس و بناغەی گشت ئایینەکان و دینی ئیسلامیشە ، بازێکیان خوای دلۆڤان خۆی رێی نیشاندان، چونکە ئامادەو شیاو بوون ،هی وایشیان هەبوو بەهۆی لاساری خۆیانەوە لاڕێی و گومڕایی بۆ بڕایەوە جا ئادەی بەسەر زەوییدا بچن و بگەڕێن و ببینن و بنواڕن چارەنووسی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناو، پەیامبەرەکانیان بە درۆزن دانا چۆن بوو.(رامان)

### ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٥٩) سورەتی (النساء)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾

واته: گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو کار بەدەستانی خۆتان بن: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵیی فەرمانی خواو پەیامبەربن لەهەموو کاروبارێکدا وە بەر فەرمانی کاربەدەستان و کارسازانی خۆتان بن، واتە: بەقسەی ئەو کاربەدەست و زانایانە بکەن، کە لەخۆتانبن. واتە: لەچوارچێوەی شەریعەتدا گوێڕایەڵیان بن ئینجا ئەگەر لەشتێکدا کێشەو ناکۆکیتان بوو جا بیگێڕنەوە بۆلای خواو پەیامبەر (صلی الله علیە وسلم)، واتە: باتەنها قورئان و سوننەت داوەرو حەکەمتان بن. بەڵێ پێویستە لەهەمووشتێکدا بگەڕێینەوە لای خواو پەیامبەر (صلی الله علیە وسلم)، دیارە کەبڕیاری پەیامبەریش (صلی الله علیە وسلم) هەر بڕیاری خوایە، وەك لەسوورەتی (نیساو: ٨٠)دا هاتووە: (ومن يطع الرسول فقد اطاع الله) کەوابوو نابێ بەهیچ جۆرێك کێشەکانتان بەرنە لای تاغووتەکانی سەردەم.(رامان)

-ابن کەسیر دەڵێ -(قَالَ تَعَالَى: (أَطِيعُواْ اللَّهَ) أَيْ اتَّبِعُوا كِتَابَهُ، (وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ) أَيْ خُذُوا بِسُنَّتِهِ، (وَأُوْلِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ) أَيْ فِيمَا أَمَرُوكُمْ بِهِ مِنْ طَاعَةِ اللَّهِ لَا فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، فَإِنَّهُ لَا طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ ) (إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي المعروف)

– (وقال ابْنِ عَبَّاسٍ (وَأُوْلِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ) يَعْنِي أَهْلَ الفقه والدين) تفسير ابن كثير

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا (أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ قَالَ نَزَلَتْ فِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُذَافَةَ بْنِ قَيْسِ بْنِ عَدِيٍّ إِذْ بَعَثَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَرِيَّةٍ ) رواه البخاري ومسلم وغيرهم

واتە: لەئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لەخۆی وبابی رازی بێ دەڵێ : ئایـەتی (أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ) دابەزیوە دەربارەی (عبـدالله کـوڕی حوزافـە) کاتێ پێغەمبەر ناردی و کردیە سەرۆکی مەفرەزەکی موسڵمانان.

## چۆنیەتی دەرچوونی مەفرەزەکە بەم شێوە بوو:

١-(عَنْ عَلِيٍّ قَالَ بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَرِيَّةً وَاسْتَعْمَلَ عَلَيْهِمْ رَجُلًا مِنْ الْأَنْصَارِ وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَسْمَعُوا لَهُ وَيُطِيعُوا فَأَغْضَبُوهُ فِي شَيْءٍ فَقَالَ اجْمَعُوا لِي حَطَبًا فَجَمَعُوا لَهُ ثُمَّ قَالَ أَوْقِدُوا نَارًا فَأَوْقَدُوا ثُمَّ قَالَ أَلَمْ يَأْمُرْكُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تَسْمَعُوا لِي وَتُطِيعُوا قَالُوا بَلَى قَالَ فَادْخُلُوهَا قَالَ فَنَظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ فَقَالُوا إِنَّمَا فَرَرْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ النَّارِ فَكَانُوا كَذَلِكَ وَسَكَنَ غَضَبُهُ وَطُفِئَتِ النَّارُ فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَوْ دَخَلُوهَا مَا خَرَجُوا مِنْهَا إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە: لەعەلیەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر مەفرەزیـەکی نـارد و پیـاوێکی ئەنصـاری کردە سەرۆکیان ، وەفەرموویە ئەوانەی لەگـەلی بـوون گوێرایـەڵی وفەرمانبـەری بـۆ بکەن، ئەوانەیش لە شتێك سەرۆکی خۆیان تـوڕەکرد ، ئـەویش پێـی گـوتن دارم بـۆ کۆبکەنەوە ، ئەوانیش داریان بۆ کۆکردەوە ، دوای گوتی ئاگر لە دارەکان بەردەن ، دوای گوتی ئایا پێغەمبـەری خـوا نـەی فـەرموو گـوێی بـۆ بگـرن وبەقسـەی بکـەن ،

گوتیان بـەڵێ ، گـوت دە خۆتـان بخەنـە نـاو ئـەم ئـاگرە ، ئـەڵێ هەنـدێك تەماشـای هەندێکیانی کرد ، گوتیان ئێمە بۆیە بەدوای پێغەمبەر کەوتووین تـاکو نەچـینە نـاو ئاگر ، دوای سەرکردەکە توڕبوونەکەی سارد بویـەوە ، ئـاگریش گوژایـەوە ، کـاتێ گەرانەوە ئەم هەواڵەیان بۆ پێغەمبەر گێرایەوە ،فەرمووی : ئەگەر چووبانە ناو ئـاگر تاکو ڕۆژی قیامەت لێی دەرنەدەچوون ، بەڵکو بە گوێکرتن تەنها لە کاری چاکەیە.

## پرسیار ئایا خەڵکی چی بکەن بەرامبەر دەستەڵاتدارە خراپەکان؟

زانایان دەربارەی دەستەڵاتی خراپ دوو رایان هەیە

١–ئەلێن ئەبێ بەقسەیان بکرێت صـەبر بگرێـت (بەرامبـەر ئەوانـەی هەنـدێك خـراپن نەك زۆر)

چەند بەڵگەکیان هەیە لەوانە:

(إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً وَأُمُورًا تُنْكِرُونَهَا، قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: أَدُّوا إِلَيْهِمْ حَقَّهُمْ وَسَلُوا اللهَ حَقَّكُمْ) رواه البخاري

واتە: ئێوە لەمەودوا لەپاشە من چەند شتێك دیتە پێشتان پێتان ناخۆشـە، گوتیـان ئەی نێرراوی خوا چ فەرمانێکمان پێ دەکەی؟ فـەرمووی ئێـوە مـافی ئـەوان بـدەن و داوای مافی خۆتان لە خوا بکەن ، زانایـان دەفـەرموون : واتـە ئەگـەر چـەند کـەم و کورێکی کەمیان هەبوو ، ئومید هەبوو خۆیان چاك بکەن.

٢–رای دووەم دەڵێ ئەبێ خەڵك رازی نەبێ راپەرێ و شۆرش بکات و قـەبول نـەکات لێیان :

ئەمانەش ئەم بەڵگانە دەهێنەوە:

١-(وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ (المائدة:٢)

٢- وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ ١٥١ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ١٥٢ (الشعراء)

٣- (ابن كثير) له تەفیسرەكەیدا سەبارەت بەم ئایەتە:

( قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ (البقرة:١٢٤) (دەڵێ) (ابن خُويز)ي المالكی دەڵێ : الظالم لايَصْلُحُ ان يكونَ خليفةً ولاحَكَماً و لامُفتياً ولا شاهداً و لاراوياً) واتە: زاڵم نابێ ببێتە جێنشین وحاكم وموفتی وشاهید و راوی.

وەپێغەمبەریش لەم بارەوە فەرموویەتی :

(لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةٍ إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوف) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە: بە گوێی هیچ كەس ناكرێت بۆ گوناح و تاوان، بەگوێكرتن تەنها بۆ چاكەكردنە

لە هەموو شت عەجائب تر ئەوەیە :

هەندێ موسڵمان هەیە ، (فرعون و زاڵم و بەدین و بێ دین و ماركسی و هەرچی هەبی ئەلێن ئەتۆ (وەلی ئەمر) ئیمەی ، ئەوانە سێبەر و دروستكراوی خەڵكی زاڵمن .

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٦٠) سورەتی (النساء)

(أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ ۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ٦٠) النساء

واتە: ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بەلای ئەوانەی وا خۆ نیشان دەدەن کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆتۆ(کە قورئانە) و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە(کە تەوراتە) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خوا ناکات لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوایان پێی نەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕایی یەکی دوور لە ڕاستی. (پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێڕانەوە هەیە:

١- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ أَبُو بَرْزَةَ الأَسْلَمِيُّ كَاهِنًا يَقْضِي بَيْنَ الْيَهُودِ فِيمَا يَتَنَافَرُونَ إِلَيْهِ، فَتَنَافَرَ إِلَيْهِ أُنَاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ إِلَى قَوْلِهِ: إِنْ أَرَدْنَا إِلا إِحْسَانًا )(النِّسَاء: ٦٢) المعجم الكبير للطبراني

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ: ئەبو بەرەزەی ئەسلەمی فالچی (کاهن) بوو، دادوەری دەکرد لە نێوان جوولەکەکان کاتێ کێشەیان دەبوو، هەندێ خەڵکی موسڵمان کیشەیان هەبوو بردیانە لای (ئەبو بەرەزە) جا خوا دەربارەی ئەوانە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ)

**تێبینی** : ئەم موسڵمانانەی کێشەکەیان بردەلای ئەبو بەرەزە مونافیق بووینە نەك موسڵمان، بۆیە نەچووینە لای پێغەمبەر.

٢-( عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: كَانَتْ بَيْنَ رَجُلٍ مِمَّنْ يَزْعُمُ أَنَّهُ مُسْلِمٌ ، وَبَيْنَ رَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ خُصُومَةٌ ، فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: أُحَاكِمُكَ إِلَى أَهْلِ دِينِكَ ، أَوْ قَالَ: إِلَى النَّبِيِّ؛ لِأَنَّهُ قَدْ عَلِمَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَأْخُذُ الرِّشْوَةَ فِي الْحُكْمِ. فَاخْتَلَفَا ، فَاتَّفَقَا عَلَى أَنْ يَأْتِيَا كَاهِنًا فِي جُهَيْنَةَ قَالَ: فَنَزَلَتْ: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ) (النساء: ٦٠) يَعْنِي: الَّذِي مِنَ الْأَنْصَارِ (وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ) (البقرة: ٤) يَعْنِي: الْيَهُودِيَّ (يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ) (النساء: ٦٠) إِلَى الْكَاهِنِ ) اخرجه الطبري في جامع البيان

واته: له شهعبییهوه هاتووه دهڵێ: كیشه ههبوو له نێوان كهسێك خۆی به موسڵمان دادهنـا لهگـهڵ جوولهكهیـهك ، كـابرای جوولهكـه گـوتی كێشـهكه دهبینـه لای شارهزایانی ئاینی تـۆ یـان گـوتی دهبینـه لای پێغهمبـهری ئێـوه ، چـونكه دهیزانـی پێغهمبهر بهرتیل وهرنـاگری لـه دادوهری ، جـا رێك نهكـهوتن لهسـهر ئـهوه، دوای رێكهوتن بچنه لای فالچیهك له (جوههینه) دهڵـێ جـا دهربارهیـان ئـهم روداوه ئـهم ئایهته دابهزی (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ (النسا(٦٠).

(بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ) واتـه : ئـهوهی ئهنصـاری بـوو ، وه (وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ) واتـه: كابرای یههودی (يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ) واته :كابرای كاهین

## ٢- هۆی دابهزینی ئایهتی ( ٦٥ ) سورەتی ( النسا )

(فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ٦٥) النساء

واته: نهخێر(وانی یه كه خۆیان به باوەڕدار نیشان دهدهن) سوێند به پهروهردگارت بـڕوا دارنـین تـا تـۆ نهكهنـه دادوهر لهھـهر ئـاژاوه و دووبـهرهكی یـهكی نێوانیـان دا

لەپاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بە هیچ بێزاری یەك لـەو بڕیـارەی تـۆ داوتـە و مل کەچ نەکەن بە مل کەچی یەکی تەواو.(پوختەی تەفسیر)

١- (عَنْ عُرْوَةَ قَالَ خَاصَمَ الزُّبَيْرُ رَجُلًا مِنْ الْأَنْصَارِ فِي (شَرِيجٍ مِنْ الْحَرَّةِ) فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْقِ يَا زُبَيْرُ ثُمَّ أَرْسِلْ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ ، فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ اسْقِ يَا زُبَيْرُ ثُمَّ احْبِسْ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ ثُمَّ أَرْسِلْ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ وَاسْتَوْعَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلزُّبَيْرِ حَقَّهُ فِي صَرِيحِ الْحُكْمِ حِينَ أَحْفَظَهُ الْأَنْصَارِيُّ كَانَ أَشَارَ عَلَيْهِمَا بِأَمْرٍ لَهُمَا فِيهِ سَعَةٌ قَالَ الزُّبَيْرُ فَمَا أَحْسِبُ هَذِهِ الْآيَاتِ إِلَّا نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ) رواه البخاري ومسلم

واتــە: لــەعوروەوە هــاتووە دەڵــێ : زوبــێر و پیــاوێکی ئەنصــاری کێشــەیان بــوو دەربارەی (شَرِيجٍ مِنْ الْحَرَّةِ) کە شوێنێکە لە مەدینە ، جا پێغەمبەر فەرمووی ئەی زوبێر تۆ ئاوبدە دوای ئاوەکە بـۆ جیرانەکـەت بـەردەوە ، کـابرای ئەنصـاری گـوتی بۆیە ئەو حوکمەت دا چونکە زوبێر کوڕی پلکەتە ، پێغەمبەر ڕەنگی گۆڕاوتوڕەبـوو ، فەرمووی : ئەی زوبێر کشـتوکاڵی خـۆت ئاوبـدە و ئاوەکـەت بگـرەوە تـاکو لـەبن دیوار دەپەنگێتەوە (واتە: بە تـەواوی بـا ئـاو بخواتـەوە تـاکو دەگاتـە بـن دیـوار )، ئەوجا ئاوەکە بـەردەوە بـۆ جیرانەکـەت ، جـاری یەکـەم پێغەمبـەر حـەقی زوبـێری بەتەواوی نەدا ، بەڵام کە کابرای ئەنصاری ئەوە هەڵوێستی بوو ، پێغەمبـەر حـەق و مافی زوبێری بەتواوی دا، جـا زوبـێر دەڵـێ : پـێم وایـە ئـەم ئایەتـە دەربـاری مـن دابەزیوە

معانی الكلمات:-(شَرِيجٍ مِنْ الْحَرَّةِ) ناوچەیەك بـووە لـە مەدینـە ،( الشـراج): مجاري المَاء من الْحرار إِلَى السهل، وَاحِدهَا شرج.(والحرة): الأَرْض الَّتِي قد ألبست حِجَارَة

سَوْدَاء ،والجدر: الْجِدَار. ،وأحفظ: أغضب. وصريح الحكم: ظَاهره. واستوعى،وَشَجر مَا بَين الْقَوْم: اخْتلفُوا، واشتجروا: تنازعوا

-زوبیر کوره پووری پێغەمبەر بوو ، کوری صفەیەی کچی عبدالموتەلیب بووە.

-دەگونجێ ئەم کەسە موونافیق بێ یان موونافیق نەبێ ، بێگومان کارێکی زۆر خراپی کردوە.

نموونە لەسەر رازی نەبوون بە حوکمی پێغەمبەر :

( عَن سَلمَة بن الْأَكْوَع أَنَّ رَجُلًا أَكَلَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشَمَالِهِ فَقَالَ: (كُلْ بِيَمِينِكَ) قَالَ: لاأستطيع. قَالَ (لَا اسْتَطَعْتَ) . مَا مَنَعَهُ إِلَّا الْكِبْرُ قا ل: فَمَا رَفعهَا إِلَى فِيهِ. رَوَاهُ مُسلم

واتە: لەسلمەی کوڕی ئەکوع هاتووە دەڵێ : کابرایەك لەلای پێغەمبەر بەدەستی چەپی نانی خوارد ، ئەویش پێی فەرموو (بە راستە بخۆ) کابرا گوتی ناتوانم ، فەرمووی (دە نەتوانی) ئەوەی رێگر بوو کابرا وانەکات (خۆبەزگرتنی بوو، جا دەستی بۆ بەرزنەکرایەوە بۆ دەمی.

ئەبێ ئیمانداران کاتێ بانگکران بۆ لای خواو پێغەمبەر بڵێن (سمعناو اطعنا) واتە گوێمان لێ بوو وبەقسەتان دەکەین .وەك خوا فەرموویەتی (إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا) (النور:٥١).

لەئایەتی دیکەدا دەفەرمووی: ئایا حوکمی نەزانی داوا دەکەن ، لە کاتێکدا لە حوکمی خوا باشترە نیە ، وەك خوا فەرموویەتی (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ )(٥٠) سورة المائدة)

**وەلەم بارەوە ئەم دەقەش هاتووە:**

( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَبْغَضُ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ ثَلَاثَةٌ مُلْحِدٌ فِي الْحَرَمِ وَمُبْتَغٍ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَمُطَّلِبُ دَمِ امْرِئٍ بِغَيْرِ حَقٍّ لِيُهَرِيقَ دَمَهُ) رواه البخاري

واتـە: لـەئیبنو عەبباسـەوە هـاتووە دەڵـێ : پێغەمبـەر فەرموویـەتی : بـوغزاوترین کەسن لەلای خوا سێ کەسن : کەسێ مولحید بێ لە ناو حـەرەم ، وە کەسـێ لـەناو بازنەی ئیسـلامدایە و داوای رێبـازی جـاهیلی دەکـات وە کەسـێ بەناحـەق خـوێنی کەسێ برێژێ .

## ترسناکی سەرپێچی کردنی فەرمانی پێغەمبەر :

١-( فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٦٣)

واتە: دەبا ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانی پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەکـەن، بترسن کە سەرەنجام تووشی بەڵاو نەهاتێك ببن یا تووشی سزایەکی بەئێش ببن.

٢-( كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ إِلا مَنْ أَبَى مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبى) البخاري

واتە: هەموو ئوممەتم دەچێتە بەهەشت مەگەر کەسێك نەیـەوێ ، ئـەوەی بـە قسـەم بکات دەچێتە بەهەشت ، وە ئەوەی سەرپێچیم بکات دەچێتە دۆزەخ.

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٦٩) سورەتی (النساء)

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ٦٩﴾ النساء

واتە: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکات جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا بەهرەی ڕشتووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان وە ئەوانە چ هاوڕێ و هاوەڵێکی چاکن.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێرانەوە هەیە:

١-( عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ إِنَّكَ لَأَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي، وَإِنَّكَ لَأَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَهْلِي، وَأَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ وَلَدِي، وَإِنِّي لَأَكُونُ فِي الْبَيْتِ، فَأَذْكُرُكَ فَمَا أَصْبِرُ حَتَّى آتِيَكَ، فَأَنْظُرُ إِلَيْكَ، وَإِذَا ذَكَرْتُ مَوْتِي ومَوْتَكَ عَرَفْتُ أَنَّكَ إِذَا دَخَلْتَ الْجَنَّةَ رُفِعْتَ مَعَ النَّبِيِّينَ، وَإِنِّي إِذَا دَخَلْتُ الْجَنَّةَ خَشِيتُ أَنْ لَا أَرَاكَ. فَلَمْ يُرِدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى نَزَلَ جِبْرِيلُ بِهَذِهِ الْآيَةِ: (وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ) (النساء: ٦٩) الْآيَةَ) أخرجه الطبراني وابن مردويه (لباب النقول: ٧٤) والضياء المقدسي (تفسير ابن كثير: ٥٢٣/١) وأبو نعيم (فتح القدير: ٤٨٥/١) كلهم من طريق الطبراني عن عائشة رضي الله عنها به. قال الضياء المقدسي: إسناده لا بأس به، ووافقه السيوطي (لباب النقول: ٧٤) وصححه الهيثمي (مجمع الزوائد: ٧/٧) . قلت: وبهذا تتقوى المراسيل السابقة

واته: پیاوێك هاتەلای پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) وتی: بێگومانبە، من تۆم لەخۆم و ماڵ و منداڵەکانم خۆشتر ئەوێ، کاتێکیش کە لەماڵەوەم هەر لەیادمی و، هەرگیز بێ تۆش ئۆقرە ناگرم، بەڵام کە بیرم لەمردنی خۆم و تۆم کردەوە ئەوسا زانیم کە تۆ لەگەڵ پەیامبەران دەچیتە بەهەشت و جێگەی خۆت، ترسم لێ نیشت کە جارێکی تر نەتبینمەوە! پێغەمبەر وەڵامی نەدایەوە ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی (وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ)

٢-(عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ: مَا يَنْبَغِي لَنَا أَنْ نُفَارِقَكَ فِي الدُّنْيَا فَإِنَّكَ إِذَا فَارَقْتَنَا رُفِعْتَ فَوْقَنَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ) عبدالرزاق في المصنف وأخرجه ابن جرير (٥/١٠٤) وابن أبي حاتم (لباب النقول: ١٥٨) عن مسروق به، وهو مرسل صحيح الإسناد، ويشهد له

واته : لەمەسروقەوە هاتووە دەڵێ : هاوەڵانی پێغەمبەر گوتیان ئێمە چی بکەین ئەگەر تۆ لە دونیا ئێمەت بەجێ هێشت ، تۆ بەرزدەبیتەوە لە بەهەشت ئێمە تۆ نابینین ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ)

## ئایا بەچی دەبیتە رەفیقی پێغەمبەر؟

(عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبٍ الْأَسْلَمِيِّ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَيْتُهُ بِوَضُوئِهِ وَحَاجَتِهِ فَقَالَ لِي: (سَلْ) فَقُلْتُ: أَسْأَلُكَ مُرَافَقَتَكَ فِي الْجَنَّةِ. قَالَ: (أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ) قُلْتُ: هُوَ ذَاكَ. قَالَ: (فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ) رَوَاهُ مُسلم

واتە : لە ربیعەی کوڕی کەعبی ئەسلمیەوە هاتووە دەڵێ : شەوان لەلای پێغەمبەر دەمامەوە ، دەستنوێژم بۆ دەگرت و پێویستیەکانم بۆ جێ بەجێ دەکرد، فەرمووی : داوا بکە، گوتم دەمەوێ رەفیقی تۆ بم لە بەهەشت ، فەرمووی : شتی دیکە داوا بکە،گوتم هەر ئەوە ، فەرمووی : یارمەتیم بدە بە زۆر سوجدە بردن ، ئەم فەرموودە موژی خۆشی تیدایە بۆ موسڵمانان کەواتە ئیمانداران لە قیامەت لە پێغەمبەر نزیکن.

************************

## وتاری ژماره (٣١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٧٧) سورەتی (النساء)**

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَخۡشَوۡنَ ٱلنَّاسَ كَخَشۡيَةِ ٱللَّهِ أَوۡ أَشَدَّ خَشۡيَةٗۚ وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبۡتَ عَلَيۡنَا ٱلۡقِتَالَ لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖۗ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ٧٧﴾ النساء

واته: ئایا سەیری ئەو کەسانەت نە کردووە کە پێیان وترا دەستتان بگێڕنەوە (لە جەنگ و کوشتار) و نوێژ بکەن و زەکات بدەن ؟ کەچی کاتێك جەنگیان لەسەر پێویست کرا یەکسەر دەستەیەکیان لە خەڵکی دەترسان وەك ترسان لە خودا بگرە زیاتریش دەترسان دەیان وت ئەی پەروەردگاری ئێمە بۆچی جەنگت لەسەرمان پێویست کردووە خۆزگە دوات دەخستین(لە جەنگ کردن) بۆ ماوەیەکی کەم بڵێ خۆشی و لەزەتی دنیا زۆر کەمە و ڕۆژی دوایی باشترە بۆ کەسێك لەخوا بترسێت وە ستەمتان لێ ناکرێت بە (ئەندازەی) تاڵی ناوکە خورمایەك.(پوختەی تەفسیر)

١- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، وَأَصْحَابًا لَهُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ، أَتَوَا النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللهِ كُنَّا فِي عِزٍّ وَنَحْنُ مُشْرِكُونَ فَلَمَّا آمَنَّا صِرْنَا أَذِلَّةً. فَقَالَ: إِنِّي أُمِرْتُ بِالْعَفْوِ فَلَا تُقَاتِلُوا الْقَوْمَ ، فَلَمَّا حَوَّلَهُ اللهُ إِلَى الْمَدِينَةِ أَمَرَهُ بِالْقِتَالِ فَكَفُّوا، فَأَنْزَلَ اللهُ: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ) (النساء: ٧٧) (رواه النسائي و ابن أبي حاتم والحاكم) الآية قال الالباني صحيح الاسناد

واته: لەئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ : عبدالرحمن کوری عـەوف و هـاوەڵانی خـوا لێیان رازی بێ ، هاتنە لای پێغەمبەر گوتیان ئەی نێرراوی خوا ئێمە کـاتی موشـریك بوون بە عیزەت بوون ، ئێستا کە موسڵمانین زەلیل بووینە، فەرمووی مـن فـەرمانم پێ کراوە لێ بوودەبم و لەگەلیان جەنگ نەکەم ، جا کاتێ کۆچیان کـرد بـۆ مەدینـە فەرمان بە پێغەمبـەر کـرا بجـەنگی لەگـەلێ کـافران و زاڵمـان ، جـا ئەوانـە ئـەوجارە لەسەر دڵیان قورس بوو.

٢-( عَنْ قَتَادَةَ: قَوْلُهُ: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ) (النساء: ٧٧) فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ: (إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ) (النساء: ٧٧) قَالَ: كَانَ أُنَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ بِمَكَّةَ قَبْلَ الْهِجْرَةِ ، تَسَرَّعُوا إِلَى الْقِتَالِ ، فَقَالُوا لِنَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ذَرْنَا نَتَّخِذْ مَعَاوِلَ فَنُقَاتِلَ بِهَا الْمُشْرِكِينَ بِمَكَّةَ. فَنَهَاهُمْ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ قَالَ: (لَمْ أُؤْمَرْ بِذَلِكَ) فَلَمَّا كَانَتِ الْهِجْرَةُ وَأُمِرَ بِالْقِتَالِ ، كَرِهَ الْقَوْمُ ذَلِكَ ، فَصَنَعُوا فِيهِ مَا تَسْمَعُونَ ، فَقَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ لِمَنِ اتَّقَى وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا) (النساء: ٧٧) تفسير الطبري والعجاب في بيان الاسباب

**واتە: لە قەتادەوە هاتووە دەڵێ: ئەم ئایەتە (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ)) خویندیـەوە تـاکو گەیشـتە (إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ) گـوتی : هەنـدێ لـە هاوەڵانی پێغەمبەر کە لە مەککە بوون پێش هیجرەت ، پەلەیان دەکرد بۆ جەنگ کـردن ، بـە پێغەمبـەریان گـوت لێمـان گـەرێ بـا شـەر بکـەین لەگـەلێ کـافران ، پێغەمبەریش قەدەغەی کردن ، و فەرمووی هێشتا فەرمانم پێ نەکراوە بـۆ جـەنگ کردن ، جا کاتێ هیجرەت کراو فەرمانکرا بە شەرکردن هەندێك پێیان ناخۆش بوو**

، خواش دەربارەی ئەمانە فەرمووی ﴿قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ لِمَنِ اتَّقَى وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٨٣ ) سورەتی ( النساء )

﴿وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَىٰ أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَاتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلَّا قَلِيلًا ٨٣﴾ النساء

واتە: وە کاتێك هەواڵێکیان پێ بگات دەر بارەی ئاسایش و هێمنایەتی یان لە بارەی ترسەوە بڵاوی دەکەنەوە بەڵام ئەگەر بیان گەڕانایەتەوە بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بۆ لای کار بەدەستانی خۆیان ئەوە ئەوانەی ڕاستی هەواڵەکان دەردەهێنن دەزانن هەواڵەکە(ڕاستە یان درۆیە) وە ئەگەر چاکەو بەزەیی خوا نەبوایە بەرامبەر بە ئێوە بێگومان شوێن شەیتان دەکەوتن کەمێکتان نەبێت.

((**١-(عن** عَبْد اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ، حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، قَالَ: لَمَّا اعْتَزَلَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِسَاءَهُ، قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا النَّاسُ يَنْكُتُونَ بِالْحَصَى، وَيَقُولُونَ: طَلَّقَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِسَاءَهُ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُؤْمَرْنَ بِالْحِجَابِ، فَقَالَ عُمَرُ، فَقُلْتُ: لَأَعْلَمَنَّ ذَلِكَ الْيَوْمَ، قَالَ: فَدَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ، فَقُلْتُ: يَا بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ، أَقَدْ بَلَغَ مِنْ شَأْنِكِ أَنْ تُؤْذِي رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: مَا لِي وَمَا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، عَلَيْكَ بِعَيْبَتِكَ، قَالَ فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ، فَقُلْتُ لَهَا: يَا حَفْصَةُ، أَقَدْ بَلَغَ مِنْ شَأْنِكِ أَنْ تُؤْذِي رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ وَاللهِ، لَقَدْ عَلِمْتِ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لَا يُحِبُّكِ، وَلَوْلَا أَنَا لَطَلَّقَكِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى

اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَبَكَتْ أَشَدَّ الْبُكَاءِ، فَقُلْتُ لَهَا: أَيْنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: هُوَ فِي خِزَانَتِهِ فِي الْمَشْرُبَةِ، فَدَخَلْتُ، فَإِذَا أَنَا بِرَبَاحٍ غُلَامِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَاعِدًا عَلَى أُسْكُفَّةِ الْمَشْرُبَةِ، مُدَلٍّ رِجْلَيْهِ عَلَى نَقِيرٍ مِنْ خَشَبٍ – وَهُوَ جِذْعٌ يَرْقَى عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيَنْحَدِرُ – فَنَادَيْتُ: يَا رَبَاحُ، اسْتَأْذِنْ لِي عِنْدَكَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَظَرَ رَبَاحٌ إِلَى الْغُرْفَةِ، ثُمَّ نَظَرَ إِلَيَّ، فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا، ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَبَاحُ، اسْتَأْذِنْ لِي عِنْدَكَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَظَرَ رَبَاحٌ إِلَى الْغُرْفَةِ، ثُمَّ نَظَرَ إِلَيَّ، فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا، ثُمَّ رَفَعْتُ صَوْتِي، فَقُلْتُ: يَا رَبَاحُ، اسْتَأْذِنْ لِي عِنْدَكَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِنِّي أَظُنُّ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ظَنَّ أَنِّي جِئْتُ مِنْ أَجْلِ حَفْصَةَ، وَاللهِ، لَئِنْ أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِضَرْبِ عُنُقِهَا، لَأَضْرِبَنَّ عُنُقَهَا، وَرَفَعْتُ صَوْتِي، فَأَوْمَأَ إِلَيَّ أَنِ ارْقَهْ، فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى حَصِيرٍ، فَجَلَسْتُ، فَأَدْنَى عَلَيْهِ إِزَارَهُ وَلَيْسَ عَلَيْهِ غَيْرُهُ، وَإِذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ، فَنَظَرْتُ بِبَصَرِي فِي خِزَانَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِذَا أَنَا بِقَبْضَةٍ مِنْ شَعِيرٍ نَحْوِ الصَّاعِ، وَمِثْلِهَا قَرَظًا فِي نَاحِيَةِ الْغُرْفَةِ، وَإِذَا أَفِيقٌ مُعَلَّقٌ، قَالَ: فَابْتَدَرَتْ عَيْنَايَ، قَالَ: (مَا يُبْكِيكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ) قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، وَمَا لِي لَا أَبْكِي وَهَذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِكَ، وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ لَا أَرَى فِيهَا إِلَّا مَا أَرَى، وَذَاكَ قَيْصَرُ وَكِسْرَى فِي الثِّمَارِ وَالْأَنْهَارِ، وَأَنْتَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَصَفْوَتُهُ، وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ، فَقَالَ: (يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، أَلَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَنَا الْآخِرَةُ وَلَهُمُ الدُّنْيَا؟)، قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: وَدَخَلْتُ عَلَيْهِ حِينَ دَخَلْتُ، وَأَنَا أَرَى فِي وَجْهِهِ الْغَضَبَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا يَشُقُّ عَلَيْكَ مِنْ شَأْنِ النِّسَاءِ؟ فَإِنْ كُنْتَ طَلَّقْتَهُنَّ، فَإِنَّ اللهَ مَعَكَ، وَمَلَائِكَتَهُ، وَجِبْرِيلَ، وَمِيكَائِيلَ، وَأَنَا، وَأَبُو بَكْرٍ، وَالْمُؤْمِنُونَ مَعَكَ، وَقَلَّمَا تَكَلَّمْتُ وَأَحْمَدُ اللهَ بِكَلَامٍ، إِلَّا رَجَوْتُ أَنْ يَكُونَ اللهُ يُصَدِّقُ قَوْلِي الَّذِي أَقُولُ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ آيَةُ التَّخْيِيرِ: (عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ

يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ) (التحريم: ٥)، (وَإِنْ تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ) (التحريم: ٤)، وَكَانَتْ عَائِشَةُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ، وَحَفْصَةُ تَظَاهَرَانِ عَلَى سَائِرِ نِسَاءِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَطَلَّقْتَهُنَّ؟ قَالَ: (لَا)، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ وَالْمُسْلِمُونَ يَنْكُتُونَ بِالْحَصَى، يَقُولُونَ: طَلَّقَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِسَاءَهُ، أَفَأَنْزِلُ، فَأُخْبِرَهُمْ أَنَّكَ لَمْ تُطَلِّقْهُنَّ، قَالَ: (نَعَمْ، إِنْ شِئْتَ)، فَلَمْ أَزَلْ أُحَدِّثُهُ حَتَّى تَحَسَّرَ الْغَضَبُ عَنْ وَجْهِهِ، وَحَتَّى كَشَرَ فَضَحِكَ، وَكَانَ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ ثَغْرًا، ثُمَّ نَزَلَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَنَزَلْتُ، فَنَزَلْتُ أَتَشَبَّثُ بِالْجِذْعِ، وَنَزَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَأَنَّمَا يَمْشِي عَلَى الْأَرْضِ مَا يَمَسُّهُ بِيَدِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّمَا كُنْتَ فِي الْغُرْفَةِ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ، قَالَ: (إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ)، فَقُمْتُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، فَنَادَيْتُ بِأَعْلَى صَوْتِي، لَمْ يُطَلِّقْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِسَاءَهُ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ) (النساء: ٨٣) فَكُنْتُ أَنَا اسْتَنْبَطْتُ ذَلِكَ الْأَمْرَ، وَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ آيَةَ التَّخْيِيرِ ) **صحيح مسلم**

واتە: لەعەبدولاّی کوری عەبباسەوە هاتووە دەڵێ : عومەر بۆی گێرامەوە گوتی : کاتێ بۆ ماوەیەك پێغەمبەر لە خێزانەکانی دوورکەوتەوە ، دەڵێ چوومە مزگەوت ، خەڵکی دەیانگوت پێغەمبەر خێزانەکانی تەلاّق داوە ، ئەوە پێش دابەزینی ئایەتی حیجاب بوو، عومەر دەڵێ : گوتم ئەبێ ئەو هەواڵە بزانم ، چووم لای عائیشە گوتم ئەی کچی ئەبوبەکر دەڵێن تۆ پێغەمبەری خوا ئازار دەدەی ، گوتی ئەی کوری خەتاب تۆ ئیشت بەمن چییە، برۆ عەیبی خۆتان چاك بکەن (واتە: برۆ حفحەی کچت چاك بکە)، دەڵێ چوومە لای (حفحە) گوتم ئەی حەفحە پێم گەیشتووە تۆ پێغەمبەری خوا ئازار دەدەی ، سوێند بەخوا دەزانی پێغەمبەری خوا تۆ خۆشناوێ

، ئەگەر لەبەر من نەبێ تەلاقت دەدات ، حەفصە بە توندی گریا، پێم گوت کوانی پێغەمبەری خوا؟ گوتی لەلای عەمبارەکەیەتی لەلای حەوزی ئاوخواردنەوە ، چوومە لای پێغەمبەر ، خزمتکارەکەی کەناوی (رباح) بوو دانیشتبوو لەسەر لیواری حەوزەکە ، قاچەکانی شۆڕکردبونەوە لەسەر تەختە دارێك کە پێغەمبەر پێی سەردەکەوت ودەهاتە خوارێ ، بانگم کرد هۆ (رباح) مۆڵەتم بۆ وەربگرە لە پێغەمبەری خوا، ریباح تەماشای ژوورەوەی کرد ، دوای تەماشای منی کرد ، هیچی نەگوت ، دوای دەنگی خۆم بەرزکردەوە گوتم ئەی (رباح) مۆڵەتم بۆ لە پێغەمبەری خوا وەربگرە ، وابزانم پێغەمبەر دەزانێ من هاتووم ، بۆ قسەکردن دەربارەی (حفصە) سوێند بەخوا ئەگەر پێغەمبەری خوا فەرمانم پێ بکات لە ملی دەدەم ، دەنگی خۆم بەرزکردوە ، ئامـاژەی بۆ کردم کە سەرکەوم ، چوومە ژوورەوە پێغەمبەری خوا پاڵی دابویەوە لەسەر حەسیرێك ودانیشتم ، کراسی خۆی هەڵیشایەوە وجگە لەو کراسە هیچی دیکەی بەسەرەوە نەبوو ، شوێنەواری حەسیری لەتەنیشتەکانی دیار بوو ، و تەماشای عەمباری پێغەمبەرم کرد چەند مستە جۆیەکی تێدا بوو ، ساعێك دەبوو (واتە: چوار مست،نزیکە دوو کیلۆ ) وە هەندەش مازی لەلایەکی ژوورەکە بوو (بۆ پست خۆش کردن وشتی دیکە) کوندەك هەڵواسرابوو ، عومەر دەڵێ : گریام و ئاو بەچاوەکانمدا هاتە خوار ، فەرمووی ئەی کوڕی خەتاب بۆچی دەگری ؟ گوتم ئەی نێرراوی خوا چۆن نەگریم ، وا خەتی حەسیر بەتەنیشتەوە دیارە و ئەوەش عەمبارەکەتە وا دەبینم چی تێدایە، ئەوەش (قیصر) و(کیسرا) ان لە ناو باغی پڕبەربومن و روبار بە ژێریاندا دەڕوات ، وەتۆش پێغەمبەری خوای وهەڵبژاردراوی ئەوەی ، ئەوەش عەمبارەی ئازوقەتە کەبەتاڵە ، فەرمووی (ئەی کوری خەتاب ئایا رازی نابی ئێمە قیامەتمان هەبێ و ئەوانیش دونیا، گوتم بەڵێ ، عومەر دەڵێ کاتێ یەکەم جار چوومە لا ی پێغەمبەر خەمباری

ودڵتەنگی وتورەیی پێوە دیار بوو ، گوتم ئەی نێرراوی خوا ئافرەتان ئازارت دەدەن ؟ ئەگەر دەتەوێ تەلاَقیان بدە، بێگومان خوا و فریشتەکانی وجوبریل و میکائیل و من و ابوبکر و ئیمانداران لەگەڵ تۆداین ، کەمێك قسەم کرد و سوپاسی خوا دەکەم ، ئومێدم دەخوازت خوا پاڵپشتی قسەکانم بکات ، جا خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند ، بە ئایەتی سەرپشك بەناوبانگە (عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ) (التحريم: ٥)

)، (وَإِنْ تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ) (التحريم: ٤)، وە عائیشەی کچی ئەبوبکر و حەفصحە لەسەروی خێزانەکانی پێغەمبەر نارازی بوون ، گوتم ئەی نێرراوی خوا ئایا خێزانەکانت تەلاق داون ، فەرمووی (نەخێر) گوتم ئەی نێرراوی خوا من چوومە مزگەوت موسڵمانان داریان لە لم وچەگر وەردەدا دەیانگوت پێغەمبەری خوا خێزانەکانی تەلاق داوە، ئایا بچم هەواڵیان پێ بدەم کە تۆ تەلاقت نەداون، فەرمووی (بلێ) ئەگەر حەز دەکەی ، بەردەوام قسەم لەگەڵ پێغەمبەر کرد تاکو توڕیی نەما لە دەم و چاوی و تاکو هاتە پێکەنین و ددانەکانی دەرکەوتن ، ددانەکانی لەهەموو کەس جوانتر بوو ، پێغەمبەری خوا هاتە خوار وە منیش هاتمە خوار دەستم گرتبوو بە قەدی دار خورما، پێغەمبەر هاتە خوا

وەك ئەوەی لەسەر زەوی بڕوات بەدەست خۆی نەگرت ، گوتم ئەی نێرراوی خوا ، بێگومان تۆ (٢٩) ڕۆژە لە ژووری ، فەرمووی (ئەم مانگە بیست ونۆ ڕۆژە) ، هاتمە لای دەرگای مزگەوت بەدەنگی بەرز گوتم پێغەمبەری خوا خێزانەکانی تەلاَق نەداوە ، جا ئەم ئایەتە دابەزی (وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ) جا من ئەم فەرمانم دەرهێنا و خواش ئایەتی سەرپشککردنی ناردەخوار .

معانى الكلمات :

١-(ينكتون بالحصى) أي يضربون به الأرض كفعل المهموم المفكر

٢- (عليك بعيبتك) المراد عليك بوعظ بنتك حفصة قال أهل اللغة العيبة في كلام العرب وعاء يجعل الإنسان فيه أفضل ثيابه ونفيس متاعه فشبهت ابنته بها

٣- (خزانته) الخزانة مكان الخزن كالمخزن وما يخزن فيه يسمى خزينة

٤-(المشربة) قال في الصباح بفتح الميم والراء الموضع الذي يشرب منه الناس وبضم الراء وفتحها الغرفة

٥-(أسكفة) هي عتبة الباب السفلي (مدل رجليه) أي مرسلهما

٦-(نقير) أي على شيء من خشب نقر وسطه حتى يكون كالدرجة قال النووي هذا هو الصحيح الموجود في جميع النسخ وذكر القاضي أنه بالفاء بدل النون وهو فقير بمعنى مفقور مأخوذ من فقار الظهر وهو جذع فيه درج

٧-(أن أرقه) أي أشار إلي رباح بالصعود إلى المشربة بواسطة ذلك الجذع المنقور كالسلم ف

٨ (أن) تفسيرية و (ارقه) أمر من الرقي والهاء في آخره للسكت وفي الكلام حذف تقديره فرقيت فدخلت

٩-(قرظا) القرظ ورق السلم يدبغ به

١٠-(أفيق) هو الجلد الذي لم يتم دباغه وجمعه أفق كأديم وأدم وقد أفق أديمه يأفقه

١١-(فابتدرت عيناي) أي لم أتمالك أن بكيت حتى سالت دموعي

١٢-(تحسر الغضب) أي زال وانكشف

١٣-(كشر) أي أبدي أسنانه تبسما ويقال أيضا في الغضب قال ابن السكيت كشر وبسم وابتسم وافتر كله بمعنى واحد فإن زاد قيل قهقه وزهزق وكركر

١٤-(أتشبث) أي مستمسكا بذلك الجذع الذي هو كالسلم للغرفة

١٥-(يستنبطونه) قال الزمخشري في الكشاف أي الذين يستخرجون تدبيره بفطنتهم وتجاربهم والنبط الماء يخرج من البئر أول ما تحفر وإنباطه واستنباطه إخراجه واستخراجه فاستعير لما يستخرجه الرجل بفضل ذهنه من المعاني والتدابير فيما يعضل ويهم

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٨٨ تاكو ٩٠) سورەتی (النسا)

(فَمَا لَكُمْ فِي ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُواْ مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ٨٨ وَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءً ۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ أَوْلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ٨٩ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَٰتِلُواْ قَوْمَهُمْ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَٰتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ٩٠)

واتە: ئەوە چیتانە دەربارەی دووڕووەكان بوونەتە دوو دەستە لە كاتێكدا خوا ئەوانەی گەڕاندۆتەوە بۆ بێ باوەڕی بەهۆی كردەوەكانیانەوە ئایا دەتانەوێت ڕێنموونیی كەسێك بكەن كە خوا گومڕای كردووە ؟ وە هەر كەسێ خوا گومڕای بكات ئەوە هەرگیز ناتوانی ڕێگای ڕاستی بۆ بدۆزیتەوە (٨٨)

١-(عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ لَمَّا خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أُحُدٍ رَجَعَ نَاسٌ مِمَّنْ خَرَجَ مَعَهُ وَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِرْقَتَيْنِ فِرْقَةً تَقُولُ

نُقَاتِلُهُمْ وَفِرْقَةٌ تَقُولُ لَا نُقَاتِلُهُمْ فَنَزَلَتْ فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُمْ بِمَا كَسَبُوا وَقَالَ إِنَّهَا طَيْبَةُ تَنْفِي الذُّنُوبَ كَمَا تَنْفِي النَّارُ خَبَثَ الْفِضَّةِ) البخاري

شرح : أركسهم بما كسبوا) أوقعهم في الخطأ وأهلكهم بسبب عصيانهم ومخالفتهم وأركسه قلبه ونسكه أي جعل أعلاه أسفله. / النساء ٨٨ /. (تنفي الذنوب) تظهر من يرتكب فيها الذنوب وتميزهم.

واته: لەزەیدی کوڕی سابیتەوە هاتووە خوا لیّ رازی بیّ دەڵیّ :کاتیّ پیّغەمبەر دەرچوو بۆ جەنگی (احد) هەندیّ لە خەڵکی گەرانەوە لەگەلی نەچوون (ئەوانە موونافیقەکان ) بوون ، جا هاوەڵانیش بوونە دوو بەش هەندێك دەیانگوت کافربوون شەریان لەگەڵ دەکەین ، هەندێك دەیانگوت شەریان لەگەڵ ناکەین هێشتا موسڵمانن ، جا خوا ئایەتی دابەزاند وفەرمووی (فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُمْ بِمَا كَسَبُوا) ، پێغەمبەر فەرمووی ئەوە (طَيْبَةُ)یە واتە: شاری مەدینە گوناحان رەش دەكاتەوە ،وەك چۆن ئاگر پیسی زیو لادەبات.

(أركسهم) واتە: سەربەرەو خواری کردنەوە، وەکو کەسێك سەری بخرێتە سەر زەوی و قاچی بەرز بکرێتەوە.

*********************************

# وتاری ژماره (٣١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٩٣) سورەتی (النساء)

﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ٩٣﴾ النساء

واته: وه هەر کەسێك ئیماندارێك بەدەس ئەنقەس بکوژێت ئەوه تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە بە هەمیشەیی تیایدا ئەبێت و خوا خەشمی لێگرتووه و نەفرینی لێ کردووه و سزایەکی گەورەی بۆ ئامادە کردووه.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ أَمَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبْزَى قَالَ سَلْ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ هَاتَيْنِ الْآيَتَيْنِ مَا أَمْرُهُمَا وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ لَمَّا أُنْزِلَتْ الَّتِي فِي الْفُرْقَانِ قَالَ مُشْرِكُو أَهْلِ مَكَّةَ فَقَدْ قَتَلْنَا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ وَدَعَوْنَا مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَقَدْ أَتَيْنَا الْفَوَاحِشَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ الْآيَةَ فَهَذِهِ لِأُولَئِكَ وَأَمَّا الَّتِي فِي النِّسَاءِ الرَّجُلُ إِذَا عَرَفَ الْإِسْلَامَ وَشَرَائِعَهُ ثُمَّ قَتَلَ فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ فَذَكَرْتُهُ لِمُجَاهِدٍ فَقَالَ إِلَّا مَنْ نَدِمَ )رواه البخاري

واته: له سەعیدی کوڕی جوبیرەوه هاتووه دەڵێ: عبدالرحمن کوڕی ئەبزا فەرمانی پێ کردم ، گوتی : پرسیار بکە لە ئیبنو عەباس دەربارەی ئەم دوو ئایەتە بزانە حوکمیان چییە؟ (وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا)

دەڵێ منیش پرسیارم لە ئیبنو عەباس کرد ، ئەویش گوتی: کاتێ ئەو ئایەتەی لە (الفرقان) دابەزی موشریکانی مەککە گوتیان : ئێمە خەڵکمان کوشتوە کە خوا حەرامی کردوە، وە هاواری جگە لە خوامان کردوە، وە داوێن پیسیشمان کردوە، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ.........) ئەو ئایەتە بۆ ئەوانەیە، بەلاَم ئەو ئایەتەی لە سورەتی (النسا) ئەوە پیاوێکە ئیسلام و یاساکانی زانیوە، دوای خەڵکی کوشتوە ، پاداشتی دۆزەخە، دەڵێ: ئەمم بۆ موجاهید باسکرد، گوتی : مەگەر کەسێك پەشیمان بێتەوە.

ئەوەش دوو هەر دووبابەتەکە:

**١-( وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ٦٨ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ٦٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٧٠) الفرقان**

واتە: وە کەسانێکن کە لەگەڵ خوادا ناپەرستن هیچ پەرستراوێکی تر و ناکوژن هیچ کەسێ کە خوا کوشتنی ئەوی یاساغ (حەرام) کردووە بەهەق و ڕەوا نەبێ وە زیناو داوێن پیسی ناکەن وە هەر کەس ئەو تاوانانە بکات (کە باسکران) تووشی تۆڵەکەی دێت.(٦٨) سزای بۆ چەند بارە دەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا و بێ بڕانەوە بەبێ ڕێزو ڕیسوایی لە دۆزەخ دا دەمێنێتەوە.(٦٩) بێجگە لە کەسێ تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ کارو کردەوەی چاکیشی کردبێت ئا ئەوانە خوا خراپە و تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە وە خوا هەمیشە لێبووردەی بە بەزەیی یە.(٧٠) (پوختەی تەفسیر)

**٢-( وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ٩٣) النساء**

واتە: هەر کەسێك بەدەستی ئەنقەست ئیمانداریێك بکوژێت (بەحەلالی بزانێت)، ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە، نەمرە تیایدا، هەروەها خوا لێی تورِە بووە و نەفرینی لێکردووە و سزایەکی گەورە و بێ سنووری بۆ ئامادە کردووە.(تەفسیری ئاسان)

٢–( عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ اخْتَلَفَ أَهْلُ الْكُوفَةِ فِي قَتْلِ الْمُؤْمِنِ فَرَحَلْتُ فِيهِ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ نَزَلَتْ فِي آخِرِ مَا نَزَلَ وَلَمْ يَنْسَخْهَا شَيْءٌ( رواه الخاري )

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبێرەوە هاتووە دەڵێ: ئەهلی کوفە راجیایان کەوتە نێوان دەربارەی کوشتنی ئیماندار ، دەڵێ منیش چوومە خزمەت ئیبنو عەباس ، ئەویش گوتی : ئەم ئایەتە دابەزی لە دوایەکان و هیچ ئایەتێکی نەسخی نەکردۆتەوە.

**چەند فەرموودەیەك لەم بارەوە:**

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الظُّلْمُ ثَلَاثَةٌ، فَظُلْمٌ لَا يَغْفِرُهُ اللَّهُ، وَظُلْمٌ يَغْفِرُهُ اللَّهُ، وَظُلْمٌ لا يَتْرُكُ اللهُ منه شيئاً. فَأَمَّا الظُّلْمُ الَّذِي لَا يَغْفِرُهُ اللَّهُ فَالشِّرْكُ، وقال: (إنَّ الشرك لَظُلْمٌ عظيم)، وَأَمَّا الظُّلْمُ الَّذِي يَغْفِرُهُ اللَّهُ فَظُلْمُ الْعِبَادِ لِأَنْفُسِهِمْ فِيمَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ رَبِّهِمْ، وَأَمَّا الظُّلْمُ الَّذِي لَا يَتْرُكُهُ فَظُلْمُ الْعِبَادِ بَعْضِهِمْ بَعْضًا حَتَّى يَدِينَ لِبَعْضِهِمْ مِنْ بَعْضٍ) أخرجه الطيالسى أبو نعيم فى الحلية قال الالباني حسن

واتە:لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: زوڵم (٣) جۆرە ، زوڵمێك خوا لە خاوەنەکەی خۆش نابێ ، وە زوڵمێك خوا لە خاوەنەکەی خۆش دەبێ، وە زوڵمێك هیچی لێ پاز نادرێ، ئەو زوڵمەی خوا لێ خۆش نابێ ئەوە شیرکە، وەك خوا فەرموویەتی (شیرك زوڵمێکی گەورەیە) وە ئەو زوڵمەی خوا لێ خۆش دەبێ ، ئەوە زوڵمی بەندەکانە کە لە خۆیان دەکەن لە نێوان ئەوان خوای

خۆیـان، وه ئـەو زوڵمـەی هیچـی پارزنـادرێ ، ئـەوە زوڵمـی بەندەکانـە هەنـدێك لـە هەندێکی دەکەن تاکو حەق ومافی یەکدی دەدەنەوە.

-(كُلُّ ذَنْبٍ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَغْفِرَهُ إِلَّا الرَّجُلَ يَمُوتُ كَافِرًا، أَوْ الرَّجُلَ يَقْتُلُ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا) رواه النسائي والحاكم وقال صحيح الإسناد

واتە: هەموو گوناحێك ئومید وایە خوا چاوپۆشی لێ بکات ، مەگەر کەسێك بەکافری بمرێ ، یان گەسێك باوەڕدارێك بکوژی بە ئەنقەست.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٩٤) سورەتی (النساء)

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ٩٤)

واتـە: کـە چـوونە جیهـاد هـەموو شـتێ لێـك بدەنـەوە: ئیمـامی (بوخـاریی) دەڵـێ: کابرایەکی دەوڵەمەند باوەڕی هێناو، موسـڵمانەکانیش بـێ ئاگـابوون لێـی، جاکـاتێ هات و سڵاوی لێکردن، ئەوان وتیـان: ئەمـە بۆئـەوە سـڵاو دەکـا ئێمـە نـەیکوژین و، مەڕومالّاتەکەی بپارێزێ، بۆیە لێیان قەبووڵ نەکردو کوشتیان! جا ئەم ئایەتە هـات و فەرمووی: ئـەی ئەوکەسـانەی باوەڕتـان هێنـاوە! کـاتێ لەبـەر ڕێـی خـوا دەچـنە جیهاد، یان هەرکارێکی تر دەکەن بەباشی بکۆڵنەوە لەو خەڵکـەی پێیـان دەگـەن و لەخۆتانـەوە بـە کافریـان دامـەنێن و مـەیانکوژن و ئەوکەسـە داوای ئاشـتیی دەکـاو دەیەوێ فەرمانبەردار بێ، ئێوە پێی مەڵێن: ئیماندار نیت دەتانەوێ بـەوە سـامان و داراییەکی ژیانی دونیا بەدەست بخەن خـۆ بـەلای خـواوە غەنیمـەتێکی زۆرو فـراوان

هەیە ئێوەیش –بەر لەمە– هەر ئاوابوون و ئیمان هێنانتان هەر بەوشێوە بوو لێیشتان وەرگیرا جاخوا بەبەزەیی خۆی ڕێزی گرتن و منەتی نایە سەرتان و دینی خۆی سەرخست و، ئێوەش ئیمانی خۆتانتان دەربڕی (فتبینوا) جا بۆجارێکی تر پێیان دەڵێتەوە: لەکارەکانتان بکۆڵنەوە ئەوسا ئەنجامیان بدەن. واتە: پەلە مەکەن لەبڕیارداو وردو لەسەرخۆبن بەراستی خوا هەمیشە لەوکاروکردەوە دەیکەن بەئاگایەو، هەر بەپێی ئەوەش پاداشت و تۆڵەتان ئەداتەوە. ڕێنماییەکانی ئایەتی (٩٤): ١– دەبێ بۆجیهاد ڕێگەی دوورو درێژ ببڕدرێ. ٢– دەبێ لەو شتانە بکۆڵینەوە کە کردنیشیان بەهەڵە زیانێکی گەورەی لێ دەوەشێتەوە. ٣– وەرگرتنی پەندو ئامۆژگاری لەڕووداوەکان.(تەفسیری ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێرانەوە هەیە:

١–( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا (وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمْ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا) قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ كَانَ رَجُلٌ فِي غُنَيْمَةٍ لَهُ فَلَحِقَهُ الْمُسْلِمُونَ فَقَالَ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ فَقَتَلُوهُ وَأَخَذُوا غُنَيْمَتَهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِي ذَلِكَ إِلَى قَوْلِهِ تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا تِلْكَ الْغُنَيْمَةُ قَالَ قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ السَّلَامَ ) رواه البخاري

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی ڕازی بێ دەڵێ: ئایەتەی (وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمْ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا) پیاوێك مێگەلە مەڕێکی هەبوو ،موسڵمانان پێی گەیشتن ، کابرای مەڕدار گوتی :( السلام علیکم ) ئەوانیش کوشتیان و مەڕەکەیان برد ، گوتیان : ئەوە لەترسان سڵاوی کردوە موسڵمان نیە،

جا خوا ئەو ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی : داوای کەل وپەلی و ژیان دونیا دەکەن ، مەبەستی دەستەکەوتی مەڕەکانە .

٢-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ مَرَّ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ عَلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهُ غَنَمٌ لَهُ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ قَالُوا مَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا لِيَتَعَوَّذَ مِنْكُمْ فَقَامُوا فَقَتَلُوهُ وَأَخَذُوا غَنَمَهُ فَأَتَوْا بِهَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمْ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: پیاوێك لە هۆزی سولیم بەلای کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر رابرد ، ئەویش سڵاوی لێ کردن، هاوەڵان گوتیان: تەنها لەبەر ئەوە سڵاوی لە ئێوە کرد تاکو خۆی لێتان بپارێزێ، هەستان کوشتیان ، ومەڕوماڵاتیان برد، هێنایانە خزمەت پێغەمبەر ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند فەمووی: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ بۆ سەفەرو جیهاد چوونەدەرێ، شت روون بکەنەوە ، ئەگەر کەسێك سڵاوی لێ کردن لە خۆڕا مەڵێن ئەو کەسە موسڵمان نیە.

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٩٥) سوڕەتی (النساء)

(لَا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ٩٥)

واتە : موسڵمانی جەنگاوەرو دانیشتوو کەی وەك یەكن: پێشەوا (بوخاری) لە(بەراو) وە دەگێڕێتەوە: کاتێ کەئایەتی: **(لا يستوي القاعدون من المؤمنين ..)**

هاتەخوارێ، پێغەمبەر (صلی اللـه علیـه وسـلم) (زەیـد)ی بـانگکرد تـابۆی بنوسـێ، ئـەویش دەفـەی شـانی حـەیوانێکی هێنـاو ئایەتەکـەی لەسـەر نووسـی، پاشـان کوڕەکەی (ئوممی مەکتوم) هات و سکاڵای نابینایی خۆی کردو رایگەیاند کـە لەبـەر نابینایی ناتوانێ بچێت بۆجیهاد، دەبێ چارەی چی بێت، ئەوجا بەشەکەی تری هات و فەرمووی: (.. **غیر اولي الضرر ..**). (**لایستوي القاعدون مـن المؤمنین غـیر أولـي الضرر والمجاهدون في سبیل الله بأموالهم وأنفسهم** )واتە: ئەو دانیشتووە بڕوادارانە – جگە لەوانـەیان نوقوسـتانن– و موجاهیـدانێ کـە بـەماڵ و بـەگیانیان لـەڕێی خـوادا تێدەکۆشـن یەکسـان نـین، واتـە: کەسێك لەگۆرەپانـدا بـێ وجیهـاد بکـات، لەگـەڵ کەسێکی دانیشتوودا یەکسان نین، مەگەر ئەودانیشتووە عوزرێکی شەرعیی هەبێت، وەك شەلیی و کوێریی و هەر ناتەواوییەکی تر، یان فەرماندەکـەی مۆڵـەتی دابێـت و گۆرەپـانی جـێ هێشـتبێت. بـەڵێ لـەم جێگایـەدا فـەزڵی هەنـدێ لەموجاهیـدانی بەسـەرهەندێکی دیکـەدا نـەداوەو، سـەرجەم چـوونیەك باسـیان دەکـا، بـەڵام لەسوورەتی (حەدید: ١٠)دا بەڕاشکاوەیی دەبینرێ کـە هەنـدێکیان فـەزڵیان هەیـە بەسەر هەندێکی تریاندا، وەك دەفەرموێ: (**لا یستوي منکم من أنفق من قبـل الفـتح وقاتل أولئك أعظم درجة من الذین أنفقوا من بعد وقاتلوا وکلا وعدالله الحسنی** ). ئەو موجاهیدانەی کە بەماڵ و بـەگیانیان جیهـاد دەکـەن، خـوا بـە پلەیـەك فـەزڵی داون بەسەر دانیشتواندا، تەنانەتی بەسەر ئەوانەشدا بیانوویان هەیە، یـان مۆڵـەت دراون. بەڵێ.. ئەوکەسـەی ئامـادەیی جیهـادی هەیـەو، بیانوویـەك دەسـتی دەگـرێ و بـۆی ناگونجێـت، لای خـوا هـەر بەموجاهیـد دەدرێتـە قەڵـەم، بـەڵام ئەڵبەتـە وەك ئـەو موجاهیدە نییە کە بەسامان و بەگیان لەگۆڕەپاندایە وخـوا بـەڵێنی پاداشـتی بـەرزو بـەنرخ و چـاکی داوە بەهـەردوولایان، واتـە: بەخـەڵکانی دانیشـتووی بـەبیانوو و،

موجاهیدی ناوگۆڕەپان و خـوا بـەکرێ و مزەیـەکی مـەزن فـەزڵی موجاهیـدانی داوە بەسەر خەڵکانی دانیشتوودا) تەفسیری ڕامان .

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ الْبَرَاءِ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ادْعُ لِي زَيْدًا وَلْيَجِئْ بِاللَّوْحِ وَالدَّوَاةِ وَالْكَتِفِ أَوْ الْكَتِفِ وَالدَّوَاةِ ثُمَّ قَالَ اكْتُبْ لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ وَخَلْفَ ظَهْرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَمْرُو بْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَمَا تَأْمُرُنِي فَإِنِّي رَجُلٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ فَنَزَلَتْ مَكَانَهَا لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ) رواه البخاري

واتە: لە بەراوە هـاتووە دەڵـێ: کـاتێ ئـەم ئایەتـە دابـەزی (لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ) پێغەمبەر فەرمووی : بۆم بانگی (زید) بکەن، و با شتومەکی نووسین لەگەڵ خۆی بێنێ، دوای بە زیدی فەرمووی: بنوسە (لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ) وە لە پشت پێغەمبەر عەمری کوڕی ئوم مەکتومی کـوێر هـەبوو ، گـوتی: ئەی نێرراوی خوا چ فەرمانێکم پێ دەکەی ، من پیاوێکی نابینام ، جا لە جیاتی ئەو ئایەتـە ئـەوجارە بـەم جـۆرە دابـەزی وفـەرمووی (لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ)

واتە: هەرگیز وەکو یەك نین ئەوانەی لە پێناوی خوا جیهاد دەکەن لەگەڵ ئەوانـەی لـە مـاڵ دانیشـتوون ، جگـە لەوانـەی عوزیریـان هەیـە وەك نـەخۆش و کـوێر و پەککەوتە.....)

٢-(عن سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ السَّاعِدِيُّ أَنَّهُ رَأَى مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ فِي الْمَسْجِدِ فَأَقْبَلْتُ حَتَّى جَلَسْتُ إِلَى جَنْبِهِ فَأَخْبَرَنَا أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمْلَى عَلَيْهِ لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَجَاءَهُ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهْوَ يُمِلُّهَا عَلَيَّ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَاللَّهِ لَوْ أَسْتَطِيعُ الْجِهَادَ لَجَاهَدْتُ وَكَانَ أَعْمَى فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي فَثَقُلَتْ عَلَيَّ حَتَّى خِفْتُ أَنْ تَرُضَّ فَخِذِي ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ غَيْرَ أُولِي الضَّرَرِ) رواه البخاري

دەرسەکانی ئەم ئایەتە:

١-بەزەیی هاتنەوەی خوا بە خەڵکی خاوەن بیانو.

٢-ئەوانە مادام حەزیان لە کارەچاکەکانە ناشتوانن بەشداربن، لەپاداشتەکە بەشدارن.

٣-لە فەرموودا هاتووە کەسی نەخۆش و ڕێبوار پاداشتیان هەیە، نەخۆش تاکو چاك دەبێتەوە ، ڕێبوار تاکو دەگەڕێتەوە.

(عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ أَوْ سَافَرَ كُتِبَ لَهُ بِمِثْلِ مَا كَانَ يَعْمَلُ مُقِيماً صَحِيحاً) رَوَاهُ الْبُخَارِيّ

-( إِنَّ الْعَبْدَ الْمُسْلِمَ إِذَا مَرِضَ أَوْ سَافَرَ كُتِبَ لَهُ مِنْ الْأَجْرِ كَمَا كَانَ يَعْمَلُ مُقِيمًا صَحِيحًا) رواه احمد

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : بەندەی موسڵمان مادام نەخۆشە یان لەسەفەرە ، پاداشتی ئەو کردەوانەی بۆ دەنوسرێت کە کاتی ساغی دەیکردن ، یان کە لەسەفەر نەبوو.

**************************

## وتاری ژماره (٣٢) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٩٧) سورەتی (النساء)

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا ۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ٩٧﴾ النساء

واته: وا دەردەكەوێت هەندێك لەوانەی لە مەككەدا موسڵمان بووبوون، لەبەر ئەو ماڵ و سەروەتەی هەیانبوو هەر لە مەككەدا مابوونەوەو كۆچیان نەكرد بۆ مەدینە، تا لەوێ ژمارەی موسڵمانان لە مەدینەدا زیاد بێت و لەگەڵیاندا بەرانبەر دوژمن بوەستن، وە ڕازی بوون بەو ژیانە دژوارو ناخۆشەی كە لەناو بتپەرستەكاندا لە مەككە هەیانبوو. ئەمە لە حاڵێكدا كە كۆچكردنیان لەسەر پێویست كرابوو، ئینجا لەم ئایەتە پیرۆزەدا، خودا دەفەرموێت: بێگومان ئەو جۆرە كەسانە كە ستەمیان لە خۆیان كردووە، بەوەی لەناو بتپەرستەكاندا ماونەتەوە، لەكاتی گیان لێ سەندنەوەیاندا مەلائیكەكان پێیان دەڵێن: بۆچی بە زەلیلی لەناو بتپەرستەكاندا مانەوەو كۆچتان نەكرد، تا بەباشی پەیڕەوی ئایینەكەتان بن؟! ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان: بێ تواناو دەستبەسەر بووین.. ئینجا مەلائیكەكان وتیان: بۆچی بە زەلیلی قایل بوون، ئایا سەر زەوی خودا فراوان نەبوو كۆچ بكەن تا لە بتپەرستەكان ڕزگارتان ببێت؟! ئەوانە ئەگەر باوەڕیان بە ئایینەكەیان قایم بوایە لە كۆچكردن بەجێ نەدەمان، لە حاڵێكدا كە كۆچ پێویست كرابوو لەسەریان.. بۆیە

جێگەیان دۆزەخە، کە سەرەنجامێکی زۆر ناخۆشەو خراپترین ئاکامە) (تەفسیری گوڵشەن)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عن عكرمة عن ابن عباس قال: كان قوم من أهل مكة أسلموا وكانوا يستخفون بالإسلام، فأخرجهم المشركون يوم بدر معهم، فأصيب بعضهم وقتل بعض، فقال المسلمون: كان أصحابنا هؤلاء مسلمين وأكرهوا فاستغفروا لهم فنزلت (إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ) إلى آخر الآية. قال: وكتب إلى من بقي بمكة من المسلمين هذه الآية لا عذر لهم قال: فخرجوا فلحقهم المشركون فأعطوهم الفتنة فنزلت هذه الآية (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ) إلى آخر الآية. فكتب المسلمون إليهم بذلك فخرجوا وأيسوا من كل خير ثم نزلت فيهم (ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا فُتِنُوا ثُمَّ جَاهَدُوا وَصَبَرُوا إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَحِيمٌ) فكتبوا إليهم بذلك إن الله قد جعل لكم مخرجا، فخرجوا فأدركهم المشركون فقاتلوهم ثم نجا من نجا وقتل من قتل)الحديث قال الهيثمي في مجمع الزوائد ج٧ ص١٠ رجاله رجال الصحيح غير محمد بن شريك وهو وهو ثقة) الصحيح المسند في اسباب النزول

واتە: لەئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ : هەندێ خەڵکی مەککە موسڵمان ببوون بەلآم بەدزی ، موشریکانیش ڕۆژی (بدر) لەگەل خۆیان هێنان بۆ شەڕ ، هەندێك بریندار‌بون و هەندێك کوژران ، موسڵمانان گوتیان ئەوانە هاوەڵی ئێمەن وپێیان ناخۆش بوو کوژراون ، داوایان لە خوا کرد عەفویان بکات چونکە لەگەڵ کافران کوژراون ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند (إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ) دەڵێ ئەم ئایەتەیان نووسی و ناردیان بۆ ئەو موسڵمانانەی لە (مكە) مابوون ، کە

هیچ بیانویان نەماوە ، ئەوانیش دەرچوون بۆ مەدینە لە ڕێگا توشی موشریکان بوون ، توشی بەلاو تاقیکردنەوە بوون ، جا ئەم ئایەتە دابەزی (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ) جا موسلمانان ئەم ئایەتەشیان بۆ نووسیێن ونادریان ، جا لە هەموو خێرێك بێ ئومید بوون ، ئەوجا خوا ئەم ئایەتەی دەربارەیان ناردە خوارەوە (ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا فُتِنُوا ثُمَّ جَاهَدُوا وَصَبَرُوا إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَحِيمٌ)) جا موسلمانان ئەم ئایەتەیان بۆ ناردن ، خوا دەرگایەکی بۆ کردنەوە ، دەرچوون بۆ لای مەدینە ، توشی موشریکان بوون ، هەندێ کوژران و هەندێکش رزگاریان بوون .

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠٠) سوڕەتی (النساء)

(وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ١٠٠) النساء

واتە: وە هەر کەسێك کۆچ بکات لە ڕێ ی خوادا دەستی دەکەوێت لە زەوی دا جێگە و ڕێگەی زۆر(کە دوژمن پێی ناخۆشە) وە فراوانی(لە رۆزی ژیاندا) وە هەر کەسێك لە ماڵی خۆی دەرچێت وە کۆچ بکات بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی پاشان مردن پیێ ی بگات ئەوە بێگومان پاداشتی ئەو کەسە کەوتۆتە سەر خوا وە خوا هەمیشە لێبوردەی بە بەزەییە.

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنِ الزُّبَيْرِ بن العوام ، فِيمَنْ (هَاجَرَ إِلَى أَرْضِ الْحَبَشَةِ الْهِجْرَةَ الثَّانِيَةَ خَالِدُ بْنُ حِزَامٍ فَنَهَشَتْهُ حَيَّةٌ فِي الطَّرِيقِ فَمَاتَ)رواه الحاكم

واتە: لە زوبێری کوڕی عەوامەوە هاتووە دەڵێ: ئەوانەی بۆ زەوی حەبەشە کۆچیان کرد جاری دووەم (خالدی کوڕی حزام) یان تێدا بوو لە ڕێگا مارێك پێوەدا و مرد، جا ئەو ئایەتە دەربارەی ئەو دابەزی

٢-(هاجر خالد بن حزام إلى أرض الحبشة فنهشته حية في الطريق فمات فنزلت فيه : ( ومن يخرج من بيته مهاجرا إلى الله ورسوله ثم يدركه الموت فقد وقع أجره على الله وكان الله غفورا رحيما ( النساء : ١٠٠ ) . فقال الزبير : فكنت أتوقعه وأنتظر قدومه وأنا بأرض الحبشة فما أحزنني شيء حزن وفاته حين بلغني لأنه قل أحد ممن هاجر من قريش إلا ومعه بعض أهله أو ذوي رحمه ولم يكن معي أحد من بني أسد بن عبد العزى ولا أرجو غيره ) السلسلة الصحيحة

واتە: خالد کوڕی حزام کۆچی کرد بۆ حەبەشە لە ڕێگ مارێك پیوەدا وەفاتی کرد ، ئەم ئایەتەی دەربارە هاتە خوار (وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ١٠٠)

زوبیر دەڵێ : من چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد تاکو بێتە حەبەشە، ئەوەی زۆر خەمباری کردم ، هەرکەس کۆچی دەکرد لەگەڵ خزم وکەس وکاری بوو ، ئەو بەتەنیا بوو.

کەواتە: (ئەم ئایەتە بۆ خالدی کوڕی حزام) دابەزیوە کە چۆن بە غەریبی دەمرێ لە ڕێگا.

**دەرسەکانی ئەم ئایەتە:**

١-ئەم ئیسلامە واها بە ئاسانی نەگەوێتە ئەو ڕۆژە

٢-خالید کوڕی حیزام لە غوربەتی دەمرێ ، بەڵام خوا لەسەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمان ئایەتی دەربارە دەنێرێتە خوارەوە.

٣-ئینسان ئەگەر بە مەردی بمرێ ، خوا ناوی بە زیندوی دەهێڵێتەوە.

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠٢) سورەتی (النساء)

﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ ۖ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ١٠٢

واتە: نوێژی ترس و شێوەی کردنەکەی: (ئیبن کەسیر) لە (ئەبوو عەییاش)ـەوە - کەپێشەوا (ئەحمەد، حاکم، ئیبن جەریر) ریوایەتی دەکەن- ئەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەگەڵ پەیامبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) لە(عوسفان)دا نوێژی نیوەڕۆمان دەکرد، بێ باوەڕەکانیش بەسەرۆکایەتی (خالیدی کوڕی وەلید) لەبەر دەمماندا (لەلای ڕووگەوە) بوون، جا کە دیتیان وائێمە خەریکی نوێژین وتیان: خۆزگە هەرئێستا بەیەکدەست دەماندا بەسەریاندا پاشان وتیان: خۆ بەینێکی تر کاتی نوێژی تریان دێت، خۆ ئاشکرایە کەموسڵمانەکان نوێژیان لەخۆیان و لەماڵ و منداڵیان خۆشتردەوێ، (عەیاش) دەڵێ: لەنێوان نوێژی نیوەڕۆو عەسردا (جوبریل) ئەم ئایەتەی هێناو فەرمووی: (وإذا کنت فیهم فأقمت لهم الصلاة) کاتێ لەناو

هاوەڵانتدا بوویت ئەی پێغەمەر! (صلی اللـه علیـه وسـلم) واتـە: لەسـەفەردا، ئینجا ویسـتت نوێـژی بەکۆمـەڵیان بۆبکـەیت و، کـاتی رووبەڕووبوونـەوەش بـوو لەگـەڵ کافراندا با دەستەیەکیان لەگەڵت هەڵسن ونوێژ دابەستن، ئـەوانی تریشـیان لـەرووی دوژمن رابووەستن، واتە: ئەگەر دوژمن لەنێوان ئێوەو قیبلەدا بوو، هاوەڵەکانت بکـە بەدوو دەستەوە ودەبێ هەموو –نوێژ خـۆین و پاسـەوان– چـەکەکانیان بەدسـتەوە بگرن جا کاتێ ئەم دەسـتە کـە لەگـەڵ تـۆ سـوژدە دەبـەن، بـە پەلـە بچـن لـەدوای ئێـوەوە رابووەسـتن و پارێزگاریتـان بکـەن، واتـە: دەسـتەی یەکـەم رکاتێـك لـە نوێژەکەیان لەگەڵ تۆ دەکەن، ئەوسا بەپەلە جیا دەبنەوەو بۆخۆیـان و ئـەوی تـری تەواودەکـەن و دەبنـە پاسـەوان و دەبـێ ئـەو دەسـتەکەی تـر کـە هێمـان نوێـژیان نـەکردووەو پاسـەوانن بێنـە پـێش و لەگـەڵ تـۆدا نوێـژ بەجەماعـەت بکـەن و دەبـێ وریایی خۆیان وەرگرن و چەکەکانیشیان بەدەستەوە بگرن و بێ باوەڕەکـان پێیـان خۆشە کە ئێوە –بەهۆی نوێژەکەتانەوە– لەچەك و کەلوپەلەکانتان غافلٚ و بێ ئاگا بـبن ئەوسـا ئـەوانیش بەیـەك دەسـت پـەلامارتان بـدەن و هێـرش بێننـە سـەرتان، کـەوابوو نـابێ هـەموو بەیـەکجار پێکـەوە نوێـژ بکـەن، بـەڵکو دەبـێ دەسـتەیەك بەچەکەوە پاسەوانتان بن هەتا لێدەبنەوە وە ئەگەر نارەحەتیی و ئازارێکتان هەبوو وەکو باران، یان نەخۆش و بریندار بن، ئەوە لەوکاتانەدا هیچ گوناهتان لەسەر نییـە چـەکەکانتان دانـێن لـەکاتی نوێژەکانـدا و هـەردەبێ هۆشـیاریی و وریـایی خۆتـان وەرگرن ، واتە: تا ئەتوانن ئامادە باش بن بۆ دوژمن و خۆتان بپارێزن لێیـان دیـارە کەخوا بۆ بێ باوەڕەکان سزایەکی ئابڕووبـەروو ریسـواکەری ئامـادە کـردووە. بـەڵێ خوای گەورە و دلۆڤان لەبەر باران و هەرشتێکی تری دژوار مۆڵەتی موسڵمانان دەدا چەکەکانیان لەشان داگرن، بەڵام لەوکاتەشدا هـەردەبێ هوشـیارو وریـابن، کـەوابوو

ئەگەر موسڵمانان هەمیشە ئامادەباش بن بۆ جیهاد خوای بە دەسەڵات کافران دەشکێنێ و ریسوایان دەکات. (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيُّ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعُسْفَانَ فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ صَلَاةُ الظُّهْرِ ، وَعَلَى خَيْلِ الْمُشْرِكِينَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ، قَالَ: فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَصْحَابِهِ الظُّهْرَ ، قَالَ: فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: إِنَّ لَهُمْ صَلَاةً بَعْدَ هَذِهِ هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنْ أَبْنَائِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ، يَعْنُونَ صَلَاةَ الْعَصْرِ، فَنَزَلَ جَبْرَئِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ ، فَأَخْبَرَهُ ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ (وَإِذَا كُنْتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ) (النساء: ١٠٢) الْآيَةَ إِلَى آخِرِهَا، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ ، فَصَفَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَفَّيْنِ ، وَعَلَيْهِمُ السِّلَاحُ ، فَكَبَّرَ وَالْعَدُوُّ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وَكَبَّرُوا جَمِيعًا ، وَرَكَعُوا جَمِيعًا، ثُمَّ سَجَدَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ ، وَالْآخَرُونَ قِيَامًا يَحْرُسُونَهُ، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ إِلَى الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ وَسَجَدَ الْآخَرُونَ ، ثُمَّ تَقَدَّمَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَصَافِّ هَؤُلَاءِ ، وَتَأَخَّرَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَصَافِّ هَؤُلَاءِ ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً أُخْرَى ، فَرَكَعُوا جَمِيعًا ، ثُمَّ سَجَدَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ ، وَالْآخَرُونَ قِيَامًا يَحْرُسُونَهُمْ ، فَلَمَّا فَرَغُوا سَجَدَ هَؤُلَاءِ ، ثُمَّ سَلَّمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ . قَالَ أَبُو عَيَّاشٍ: فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذِهِ الصَّلَاةَ مَرَّتَيْنِ، مَرَّةً بِعُسْفَانَ وَمَرَّةً فِي أَرْضِ بَنِي سُلَيْمٍ) السنن الكبري للبيهقي والدار قطني وواحمد (إسناده صحيح، رجاله ثقات رجال الشيخين غير أن صحابيه لم يخرج له سوى أبي داود

والنسائي. منصور: هو ابن المعتمر، ومجاهد: هو ابن جبر المكي.وهو عند عبد الرزاق في "مصنفه" (٤٢٣٧) ، ومن طريقه أخرجه الطبراني في "الكبير" (٥١٣٢) ، والدارقطني ٢/٥٩- ٦٠.وأخرجه الطيالسي (١٣٤٧) ، وأبو داود (١٢٣٦) ، والنسائي في "المجتبى" ٣/١٧٧-١٧٨، والدولابي في "الكنى" ١/٤٧، والطبري في "تفسيره" (١٠٣٢٣) و (١٠٣٢٤) و (١٠٣٧٨) ، وابن حبان (٢٨٧٦) ، والطبراني في "الكبير" (٥١٣٣- ٥١٤٠) ، والدارقطني ٢/١٦٠، والحاكم ١/٣٣٧-٣٣٨، والبيهقي في "السنن" ٣/٢٥٤-٢٥٥ و٢٥٦-٢٥٧، والبغوي في "شرح السنة")

٢-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ: (إِنْ كَانَ بِكُمْ أَذًى مِنْ مَطَرٍ أَوْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَنْ تَضَعُوا أَسْلِحَتَكُمْ) (النساء: ١٠٢) قَالَ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ كَانَ جَرِيحًا ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

٣-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَلَقِيَ الْمُشْرِكِينَ بِعُسْفَانَ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ الله عليه الصلاة والسلام الظُّهْرَ فَرَأَوْهُ يَرْكَعُ وَيَسْجُدُ هُوَ وَأَصْحَابُهُ، قَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: كَانَ هَذَا فُرْصَةً لَكُمْ لَوْ أَغَرْتُمْ عَلَيْهِمْ مَا عَلِمُوا بِكُمْ حَتَّى تُوَاقِعُوهُمْ، فَقَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ: فَإِنَّ لَهُمْ صَلَاةً أُخْرَى هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنْ أَهْلِيهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ، فَاسْتَعِدُّوا حَتَّى تُغِيرُوا عَلَيْهِمْ فِيهَا، فَأَنْزَلَ الله تعالى تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَلَى نَبِيِّهِ: (وَإِذَا كُنْتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، وَأَعْلَمَ مَا ائْتَمَرَ بِهِ الْمُشْرِكُونَ، وَذَكَرَ صَلَاةَ الْخَوْفِ ) اسباب النزول للواحدي والحاكم في المستدرك

واته: له عبدالله كوڕی عەبباسەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر چووە دەرێ گەیشتە موشریكان لە ناوچەی (عوسفان) كاتێ پێغەمبەر و هاوەڵان نوێژی نیوەڕۆیان كرد ، كافران دیتیان وا سوجدە وركوع دەبن ، هەندێكیان گوتیانە هەندێك فورسەتێكی

باش بوو له ناو نوێژ پەلامارمان دابان ، یەکێك گوتی نوێژی دیکە دەکەن لە دوای ئەم نوێژە (واتە: عەسر) ئەم لای ئەوان خوشەویستره لە مالٚ و کەس وکاریان ، جا بەسەریان دادەدەین ، خواش ئاگادرای پێغەمبەری کردوە ئەم ئایەتەی دابەزاند (وَإِذَا كُنْتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ)

## جۆرەکانی نوێژی ( ترس ):

ئایا چەند جۆرە نوێژی ترس هەیە؟ هەندێ دەڵێن (٢٠) هەندێ دەڵێن (١٦) و هەندێ دەڵێن (٨)

## پێنج جۆریان بەناوبانگن:

شیوەی یەکەم :

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: (صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاةَ الْخَوْفِ بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَةً، وَالطَّائِفَةُ الْأُخْرَى مُوَاجِهَةُ الْعَدُوِّ، ثُمَّ انْصَرَفُوا وَقَامُوا فِي مَقَامِ أَصْحَابِهِمْ مُقْبِلِينَ عَلَى الْعَدُوِّ، وَجَاءَ أُولَئِكَ ثُمَّ صَلَّى بِهِمِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قَضَى هَؤُلَاءِ رَكْعَةً، وَهَؤُلَاءِ رَكْعَةً) رواه مسلم

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەری خوا نوێژی ترسی کرد بۆ موسڵمانان کردنی بە دوو کۆمەڵ ، بە یەکێك لەو دوو کۆمەلە یەك رکعەتی کرد ، کۆمەڵی دووەم بەرامبەر دوژمن بوون ، دوای ئەوانەی رکعەتەکەی پێ کردن رۆیشتن بۆ بەرامبەر دوژمن ، لە شوێنەی ئەوان راوەستان ، دوای کۆمەلەکەی دیکە هاتن رکعاتێکی پێ کردن و سەلامی دایەوە ، جا ئەوانەی لە خزمەتی بوون بۆ خۆیان رکعاتێکی دیکیان کرد سەلامیان دایەوە ، و ئەوانی دیکەش بۆ خۆیان رکعاتێکیان کردو سەلامیان دایەوە.

شیوەی دووەم :

(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِذِي قَرَدٍ وَصَفَّ النَّاسُ خَلْفَهُ صَفَّيْنِ صَفًّا خَلْفَهُ وَصَفًّا مُوَازِيَ الْعَدُوِّ فَصَلَّى بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَةً ثُمَّ انْصَرَفَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَكَانِ هَؤُلَاءِ وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً وَلَمْ يَقْضُوا ) رواه النسائي قال الالباني صحيح

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەری خوا نوێژی کرد لە (زی قەرەدە) موسڵمانانی کردن بە دوو ریز لە دوای خۆی ، نوێژی کرد بۆ ئەو ریزی لە دوای بوون ، دوای ئەوان رۆیشتن بۆ جێگای ریزی دووەم ، جا ئەوانەی ریزی دووەم هاتن یەك رکعاتیشی بۆ ئەوان کرد ، دوای رکعاتەکەی دیکەیان نەگێرایەوە ، دیارە پێغەمبەریش دوو رکعاتی کردوون .

شیوەی سێیەم:

(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَتَّى إِذْ كُنَّا بِذَاتِ الرِّقَاعِ، نُودِيَ: الصَّلَاةُ جَامِعَةٌ، فَصَلَّى بِطَائِفَةٍ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ تَأَخَّرُوا، وَصَلَّى بِالطَّائِفَةِ الْأُخْرَى رَكْعَتَيْنِ، فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعُ رَكَعَاتٍ، وَلِلْقَوْمِ رَكْعَتَانِ) رواه ابن حبان قال الالباني صحيح

واتە: لە جابیرەوە هاتووە دەڵێ : لەگەڵ پێغەمبەر رۆیشتین تاکو گەیشتینە (زاتو رریقاع) بانگ کرا بۆ نوێژ کۆببنەوە ، جا پێغەمبەری خوا بە کۆمەڵك دوو رکعاتی کردن جا ئەوان لاچوون ، وە دوو رکعات نوێژی بۆ کۆمەلەکەی دیکە کرد، کەواتە : پێغەمبەری خوا چوار رکعاتی کرد و ئەوانەیش هەر یەك و دوو رکعات .

شیوەی چوارەم:

(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِطَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى بِآخَرِينَ أَيْضًا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ) رواه النسائي قال الالباني صحيح

واته: له جابیرەوه هاتووه دەڵێ : پێغەمبەری خوا دوو ركعاتی بۆ كۆمەڵێك كرد و سەلامی دایەوه ، جا كۆمەڵی هاتن دوو ركعاتی بۆ كۆمەڵی دووەم كردو سەلامی دایەوه

شیوەی پێنجەم:

(عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاةَ الْخَوْفِ فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ فَقَامَتْ طَائِفَةٌ مَعَهُ وَطَائِفَةٌ بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ فَصَلَّى بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً ثُمَّ ذَهَبُوا وَجَاءَ الْآخَرُونَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً ثُمَّ قَضَتْ الطَّائِفَتَانِ رَكْعَةً رَكْعَةً قَالَ وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ فَإِذَا كَانَ خَوْفٌ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَصَلِّ رَاكِبًا أَوْ قَائِمًا تُومِئُ إِيمَاءً ) رواه مسلم

واته: لەئیبنو عومەرەوه هاتووه دەڵێ : ئەگەر ترس لەمە زیاتربوایە (واتە: نەیان توانیبایە ئاوا بە كۆمەل نوێژ بكەن) كابرای موسڵمانی جەنگاوەر نوێژی بە سواری یان بەپێوه یان لە حالەتی رۆیشتندا دەكات ، جا لەحالەتی سواری وەلآخ و سیارەدا مەرج نیە بچیتە ركوع وسوجد بەڵكو ئامازە دەكات.

خواش لەم بارەوه فەرموویەتی :

(فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ۖ فَإِذَا أَمِنتُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ ٢٣٩ ) البقره

واته: ئینجا ئەگەر ترسان (كە نوێژەكەتان وەكو پێویست ئەنجام نەدەن بەهۆی جەنگ یان مەترسیەكەوه) دەتوانن بەدەم رۆیشتنەوه یان بە سواری ئەنجامی

بدەن، هەرکاتێك ئەمین بوونەوە و هەستتان بە هێمنی کرد، ئینجا یادی خـوا بکـەن و (نوێژەکانتان بەچاکی ئـەنجام بـدەن) بـەو شـێوەیەی کـە فێـری کـردوون پێشـتر نەتاندەزانی (ئاسان)

***************************

# وتاری ژماره (٣٤) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠٥ تاکو ١١٣) سورەتی (النساء)**

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ١٠٥﴾ ...................... النساء

واتە: بێگومان ئێمە دامان بەزاندۆتە سەر تۆ ئەم قورئانە بەڕاستی بۆ ئەوەی بڕیار بدەی لە نێوان خەڵکیدا بەو بڕیارەی کە خوا نیشانی داویت وە بۆ ناپاکان مەبە بە پارێزەر و داواچی

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

١- (عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَتَادَةَ بْنِ النُّعْمَانِ، قَالَ: كَانَ أَهْلُ بَيْتٍ مِنَّا يُقَالُ لَهُمْ: بَنُو أُبَيْرِقٍ بِشْرٌ وَبُشَيْرٌ وَمُبَشِّرٌ، وَكَانَ بُشَيْرٌ رَجُلًا مُنَافِقًا يَقُولُ الشِّعْرَ يَهْجُو بِهِ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ يَنْحَلُهُ بَعْضَ العَرَبِ ثُمَّ يَقُولُ: قَالَ فُلَانٌ كَذَا وَكَذَا، فَإِذَا سَمِعَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَلِكَ الشِّعْرَ قَالُوا: وَاللَّهِ مَا يَقُولُ هَذَا الشِّعْرَ إِلَّا هَذَا الخَبِيثُ، أَوْ كَمَا قَالَ الرَّجُلُ، وَقَالُوا: ابْنُ الأُبَيْرِقِ قَالَهَا، قَالَ: وَكَانُوا أَهْلَ بَيْتِ حَاجَةٍ وَفَاقَةٍ، فِي الجَاهِلِيَّةِ وَالإِسْلَامِ، وَكَانَ النَّاسُ إِنَّمَا طَعَامُهُمْ بِالمَدِينَةِ التَّمْرُ وَالشَّعِيرُ، وَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا كَانَ لَهُ يَسَارٌ فَقَدِمَتْ ضَافِطَةٌ مِنَ الشَّامِ مِنَ الدَّرْمَكِ، ابْتَاعَ الرَّجُلُ مِنْهَا فَخَصَّ بِهَا نَفْسَهُ، وَأَمَّا العِيَالُ فَإِنَّمَا طَعَامُهُمُ التَّمْرُ وَالشَّعِيرُ، فَقَدِمَتْ ضَافِطَةٌ مِنَ الشَّامِ فَابْتَاعَ عَمِّي رِفَاعَةُ بْنُ زَيْدٍ حِمْلًا مِنَ الدَّرْمَكِ

فَجَعَلَهُ فِي مَشْرَبَةٍ لَهُ، وَفِي المَشْرُبَةِ سِلَاحٌ وَدِرْعٌ وَسَيْفٌ، فَعُدِيَ عَلَيْهِ مِنْ تَحْتِ البَيْتِ، فَنُقِبَتْ المَشْرُبَةُ، وَأُخِذَ الطَّعَامُ وَالسِّلَاحُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَانِي عَمِّي رِفَاعَةُ، فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي إِنَّهُ قَدْ عُدِيَ عَلَيْنَا فِي لَيْلَتِنَا هَذِهِ، فَنُقِبَتْ مَشْرَبَتُنَا فَذُهِبَ بِطَعَامِنَا وَسِلَاحِنَا. قَالَ: فَتَحَسَّسْنَا فِي الدَّارِ وَسَأَلْنَا فَقِيلَ لَنَا: قَدْ رَأَيْنَا بَنِي أُبَيْرِقٍ اسْتَوْقَدُوا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ، وَلَا نَرَى فِيمَا نَرَى إِلَّا عَلَى بَعْضِ طَعَامِكُمْ، قَالَ: وَكَانَ بَنُو أُبَيْرِقٍ قَالُوا وَنَحْنُ نَسْأَلُ فِي الدَّارِ: وَاللَّهِ مَا نُرَى صَاحِبَكُمْ إِلَّا لَبِيدَ بْنَ سَهْلٍ، رَجُلٌ مِنَّا لَهُ صَلَاحٌ وَإِسْلَامٌ، فَلَمَّا سَمِعَ لَبِيدٌ اخْتَرَطَ سَيْفَهُ وَقَالَ: أَنَا أَسْرِقُ؟ فَوَاللَّهِ لَيُخَالِطَنَّكُمْ هَذَا السَّيْفُ أَوْ لَتُبَيِّنُنَّ هَذِهِ السَّرِقَةَ، قَالُوا: إِلَيْكَ عَنْهَا أَيُّهَا الرَّجُلُ فَمَا أَنْتَ بِصَاحِبِهَا، فَسَأَلْنَا فِي الدَّارِ حَتَّى لَمْ نَشُكَّ أَنَّهُمْ أَصْحَابُهَا، فَقَالَ لِي عَمِّي: يَا ابْنَ أَخِي لَوْ أَتَيْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتَ ذَلِكَ لَهُ، قَالَ قَتَادَةُ: فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: إِنَّ أَهْلَ بَيْتٍ مِنَّا أَهْلَ جَفَاءٍ، عَمَدُوا إِلَى عَمِّي رِفَاعَةَ بْنِ زَيْدٍ فَنَقَبُوا مَشْرَبَةً لَهُ، وَأَخَذُوا سِلَاحَهُ وَطَعَامَهُ، فَلْيَرُدُّوا عَلَيْنَا سِلَاحَنَا، فَأَمَّا الطَّعَامُ فَلَا حَاجَةَ لَنَا فِيهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (سَآمُرُ فِي ذَلِكَ)، فَلَمَّا سَمِعَ بَنُو أُبَيْرِقٍ أَتَوْا رَجُلًا مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ: أُسَيْرُ بْنُ عُرْوَةَ فَكَلَّمُوهُ فِي ذَلِكَ، فَاجْتَمَعَ فِي ذَلِكَ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ الدَّارِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ قَتَادَةَ بْنَ النُّعْمَانِ وَعَمَّهُ عَمَدَا إِلَى أَهْلِ بَيْتٍ مِنَّا أَهْلِ إِسْلَامٍ وَصَلَاحٍ، يَرْمُونَهُمْ بِالسَّرِقَةِ مِنْ غَيْرِ بَيِّنَةٍ وَلَا ثَبَتٍ، قَالَ قَتَادَةُ: فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَلَّمْتُهُ، فَقَالَ: (عَمَدْتَ إِلَى أَهْلِ بَيْتٍ ذُكِرَ مِنْهُمْ إِسْلَامٌ وَصَلَاحٌ تَرْمِيهِمْ بِالسَّرِقَةِ عَلَى غَيْرِ ثَبَتٍ وَبَيِّنَةٍ)، قَالَ: فَرَجَعْتُ، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي خَرَجْتُ مِنْ بَعْضِ مَالِي وَلَمْ أُكَلِّمْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ذَلِكَ، فَأَتَانِي عَمِّي رِفَاعَةُ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي مَا صَنَعْتَ؟ فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: اللَّهُ المُسْتَعَانُ، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ نَزَلَ القُرْآنُ (إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الكِتَابَ بِالحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلَا تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيمًا) (النساء: ١٠٥) بَنِي أُبَيْرِقٍ (وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ)

(النساء: ١٠٦) أَيْ مِمَّا قُلْتَ لِقَتَادَةَ (إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا) (النساء: ٢٣) (وَلَا تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنْفُسَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ) (النساء: ١٠٨)– إِلَى قَوْلِهِ – (غَفُورًا رَحِيمًا) (النساء: ٢٣) أَيْ: لَوْ اسْتَغْفَرُوا اللَّهَ لَغَفَرَ لَهُمْ (وَمَنْ يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِهِ) (النساء: ١١١)– إِلَى قَوْلِهِ – (وَإِثْمًا مُبِينًا) (النساء: ٢٠) قَوْلَهُمْ لِلَبِيدٍ (وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُ) (النساء: ١١٣)– إِلَى قَوْلِهِ – (فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا) (النساء: ٧٤) فَلَمَّا نَزَلَ القُرْآنُ أَتَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالسِّلَاحِ فَرَدَّهُ إِلَى رِفَاعَةَ، فَقَالَ قَتَادَةُ: لَمَّا أَتَيْتُ عَمِّي بِالسِّلَاحِ، وَكَانَ شَيْخًا قَدْ عَشَا – أَوْ عَسَا – فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَكُنْتُ أُرَى إِسْلَامُهُ مَدْخُولًا، فَلَمَّا أَتَيْتُهُ بِالسِّلَاحِ قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، هُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَعَرَفْتُ أَنَّ إِسْلَامَهُ كَانَ صَحِيحًا، فَلَمَّا نَزَلَ القُرْآنُ لَحِقَ بُشَيْرٌ بِالمُشْرِكِينَ، فَنَزَلَ عَلَى سُلَافَةَ بِنْتِ سَعْدِ ابْنِ سُمَيَّةَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ المُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا) (النساء: ١١٥) فَلَمَّا نَزَلَ عَلَى سُلَافَةَ رَمَاهَا حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ بِأَبْيَاتٍ مِنْ شِعْرٍ، فَأَخَذَتْ رَحْلَهُ فَوَضَعَتْهُ عَلَى رَأْسِهَا ثُمَّ خَرَجَتْ بِهِ فَرَمَتْ بِهِ فِي الأَبْطَحِ، ثُمَّ قَالَتْ: أَهْدَيْتَ لِي شِعْرَ حَسَّانَ؟ مَا كُنْتَ تَأْتِينِي بِخَيْرٍ) رواه الترمذي قال الالباني حسن

واتـه: لـه قـەتادەی كـوڕی نوعمانـەوە هـاتووە دەڵـێ : بنەماڵەیـەك هـەبوون پێـان دەگـوترا بـەنو (ئوبـەریق) كـە ئەوانـە بـوون (بیشـرو ، و بوشـەیر و موبەششـیر) ، بوشەیر پیاوێكی مونافیق بـوو ، شـێعری جنێـوی دەگـوت بـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (دوای بەناو عەرەبان بـڵاوی دەكـردەوە ) دوایـی دەیگـوت فـلان و فـلان گوتیانـە ، كاتێ هاوەڵان ئەم شێعریان دەبیست دەیانگوت سوێند بەخوا ئەو شێعرانە هی ئـەو

پیسەن ، دەڵێ خێزانێکی هەژار هەبوون لە سەردەمی نەزانی و ئیسلام هەر هەژار بوون ، خەڵکی مەدینەش خواردنیان خورماو جۆ بوو، ئەگەر پیاوێك وەزعی باشبایە بارە وشتری بۆ دەهات لە شام لە ئارد ، دەیفرۆشت خۆی پێ دەژیاند ، بەلاّم هەژارەکان خواردنیان خورما و جۆ بوو ، وە بارێك وشتر لە شام هات مامم (ریفاعەی کوڕی یەزید ) کڕی ، بارێك ئارد بوو لە عەمبارەی خۆی داینا، وەلەو عەمبارە چەکێك و زرەێ یەك و شمشێرێکی تێدابوو، لە ژێرەوە ماڵەکە بۆ عەمبارەکە چوون وکونیان کرد ، خواردن و چەکەکەیان برد، کە بەیانی بویەوە مامم هات (ریفاعە) گوتی ئەی برازەکەم ، ئەم شەو هاتوونە سەرمان و عەمبارەکەیان کون کردوە، چەك و خواردنی ئێمەیان بردوە، گوتی ئێمە تاقبیمان کردوە و پرسیارمان کردوە ئەڵێن بەنی (ئوبەریق) ئەم شەو روناکیان پێ کرد بوو ، ئەوانیش گوتیان (لبید کوڕی سەهل)ە پیاوێك لە ئێمە چاکەی هەیە (لبید جوولەکە بوو ، بەلام کەسایەتی بوو )، کاتێ (لبید) ئەمەی بیست شمشێری درەکێشا و گوتی من دزی دەکەم؟ سوێند بەخوا ئەم شمشێرە نقومتان دەکەم یان ئەبێ ئەم دزیە ئاشکرا بێ ، گوتیان ..................، مامم پێی گوتم ئەی کوڕە برازام ئەگەر بچیە لای پێغەمبەر ئەمەی بۆ باس بکەی ،( قەتادە) دەڵێ چوومە لای پێغەمبەر گوتم مالێك هەیە دەست کورتن ، چووینە سەر ماڵی مامم (ریفاعەی کوڕی زەید) عەمبارەکەیان کون کردوە ، چەك وخواردنیان بردوە ، با چەکەکەمان بدنەوە خواردنیان بۆ خۆیان، پێغەمبەر فەرمووی : دوای بریارێکی لێ دەدەم ، کاتێ بەنو (ئوبەریق) ئەویان بیست چونە لای پیاوێك پێیان دەگوت (ئوسەری کوڕی عورروە) قسەیان لەگەڵ کرد لەم بارەوە، خەڵێك لەو مالاّن کۆبونەوە ، گوتیان ئەی نێرراوی خوا ، (قەتادەی کوڕی نوعمان) و مامی یەقەی خێزانێکی ئیمەیان گرتووە ، ئەوانیش چاك و موسڵمانن تاوانباریان دەکەن بە دزین ، بەبێ شاهیدو بەڵگە

(قەتادە) دەڵێ : چوومە لای پێغەمبەر قسەم لەگەڵ کرد ، فەرمووی : خێزانێك تاوانبار دەکەی لەوان بە دزین بەبێ شاهێدو بەڵگە) دەڵێ گەرامەوە حەزم دەکرد ماڵ وسامانم ڕۆیشتبایە نەك قسەم لەگەڵ پێغەمبەر کربایە، مامم (ریفاعە ) گوتی ئەی برازاکەم چیت کرد ؟ پێم گوت ئەوەی پێغەمبەر پێی گوتم ، گوتی خوا یارمەتی دەرە، زۆری پێ نەچوو قورئان دابەزی (إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلَا تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيمًا) بەنی (ئوبەریق) (وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ) واتە: ئەوەی بە قەتادەت گوتوە (إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا) (وَلَا تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنْفُسَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ.............) واتە : ئەگەر داوای لێ بوردنیان کردبایە خوا عەفوی دەکردن ، (وَمَنْ يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِهِ........) وە قسەی ئەوان بۆ (لبید) (وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُ..................) جا کاتێ قورئان دابەزی پێغەمبەر چەکەکەی بۆ (ریفاعە) گێرایەوە ، قەتادە دەڵێ : کاتێ چەکەکەم بۆ مامم بردەوە کەپیاوێکی پیربوو ،لە سەردەمی نەزانی کەسێکی تاوانبار بوو ، وام دەزانی بەناچاری موسڵمان بووە ، کاتێ چەکەکەم بۆ بردەوە ، گوتی ئەی برازاکەم ، ئەوە کردمە خێر لە پیناوی خوا ، جا زانیم موسڵمانەتیەکەی راست ودروستە، کاتێ قورئان دابەزی (بوشیر) چووە ناو کافران ، بویە میوانی (کچی سەعدی کوڕی سومیە) خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا) جا کە میوانی (سولافە) بوو ، (حەسانی کوڕی سابیت) چەند پارچە شێعرێکی لەسەر گوت ، سولافەش لی وەرگرت و فریدایە ناو جووگە و شێعری (حسان) بۆ من بە دیاری دێنی ، تۆ خێرت پێوە نیە بۆ من.

**تێبینی : ئەم ڕوایەتەش هەیە.**

أُنْزِلَتْ كُلُّهَا فِي قِصَّةٍ وَاحِدَةٍ، وَذَلِكَ أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ:طُعْمَةُ بْنُ أُبَيْرِقٍ، أَحَدُ بَنِي ظَفَرِ بْنِ الْحَارِثِ، سَرَقَ دِرْعًا مِنْ جَارٍ لَهُ يُقَالُ لَهُ:قَتَادَةُ بْنُ النُّعْمَانِ، وَكَانَتِ الدِّرْعُ فِي جِرَابٍ فِيهِ دَقِيقٌ، فَجَعَلَ الدَّقِيقُ يَنْتَثِرُ مِنْ خَرْقٍ فِي الْجِرَابِ، حَتَّى انْتَهَى إِلَى الدَّارِ وَفِيهَا أَثَرُ الدَّقِيقِ. ثُمَّ خَبَّأَهَا عِنْدَ رَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ يُقَالُ لَهُ: زَيْدُ بْنُ السَّمِينِ، فَالْتُمِسَتِ الدِّرْعُ عِنْدَ طُعْمَةَ فَلَمْ تُوجَدْ عِنْدَهُ، وَحَلَفَ لَهُمْ وَاللَّهِ مَا أَخَذَهَا وَمَا لَهُ بِهِ مِنْ عِلْمٍ. فَقَالَ أَصْحَابُ الدِّرْعِ: بَلَى وَاللَّهِ قَدْ أَدْلَجَ عَلَيْنَا فَأَخَذَهَا، وَطَلَبْنَا أَثَرَهُ حَتَّى دَخَلَ دَارَهُ، فَرَأَيْنَا أَثَرَ الدَّقِيقِ. فَلَمَّا أَنْ حَلَفَ تَرَكُوهُ وَاتَّبَعُوا أَثَرَ الدَّقِيقِ حَتَّى انْتَهَوْا إِلَى مَنْزِلِ الْيَهُودِيِّ، فَأَخَذُوهُ فَقَالَ: دَفَعَهَا إِلَيَّ طُعْمَةُ بْنُ أُبَيْرِقٍ، وَشَهِدَ لَهُ أُنَاسٌ مِنَ الْيَهُودِ عَلَى ذَلِكَ، فَقَالَتْ بَنُو ظَفَرٍ. وَهُمْ قَوْمُ طُعْمَةَ-:انْطَلِقُوا بِنَا إِلَى رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم، فَكَلَّمُوهُ فِي ذَلِكَ وَسَأَلُوهُ أَنْ يُجَادِلَ عَنْ صَاحِبِهِمْ وَقَالُوا: إِنْ لَمْ تَفْعَلْ هَلَكَ صاحبنا وافتضح وبريء الْيَهُودِيُّ، فَهَمَّ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم أَنْ يَفْعَلَ- وَكَانَ هَوَاهُ مَعَهُمْ- وَأَنْ يُعَاقِبَ الْيَهُودِيَّ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: إِنَّا أَنْزَلْنا إِلَيْكَ الْكِتابَ بِالْحَقِّ الْآيَةَ كُلَّهَا. وَهَذَا قَوْلُ جَمَاعَةٍ مِنَ الْمُفَسِّرِينَ) اسباب النزول للواحدي ، قال المحقق : كمال بسيوني زغلول بدون إسناد. وأخرج الترمذي في التفسير (٣٠٣٦) في حديث طويل ما يؤيد ذلك وقال: هذا حديث غريب.وأخرج الحاكم مثله (٤/ ٣٨٥) وصححه وأقره الذهبي.وذكره ابن كثير في تفسير هذه الآية. وذكره السيوطي في الدر (٢/ ٢١٥) وفي لباب النقول (ص ٩٢)

واتە: (توعمەی کوڕی ئوبەیریق) کڵاوخوودەیەکی لەماڵی (قەتادە)ـی دراوسێیدا دزیی و لەلای (زەید کوڕی سەمین)ی جوولەکەدا شاردیەوە، پاشان گومان خرایە سەر توعمە و داوای خوودەکەی لێکرا، ئەوسا ئەویش سوێندی خوارد کە نەیبردووە و ئاگایشی لێی نییە، بەڵام بۆدوایی لای جوولەکەکە دۆزرایەوە، ئەویش وتی: توعمە

لێرەی لامنی دایناوە، خەڵکێکیش لەجوولەکەکان شایەدیان بۆ داو کەوتە سەر توعمە، ئینجا هۆزەکەی توعمە (بنی زەفەر) چوونە لای پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) تا بەرگری لەم بکەن و بیخەنە سەر جوولەکەکە،گوتیان ئەگەر بەرگری لێ نەکەی ئابروی دەچێ و جوولەکەش بێ تاوان، پێغەمبەر مەیلی بۆ رای ئەوان چوو، بەڵام پاشان ئایەتی (إنا أنزلنا ..) هات و دزیەکە کەوتە سەر توعمەو لەترسا هەڵهات بۆ مەککە و لەئاین وەرگەڕا، ئەوسا پاش ماوەیەك لەوێیش چوو بۆ دزیی و دیوارێکی کون کردو، دیوارەکە کەوت بەسەریاو مرد .

دەرسەکانی ئەم ئایەتە:

١-خوا لەگەڵ حەقە

٢-دزیکردن هۆی لە دەستانی ئیمانە و ئینسانە.

٣-درکەوتنی عەدالەتی ئیسلام ، کە بۆ هەموو کەس وەکو یەکە.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (١١٩) سورەتی (النساء)

**﴿وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ١١٩﴾** النساء

واتە: هەر دەبێت لەراستەڕێ سەرلێشێواوییان بکەم و دڵیان پڕکەم لەئاوات و ئارەزووی ناراست و سەرقاڵیان کەم، بۆیە بەو خەڵکەی دەگوت: زیندووبوونەوەو هیچ حیساب و کیتابێ نییە، وە هەروەها مەرج بێ بۆخۆم فەرمانیان پێبدەم، گوێی ئاژاڵ و مەڕوماڵاتیان دابڕن، یا بیبڕن و بیکەنە نیشانەی حەرام بوونیان، بەڵێ لەسەردەمی نەفامیدا هەر وشترێك پێنج سکی کردبا، دیارییان ئەکرد بۆ بتەکانیان و

گۆشـتیان نەئـەخوارد و وە دەبـێ فەرمانیشـیان پێبـدەم کـە: شـكڵ و بیچـمی دروستکراوەکانی خوا تێك بدەن و بگۆڕن (ئیـبنی عـەبباس و، موجاهیـدو، زەحـاك) دەڵێن: مەبەست لەم گۆڕین و دەسکاری کردنی خـەڵكی خوایـە، تێكدان و گـۆڕینی دینی خوایە لێیان، (تەبـەریی)ش هـەر ئەمـەی پـێ باشـە. منـیش هـەروا ئـەزانم کـە مەبەسـت بـەو گۆڕینـە، گـۆڕینی دیـن و (فـیترەت)یانـە، ئەگەرچـی هەنـدێ مانـاو مەبەستی تریش بگەیەنێت. وەك هەندێ لەراڤەکەرانی قورئان لـەم شـوێنەدا ئامـاژە بەهەندێ شتی تر ئەکـەن، وەك کوتـانی خـاڵ و، ڕێكـوپێككردن و هـەڵگرتنی بـرۆو، شاش کردنی ددان و، هەڵكێشانی مووی روخسارو ڕوومەت( رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، فِي قَوْلِهِ (وَلآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللهِ) (النساء: ١١٩) قَالَ: يَعْنِي إِخْصَاءَ الْبَهَائِمِ) رواه البيهقي

واتە: لەئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ : قسـەی خـوا (وَلآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللهِ) واتە : خەساندنی ئاژەلان دەگرێتەوە

هەندێ دەڵێن مەبەست پێی برۆکردنە:

٢-( عَـنْ عَبْـدِ اللهِ، قَـالَ: (لَعَـنَ اللهُ الْوَاشِـمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِـمَاتِ، وَالنَّامِصَـاتِ وَالْمُتَنَمِّصَـاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَـاتِ لِلْحُسْـنِ الْمُغَيِّـرَاتِ خَلْقَ اللهِ) قَـالَ: فَبَلَـغَ ذَلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ لَهَا: أُمُّ يَعْقُوبَ وَكَانَتْ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَأَتَتْهُ فَقَالَتْ: مَا حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكَ أَنَّكَ لَعَنْتَ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ، لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللهِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: (وَمَا لِي لَا أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ وَهُوَ فِي كِتَابِ اللهِ) فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ لَوْحَيِ الْمُصْحَفِ فَمَا وَجَدْتُهُ

فَقَالَ: لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وَجَدْتِيهِ، قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا) (الحشر: ٧) فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: فَإِنِّي أَرَى شَيْئًا مِنْ هَذَا عَلَى امْرَأَتِكَ الْآنَ، قَالَ: (اذْهَبِي فَانْظُرِي)، قَالَ: فَدَخَلَتْ عَلَى امْرَأَةِ عَبْدِ اللهِ فَلَمْ تَرَ شَيْئًا، فَجَاءَتْ إِلَيْهِ فَقَالَتْ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا، فَقَالَ: (أَمَا لَوْ كَانَ ذَلِكَ لَمْ نُجَامِعْهَا) رواه مسلم

معاني الكلمات : (النامصات) النامصة هي التي تزيل الشعر من الوجه والمتنمصة هي التي تطلب فعل ذلك بها

(والمتفلجات للحسن) المراد مفلجات الأسنان بأن تبرد ما بين أسنانها الثنايا والرباعيات وهو من الفلج وهي فرجة بين الثنايا والرباعيات وتفعل ذلك العجوز ومن قاربتها في السن إظهارا للصغر وحسن الأسنان لأن هذه الفرجة اللطيفة بين الأسنان تكون للبنات الصغار فإذا عجزت المرأة كبرت سنها وتوحشت فتبردها بالمبرد لتصير لطيفة حسنة المنظر وتوهم كونها صغيرة ويقال له أيضا الموشر

(لم نجامعها) قال جماهير العلماء معناه لم نصاحبها ولم نجتمع نحن وهي بل كنا نطلقها ونفارقها

واتە: لە عەبدولڵای كوڕی مەسعود هاتووە ئەڵێ :خوا لەعنەتی كردوە لەو كەسانەی لاشە دەكوتن و بۆیان دەكوترێ ، وە لەو كەسانەی برۆ دەكەن ، وە لەو كەسانەی ددانی خۆیان دەڕنن بۆ جوانی ، دروستكراوی خوا دەگۆڕن، ئەو قسە گەیشتەوە بە ئافرەتێك بەناوی دایكی (یەعقوب) هاتە لای عەبدولاَ ، گوتی چۆن لەعنەت دەكەی لە خاڵ كوت و برۆكەر و ددان ڕن ، گۆتی چۆن لەعنەت ناكەم لە كەسێ كە پێغەمبەر لەعنەتی لێ كردوە ، ئافرەتەكە گوتی لە قورئان نەمدیوە ، عەبدولاَ گوتی ئەگەر قورئانت خویندبایە دەتدۆزییەوە ، خوا فەرموویەتی : ئەوەی پێغەمبەر فەرمانی پێ كردن جێ بەجێی بكەن ، ئەوەی ڕێگری لێ كردن مەی كەن،

ئافرەتەکە گوتی خێزانی تۆش شتێکی لە دەم و چاو دیارە ، عەبدولاَ گوتی بڕۆ سەیری بکە هیچ نادۆزیتەوە وئەگەر وابکا تەلاقی دەدەم ، چوو هیچی نەدۆزیەوە.

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٢٧) سورەتی (النساء)

﴿وَيَسۡتَفۡتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِيهِنَّ وَمَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤۡتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلۡوِلۡدَٰنِ وَأَن تَقُومُواْ لِلۡيَتَٰمَىٰ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا ١٢٧﴾ النساء

واتە: وە(ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ئافرەتان بڵێ خوا وەڵامتان دەداتەوە دەربارەیان وە ئەوەی بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە لە قورئاندا(وەڵامێکە) لە بارەی کچانی هەتیوەوە ئەوانەی پێ یان نادەن ئەوەی نووسراوە بۆیان(واتە میراتی باوکیان) وە حەز ناکەن مارەیان بکەن(لەبەر میراتەکەشیان ناهێڵن شوو بکەن) وە لەبارەی ئەو منداڵانەی کە بێ دەسەڵاتن وە(خوا فەرمان دەدات) بە دادگەری لەگەڵ هەتیوان دا بجولێنەوە وە هەر کردەوەیەکی باش بکەن ئەوە بێگومان خوا بە ئاگایە لێ ی.(پوختەی تەفسیر)

وە ( ئیبنی عەباس) ئەڵێت: ئەم ئایەتە لەبارەی ئەوکەسانەوە هاتەخوارێ کەکیژۆڵەی هەتیویان لابوو بەخێویان دەکرد، بەڵام وەك عادەت و باوی نالەباری خۆیان شتێکیان فرێدەدایە سەری، بەوە دەبوونە ماڵیان! ئینجا ئەگەر جوان وشۆخ و شەنگ بووبا نەیان ئەهێشت کەس بیخوازێ و داوای بکات، کاتێکیش مردبا گشت سامانەکەیان دەخوارد. ئەوجا خوا فەرمووی: (و یستفتونك ..) هەروەها دەڵێت: سەردەمی پێش ئیسلام کیژۆڵەو کوڕانی مێر منداڵ میراتیان نەئەدانێ، جا

خوا فـەرمووی: (.. وأن تقوموا لليتامي بالقسط ) پێشـەوا بوخـاریی ئـەم ڕیوایەتـەی هێناوە (رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١ –(عن عُرْوَة بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى وَإِنْ خِفْتُمْ أَنْ لَا تُقْسِطُوا إِلَى وَرُبَاعَ فَقَالَتْ يَا ابْنَ أُخْتِي هِيَ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا تُشَارِكُهُ فِي مَالِهِ فَيُعْجِبُهُ مَالُهَا وَجَمَالُهَا فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِي صَدَاقِهَا فَيُعْطِيهَا مِثْلَ مَا يُعْطِيهَا غَيْرُهُ فَنُهُوا أَنْ يُنْكِحُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ وَيَبْلُغُوا بِهِنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ مِنْ الصَّدَاقِ وَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا طَابَ لَهُمْ مِنْ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ قَالَ عُرْوَةُ قَالَتْ عَائِشَةُ ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ هَذِهِ الْآيَةِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ إِلَى قَوْلِهِ وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ وَالَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ أَنَّهُ يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ الْآيَةُ الْأُولَى الَّتِي قَالَ فِيهَا وَإِنْ خِفْتُمْ أَنْ لَا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنْ النِّسَاءِ قَالَتْ عَائِشَةُ وَقَوْلُ اللَّهِ فِي الْآيَةِ الْأُخْرَى وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ يَعْنِي هِيَ رَغْبَةُ أَحَدِكُمْ لِيَتِيمَتِهِ الَّتِي تَكُونُ فِي حَجْرِهِ حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ الْمَالِ وَالْجَمَالِ فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا رَغِبُوا فِي مَالِهَا وَجَمَالِهَا مِنْ يَتَامَى النِّسَاءِ إِلَّا بِالْقِسْطِ مِنْ أَجْلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ ) وصحيح البخاري

واتـە: لـە عـورەوەی کـوڕی زوبـێرەوە هـاتووە دەڵـێ : پرسـیارم کـرد لـە عائیشـە دەربارەی قسەی خوا (وَإِنْ خِفْتُمْ أَنْ لَا تُقْسِطُوا) گـوتی ئـەی کـوڕی خوشـکم ئـەوە یەتیمە لـەماڵی سەرپەرشـتیارە کەیـەتی ، بەشـدارە لـە ماڵەکـەی چـاوی لـە مـاڵ و جوانیەکەیــەتی دەیــەوێ مــارەی بکــات ، بــەبێ ئــەوەی مارەیەکــەی بەتــەواوی ودادپەروەرانە بداتێ ، جا قەدەغە کرا مارە بکرێن مەگەر حەق و مافیـان بەتـەواوی

بدەنێ ، جا فەرمانکرا جگە لەوان مارە بکرێت لە ئافرەتان ، عورەوە دەڵێ عائیشە گوتی پاشان خەڵکی پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر ، ئنجا ئەو ئایەتە دابەزی (وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ إِلَى قَوْلِهِ وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ) ئەوەی خوا باسی کردیە لە قورئان دەخوێندرێتەوە ئایەتی یەکەم کە دەفەرموێت (وَإِنْ خِفْتُمْ أَنْ لَا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنْ النِّسَاءِ) عائیشە گوتی وەقسەی خوا لە ئایەتی دیکە کە دەفەرموێت (وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ) واتە یەکێك لە ئێوە .... کەیەتمێکی کەم ماڵ و کەم جوان لە ماڵیەتی ، قەدەغەکراوە مارەبکرێن بۆ چاوبرین لەماڵ و جوانیان مەگەر مارەیی تەواویان پێبدرێت. (ڕامان)

-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، فِي قَوْلِهِ: (فِي يَتَامَى النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ) (النساء: ١٢٧) مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ فَكَانَ الرَّجُلُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَكُونُ عِنْدَهُ الْيَتِيمَةُ فَيُلْقِي عَلَيْهَا ثَوْبَهُ ، فَإِذَا فَعَلَ بِهَا ذَلِكَ لَمْ يَقْدِرْ أَحَدٌ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا أَبَدًا ، فَإِنْ كَانَتْ جَمِيلَةً وَهَوِيَهَا تَزَوَّجَهَا وَأَكَلَ مَالَهَا ، وَإِنْ كَانَتْ دَمِيمَةً مَنَعَهَا الرَّجُلُ أَبَدًا حَتَّى تَمُوتَ فَإِذَا مَاتَتْ وَرِثَهَا ، فَحَرَّمَ اللَّهُ ذَلِكَ وَنَهَى عَنْهُ) تفسير الطبري

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ: قسەی خوا (**لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ**)) ئەوەی بۆیان دانراوە ، ئارزوتانە مارەیان بکەن ، پیاوان زەمانی جاهیلی منداڵی یەتیمان لەلابوو ، قوماشێکی فرێدەدایە سەری و پاوانی دەکرد ، کەس نەیدەتوانی مارەیان بکا هەتا هەتاییێ، ئەگەر جوان بوایە وئارەزوی لێبوایە ماری دەکرد و ماڵەکەی دەخوارد ، ئەگەر ناشیرین بوایە قەدەغەی دەکرد مێردبکاتەوە تاکو دەمرد ، لەپاش مردن میراتی لێ دەگرت (لە زەمانی جاهیلی میراتیان لە یەتیم دەگرد) خواش ئەمەی حەرام کردو قەدەغەی کردن ئەم کارە بکەن.

# وتاری ژماره (٣٥) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٢٨) سورەتی (النساء)

﴿وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ ۚ وَإِن تُحْسِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ١٢٨﴾ النساء

واته: ئەگەر ئافرەتێك لە پشت تێكردن یان مامەڵەی خراپی مێردەكەی ترساو، نیشانەی ئەو خراپی و لالووتی یەی بۆ دەركەوت، جا ئیتر هۆی ئەو ڕووتێنەكردنەی، پیری و بێ توانایی ژنەكە بێت، یان لەبەر ناشیرینی بێت، یاخود لەبەرئەوە بێت كە پیاوەكە ژنی تری هەبێت.. یان هەر هۆیەكی تر، ئەگەر بكرێت ژنە لەگەڵ مێردەكەی لەسەر هەندێك شت ڕێك بكەون، وەك ئەوەی قایل بێت كە مێردەكەی زۆرتر لای ژنەكەی تری بێت، یاخود لە بەشێك لە مارەیی یەكەی خۆی خۆش ببێت، بۆ ئەوەی كاریان نەگاتە تەڵاق و جیابوونەوە لەیەكتر، ئەوە كارێكی چاك و درووستەو هیچ گوناهێكی تێدا نیە. (وأحضرت الانفس)... واتە: ئەوەی ووترا درووستە، هەرچەندە ڕەزیلی هاوڕێی دڵانەو بە زەحمەت نەبێت لێی جیا نابێتەوە.. ئافرەت نایەوێت هیچ كام لە مافەكانی لە كیس بچێت، پیاویش نایەوێت گشت مافەكان و داواكانی بۆ بێنێتە دی، جا ئەی موسڵمانینە! ئەگەر بە ڕەفتاری جوان و شیرین لەگەڵیاندا بجوڵێنەوە پارێزكارو لە خوا ترس بن دەرهەقیان و خۆتان لە ئازاردانیان بپارێزن، ئەوە بێگومان خودا زۆر ئاگادارە بەو كارەتان و، چاكەی لێ وون نابێت.(گوڵشەن)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ عَائِشَةَ وَإِنْ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا قَالَتْ هِيَ الْمَرْأَةُ تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ لَا يَسْتَكْثِرُ مِنْهَا فَيُرِيدُ طَلَاقَهَا وَيَتَزَوَّجُ غَيْرَهَا تَقُولُ لَهُ أَمْسِكْنِي وَلَا تُطَلِّقْنِي ثُمَّ تَزَوَّجْ غَيْرِي فَأَنْتَ فِي حِلٍّ مِنْ النَّفَقَةِ عَلَيَّ وَالْقِسْمَةِ لِي فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَصَّالَحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ) صحيح البخاري

واتە: لە عایئشەوە هاتووە دەڵێ : ئەو ئایەتە (وَإِنْ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا) ئەوە ئافرەتێکە لای پیاوێکە ئارەزووی لێنیە دەیەوێ تەلاقی بدات و ئافرەتێکی دیکە مارە بکات ، ئەو ئافرەتەش پێی دەڵێ تەلاقم مەدە و ئافرەتێکی دیکە مارە بکە گەردەنت ئازا بێ لە نەفەقە و سەرجێی ، ئەوەیە قسەی خوا (فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَصَّالَحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ)

وەهەوەها ئەم دەقەش هەیە (خاتوو عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، ئەڵێت: ئەگەر پیاوێك دوو ژنی هەبوایاو، یەکێکیانی حەز لێ نەکردبا، وەیان بەکەڵکی ژن و مێردی نەهاتباو بیویستایە تەڵاقی بدا، ژنەکە دەیوت تەڵاقم مەدەو، سەبارەت بەکاروباری منیش ئازاد بە، جائیتر ئەم ئایەتە: (فلا جناح علیهما ..) هات، بوخاریی و موسلیم هێناویانە، ئەگەرچی هەندێ جیاوازیشیان هەبێ(ڕامان)

( عَنْ عَائِشَةَ وَإِنْ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا قَالَتْ هُوَ الرَّجُلُ يَرَى مِنْ امْرَأَتِهِ مَا لَا يُعْجِبُهُ كِبَرًا أَوْ غَيْرَهُ فَيُرِيدُ فِرَاقَهَا فَتَقُولُ أَمْسِكْنِي وَاقْسِمْ لِي مَا شِئْتَ قَالَتْ فَلَا بَأْسَ إِذَا تَرَاضَيَا) صحيح البخاري

( عَنْ عَائِشَةَ وَإِنْ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا الْآيَةَ قَالَتْ أُنْزِلَتْ فِي الْمَرْأَةِ تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ فَتَطُولُ صُحْبَتُهَا فَيُرِيدُ طَلَاقَهَا فَتَقُولُ لَا تُطَلِّقْنِي وَأَمْسِكْنِي وَأَنْتَ فِي حِلٍّ مِنِّي فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ ) صحيح مسلم

وەهەروەها ئەم دەقانەش هەن:

١-( عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَالَتْ عَائِشَةُ يَا ابْنَ أُخْتِي كَانَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يُفَضِّلُ بَعْضَنَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْقَسْمِ مِنْ مُكْثِهِ عِنْدَنَا وَكَانَ قَلَّ يَوْمٌ إِلَّا وَهُوَ يَطُوفُ عَلَيْنَا جَمِيعًا فَيَدْنُو مِنْ كُلِّ امْرَأَةٍ مِنْ غَيْرِ مَسِيسٍ حَتَّى يَبْلُغَ إِلَى الَّتِي هُوَ يَوْمُهَا فَيَبِيتَ عِنْدَهَا وَلَقَدْ قَالَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ حِينَ أَسَنَّتْ وَفرِقَتْ أَنْ يُفَارِقَهَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمِي لِعَائِشَةَ فَقَبِلَ ذَلِكَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهَا قَالَتْ نَقُولُ فِي ذَلِكَ أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى وَفِي أَشْبَاهِهَا أُرَاهُ قَالَ وَإِنْ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا) صحيح سنن أبي داود

واتە: عائیشە گوتی : ئەی کوڕی خوشکم (عوروە) پێغەمبەر لە شەو مانەوە لـە لای خێزانەکانی وەکو یەك لە لایان دەمایەوە، بەڵام مەگەر کو دەنا هەموو ڕۆژی سـەری لە هەموو خێزانەکانی دەدا و ئـەوحوالی دەپرسـین ، تـاکو دەگەیشـتە نۆبـەی ئـەو ئافرەتەی کە لەلای دەمایەوە، سودەی کچی زەمعە کـاتێ بەتەمـەن داچـوو، گوتیـە پێغەمبەر من نۆبەی خۆم دەدەم عائیشە، پێغەمبەریش قەبولی کرد، ئێمە وا حاڵین ، ئەم ئایەتە بۆ ئەو بۆنە و هاوێنەکانی دابەزیوە.

٢-( اِنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ الْأَنْصَارِيَّ – وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – كَانَتْ عِنْدَهُ امْرَأَةٌ حَتَّى إِذَا كبرتْ تَزَوَّجَ عَلَيْهَا فَتَاةً شَابَّةً وَآثَرَ عَلَيْهَا الشَّابَّةَ، فَنَاشَدَتْهُ الطَّلَاقَ فَطَلَّقَهَا تَطْلِيقَةً، ثُمَّ أَمْهَلَهَا حَتَّى إِذَا كادت تحل راجعها، ثم عاد فآثر عليها الشابة فَنَاشَدَتْهُ الطَّلَاقَ، فَقَالَ لَهَا: مَا شِئْتِ إِنَّمَا بَقِيَتْ لَكِ تَطْلِيقَةٌ وَاحِدَةٌ، فَإِنْ شِئْتِ اسْتَقْرَرْتِ عَلَى مَا تَرَيْنَ مِنَ الْأَثَرَةِ وَإِنْ شِئْتِ فَارَقْتُكِ، فَقَالَتْ: لَا بَلْ أَسْتَقِرُّ عَلَى الْأَثَرَةِ، فَأَمْسَكَهَا عَلَى ذَلِكَ فَكَانَ ذَلِكَ صُلْحَهُمَا، وَلَمْ يَرَ رَافِعٌ عَلَيْهِ إِثْمًا حِينَ رَضِيَتْ أَنْ تَسْتَقِرَّ عِنْدَهُ عَلَى الْأَثَرَةِ فِيمَا آثَرَ بِهِ عليها (أخرجه البهيقي وابن أبي حاتم) صحيح ،

مرسـل، وقـد أخرجـه البيهقـي فـي السـنن (٧/ ٢٩٦) وعـزاه فـي الـدر (٢/ ٢٣٢) للشافعي وسعيد بن منصور وابن أبي شيبة والبيهقي. وذكره في لباب النقول ص ٩٥- .وله شاهد موصول عن رافع بن خديج أخرجه الحاكم (٢/ ٣٠٨) وصححه ووافقه الذهبي.

واتــه: رافيعــی كــوڕی خــەديجی ئەنصــاری يــەكێك بــوو لــە هــاوەڵانی پێغەمبــەر ئـافرەتێكی لـەلابوو تـاكو پيربـوو ، جـا ژنێكـی گـەنجی بەسـەر هێنـا و گەنجەكـەی هەڵبژارد ، وداوای تەلاقی كرد يەك تەلاقی دا ، لێی گەڕا تاكو ماوەی گێڕانەوە ئنجـا گێڕايەوە ، دووبارە تەلاقی دايەوە ، دوای پێ گوت يەك تەلاقت ماوە ، ئەگـەر حـەز دەكـەی بـا لێـك جيابينـەوە ، چ حـەز دەكـەی لـەلام بمينـەوە بـەڵام ژنـە گەنجەكـە هەڵدەبژێرم بەسـەرتۆدا، ژنەپيرەكـەی گـوتی رازيمـە و لات دەمێنمـەوە ، رافيعـيش هيشتيەوە صولحيان بەم شێوە كرد ،رافع ئەوەی بە گوناح نەدەزانی.

## ٢- هۆی دابەزينی ئـايەتـی (١٧٦) سورەتـی (النساء)

﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌۢ ١٧٦﴾ النساء

واتە: ئەی محمد (صلی الله عليە وسلم) داوای فتوات لێدەكەن دەربارەی (كلالە) كە بريتی يە: لە كەسێك باوك و نەوەی نەبێت، تۆش بڵێ: خوا وەڵامتان دەداتـەوە لـەو بارەيـەوە، ئەگـەر كەسـێك (پياوێـك) وەفـاتی كـردو منـداڵی نـەبوو، هـەر تـەنها خوشكێكی هەبوو، ئەوە نيوەی سامانەكەی بۆ ئـەوە (نيوەكـەی تريشـی دەخرێتـە

دارایی گشتی یەوە ئەگەر هەبێت و ئەگەر نەبوو لە بەرژەوەندیەکی گشتیدا بەکار دەهێنرێت)، (بەڵام ئەگەر مردووەکە ئافرەت بوو) ئەوا براکەی هەموو میراتیەکەی دەبات، ئەگەر ئافرەتەکە منداڵی لەدوا بەجێ نەمابوو، (خۆ ئەگەر پیاوە مردووەکە) دوو خوشکی لە دوا بەجێ مابوو ئەوە دووبەش لە سێ بەشی ئەوەی بەجێی هێشتووە بۆ ئەوان دەبێت، خۆ ئەگەر میراتگران پیاوان و ئافرەتان بوون هەموویشیان لە خوشك و برا پێکهاتبوون ئەوە بۆ نێرینەیەکیان ئەندازەی بەشی دوو مێینە هەیە، خوای گەورە ئەم شتانەتان بۆ ڕوون دەکاتەوە نەوەکو سەرگەردان بن، خوای گەورەش بە هەموو شتێك زانایە.(ئاسان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ جَابِرٍ قَالَ: اشْتَكَيْتُ فَدَخَلَ عَلَيَّ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم وَعِنْدِي سَبْعُ أَخَوَاتٍ، فَنَفَخَ فِي وَجْهِي فَأَفَقْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُوصِي لِأَخَوَاتِي بِالثُّلُثَيْنِ قَالَ: احْبِسْ فَقُلْتُ: الشَّطْرُ؟ قَالَ: احْبِسْ. ثُمَّ خَرَجَ فَتَرَكَنِي قَالَ: ثُمَّ دَخَلَ عليّ وقال لي: يَا جَابِرُ إِنِّي لَا أُرَاكَ تَمُوتُ فِي وَجَعِكَ هَذَا، إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَنْزَلَ فَبَيَّنَ الَّذِي لِأَخَوَاتِكَ (جَعَلَ لِأَخَوَاتِكَ) الثُّلُثَيْنِ. وَكَانَ جَابِرٌ يَقُولُ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِيَّ: يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ) اسباب النزول للواحدي ، أخرجه أبو داود في كتاب الفرائض (٢٨٨٧) . وعزاه المزي في تحفة الأشراف (٢٩٧٧) لأبي داود والنسائي في الكبرى في كتاب الفرائض وفي كتاب الطب.وأخرجه البيهقي في السنن (٦/ ٢٣١) وقد سبق برقم (٢٩٧)

واتە: لە جابیرەوە هاتووە دەڵێ : نەخۆش بووم ، پێغەمبەر هاتە سەردانم ، منیش (٧) خوشکم هەبوون ، گوتم ئەی نێرراوی خوا وەصیت بکەم بۆ خوشکەکانم دوو

لەسەر سێیان بدرێتیٚ ، فەرمووی کەمی کەوە ، گوتم نیوە ، فەرمووی کەمی کەوە ، دوای چووە دەرەوە ، دوای هاتە ژوورەوە فەرمووی ئەی (جابر) من نابینم تۆ لەم نەخۆشیە وەفات بکەی ، خوا قورئانی دابەزاندوە بۆ بەشی خوشکەکانی روون کردۆتەوە ، دوو سێیەکی بۆ داناون ، وە (جابر) دەیگوت ئەم ئایەتە دەربارەی من دابەزیوە (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ)

واتە: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) داوای فتوات لێدەکەن دەربارەی (کلالە) کە بریتی یە: لە کەسێك باوك و نەوەی نەبێت، تۆش بڵێ: خوا وەڵامتان دەداتەوە .

-(جابر بن عبد الله يقول مرضت فأتاني رسول الله صلى الله عليه و سلم يعودني هو وأبو بكر معه وهما ماشيان وقد أغمي علي فتوضأ رسول الله صلى الله عليه و سلم فصب علي من وضوئه فقلت يا رسول الله كيف أصنع كيف أقضي في مالي حتى نزلت آية الميراث في آخر النساء ( وإن كان رجل يورث كلالة ) و ( يستفتونك قل الله يفتيكم في الكلالة ) الآية ( صحيح ) صحيح أبي داود ٢٥٦٨ : وأخرجه البخاري ومسلم

-(عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ الْيَعْمُرِيِّ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، قَامَ خَطِيبًا يَوْمَ الْجُمُعَةِ – أَوْ خَطَبَهُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ – فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا أَدَعُ بَعْدِي شَيْئًا هُوَ أَهَمُّ إِلَيَّ مِنْ أَمْرِ الْكَلَالَةِ، وَقَدْ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَا أَغْلَظَ لِي فِي شَيْءٍ مَا أَغْلَظَ لِي فِيهَا، حَتَّى طَعَنَ بِإِصْبَعِهِ فِي جَنْبِي – أَوْ فِي صَدْرِي – ثُمَّ قَالَ: (يَا عُمَرُ، تَكْفِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ الَّتِي نَزَلَتْ فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ) رواه ابن ماجه قال الالباني صحيح

شرح : (آية الصيف) هي قوله تعالى – يستفونك قل الله في الكلالة – وهي نزلت في الصيف. وهي أوضح من آية الشتاء التي هي في أول سورة النساء

-(عَنْ الْبَرَاءِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ كَامِلَةً بَرَاءَةٌ وَآخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ خَاتِمَةُ سُورَةِ النِّسَاءِ يَسْتَفْتُونَكَ قُلْ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ ) رواه البخاري

************************************

# وتاری ژماره (٣٦) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی ( المائدە ):

–ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٥)ە  ژمارەی ئایەتەکانی (١٧٦) ئایەتە

سورەتی (المائدە) لەسورەتە درێژەکانی مەدینەیە ، لەگەڵ باسی عەقیدە ، باسی چەندین ئەحکامی شەرعی دەکات وەك (یاساکانی گرێ بەست ، کوشتنەوە ، ڕاو ، ئیحرام ، مارکردنی ژنانی ئەهلی کیتاب ، هەڵگەرانەوە ، پاك و خاوێنی ، سزای دزین ، سزای ستەم وفەسادی لەسەر زەوی ، یاساکانی مەی و قومار، کەفارەتی سوێند ، کوشتنی نێچیر لە حەرەم ، وەصیەت لە کاتی مردن ، حوکم نەکردن بەشەریعەتی خوا)

–وەهەروەها سەرەرای ئەم حوکمانە چەند چیرۆکێك باس دەکات بۆ دەرس وەرگرتن ، وەك نەوەی ئیسرائیل و موسی ، کە هەڵوێستی زۆر خراپیان هەبووە بەرامبەر موسی علیه السلام

–وەچیرۆکی (هابیل و قابیل) دوو نموونەن لە خێرو شەر

–وە چیرۆکی و موعجیزەی (عیسی) علیه السلام باس دەکات ، کاتێ حەواریەکان داوای خوانێك خواردن دەکەن ، خوا بۆی دابەزاندن وەك موعجیزەیەکی گەورە .

–ئایا بۆچی ناو نراوە (المائدە)؟ وەلاّم : چونکە حەواریەکان داوایان کرد خوا خوانێك خواردنیان بۆ دابەزینی بۆ راستی پێغەمبەرایەتی عیسی و تاکو ببێتە چەژن بۆیان ، خواش داواکەی عیسای جێ بەجێ کرد ، کەواتە ناوی ئەم سورەتە  بەناوی ئەم خوانە خواردنە کراوە.

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢) سورەتی (المائدة)

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢) المائدة

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دەستكاری دروشمەكانی خوا مەكەن و هەڵی مەوەشێننەوە (بەتایبەت دروشمەكانی حەج و عەمرە) هەروەها مانگەكانی حەرام (كە: ڕجب، ژوالقعدە،ژوالحجە، محرم)ن، تێكی مەدەن و ئەو قوربانیەش كە دەكرێت (مەرجەكانی مەشێوێنن) و ئەو ملوانكانەی (دەكرێتە ملی ئاژەڵ، كە نیشانەیە بۆ ئەوەی خاوەنیان بڕیاریداوە بكرێن بەقوربانی) لێی مەكەنەوە و ڕێگە لەوانە مەگرن كە دێن بۆ (تەواف)ی كەعبەو لەكاتێكدا بەئومێدی فەزڵ و ڕەزامەندی خوان، كاتێك ئیحرام دەشكێنن، ئەوە بۆتان هەیە ڕاو بكەن، هەروەها دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی كەسانێك كە نەیانهێشت كاتی خۆی (تەواف)ی كەعبە بكەن، مەكەنە هۆی دەستدرێژی و بەرپاكردنی ناخۆشی، یارمەتی و كۆمەكیی یەكتر بكەن لەسەر چاكەو خواناسی، نەكەن یارمەتی وكۆمەكی یەكتر بكەن لەسەر گوناهو دەستدرێژی، لە خوا بترسن و پارێزكار بن، چونكە بەڕاستی خوا زۆر بەتوندی تۆڵە دەسێنێت.(ئاسان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێڕانەوە هەیە:

١- (عن ابن عباس قوله:(لا تحلوا شعائر الله) إلى قوله:ولا آمين البيت، (فكان المؤمنون والمشركون يحجون إلى البيت) جميعًا، فنهى الله المؤمنين أن يمنعوا أحدًا أن يحجّ البيت أو يعرضوا له، من مؤمن أو كافر، ثم أنزل الله بعد هذا: (إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا) ، وقال: (مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَنْ يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ) ، وقال: (إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ) (سورة التوبة: ١٨) ، فنفى المشركين من المسجد الحرام) تفسير الطبري

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە هاتوو دەڵێ : قسەی خوا (لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ ) تاكو دەگاتە (وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ) ئیمانداران و موشریكان هەموویان حەجیان دەكرد ، خوا نەیهێشت ئیمانداران كەس قەدەغە بكەن لە حەج ، چ ئیماندار چ كافر ، دوای ئەم ئایەتە دابەزی (إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا) وەفەرمووی (مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَنْ يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ) وە فەرمووی (إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ) جا موشریكان قەدەغەكران لە مزگەوتی حەرام.

٢-(وَقَالَ زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ: كَانَ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم وَأَصْحَابُهُ بِالْحُدَيْبِيَةِ حِينَ صَدَّهُمُ الْمُشْرِكُونَ عَنِ الْبَيْتِ، وَقَدِ اشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، فَمَرَّ بِهِمْ نَاسٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يُرِيدُونَ الْعُمْرَةَ، فَقَالَ أَصْحَابُ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم: نَصُدُّ هَؤُلَاءِ كَمَا صَدَّنَا أَصْحَابُهُمْ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: لَا تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ وَلَا الشَّهْرَ الْحَرَامَ وَلَا الْهَدْيَ وَلَا الْقَلَائِدَ وَلَا آمِّينَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ أَيْ وَلَا تَعْتَدُوا عَلَى هَؤُلَاءِ الْعُمَّارِ، أَنْ صَدَّكُمْ أَصْحَابُهُمْ ) اسباب النزول للواحدي

واتــه: زەیـدی کـوڕی ئەسـلەمە دەڵـێ : هـاوەڵانی پێغەمبـەر کـاتێ لـە ناوچـەی (الحدیبیـه) قەدەغـەکران بێنـە (بیـت) لەلایـەن موشـریکانەوە ، زۆریـان لەسـەر دڵ گران بوو، جا هەندێ لە موشریکان بەلای موسڵماناندا تێپەرین بۆ عومەرە دەچوون ، هاوەڵانیش گوتیان ، ئێمەش ئەوانـە قەدەغـە دەکـەین چـۆن موشـریکانی مەککـە ئێمەیان قەدەغە کرد بچینە کەعبە ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزانـد (لَا تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ وَلَا الشَّهْرَ الْحَرَامَ وَلَا الْهَدْيَ وَلَا الْقَلَائِدَ وَلَا آمِّينَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ) **واتـە : سـتەم لەو عومەرەکاران** مەکەن ، ئەگەر هاوەڵانی ئەوان ئێوەیان قەدەغە کردوە .

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٣) سورەتی (المائدة)

(حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣) المائدة

واتە: لە سەرتان یاساغ کراوە(گۆشتی) مردارەوە بوو وە خـوێن وە گۆشـتی بـەراز و ئەو ئاژەڵەی لە کاتی سەر بڕیندا ناوی غەیری خـوای لـێ برابـێ و ئـاژەڵی خنکـاو(و خنکێنراو) وە ئەوەی کـە لـێ ی درابـێ تـا گیـانی دەرچـوبێ وە ئـەوەی لـە بـەرزی کەوتبێتە خوارەوەو مردبێ وە شۆق لێدراو(کە بەو شۆق لێدانـە مردبـێ) وە ئـەوەی دڕندە لێ ی خواردبێ بێجگە ئەوەی(پێش مردن) سەرتان بڕی بـێ هـەروەها(یاسـاغ کراوە لە سەرتان) ئەو ئاژەڵەی لەسەر بەرد سەر بڕابێ(نصب: چەند بەردێ بوون لە دەوری کەعبـە بـە پـیرۆز سـەیر دەکـران و لـە لایـان دا ئاژەڵیـان سـەر دەبـڕی) و

داواکردنی بەش بەخت(و نیاز گرتنەوە) بە تیرو پشك(ئەنجام دانی) ئەمانە هەمووی لە فەرمان دەرچوون و تاوانە ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە ئەمڕۆ نائومێد بوون لە ئاینەکەتان کەواتە لێیان مەترسن تەنها لە من بترسن ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو(کامڵ) کردوە بۆتان و چاکەو بەهرەی خۆم بە تەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا و ڕازی بووم کە ئیسلام ئایینتان بێت جا هەر کەس ناچار بوو لە برسیەتیدا بێ ئەوەی نیەتی گوناه کردنی هەبێ(لەو گۆشتانە بخوات گوناهی ناگات) ئەوە بەڕاستی خوا لێخۆش بووی بە بەزەیی یە.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێرانەوە هەیە:

١-( عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ إِلَى قَوْمِي أَدْعُوَهُمْ إِلَى اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، وَأَعْرِضُ عَلَيْهِمْ شَرَائِعَ الْإِسْلَامِ، فَأَتَيْتُهُمْ وَقَدْ سَقُوا إِبِلَهُمْ، وَأَحْلَبُوهَا، وَشَرِبُوا فَلَمَّا رَأَوْنِي، قَالُوا: مَرْحَبًا بِالصُّدَيِّ بْنِ عَجْلَانَ، ثُمَّ قَالُوا: بَلَغَنَا أَنَّكَ صَبَوْتَ إِلَى هَذَا الرَّجُلِ قُلْتُ: (لَا وَلَكِنْ آمَنْتُ بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ، وَبَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْكُمْ أَعْرِضُ عَلَيْكُمُ الْإِسْلَامَ وَشَرَائِعَهُ، فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ جَاءُوا بِقَصْعَةٍ دَمٍ فَوَضَعُوهَا، وَاجْتَمَعُوا عَلَيْهَا يَأْكُلُوهَا) فَقَالُوا: هَلُمَّ يَا صُدَيُّ، فَقُلْتُ: (وَيْحَكُمْ إِنَّمَا أَتَيْتُكُمْ مِنْ عِنْدِ مَنْ يُحَرِّمُ هَذَا عَلَيْكُمْ بِمَا أَنْزَلَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ ، قَالُوا: وَمَا ذَاكَ؟ قُلْتُ: نَزَلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الْآيَةُ (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ) (المائدة: ٣) إِلَى قَوْلِهِ (إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ) (المائدة: ٣) فَجَعَلْتُ أَدْعُوَهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ وَيَأْبُونَ فَقُلْتُ لَهُمْ: وَيْحَكُمُ ايْتُونِي بِشَيْءٍ مِنْ مَاءٍ، فَإِنِّي شَدِيدُ الْعَطَشِ، قَالُوا: لَا، وَلَكِنْ نَدَعُكَ تَمُوتُ عَطَشًا، قَالَ: (فَاعْتَمَمْتُ وَضَرَبْتُ رَأْسِي فِي الْعِمَامَةِ، وَنِمْتُ فِي الرَّمْضَاءِ فِي حَرٍّ شَدِيدٍ،

فَأَتَانِي آتٍ فِي مَنَامِي بِقَدَحٍ زُجَاجٍ لَمْ يَرَ النَّاسُ أَحْسَنَ مِنْهُ وَفِيهِ شَرَابٌ لَمْ يَرَ النَّاسُ أَلَذَّ مِنْهُ فَأَمْكَنَنِي مِنْهَا، فَشَرِبْتُهَا فَحَيْثُ فَرَغْتُ مِنْ شَرَابِي اسْتَيْقَظْتُ وَلَا، وَاللَّهِ مَا عَطِشْتُ، وَلَا عَرَفْتُ عَطَشًا بَعْدَ تِلْكَ الشَّرْبَةِ) فَسَمِعْتُهُمْ يَقُولُونَ: أَتَاكُمْ رَجُلٌ مِنْ سُرَاةِ قَوْمِكُمْ فَلَمْ تَمْجَعُوهُ بِمَذْقَةٍ فَأْتُونِي بِمَذِيقَتِهِمْ فَقُلْتُ: (لَا حَاجَةَ لِي فِيهَا إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَطْعَمَنِي وَسَقَانِي فَأَرَيْتُهُمْ بَطْنِي فَأَسْلَمُوا عَنْ آخِرِهِمْ) رواه الحاكم قال الالباني صحيح في السلسلة الصحيحة

واتە: لەبو ئومامەوە هاتووە خوا لێی رازی بێ دەڵێ : پێغەمبەر رەوانەی کردم بۆ لای گەلێك بانگیان بکەم بۆ ئیسلام و بنەماکانی ئیسلامیان بۆ بخەمە ڕوو ، چوومە لایان وشتریان ئاودەدا و دەیان دۆشت ، دەیانخواردەوە ، کاتێ منیان دیت ، گوتیان سلاو لە (صودی کوڕی عەجلان) دوای گوتیان پێمان گەیشتووە تۆ مەیلی ئەو پیاوەت هەیە (مەبەستیان پێغەمبەر بووە)، گوتم نەخێر بەڵکو باوەڕم بەخوا و بە پێغەمبەر هێناوە ، وە پێغەمبەر منی راوانکردوە بانگتان بکەم بۆ ئیسلام و یاساکانی ، ئێمە لەو قسانەدا بوین قاپێك خوێنیان هێنا و لەسەری کۆبونەوە بۆ خواردنی ، گوتیان ئەی (صودی) تۆش وەرە بیخۆ، گوتم ماڵ ویرانینە من لەلای کەسێك هاتووم ئەوەی لێتان حەرام کردوە ، چونکە خوا ئایەتی لەسەر دابەزاندوە ، گوتیان ئەو ئایەتە چییە؟ گوتم ئەم ئایەتەیە (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ) وە بانگم دەکردن بۆ ئیسلام ، ئەوانیش رەتیان کردوە ، پێم گوتن ماڵویرانینە هەندێك ئاوم بدەنێ زۆر تێنووم ، گوتیان نەخێر لێت دەگەڕێن تاکو لە تێنوان دەمری ، دەڵێ مەندیلم بەست و سەرم لەناو مەندیل نا، و خەوتم لەسەر زەوێکی زۆر گەرم ، لەخەومدا کەسێك هات پەرداغێکی شوشەی پێ بوو ، جوانی وەها نەبینرابوو ، شەرابێکی تێدا بوو کەس ئەم شەرابە خۆشەی نەبینیوە ، جا لێم خواردەوە ، کەتەواو بووم لە خواردنەوەی بە ئاگا هاتم ، سوێند بەخوا تێنوتیم

ئەما و پاش ئەم شەرابە ئەم زانی تێنوەتی چییە؟ گوێم لێ بوو دەیانگوت پیاوێك هاتۆتە لاتان دەبێتەوە خزمتان ، تێکەڵەی شیروئاوی بدەنێ ، جا بۆیان هێنام ، گوتم ناخۆم پێویستیم پێ نیە ، خوا خواردن و خواردنەوەی دامێ ، سکی خۆم پیشاندان کە پڕوتێرە ، جا هەموویان موسڵمان بوون.

تێبینی: ئەبو ئومامەی باهیلی ناوی (صدی کوڕی عجلان) گەورەی باهیلیەکانە.

(معاني الكلمات (صُدِيَ : الرجل اشتد عطشُهَ ، (صبوت: تَشَوَّق اليه، يميل ، المذقة : الطائفة من اللبن الممزوج مع الماء ، تمجمع : اكل)

وفي روايه :( عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى بَاهِلَةَ، فَأَتَيْتُهُمْ وَهُمْ عَلَى طَعَامٍ، فَرَحَّبُوا بِي وَأَكْرَمُونِي وَقَالُوا: تَعَالَ فَكُلْ، فَقُلْتُ: جِئْتُ لأَنْهَاكُمْ عَنْ هَذَا الطَّعَامِ، وَأَنَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْكُمْ لِتُؤْمِنُوا، فَكَذَّبُونِي وَزَبَرُونِي، فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا جَائِعٌ ظَمْآنُ قَدْ نَزَلَ بِي جَهْدٌ شَدِيدٌ، فَنِمْتُ فَأُوتِيتُ فِي مَنَامِي بِشَرْبَةٍ مِنْ لَبَنٍ، فَشَبِعْتُ وَرَوِيتُ، وَعَظُمَ بَطْنِي، فَقَالَ الْقَوْمُ: أَتَاكُمْ رَجُلٌ مِنْ خِيَارِكُمْ وَأَشْرَافِكُمْ فَزَبَرْتُمُوهُ، اذْهَبُوا إِلَيْهِ فَأَطْعِمُوهُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ مَا يَشْتَهِي، فَأَتَوْنِي بِطَعَامٍ فَقُلْتُ: مَا لِي حَاجَةٌ فِي طَعَامِكُمْ وَشَرَابِكُمْ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَطْعَمَنِي وَسَقَانِي، فَانْظُرُوا إِلَى حَالِي الَّتِي أَنَا عَلَيْهَا، فَآمَنُوا بِي وَبِمَا جِئْتُ مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رواه الطبراني في معجمه الكبير

**گرنگی ئەم ئایەتە لە لای کەسێکی جوولەکە :**

( عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ آيَةٌ فِي كِتَابِكُمْ تَقْرَءُونَهَا لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ نَزَلَتْ لَاتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيدًا، قَالَ: فَأَيُّ آيَةٍ؟ ، قَالَ: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي، وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا) (المائدة: ٣) ، فَقَالَ عُمَرُ: إِنِّي لَأَعْلَمُ الْمَكَانَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ، وَالْيَوْمَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِعَرَفَاتٍ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ) رواه البخاري و مسلم

واتە : لەعومەری کوڕی خەتابەوە هاتووە خوا لێی رازی بێ دەڵێ : پیاوێکی جوولەکە هاتە لام گوتی ئەی ئەمیری ئیمانداران ئایەتێك لە قورئانێ هەیە ئەگەر بۆ سەر ئێمە دابەزیبایە ئەم ڕۆژەمان دەکردە چەژن ، ئەڵێ کام ئایەتە ؟ گوتی (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي، وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا) عومەر دەڵێ گوتم : من دەزانم لەکام شوێن و کام ڕۆژ دابەزی ، لە کیوی عەرەفات و ڕۆژی هەینی بوو .

وفي رواية( عَنْ كَعْبِ الْأَحْبَارِ قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: إِنِّي لَأَعْرِفُ قَوْمًا لَوْ نَزَلَتْ عَلَيْهِمْ هَذِهِ الْآيَةُ لَنَظَرُوا إِلَى يَوْمِ نَزَلَتْ فِيهِ، فَاتَّخَذُوهُ عِيدًا، فَقَالَ عُمَرُ: أَيَّةُ آيَةٍ؟ فَقَالَ: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ) (المائدة: ٣) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ. فَقَالَ عُمَرُ: (إِنِّي لَأَعْرِفُ فِي أَيِّ يَوْمٍ أُنْزِلَتْ: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ) (المائدة: ٣) يَوْمَ جُمُعَةٍ، يَوْمَ عَرَفَةَ، وَهُمَا لَنَا عِيدَانِ) رواه الطبراني في الاوسط

واتە : لە کەعبی زانای جوولەکانەوە هاتووە دەڵێ : گوتمە عومەری کوڕی خەتاب : من دەزانم گەلێك هەن ، ئەگەر ئەو ئایەتەیان بۆ سەر دابەزیبایە دەیانکردە چەژن ، عومەر دەڵێ کام ئایەتە؟ گوتی (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ) عومەر گوتی : من دەزانم لە چ ڕۆژێك دابەزی ، ڕۆژی هەینی بوو ، وڕۆژی عەرەفە بوو ، هەردوکیان بۆ ئێمە چەژنن

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٦) سورەتی (المائدة)

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦}المائدة

واتـە: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە! هەركـە ویسـتان هەڵسـن بـۆ نوێـژو دەستنوێژتان نەبوو دەم و چاوو دەستتان لەگەڵ ئانیشكتاندا بشۆرن و مەسحی سەرتان بكێشن و، پێتان لەگەڵ قاپتاندا بشۆرن. بەڵێ.. ئەم وشەی (وأرجلكم) بەسێ جۆر خوێنراوەتەوە: یەكەم و دووەم: كە بەبۆرو سەرە.. (الرفع والنصب) موتەواتیرە. سێیەم: - كە ژێرە (خفض)ـە - شازەو لەڕای گشتیی دەرچووە، جا خوێندنـەوەی (وأرجلكم) بەسـەر، هـیچ گرێیـەكی تێدانییـەو لەگـەڵ مەبەسـت و ئاقیدەی ئێمەدایە، بەڵام (وأرجلِكم) (بەژێر)ـی (لام)ـەكە ئاڵۆزییـەك دەخـولقێنێ و، لەگەڵ بیروبۆچوونی ئێمـە نـاگونجێ، چونكە فەرموودەیـەكی زۆرو زەبەنـدە هەیـەو دەچن بەگژ (مەسح) كردنی پێدا لەباتی شۆرین، وەكو دەفەرموێ: (.. ویل للأعقاب من النـار ) و چەند فەرموودەیـەكی تـریش كـە (بوخـاریی) و (موسـلیم) دەیـانهێنن لەجێگـەی خۆیانـدا، ئـیتر جگـە لـەوەی كـە (عوسمـان و عـەلی و ئـیبن عـەبباس و موعاویەو عەبدوڵڵای كوڕی زەید) دەڵێن: (أن رسـول الله غسـل الـرجلين في وضـوئه، إما مرة، أو مرتين، أو ثلاثا) بوخـاریی. واتـە: هـەردەم پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) لەدەسـتنوێژییدا جـارێ، یـان دووجـار، یـان سـێ جـار پێـی دەشـۆری. بـۆ مەسـەلەی (خـوف)یـش: زانایـان - شـیعەو خـەواریج نـەبێت - یەكـدەنگن بـۆ بەكارهێنانی چ لەسەفەردا، چ لەماڵەوە. ئاخۆ شۆرینی پێ لـە (مەسـح)ـی باشـترێ

!؟ ئـەم وەڵامـە كێشـەیەكی تێدایـە، ئـاخۆ ئەگـەر خوفەكـە دڕابێـت (مەسـح)ــی دەكرێـت؟ بۆئەمـەش زانایـان قسـەیان جیـاوازە. مـاوەی مەسـحی خـۆی چـەندە؟. جەماوەری زانایان دەڵێن: ماوەی مەسحی خوف لە سەفەردا (٣) ڕۆژ و(٣) شـەوە، لەماڵەوەیش یەك شەوو یەك ڕۆژە، دەستەیەكیش دەڵێن: (مەسح) بێ ماوەیە. ئاخۆ تەنها (مەسح)ی بەشی سەرەوەی خوف پێویستە، یان بەشی ژێرەوەیشـی دەیـەوێ ؟ بۆ هـەردوولا ئیختـیلاف و رای جیـا هەیـە. ئـاخۆ گـۆرەویی مەحكـەم و ئەسـتوور (مەسح)ـی بەسەرا دەكرێت؟ ئەمیش هەرجێگەی قسەو باسە. جا ئەگەر لەش گران بوون، دەبێ تەواوی جەستەو تەنتان بشۆرن و خاوێنی كەنەوە خـۆ ئەگـەر نـەخۆش و لەش بەبار بوون و، بەكارهێنانی ئاویش زیانی دەبـوو بۆتـان، وە یـان لەسـەفەردا بوون وە یان یەكێكتان لەجێگای ئەدەبدا بێتەوە وە یان لەگەڵ ژنـانی هاوسـەرتان، سـەرجێیتان كـرد (لەسـوورەتی (نیسـاو)دا سـەبارەت بـەمانای (لامسـتم..) كورتـە باسـێك نووسـراوە دەتـوانی بگەڕێیتــەوە ئــەوێ ئاویشــتان دەسـت نەدەكــەوت بۆخۆشـتن، یـان بۆدەسـتنوێژ (فتیممـوا صـعیدا طیبـا) ئەوكاتـە بـە تـۆزێكی پـاك تەیەموم بكەن (فامسحوا بوجوهكم وأیـدیكم منـه) ڕوومـەت و دەسـتی خۆتـانی پـێ (مەسح) بكەن : دووجار دەسـت بـە تۆزەكـەدا بـدەن بـۆ هـەردووكیان. دەسـتەیەك لەزانایان دەڵێن: هەمووشتێكی زەویی – گڵ، ڕمڵ، بـەرد، كانگـە، خـوێ .. هتـد – ڕەوایە تەیەمومی پێبكرێ. ئەمەیش رای (ئیمام مالیك و ئەبوو حەنیفـەو سـەوریی) و هەندێ لەزانایانی ترە، پیشـەوا (شـافیعی)یـش بۆخـۆی دەڵێـت: تەیـەموم تـەنها بەگڵ دەكرێ، بەڵێ.. ئەگەر سەیری ڕۆحی قورئان و ئاسانكاریەكانی ئیسـلام بكـرێ كە دەفـەرموێ: (وماجعـل علـيكم فی الـدين مـن حـرج) زۆر بەئاسـانی دەتـوانرێ رای یەكەم هەڵبژێردرێ. چەند ڕێنمایەك لەبارەی تەیەمومـەوە: ١– تـەواوی موسـڵمانان یەك دەنگن كە تەیەمموم بۆ بێ دەستنوێژیی بچوك دەكرێ و، بۆ لەشگرانیش هەروا

.. زانایەکی (تابعین) نەبێ. ٢- چەندجار دەست لەتۆزەکە بدرێ؟ دەستەیەك دەڵێن: یەکجار بۆدەم و چاوو هەردوودەست بەسە، ئەمەیش ڕای پێشەوا (ئەحمەدو عەتاو مەکحوول و ئەوزاعیی و ئیسحاق)ـە، هەر ئەمڕایەش لەگشت ڕایەکانی تر بەهێزترە، چونکە فەرموودەی (متفق علیه) لەسەرە. ٣- ئایا مەسحی دەست تا ئانیشك پێویستە، یان تەنها هەردوو لەپی دەس؟ بۆ هەردووکیان قسە هەیە، بەڵام پێدەچێ کە تەیەمموم تەنها بۆ هەردوو لەپ بەهێزتر بێ. ٤- ئایا تەرتیب لە ئەندامەکانی تەیەمموم‌دا پێویستە؟ زانایان بۆ ئەمەش ڕای جیاجیایان هەیە. ٥- بەیەك تەیەمموم دوو فەرز یا زیاتر دەکرێ، یان نا؟ هەندێ وەك ئیمامی (ئەحمەدو حەسەنی بەێریی و ئەبوو حەنیفە) دەڵێن: بەڵێ زیاد لە فەرزێکی پێدەکرێ. بەڵام پێشەوا (مالیك و شافیعیی) دەڵێن: تەیەمومێك یەك فەرزی پێدەکرێ. خوا نایەوێ لە دینداریی‌دا هیچ جۆرە نارەحەتیەك بخاتە سەرشانتان و سەخڵەتتان بکا و لکن یرید لیگهرکم بەڵکو ئەیەوێ لەگوناهو تاوان پاکتان بکاتەوە ولیتم نعمته علیکم و بە تەواوی بەخششی خۆی بەسەرتانا بڕێژێ بەڵکو سوپاسی چاکەو بەهرەکانی بکەن (ڕمان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

لەم بارەوە دوو گێڕانەوە هەیە:

١-( عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْتِمَاسِهِ وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ فَأَتَى النَّاسُ أَبَا بَكْرٍ فَقَالُوا أَلَا تَرَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ وَبِالنَّاسِ مَعَهُ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ وَرَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ فَقَالَ حَبَسْتِ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالنَّاسَ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ قَالَتْ فَعَاتَبَنِي وَقَالَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ وَجَعَلَ يَطْعُنُنِي بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي فَلَا يَمْنَعُنِي مِنْ التَّحَرُّكِ إِلَّا مَكَانُ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى فَخِذِي فَنَامَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ فَتَيَمَّمُوا فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ الْحُضَيْرِ مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ فَقَالَتْ عَائِشَةُ فَبَعَثْنَا الْبَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ فَوَجَدْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ ) صحيح البخاري

واته: لەعائشەی دایکی ئیمانداران هاتووە دەڵێ : لەگەڵ پێغەمبەری خوا چووینە سەفەرێك تاگەیشتینە بیابانێك ملوانکەم پچرا ، پێغەمبەر باروبارگەی خست بەمەبەستی دۆزینەوەی ، خەڵكیش باروبارگەیان خست ، نەشوێنەكە ئاوی لێ بوو، نە خەڵكی ئاویان پێمابوو، خەڵكی چوونە لای ئەبوبەكر گوتیان نابینی (عائیشە) توشی چی كردین ، پێغەمبەری پەك خست و خەڵكیش لەگەڵ ئەو ، نەلەسەر ئاوین ونەئاومان پێیماوە، جا ئەبوبەكر هات ، پێغەمبەر لەو كاتە خەوتبوو سەری لەسەر ڕانم دانابوو ، ئەبوبەكر گوتی : ئەوە بۆچی پێغەمبەر و خەڵكیت راگەرتووە نەلەسەر ئاون ونەئاویشیان پێیماوە ، (عائیشە) دەڵێ : قسەی پێ گوتم ولۆمەی كردم ، وە بەسەرە پێیەكانی لەكەلەكی دەدام ، بەلاّم خۆم نەدەجوڵاند چونكە پێغەمبەر لەسەر ڕانم خەوت بوو ، پێغەمبەر خەوت تاكو بەیانی بەبێ ئاوی ، جا خوا ئایەتی (التیمم) دابەزاند ، (ئوسیدی كوڕی حوزیر) گوتی : ئەی ئال وبەیتی ئەبوبەكر ئەوە یەكەم بەرەكەتی ئێوە نیە (واتە: زۆر بەرەكەتی دیكەشتان هەیە) جا (عایشە) دەڵێ : كاتێ وشترمان هەڵسان بۆ ڕۆیشتن ئەو وشترەی من سواری ببووم ، دەبینین ملوانكەكە لە ژێر وشترەكەدایە.

-وفي رواية (.....وَنَزَلَتْ آيَةُ التَّيَمُّمِ ، وَوُجِدَتِ الْقِلَادَةُ فِي مُنَاخِ الْبَعِيرِ ، فَقَالَ النَّاسُ: مَا رَأَيْنَا امْرَأَةً أَعْظَمَ بَرَكَةً مِنْهَا) تفسير الطبري

واته: ...خەڵکی گوتیان هیچ ئافرەتێکمان نەبینوە وەك عائیشە بەبەرەکەت بێ بۆ موسڵمانان.

٢-(عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا اسْتَعَارَتْ مِنْ أَسْمَاءَ قِلَادَةً فَهَلَكَتْ فَأَرْسَلَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِهِ فِي طَلَبِهَا فَأَدْرَكَتْهُمْ الصَّلَاةُ فَصَلَّوْا بِغَيْرِ وُضُوءٍ فَلَمَّا أَتَوْا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَكَوْا ذَلِكَ إِلَيْهِ فَنَزَلَتْ آيَةُ التَّيَمُّمِ فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ جَزَاكِ اللَّهُ خَيْرًا فَوَاللَّهِ مَا نَزَلَ بِكِ أَمْرٌ قَطُّ إِلَّا جَعَلَ اللَّهُ لَكِ مِنْهُ مَخْرَجًا وَجُعِلَ لِلْمُسْلِمِينَ فِيهِ بَرَكَةٌ ) صحيح البخاري

واتە: لە عائیشەوە هاتووە دەڵێ: لە ئەسمای خوشکم ملوانکەکم وەرگرتبوو بە(استعارە) واتە: بە کاتی دوای بیداتەوە(لە کوردەواری دەڵێن بە ئەمانەت) ، ئەڵێ لێم بزر بوو ، پێغەمبەریش چەند کەسێکی نارد بۆ دۆزینەوەی ، کاتی نوێژ بەسەریاندا هات ، بەبێ دەست نوێژ نوێژیان کرد ، دوای گەرانەوە سکالآیان کرد لەلای پێغەمبەر ، جا ئایەتی (التیمم) دابەزی ، ئوسیدی کوڕی حوزیر گوتی : ئەی عائیشە خوا پاداشتی خێرت بداتەوە ، سوێند بەخوا هەر شتێك بۆ تۆ دابەزێ ، بۆ تۆ دەرووی خێرە ، وبۆ موسڵمانانیش بەرەکەتە.

***********************************

## وتاری ژماره (٣٧) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٣) سورەتی (المائدة)**

﴿قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُواْ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ٢٣﴾المائدة

واته : بەڵام دووپیاوی ساڵح و لەخوا ترس (یوشع، کالب) لەدوانزه فەرماندەکەیان أنعم الله علیهما خوا نازونیعمەتی خۆی رشتبوو بەسەریاندا بەبڕوای بەهێزو چاوی نەترس و دڵی دامەزراوەوە بە قەومەکەیانیان گوت: ادخلوا علیهم الباب لەدەروازەی شارەوە بچنە سەریان و یەك هێرشی سەخت بکەن و، لێیان مەترسن جا هەر کە چوونە ناو شارەوە، ئیتر بەڕاستیی ئێوە زاڵ دەبن و دەبێ بۆ سەرکەوتنش تەنها پشت بەخوا ببەستن، ئەگەر ئێوە بڕوای ڕاستەقینەتان هەیە.

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

١- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَوْلُهُ: (ادْخُلُوا الْأَرْضَ الْمُقَدَّسَةَ الَّتِي كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِكُمْ فَتَنْقَلِبُوا خَاسِرِينَ) (المائدة: ٢١) قَالَ: هِيَ مَدِينَةُ الْجَبَّارِينَ ، لَمَّا نَزَلَ بِهَا مُوسَى وَقَوْمُهُ ، بَعَثَ مِنْهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ رَجُلًا ، وَهُمُ النُّقَبَاءُ الَّذِينَ ذَكَرَ نَعْتَهُمْ لِيَأْتُوهُ بِخَبَرِهِمْ. فسَارُوا ، فَلَقِيَهُمْ رَجُلٌ مِنَ الْجَبَّارِينَ ، فَجَعَلَهُمْ فِي كِسَائِهِ ، فَحَمَلَهُمْ حَتَّى أَتَى بِهِمُ الْمَدِينَةَ ، وَنَادَى فِي قَوْمِهِ ، فَاجْتَمَعُوا إِلَيْهِ ، فَقَالُوا: مَنْ أَنْتُمْ؟ فَقَالُوا: نَحْنُ قَوْمُ مُوسَى ، بَعَثَنَا إِلَيْكُمْ لِنَأْتِيَهُ بِخَبَرِكُمْ ، فَأَعْطَوْهُمْ حَبَّةً مِنْ عِنَبٍ بِوِقْرِ الرَّجُلِ ، فَقَالُوا لَهُمْ:

اذْهَبُوا إِلَى مُوسَى وَقَوْمِهِ ، فَقُولُوا لَهُمُ: اقْدُرُوا قَدْرَ فَاكِهَتِهِمْ فَلَمَّا أَتَوْهُمْ ، قَالُوا لِمُوسَى: (اذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ) (قَالَ رَجُلَانِ مِنَ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمَا) (المائدة: ٢٣) وَكَانَا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ أَسْلَمَا وَاتَّبَعَا مُوسَى وَهَارُونَ ، فَقَالَا لِمُوسَى: (ادْخُلُوا عَلَيْهِمُ الْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَالِبُونَ وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ) (المائدة: ٢٣) اخرجه الطبري فى (جامع البيان) وابن ابى حاتم فى تفسيره ( قال محمود المصرى حسن)

واته: له ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ : قسەی خوا کە دەفەرمووێ (ادْخُلُوا الْأَرْضَ الْمُقَدَّسَةَ الَّتِي كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِكُمْ فَتَنْقَلِبُوا خَاسِرِينَ) دەڵێ ئەوە شارەی بەهێزەکانە ، کاتێ (موسى) وقەومەکەی لێی دابەزین ، موسى (١٢) پیاوی نارد ، ئەوانە هەڵبژێردراو بوون ، ئەوانە ناسراوبوون وتاکو بچن هەواڵ بێنەوە ، ڕۆیشتن لە ڕێگا گەیشتنە پیاوێك لە بەهێزەکان بوو ، ئەم دووازدە کەسەی لەجل وبەرگی خۆی پێچاو هەلیگرتن بردنیە شارەکە، و بانگی گەلەکەی خۆی کرد و بۆی کۆبونەوە ،گوتیان ئێوە کێن؟ گوتیان ئێمە گەلی موساین ، بۆ ئەوە هاتووین هەواڵتان بزانین ، ئەوانیش دەنکە ترێیەکیان دانێ قورسایی بەقەد پیاوێك بوو ، پێیان گوتن ، برۆنە لای موسی و گەلەکەی ، پێیان بڵێن با ڕێزی میوەکەیان بگرن ، کاتێ هاتنەوە گوتیان ئەی موسی (تۆ و خواکەت برۆن شەر بکەن ئێمەش لێرە دادەنیشین) و (دوو پیاو لە ئەوانەی لە خوا دەترسان خوا نیعمەتی لەگەڵ کردبوون ) ئەم دوو پیاوە خەڵکی ئەم شارەبوون ، موسڵمان بوون و بە دوای (موسی و هارون) کەوتن ، ئەم دوو کەسە گوتیانە موسی ، ئێوە لە دەرگای شار برۆنە ژوورەوە سەردەکەون ، پشت بەخوا ببەستن ، ئەگەر ئێوە راست دەکەم ئێماندارن .

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٣٣) سورەتی (المائدة)

((إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٣٣

واتە: تۆڵەی ئەوانەی دژی خواو پێغەمبەر خراپە دەکەن: (ئیبن کەسیر) –وەك لەبوخاریدا هاتووە– دەڵێ: کاتێ هۆزی (عورەینە)، لەئیسلام پاشگەز بوونەوەو، پاشان شوانەکەی پەیامبەریان (صلى الله عليه وسلم) کوشت و، وشترەکانیشیان بەتاڵان برد، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: بێگومان تۆڵەو جەزرەبەی کاری خراپی ئەوانەی دژایەتی لەگەڵ خواو پێغەمبەری ئەودەکەن و، دژی ئەو دەجەنگن و دەکوژن و هێرش دەکەنە سەر شارو گوندەکان بەردەوامیش لە عەرزدا هەوڵی فەسادوکاری گەندەڵی و خراپە کاری دەدەن و، ڕێ لەخەڵکیش دەگرن، تۆڵەیان ئەوەیە کە ئەوانەیان خەڵکیان کوشتووە، دەبێ بەتوندیی و بێ بەزەییانە بکوژرێن ئەوانەشیان خەڵك دەکوژن و سامانیشیان دەبەن، دەبێ هەڵواسرێن و لەدار بدرێن ئەوانەشیان تەنها سامانی خەڵك بە تاڵان دەبەن، دەبێ یان دەست و پێیان –ڕاست و چەپ– ببڕدرێ یان شار بەدەر بکرێن، لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر، وەیان زیندانی بکرێن، ئەگەر تەنها خەڵکیان دەترسان، واتە: نەکەسیان دەکوشت و نەداراییشیان دەبرد لەدنیادا ئەوە ریسوایی و سەرشۆڕییە بۆیان و لەدواڕۆژیشدا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە. بەڵێ.. ئەم مەسەلەی دژایەتیی و ڕێگرتنەیە درێژەیەکی هەیەو، لەکتێبە فیقهی یەکاندا وەك پێویست باسکراوە، بۆیە لێرە ئێمە درێژەی نادەینێ (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ قَوْمًا مِنْ عُكْلٍ أَوْ عُرَيْنَةَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– فَاجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ فَأَمَرَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– بِلِقَاحٍ وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا فَانْطَلَقُوا فَلَمَّا صَحُّوا قَتَلُوا رَاعِىَ رَسُولِ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ فَبَلَغَ رَسُولَ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– خَبَرُهُمْ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ فَبَعَثَ فِى آثَارِهِمْ فَمَا ارْتَفَعَ النَّهَارُ حَتَّى أُتِىَ بِهِمْ فَأَمَرَ بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– فَقُطِّعَتْ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ وَسُمِرَتْ أَعْيُنُهُمْ وَأُلْقُوا فِى الْحَرَّةِ يَسْتَسْقُونَ فَلاَ يُسْقَوْنَ حَتَّى مَاتُوا فَهَؤُلاَءِ قَوْمٌ قَتَلُوا وَسَرَقُوا وَكَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ.) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ ومُسْلِمٌ

معاني الكمات: (عكل أو عرينة) أسماء قبائل. (فاجتووا) أصابهم الجوى وهو داء الجوف إذا استمر. (بلقاح) حي الإبل الحلوب واحدتها لقوح. (سموت) فقئت بحديدة محماة. (الحرة) أرض ذات حجارة سوداء في ظاهر المدينة أي خارج بنيانها

(فَاجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ مِنَ الِاجْتِوَاءِ) أَيْ كَرِهُوا هَوَاءَ الْمَدِينَةِ وَمَاءَهَا وَاسْتَوْخَمُوهَا وَلَمْ يُوَافِقْهُمُ الْمُقَامُ بِهَا وَأَصَابَهُمُ الْجِوَاءُ (بِلِقَاحٍ) أَيْ أَمَرَهُمْ أَنْ يُلْقِحُوا بِهَا وَاللِّقَاحُ النُّوقُ ذَوَاتُ الْأَلْبَانِ وَاحِدُهَا لِقْحَةٌ بِكَسْرِ اللَّامِ وَإِسْكَانِ الْقَافِ قَالَهُ الْحَافِظُ (وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا) احْتَجَّ بِهِ مَنْ قَالَ بِطَهَارَةِ بَوْلِ مَأْكُولِ اللَّحْمِ كَمَالِكٍ وَأَحْمَدَ وَطَائِفَةٍ مِنَ السَّلَفِ وَذَهَبَ أَبُو حَنِيفَةَ وَالشَّافِعِيُّ وَجَمَاعَةٌ إِلَى الْقَوْلِ بِنَجَاسَةِ الْأَبْوَالِ وَالْأَرْوَاثِ كُلِّهَا مِنْ مَأْكُولِ اللَّحْمِ (وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ) مِنَ السَّوْقِ وَهُوَ السَّيْرُ الْعَنِيفُ وَالنَّعَمُ بِفَتْحِ النُّونِ وَالْعَيْنِ وَاحِدُ الْأَنْعَامِ أَيِ الإبل

(واتە: لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە دەڵێ : گەلێك لە (عوکل یان عورینە)هاتنە لای پێغەمبەر بۆ مەدینە ، توشی نەخۆشی بوون بەهۆی ئاوهەوای

شـارەکە ، پێغەمبـەر فـەرمانی کـرد وشـتری بەشـیریان لەگـەل بنێـرێ و لەشـیرو میزەکـەی بخۆنـەوە ، ڕۆیشـتن کـاتێ چـاك بونـەوە شـوانی پێغەمبـەریان کوشـت وشترەکانیان دزی کاتێ ئـەم هەواڵـە گەیشـتە پێغەمبـەر خێـرا کۆمـەلێکی بـەدوادا ناردن ، لەسەرەتای ڕۆژ هەواڵەکـە گەیشـتە پێغەمبـەر ، نەگەیشـتە ئێـوارە دەسـت گیرکران ، پێغەمبەر فەرمانی کرد دەست وقاچیان ببرن و چاویان دەربێـنن ، لەبـەر گەرما دایانان ، داوای ئاویان دەکرد نەیان دانێ تاکو مردن ، ئەوانە کەسـانێك بـوون کوشتنیان کردو دەزیان کردوبوو وکافریش بونەوە.

وفي رواية-( أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُمْ، أَنَّ نَاسًا أَوْ رِجَالًا مِنْ عُكْلٍ أَوْ عُرَيْنَةَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا أَهْلُ ضَرْعٍ، وَلَمْ نَكُنْ أَهْلَ رِيفٍ، فَاسْتَوْخَمُوا الْمَدِينَةَ، (فَأَمَرَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَوْدٍ وَرَاعٍ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَخْرُجُوا فِيهَا، فَيَشْرَبُوا مِنْ لَبَنِهَا وَأَبْوَالِهَا فَلَمَّا صَحُّوا، وَكَانُوا بِنَاحِيَةِ الْحَرَّةِ كَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ، وَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَاسْتَاقُوا الذَّوْدَ، فَبَعَثَ الطَّلَبَ فِي آثَارِهِمْ، فَأُتِيَ بِهِمْ، فَسَمَّرَ أَعْيُنَهُمْ، وَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، ثُمَّ تَرَكَهُمْ فِي الْحَرَّةِ عَلَى حَالِهِمْ حَتَّى مَاتُوا) رواه النسائي قال الالباني صحيح

-( عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ نَاسًا أَغَارُوا عَلَى إِبِلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَاقُوهَا وَارْتَدُّوا عَنْ الْإِسْلَامِ وَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُؤْمِنًا فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمْ فَأُخِذُوا فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ قَالَ وَنَزَلَتْ فِيهِمْ آيَةُ الْمُحَارَبَةِ وَهُمْ الَّذِينَ أَخْبَرَ عَنْهُمْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ الْحَجَّاجَ حِينَ سَأَلَهُ (سنن ابي داود والنسائي قال الالباني حسن

-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ) (المائدة: ٣٣) الْآيَةَ قَالَ: (نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي الْمُشْرِكِينَ، فَمَنْ تَابَ مِنْهُمْ قَبْلَ أَنْ يُقْدَرَ عَلَيْهِ،

لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ سَبِيلٌ، وَلَيْسَتْ هَذِهِ الآيَةُ لِلرَّجُلِ الْمُسْلِمِ فَمَنْ قَتَلَ، وَأَفْسَدَ فِي الْأَرْضِ، وَحَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، ثُمَّ لَحِقَ بِالْكُفَّارِ قَبْلَ أَنْ يُقْدَرَ عَلَيْهِ لَمْ يَمْنَعْهُ ذَلِكَ أَنْ يُقَامَ فِيهِ الْحَدُّ الَّذِي أَصَابَ) رواه النسائي قال الالباني صحيح الاسناد

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٤١ تاكو ٤٧) سورەتی (المائدة)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ ۛ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُواْ ۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ۚ لَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٌ ۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْأَخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾(٤٠)

واتە: لەبەر كرداری جوولەكە دڵت تەنگ مەكە: پیاوێكی جوولەكە لەگەڵ ژنە جوولەكەیەكدا كاری ناشەرعییان كردبوو ، پاشان وتیان: بچنە لای موحەممەد بپرسن: جائەگەر ئەو لەتۆڵەیدا بڕیاری شەلاقییدا، ئەوا بە گوێی بكەن، ئەگینا هەرچی دەڵێ گوێی مەدەنێ، ئەوسا وەكو بوخاریی وموسلیم دەڵێن، ئایەتی: (یا أیها الرسول لا یحزنك ..) هاتە خوارێ. (موسلیم و ئەبوداودو پێشەوا ئەحمەد)یش دەڵێن: جوولەكەكان تۆڵەی زیناكار كە (بەردەباران) بوو گۆڕییان بە شەلاق لێدان و ڕوورەشكردن، جا هاتن لە پەیامبەریان (صلی الله علیه وسلم) پرسی: ئاخۆ حوكمی زیناكار چییە؟ بەو مەبەستە كە پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەسەر ئەوەكە ئەوان پێیان خۆشە ئەرێ بكا، ئەویش فەرمووی:(اللهم إني أولُ مَنْ أَحْيَا أمرَكَ إذ أَمَاتُوهُ )، ئیتر فەرمانی بە بەردەباران دا، خوای گەورەش ئایەتی ( یا أیها الرسول لایحزنك الذین ) هەتا ئایەتی (٤٥)ی ناردو فەرمووی: (یا أیها الرسول لا

يحزنك الذين يسارعون في الكفر) ئـەی پەیامبـەری خـوا! (صـلی اللـه علیـه وسـلم) ئەوکەسانە دڵ تەنگت نەکەن، لە بـێ باوەڕیدا تیـژڕەویی و پێشـڕەوی دەکـەن وراو بۆچـوونی خۆیـان دەخەنـە بـەر بڕیـارو فـەرمانی خـواوە ئەوانـەیان بـەدەم و زمـان دەڵـێن: بڕوامـان هێنـاوە کەچـی بـەدڵ بڕوایـان نـەهێناوە و ئەوانەشـیان بوونەتـە جوولەکەو هەردەم گوێ بۆ درۆ هەڵدەخەن و، کاری پێدەکـەن گـوێ بـۆ کەسـانێکی تـری جاسـوس و خوانـەناس دەگـرن کـە: هێمـان نەهاتوونەتـە لای تـۆ، وەك جوولەکەکانی (خەیبەر) و (فەدەك) لەباتی ئەوە کە گوێ بۆتۆ بگرن، کەچی گوێیان بۆخەڵکی تر دەگرت و، بەبڕیاری ئەوان ڕەفتاریان دەکردو قسـەی تۆشـیان دەبـردە لای ئەوان وشە و بڕیارەکانی خوا لەجێگەی خۆیدا دەگـۆڕن، ئـەوەبوو بـەردەبارانی زیناکاریان بە قامچی لێدان گۆڕی! دەڵێن: بچن لـە محمـد (صـلی اللـه علیـه وسـلم) بپرسن : جائەگەر وەك ئەوەی خۆمان بڕیارییدا، واتـە: قامچـی لـەباتی بـەردەباران، ئەوا لێی وەرگرن و بە گوێی بکەن خۆ ئەگەر ئەو بڕیارەی خۆمانی نەدا، وشـیاربن و خۆتـانی لـێ بپـارێزن و بـەگوێی مەکـەن هەرکەسـێ خـوا بیـەوێ بەسـەختی تـاقی بکاتـەوەو گـومڕای بکـات هـەرگیز تـۆ نـاتوانی لـەخواوە شـتێکی بۆبکـەیت و، لـەو جەزرەبەیە ڕزگاری بکەیت ئەمانە خەڵکانێکن خوا نایەوێ لەچڵك و چەپەڵێ و شیرك ، دڵیان پاك بکاتەوە بەشیان لـەم جیهانـەدا ڕیسـواییە لەدواڕۆژیشـدا سـزایەکی زۆر سەخت و گەورەیان هەیە(ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: مُرَّ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَهُودِيٍّ مُحَمَّمًا مَجْلُودًا، فَدَعَاهُمْ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (هَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ؟، قَالُوا: نَعَمْ، فَدَعَا رَجُلًا مِنْ عُلَمَائِهِمْ، فَقَالَ: (أَنْشُدُكَ بِاللهِ الَّذِي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى

مُوسَى، أَهَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ) قَالَ: لَا، وَلَوْلَا أَنَّكَ نَشَدْتَنِي بِهَذَا لَمْ أُخْبِرْكَ، نَجِدُهُ الرَّجْمَ، وَلَكِنَّهُ كَثُرَ فِي أَشْرَافِنَا، فَكُنَّا إِذَا أَخَذْنَا الشَّرِيفَ تَرَكْنَاهُ، وَإِذَا أَخَذْنَا الضَّعِيفَ أَقَمْنَا عَلَيْهِ الْحَدَّ، قُلْنَا: تَعَالَوْا فَلْنَجْتَمِعْ عَلَى شَيْءٍ نُقِيمُهُ عَلَى الشَّرِيفِ وَالْوَضِيعِ، فَجَعَلْنَا التَّحْمِيمَ، وَالْجَلْدَ مَكَانَ الرَّجْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اللهُمَّ إِنِّي أَوَّلُ مَنْ أَحْيَا أَمْرَكَ إِذْ أَمَاتُوهُ، فَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لَا يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ) (المائدة: ٤١) إِلَى قَوْلِهِ (إِنْ أُوتِيتُمْ هَذَا فَخُذُوهُ) (المائدة: ٤١)، يَقُولُ: ائْتُوا مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِنْ أَمَرَكُمْ بِالتَّحْمِيمِ وَالْجَلْدِ فَخُذُوهُ، وَإِنْ أَفْتَاكُمْ بِالرَّجْمِ فَاحْذَرُوا، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) فِي الْكُفَّارِ كُلُّهَا) رواه مسلم

واتە: لە بەرای کوڕی عازەبەوە هاتووە دەڵێ : جوولەکەیەکی دەم وچاورەشکراویان بەلای پێغەمبەردا تێپەڕاند ، پێغەمبەر بانگی کردن و فەرمووی : ئەوە تۆڵەی زینایە لە تەوراتدا؟گوتیان بەڵێ ، جا پێغەمبەر بانگی زانایەکی جوولەکەی کرد فەرمووی تو ئەوخودایەی تەوراتەی بۆ موسی دابەزندوە تۆڵەی زینا ئاوا هاتووە لە کیتابەکەی ئێوە ؟ زانای جوولەکە گوتی : نەخێر ، ئەگەر نەتگوتبایە توخوا پێم نەدەگوتی ، رەجم کردن لە تەواتدا هەیە، بەڵام زینا زۆر بوو لە ناو گەورەکانمان ، ئەگەر گەورەو بەناوبانگەکان گرت بایە لەسەر زینا وازیان لێ دەهێنان ، بەڵام ئەگەر بێهێزەکان گیرابان تۆڵەیان لێ دەکرایەوە ،گوتمان وەرن با رێکەوین لەسەر شتێك لەسەر بەهێز و بێ هێز جێ بەجێ بکرێ ، جا رێکەوتین لەسەر ئەوەی لە جیاتی رەجم دارکاری و دەم وچاوی رەش بکرێ ، جا پێغەمبەر فەرمووی (خودایە من یەکەمم فەرمانی تۆ زیندو دەکەمەوە ئەگەر ئەوان بیمرێنن ،

فەرمانی کرد ئەوەی زینای کردبوو رەجمیان کرد ، جا خوا ئەو ئایەتە دابەزاند (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لَا يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ) تاکو دەگاتە (إِنْ أُوتِيتُمْ هَذَا فَخُذُوهُ) دەڵێ برۆنە لای (محمد) ئەگەر فەرمانی کرد بە دارکاری و دەم وچاو رەش کردن بەقسەی بکەن ، ئەگەر فەرمانی کرد بە رەجم ئاگاداربن وبەقسەی مەکەن ، جا خوا بۆ وەلامدانەوەی ئەو کەسە ئەو ئایەتەی دابەزاند (ئەوەی حوکم بەوەی نەکات کە خوا دابەزاندوە ئەوانە کافرن ، زاڵمن و فاسقن) بۆ کافران گشتیان .

٢-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَنْزَلَ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ وَ أُولَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ وَ أُولَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ قَالَ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ فِي الطَّائِفَتَيْنِ مِنْ الْيَهُودِ وَكَانَتْ إِحْدَاهُمَا قَدْ قَهَرَتْ الْأُخْرَى فِي الْجَاهِلِيَّةِ حَتَّى ارْتَضَوْا أَوْ اصْطَلَحُوا عَلَى أَنَّ كُلَّ قَتِيلٍ قَتَلَهُ الْعَزِيزَةُ مِنْ الذَّلِيلَةِ فَدِيَتُهُ خَمْسُونَ وَسْقًا وَكُلَّ قَتِيلٍ قَتَلَهُ الذَّلِيلَةُ مِنْ الْعَزِيزَةِ فَدِيَتُهُ مِائَةُ وَسْقٍ فَكَانُوا عَلَى ذَلِكَ حَتَّى قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ فَذَلَّتْ الطَّائِفَتَانِ كِلْتَاهُمَا لِمَقْدَمِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيَوْمَئِذٍ لَمْ يَظْهَرْ وَلَمْ يُوطِئْهُمَا عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الصُّلْحِ فَقَتَلَتْ الذَّلِيلَةُ مِنْ الْعَزِيزَةِ قَتِيلًا فَأَرْسَلَتْ الْعَزِيزَةُ إِلَى الذَّلِيلَةِ أَنْ ابْعَثُوا إِلَيْنَا بِمِائَةِ وَسْقٍ فَقَالَتْ الذَّلِيلَةُ وَهَلْ كَانَ هَذَا فِي حَيَّيْنِ قَطُّ دِينُهُمَا وَاحِدٌ وَنَسَبُهُمَا وَاحِدٌ وَبَلَدُهُمَا وَاحِدٌ دِيَةُ بَعْضِهِمْ نِصْفُ دِيَةِ بَعْضٍ إِنَّا إِنَّمَا أَعْطَيْنَاكُمْ هَذَا ضَيْمًا مِنْكُمْ لَنَا وَفَرَقًا مِنْكُمْ فَأَمَّا إِذْ قَدِمَ مُحَمَّدٌ فَلَا نُعْطِيكُمْ ذَلِكَ فَكَادَتْ الْحَرْبُ تَهِيجُ بَيْنَهُمَا ثُمَّ ارْتَضَوْا عَلَى أَنْ يَجْعَلُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ ذَكَرَتْ الْعَزِيزَةُ فَقَالَتْ وَاللَّهِ مَا مُحَمَّدٌ بِمُعْطِيكُمْ مِنْهُمْ ضِعْفَ مَا يُعْطِيهِمْ مِنْكُمْ وَلَقَدْ صَدَقُوا مَا أَعْطَوْنَا هَذَا إِلَّا ضَيْمًا مِنَّا وَقَهْرًا لَهُمْ فَدُسُّوا إِلَى مُحَمَّدٍ مَنْ يَخْبُرُ لَكُمْ رَأْيَهُ إِنْ أَعْطَاكُمْ مَا تُرِيدُونَ حَكَّمْتُمُوهُ وَإِنْ لَمْ يُعْطِكُمْ حَذِرْتُمْ فَلَمْ تُحَكِّمُوهُ فَدَسُّوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَاسًا مِنْ الْمُنَافِقِينَ لِيَخْبُرُوا لَهُمْ رَأْيَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا جَاءَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبَرَ

اللَّهُ رَسُولَهُ بِأَمْرِهِمْ كُلِّهِ وَمَا أَرَادُوا فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لَا يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ مِنْ الَّذِينَ قَالُوا آمَنَّا إِلَى قَوْلِهِ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ ثُمَّ قَالَ فِيهِمَا وَاللَّهِ نَزَلَتْ وَإِيَّاهُمَا عَنَى اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ(رواه احمد ) ٢٢١٢قال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده حسن ، والطبراني قال الالباني صحيح

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ : خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند (ئەوەی حوكم بەوەی نەكات كە خوا دابەزاندوە ئەوانە كافرن و ئەوانە زاڵمن ، ئەوانە فاسقن ) ئیبنو عەبباس دەڵێ خوا ئەم ئایەتانەی دابەزاند بۆ دوو تیرەی جوولەكە ، یەكێكیان زاڵ بوو بەسەر یەكێكیان لە زەمانی نەزانی ، جا صولحیان كرد لەسەر ئەوەی ئەوەی هۆزی (عەزیرە) كوشتویەتی لە هۆزی (زلیلە) خوێنەكەی (٥٠) وەسق بێ (وسق : دەكاتە شێست ساع) ، بەڵام ئەوەی هۆزی (زلیلە) كوشتویەتی (١٠٠) وەسق بێ ، بەم شێوە بوون تاكو پێغەمبەر چووە مەدینە ، جا هەردوو هۆزەكە بێ دەستەڵات بوون بە چوونی پێغەمبەر بۆ مەدینە ، جا هۆزی (زلیلە) یەكێكی كوشت لە (عەزیرە) ناردیانە لای زلیلە گوتیان (١٠٠) بارمان بۆ بنێرن ، زلیلە گوتیان ئایا چۆن دەبێ ئێمە لە یەك گەرەكین و یەك ئایین و یەك ڕەچەلەكین و لەیەك نیشتمانین ، خوێنەی هەندیكمان نیوەی هەندێك بێت ، ئێمە كە ئەو خوێنەمان زیاتر دەدا ئێمە بێ دەستەڵات بووین ، ئێستا (محمد) لێرەیە ئەم خوێنە زۆرە نادەین ، زۆر نەمابوو شەر دەست پێ بكات لە نێوان هەردوكیان ، دوای رازی بوون پێغەمبەر نێوانیان بكات ، جا گوتیان برۆنە لای (محمد ) ئەگەر وای بۆدانان كە داوا دەكەن بیكەنە دادوەر ، ئەگەر وای دانەنا ئاگاداربن ، چەند كەسێكی مونافیقیان نارده لای پێغەمبەر تاكو رای پێغەمبەر بزانن ، جا كە هاتن بۆ لای پێغەمبەر خوا هەواڵی بۆ پێغەمبەر نارد و ئایەتی دابەزاند فەرمووی (ئەی نێرراوی خوا دڵتەنگ مەبە دەربارەی ئەو كەسانەی پێشبڕكێ دەكەن لە كوفر لەو

کەسانەی دەڵێن ئێمە باوەڕدارین تاکو دەڵێ ئەوەی حوکم بەوەی نەکات کە خوا دایبەزاندو ە ئەوانە فاسقن ، دوای گوتی  سوێند بەخوا دەربارەی ئەم دوو  هۆزە دابەزی.

٣-(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: زَنَى رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ فَدَكٍ، فَكَتَبَ أَهْلُ فَدَكٍ إِلَى أُنَاسٍ مِنَ الْيَهُودِ بِالْمَدِينَةِ، أَنْ سَلُوا مُحَمَّدًا عَنْ ذَلِكَ، فَإِنْ أَمَرَكُمْ بِالْجَلْدِ، فَخُذُوهُ عَنْهُ، وَإِنْ أَمَرَكُمْ بِالرَّجْمِ، فَلَا تَأْخُذُوهُ عَنْهُ، فَسَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: (أَرْسِلُوا إِلَيَّ أَعْلَمَ رَجُلَيْنِ فِيكُمْ) ، فَجَاءُوا بِرَجُلٍ أَعْوَرَ يُقَالُ لَهُ ابنُ صُورِيَّا، وَآخَرَ، فَقَالَ لَهُمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَنْتُمَا أَعْلَمُ مَنْ قِبَلَكُمَا؟، فَقَالَا: قَدْ نَحَّانَا قَوْمُنَا لِذَلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَهُمَا: (أَلَيْسَ عِنْدَكُمَا التَّوْرَاةُ فِيهَا حُكْمُ اللَّهِ تَعَالَى؟ ، قَالَا: بَلَى، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَأُنْشِدُكُمْ بَالَّذِي فَلَقَ الْبَحْرَ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ، وَظَلَّلَ عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ، وَأَنْجَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ، وَأَنْزَلَ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ، مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ مِنْ شَأْنِ الرَّجْمِ؟ ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلْآخَرِ: مَا نُشِدْتُ بِمِثْلِهِ قَطُّ، ثُمَّ قَالَا: نَجِدُ تَرْدَادَ النَّظَرِ زَنْيَةً، وَالِاعْتِنَاقَ زَنْيَةً، وَالْقُبَلُ زَنْيَةً، فَإِذَا أَشْهَدَ أَرْبَعَةً أَنَّهُمْ رَأَوْهُ يُبْدِي وَيُعِيدُ كَمَا يَدْخُلُ الْمِيلُ فِي الْمِكْحَلَةِ، فَقَدْ وَجَبَ الرَّجْمُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هُوَ ذَاكَ فَأَمَرَ بِهِ) ، فَرُجِمَ، فَنَزَلَتْ: (فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِنْ تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَنْ يَضُرُّوكَ شَيْئًا وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ) الْآيَةَ ) اخرجه الحميدي في مسنده

٤-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة: (فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ (المائدة)٤٢) قَالَ: فَكَانَ مُخَيَّرًا إِنْ شَاءَ حَكَمَ، وَإِن شَاءَ أَعْرَضَ عَنْهُمْ وَرَدَّهُمْ إِلَى أَحْكَامِهِمْ قَالَ: فَنَزَلَتْ: (وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ (٤٩) المائدة)  قَالَ: فأُمِر أَنْ يَحْكُمَ بَيْنَهُمْ بِمَا فِي كِتَابِنَا) رواه البزار والبيهقي في السنن الكبري

واتە: لەئیبنو عەبباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ : کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ) دادوەری بکە لە نێوانیان یان پشتیان تێبکە ، دەڵێ : پێغەمبەر ئازاد بوو لە دادوەری نێوان ئەهلی کیتاب ئەگەر حەزی کردبایە دادوەری دەکرد ، ئەگەر حەزی نەکردبایە دادوەری بکا پشتی تێدەکردن ، و حەواڵی حوکمی خۆیانی دەکردن ، بەلاَم کاتێ ئەو ئایەتە دابەزی (وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ ) واتە: حوکم بکە لە نێوانیان بەوەی خوا دایبەزاندوە ، وە بە دوای ئارەزووی ئەوان مەکەوە ، دەڵێ ئەمر بە پێغەمبەر کرا دادوەری بکات لە نێوانیان بە قورئانی ئێمە .

**********************

## وتاری ژماره (٣٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٥٤ ) سورەتی** (المائدة)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٥٤﴾المائدة

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە هەر کەس لە ئێوە هەڵ گەڕێتەوە لە ئایینەکەی ئەوە بە زوویی خوا لەباتی ئەوان گەل و کۆمەڵێکی تر ئەهێنێ خوا ئەوانی خۆش ئەوێ و ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێ بەسۆز و بەزەیین بەرانبەر بڕواداران بەهێز و توند بەرانبەر بێ بڕوایان تێکۆشان دەکەن لە ڕێ ی خوادا و ناترسن لە سەرزەنشتی سەرزەنشت کاران ئەوەی باسکرا چاکەو بەهرەی خوایە ئەیبەخشێ بە هەر کەس کە خۆی بیەوێت وە خوا دەستەڵات فراوانی زانایە.(پوختەی تەفسیر)

١- (قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ كَعْبٍ: نَزَلَتْ فِي الْوُلَاةِ مِنْ قُرَيْشٍ، وَقَالَ الْحَسَنُ الْبَصْرِيُّ: نَزَلَتْ فِي أَهْلِ الرِّدَّةِ أَيَّامَ أَبِي بَكْرٍ. (فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ) قَالَ الْحَسَنُ: هو والله أبو بكر وأصحابه، وقال ابن أبي حاتم عن أبي موسى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ) قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هُمْ قَوْمُ هَذَا) تفيسر ابن كثير

واته: موحەممەدی کوڕی کەعب دەڵێ : ئەم ئایەتە دابەزیوە بۆ فەرمانڕەواکانی قوریش ، وە حەسەنی بەصری دەڵێ : ئەم ئایەتە دابەزیوە دەربارەی تاقمی هەڵگەڕاوەکان لە ڕۆژگاری ئەبوبەکر (فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ) حەسەنی بەصری دەڵێ سوێند بەخوا مەبەستی ئەم ئایەتە ئەبوبەکرو هاوەلانیەتی ، ئیبنو ئەبی حاتیم لە ئەبی موسی ئەشعەری دەگێڕێتەوە دەڵێ : کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ) پێغەمبەر فەرموویەتی : ئەوانە قومەی ئەوەن

٢–( عَنِ عياض الأَشْعَرِيِّ. قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هُمْ قَوْمُ هَذَا) أخرجه الحاكم (٢/٣١٣)، وابن أبي شيبة في المصنف (١٢/١٢٥)، وابن سعد في الطبقات (٤/١٠٧)، وابن جرير في "التفسير (٦/١٨٣)، والطبراني في "المعجم الكبير (١٧/٣٧١/١٠١٦) من طرق عن شعبة عن سماك بن حرب عن عياض الأشعري قال:... فذكره. وقال الحاكم: صحيح على شرط مسلم . ووافقه الذهبي.

–( لما نزلت هذه الآية : ( يا أيها الذين آمنوا من يرتد منكم عن دينه فسوف يأتي الله بقوم يحبهم ويحبونه أومأ رسول الله إلى أبي موسى بشيء كان معه فقال : (هم قوم هذا ) السلسلة الصحيحة

٣–(عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَوْلِهِ: (فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ) (المائدة: ٥٤) قَالَ: (هَؤُلَاءِ قَوْمٌ مِنَ الْيَمَنِ، ثُمَّ مِنْ كِنْدَةَ، ثُمَّ مِنَ السَّكُونِ، ثُمَّ مِنْ تُجِيبَ) الحاكم في الاوسط

السكون: هو بنو السكون بن أشرس بن ثور. بطن من كندة من القحطانية. (معجم قبائل العرب القديمة والحديثة ٢/ ٥٢٨) .

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٦٧) سورەتی (المائدة)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٦٧﴾المائدة

واتە: هەرچی لە خواوە هاتووە، دەبێ رابگەیەنرێ: ئەی پەیامبەر! (صلى الله عليه وسلم) هەر فەرمان وبریارێك لەلایەن پەوەردگارتەوە بۆت هاتووە، بێ دوودڵی و ترس لەهیچ کەسێ رایگەیەنە خۆئەگەر وات نەکرد، چاك بزانە کە بەتەواوی پەیامەکەی خوات نەگەیاندووە، خاتوونە عائیشە دەڵێت: ئەگەر پێغەمبەر بیتوانایە ئایەتێك لەقورئان بشارێتەوە، ئەوا ئایەتی: (و تخفي في نفسك ماالله مبديه وتخشي الناس والله أحق أن تخشاه ..) دەشاردەوە. بوخاریی وموسلیم. (والله يعصمك من الناس) دڵنیاشبە خوا لەئازارو پیلانی ئەو خەڵکە دەتپارێزێ، هەر کە بیانەوێ دووچاری بەڵایەکت بکەن، لەوبارەوە خاتوو عائیشە –خوا لێی رازی بێت– دەڵێت: پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) هەمیشە پاسەوانی هەبوو، هەتا ئایەتی (والله يعصمك من الناس )ی بۆهات، ئەوسا فەرمووی: خەڵکینە! ئیتر ئێوە بچن بەلای کارتانەوە، چونکە من خوا دەمپارێزێ. متفق عليه. بێگومان خوای گەورە هیدایەت و رێنوێنی هۆزو گەلی بێ باوەڕان ناکات، بەڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێ کەم و زیاد پڕبەپڕ شەریعەت و بەرنامەکەی خوای گەیاندو هاوەڵانیشی کردەشایەد، لە (حجه الوداع)دا نزیکەی (١٤٤) هەزار کەس لەهاوەڵان گوێ بیستی بوون کە فەرمووی: خەڵکینە! ئێوە کە پرسیاری منتان لێدەکرێت، چ دەڵێن؟ گوتیان: (نَشْهَدُ أنكَ قَدْ بَلّغْتَ وأَدّيْتَ ونَصَحْتَ ). ئەوجا ئەویش پەنجەی بۆ ئاسمان بەرزەوەکرد و فەرمووی: (اللهمّ هَلْ بلغتُ؟ اللهم هل بلغت ) موسلیم (ڕامان)

١-( عن عَائِشَةَ، قَالَتْ: سَهِرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقْدَمَهُ الْمَدِينَةَ، لَيْلَةً، فَقَالَ: (لَيْتَ رَجُلًا صَالِحًا مِنْ أَصْحَابِي يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ) قَالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ سَمِعْنَا خَشْخَشَةَ سِلَاحٍ، فَقَالَ: (مَنْ هَذَا؟) قَالَ: سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا جَاءَ بِكَ؟ قَالَ: وَقَعَ فِي نَفْسِي خَوْفٌ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجِئْتُ أَحْرُسُهُ، فَدَعَا لَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ نَامَ) متفق عيله

واته: له عائیشەوه هاتووه دەڵێ : لـه سـەرەتادا لـه مەدینـه پاسـەوانی دەکرا لـه پێغەمبەر شەوان ، تاکو فەرمووی خۆزگـه ئـەم شـەو پیـاوێکی صـالیح پاسـەوانی دەکردین ، عائیشه دەڵێ :لەو کاتدا گوێمان له دەنگـەدەنگی چـەك بـوو، پێغەمبـەر فەرمووی (تۆ کێی؟) گوتی من سەعدی کوری ئەبی وەقاصـم ، پێغەمبـەر فـەرمووی بۆچی هاتووی ؟ سەعد گوتی : خەمی تۆم بوو هاتۆم پاسەوانیت بکـەم ، پێغەمبـەر دوعای خێری بۆ کرد و ئنجا خەوت .

وفي رواية -( عن عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَهِرَ ذَاتَ لَيْلَةٍ وَهِيَ إِلَى جَنْبِهِ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا شَأْنُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (لَيْتَ رَجُلًا صَالِحًا مِنْ أَصْحَابِي يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ، قَالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعْتُ صَوْتَ السِّلَاحِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ هَذَا؟ )، قَالَ: سَعْدُ بْنُ مَالِكٍ، قَالَ: (مَا جَاءَ بِكَ؟ ، قَالَ جِئْتُ لِأَحْرُسَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَسَمِعْتُ غَطِيطَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي نَوْمِهِ) ابن حبان قال الالباني صحيح (غطيطه) صوت النائم ونفخه.

## چیتر پاسەوانیم لێ مەکەن:

(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحْرَسُ حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنْ النَّاسِ فَأَخْرَجَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأْسَهُ مِنْ الْقُبَّةِ فَقَالَ لَهُمْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ انْصَرِفُوا فَقَدْ عَصَمَنِي اللَّهُ) سنن الترمذي قال الالباني حسن

واتە: لە عائیشەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر پاسەوانی لە خۆ دەگرت تاکو ئەم ئایەتە دابەزی (وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنْ النَّاسِ) واتە : خوا دەتپارێزی لە خەڵکی ، جا پێغەمبەر سەری خۆی لە قوبە دەرهێناو فەرمووی : ئەی خەڵکینە بڕۆن بۆ ماڵی خۆتان بێگومان خوا دەمپارێزی .

-(عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: كَانَ الْعَبَّاسُ عَمُّ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَنْ يَحْرُسُهُ، فَلَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ) (المائدة: ٦٧) تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْحَرَسَ) رواه الطبراني في معجم الاوسط

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە دەڵێ : ئیمامی عەبباسی مامی پێغەمبەر لەو کەسانە بوو کە پاسەوانی دەکرد لە پێغەمبەر ، بەڵام کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ) پێغەمبەر هیچی دیکە پاسەوانی لە خۆی نەکرد.

## بەکردەوە سەلما خوا دەیپارێزی:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا نزل منزلا نظرُوا أعظم شَجَرَة يرونها فجعلوها للنَّبِي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَينزل تحتهَا وَينزل أَصْحَابه بعد ذَلِك فِي ظلّ الشّجر فَبَيْنَمَا هُوَ نَازل تَحت شَجَرَة وَقد علق السَّيْف عَلَيْهَا إِذْ جَاءَ أَعْرَابِي

فَأخذ السَّيْف من الشَّجَرَة ثمَّ دنا من النَّبِي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ نَائِم فأيقظه فَقَالَ يَا مُحَمَّد من يمنعك مني اللَّيْلَة فَقَالَ النَّبِي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الله فَأنْزل الله (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ) الْآيَة.) أخرجه ابن حبان في (صحيحه – ١٧٣٩ موارد) ، وابن مردويه كما في ابن كثير ،و الصحيح المسند في اسباب النزول قال الالباني حسن

واتە: لە ئەبو هوريرەوە هاتووە دەڵێ : ئەگەر پێغەمبەر لە شوێنێك دابەزیبایە لەسەفەران ، هاوەڵانە سەیریان دەكرد كام دار گەورەبایە بۆ پێغەمبەریان دادەنا و لەبن ئەو دارە دەبوو ، هاوەڵانیش لە بن سێبەری دارەكانی دیكە دەبوون ، لەو كاتدا لەبن دارێك بوو ، و شمشێرەكەی هەڵواسی بوو بە دارەكە ، كابرایەكی عەرەبی دەشتەكی دەستی كردە شمشێری پێغەمبەر و لێی نزیك كەوتەوە ، پێغەمبەریش خەوتبوو ، بەخەبەر هات ، كابرا گوتی : ئەی (محمد) ئەم شەو كێ رزگارت دەكات لە دەستم ، پێغەمبەر فەرمووی : خودا رزگارم دەكات ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ) .

**خوێنەری سەنگین ئەم كۆمەڵە زانیاریە بزانە لەم دەقە صەحیحە :**

عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: كُنْتُ مُتَّكِئًا عِنْدَ عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: يَا أَبَا عَائِشَةَ، ثَلَاثٌ مَنْ تَكَلَّمَ بِوَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللهِ الْفِرْيَةَ، قُلْتُ: مَا هُنَّ؟ قَالَتْ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللهِ الْفِرْيَةَ، قَالَ: وَكُنْتُ مُتَّكِئًا فَجَلَسْتُ، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنْظِرِينِي، وَلَا تُعْجِلِينِي، أَلَمْ يَقُلِ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ) (التكوير: ٢٣)، (وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى) (النجم: ١٣)؟ فَقَالَتْ: أَنَا

أَوَّلُ هَذِهِ الْأُمَّةِ سَأَلَ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنَّمَا هُوَ جِبْرِيلُ، لَمْ أَرَهُ عَلَى صُورَتِهِ الَّتِي خُلِقَ عَلَيْهَا غَيْرَ هَاتَيْنِ الْمَرَّتَيْنِ، رَأَيْتُهُ مُنْهَبِطًا مِنَ السَّمَاءِ سَادًّا عِظَمُ خَلْقِهِ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ، فَقَالَتْ: أَوَ لَمْ تَسْمَعْ أَنَّ اللهَ يَقُولُ: (لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ) (الأنعام: ١٠٣)، أَوَ لَمْ تَسْمَعْ أَنَّ اللهَ يَقُولُ: (وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ) (الشورى: ٥١)؟، قَالَتْ: وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَتَمَ شَيْئًا مِنْ كِتَابِ اللهِ، فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللهِ الْفِرْيَةَ، وَاللهُ يَقُولُ: (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ) (المائدة: ٦٧)، قَالَتْ: وَمَنْ زَعَمَ أَنَّهُ يُخْبِرُ بِمَا يَكُونُ فِي غَدٍ، فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللهِ الْفِرْيَةَ، وَاللهُ يَقُولُ: (قُلْ لَا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللهُ) (النمل: ٦٥) صحيح مسلم

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٨٢-٨٣) سورەتی (المائدة)

﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانًا وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ٨٢ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ٨٣ ﴾المائدة

واتە: جوولەکەو موشریك سەر سەختانە دژایەتی موسڵمانان دەکەن: بێگومان جوولەکەو هاوبەشدانەرەکانت دەست دەکەوێت ئەی پێغەمبەر! کەپتر لەهەموو خەڵکانی تر، دژایەتی ئیماندارەکان دەکەن، چونکە دڵیان پڕە لەکینەو رك و ئێرەیی و عینادیی، لە کۆنیشەوە پیشەیان هەرکوشتنی پێغەمبەران و بانگبەرانی

ڕێی هەق بووە و بێگومان دەبینی و بۆت دەرئەکەوێ کە: بەسوێترینی خەڵکانی جیهان بەرامبەر بەوانەی باوەڕیان هێناوە ئەوکەسانەن گوتیان: ئێمە نەساراو یاری عیسـاین، واتـە: ئـەمان لـە یـەهوود زۆر نـزیکترن بەباوەڕدارەکانـەوە لەلایـەنی خۆشەویستیەوە چونکە بڕێکیان قەشەو زانان و خواپەرست و رەبـەن و گۆشـەگیرن و، خۆیـان یـەکلا کردۆتـەوە بـۆ خـوا، هـەردەم ئینجیـل دەخوێننـەوەو، دەزانـن چ راسـتییەکی تێدایـە و فیـزاوی نـین و خـۆ بـەزلزان و دەعیـەباز نـازانین. (تەبـەریی) دەڵێ: ئـەم ئایـەتی ( وإذا سمعوا ..) لـەبارەی (نەجاشـیی) و هاوەڵەکانیـەوە هاتـە خوارێ. سەرنجێك: بەداخەوە خـەڵکێکی زۆر وادەزانـن ئـەم ئایەتـەی: (.. و لتجدن أقربهم مودة للذين آمنوا الذين قالوا إنا نصاري ..) وەسـف و سـەنای (نەسـارا)ی ئێسـتایەو، دەشـکرێ بکرێنـە بـراو دۆسـتی موسـڵمانان، چـونکە (بـەلای ئەوانـەوە) مەسیحیەکان وەك جوولەکە دژایەتی موسڵمانان ناکەن! دیارە ئەمە ڕاو بۆچوونێکی لاوازو هەڵـەو ناتـەواوە، چـونکە قورئـان زۆر بـە توندیی ئاگادارمـان دەکاتـەوە کـە هـەرگیز جوولەکـەو گـاور نەکەینـە دۆسـت ویارمەتیـدەری خۆمـان، وەك خـوا خـۆی دەفـەرموێ: ( يا أيها الذين آمنوا لا تتخذوا اليهود والنصاري أولياء بعضهم أولياء بعض ..) ٥١/٥. یـان دەفـەرموێ: (ولن ترضي عنك اليهود ولا النصاري حتي تتبع ملتهم ..) ١٢٠/٢، وە مێژووی جەنگەکانی خاچپەرستەکان بەڵگەیـەکی دیکەیـە، ئینجـا ئـەم ئایـەتی: (ولتجدن أقربهم مودة للذين آمنوا ..) سـەبارەت بەکۆمـەڵێکی تایبەتی (نەسارا)ی حەبەشە هات، واتە: ئەوانە کە (نەجاشی) ناردنیە لای پەیامبـەر (صـلی اللـە علیـە وسـلم)، جاهەرکـە گەیشـتن، ئـەویش بـڕێ قورئـانی بەسـەردا خوێندنەوە، ئەوانیش خێرا راستیەکانیان سەلماندو، بە کوڵ دەستیان کردە گریان، وەك کۆتایی ئایەتەکەش ئەمە دەسەلمێنێ ودەفەرموێ: (وأنهم لا يستكبرون * وإذا

سمعوا ما أنزل إلي الرسول تري أعينهم تفيض من الدمع مما عرفوا من الحق يقولون ربنا آمنا فاكتبنا مع الشاهدين ).(ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: بَعَثَ النَّجَاشِيُّ وَفْدًا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَرَأَ عَلَيْهِمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْلَمُوا. قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِمْ: (لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا) (المائدة: ٨٢) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ. قَالَ: فَرَجَعُوا إِلَى النَّجَاشِيِّ فَأَخْبَرُوهُ، فَأَسْلَمَ النَّجَاشِيُّ، فَلَمْ يَزَلْ مُسْلِمًا حَتَّى مَاتَ. قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ أَخَاكُمُ النَّجَاشِيَّ قَدْ مَاتَ، فَصَلُّوا عَلَيْهِ) ، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ، وَالنَّجَاشِيُّ بِالْحَبَشَةِ) تفسير الطبري

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە دەڵێ : نەجاشی حەبەشە وەفدێکی نارده لای پێغەمبەر لە مەدینە ، پێغەمبەر چەند ئایەتێك قورئانی بەسەردا خوێندن ، و موسڵمان بوون ، دەڵێ جا خوا ئەم ئایەتەی لەبارەیان ناردە خوارەوە (لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا) دەڵێ کە وەفدەکە گەڕانەوە لای نەجاشی هەواڵەکەیان بۆ گێڕایەوە ، ئەویش موسڵمان بوو ، نەجاشی بە موسڵمانی مایەوە تاکو وەفاتی کرد ، جا ڕۆژێك پێغەمبەر فەرمووی : براتان نەجاشی وەفاتی کردوە وەرن با نوێژی لەسەر بکەین ، پێغەمبەرو هاوەڵان نوێژیان لەسەر کرد لە مەدینە ، ئەویش لە حەبەشە بوو .

هەندێ دەڵێن سورەتی (یس) بەسەردا خوێندوتەوە .

٢-( عن سلمان، رضي الله عنه في إسلامه قال: لما قدم النبي صلى الله عليه وسلم المدينة صنعتُ طعاما، فجئت به النبي صلى الله عليه وسلم فقال: (ما هذا يا سلمان؟ قلت: صدقةٌ، فقال لأصحابه: (كلوا) ، ولم يأكل، ثم إني رجعت حتى جمعت طعاما فأتيته به، فقال: (ما هذا يا سلمان؟ ، قلت: هديةٌ، فضرب بيده فأكل، وقال لأصحابه: (كلوا) قلت: يا رسول الله، أخبرني عن النصارى؟ قال: (لا خيرَ فيهم ولا فيمن أَحَبَّهُم) ، فقمتُ وأنا مُثْقَلٌ، فأنزل الله عز وجل: (لتجدن أشد الناس عداوة للذين آمنوا اليهود والذين أشركوا) (المائدة: ٨٢) ، حتى بلغ: (تفيض من الدمع) (المائدة: ٨٣) ، فأرسل إلي رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال لي: (يا سلمان إن أصحابك هؤلاء الذين ذكر اللهُ ) المعجم الكبير للطبراني (محمود المصري صحيح)

واتـه: لـه سـه‌لمانه‌وه هـاتووه خـوا لێـی رازی بـێ ده‌ڵـێ : كـاتی موسـڵمان بـووم، پێغه‌مبه‌ر هاته مه‌دینه خواردنێكم بۆ دروست كرد بـۆ پێغه‌مبـه‌رم بـرد ، فـه‌رمووی : ئه‌ی سه‌لمان ئه‌وه چییه؟ گوتم ئه‌وه خێره ئه‌ی نێرراوی خوا ، فه‌رموویـه هـاوه‌ڵانی بخۆن به‌ڵام به‌خۆی نه‌یخوارد ، ئـه‌وجار خـواردنێكم كۆكردوه بـۆم بـرد ، فـه‌رمووی ئه‌ی سه‌لمان ئه‌وه چییه؟ گـوتم دیاریـه ، ده‌سـتی خسـته سـه‌ر سـینگم خـواردی و به‌هاوه‌ڵانی فـه‌رموو بیخـۆن ، گـوتم ئـه‌ی نێـرراوی خـوا هـه‌واڵم پـێ بـده ده‌ربـاره‌ی گاوره‌كان فه‌رمووی خێریان پێـوه نیـه، وه‌خێـر بـه‌و كه‌سـانه‌ش وه‌نیـه كـه ئـه‌وانی خۆش ده‌وێن ،منیش هه‌سام ورۆیشتم به‌ڵام ئه‌و قسـه‌م له‌سـه‌ر دڵ گـران بـوو، دوای خـوا ئـه‌م ئایه‌تـه‌ی نـارده خـواره‌وه (لتجدن أشد الناس عداوة للذين آمنوا اليهود والـذين أشـركوا) (المائـدة: ٨٢) ، حتـى بلـغ: (تفـيض مـن الـدمع) (المائـدة: ٨٣) پێغه‌مبه‌ر ناردی به‌دوام فه‌رمووی خوا باسی هاوه‌ڵانی تۆ كردوه له‌م ئایه‌ته‌دا )

تێبینی : مه‌به‌ستی هـاوه‌ڵانی تـۆ واتـه : ئه‌وانـه‌ی باشـه‌كان ، كـاتی خـۆی سـه‌لمان له‌لایان بووه كه كه‌سانی چاك و باش بوینه له‌سه‌ر ئایینی خۆیان .

**وه لەبارەی موسڵمان بوونی ( سلمان )ی فارسی ئەم چیرۆکە خۆشە هەیە :**

(عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِجَفْنَةٍ مِنْ خُبْزٍ وَلَحْمٍ ، فَقَالَ: مَا هَذَا يَا سَلْمَانُ؟ قُلْتُ: صَدَقَةٌ ، فَلَمْ يَأْكُلْ وَقَالَ لِأَصْحَابِهِ: كُلُوا ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِجَفْنَةٍ مِنْ خُبْزٍ وَلَحْمٍ ، فَقَالَ: مَا هَذَا يَا سَلْمَانُ؟ قُلْتُ: هَدِيَّةٌ ، فَأَكَلَ وَقَالَ: إِنَّا نَأْكُلُ الْهَدِيَّةَ ، وَلَا نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا تَقُولُ فِي النَّصَارَى؟ ، قَالَ: يَا سَلْمَانُ لَا خَيْرَ فِي النَّصَارَى وَلَا فِيمَنْ يُحِبُّهُمْ ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ، إِلَّا مَنْ كَانَ عَلَى مِثْلِ دِينِ صَاحِبِكَ . قَالَ: فَعَلِمْتُ أَنَّ صَاحِبِي كَانَ عَلَى دِينِ عِيسَى يَعْنِي الرَّاهِبَ الَّذِي كَانَ مَعَهُ سَلْمَانُ قَالَ الشَّيْخُ: وَفِي حَدِيثِ بُرَيْدَةَ زِيَادَةٌ تَدُلُّ عَلَى كَوْنِ سَلْمَانَ عَبْدًا حِينَ أَهْدَى إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) السنن الكبرى للبيهقي

وفى روايــه(عَنْ أَبِي قُرَّةَ الْكِنْدِيِّ، عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ، قَالَ: كُنْتُ مِنْ أَبْنَاءِ أَسَاوِرَةِ فَارِسَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، قَالَ: فَانْطَلَقْتُ تَرْفَعُنِي أَرْضٌ، وَتَخْفِضُنِي أُخْرَى، حَتَّى مَرَرْتُ عَلَى قَوْمٍ مِنَ الْأَعْرَابِ فَاسْتَعْبَدُونِي فَبَاعُونِي حَتَّى اشْتَرَتْنِي امْرَأَةٌ، فَسَمِعْتُهُمْ يَذْكُرُونَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَ الْعَيْشُ عَزِيزًا، فَقُلْتُ لَهَا: هَبِي لِي يَوْمًا، فَقَالَتْ: نَعَمْ، فَانْطَلَقْتُ فَاحْتَطَبْتُ حَطَبًا، فَبِعْتُهُ فَصَنَعْتُ طَعَامًا، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَضَعْتُهُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقُلْتُ: صَدَقَةٌ، فَقَالَ لِأَصْحَابِهِ: ( كُلُوا ) وَلَمْ يَأْكُلْ، قُلْتُ: هَذِهِ مِنْ عَلَامَاتِهِ، ثُمَّ مَكَثْتُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ أَمْكُثَ، فَقُلْتُ لِمَوْلَاتِي: هَبِي لِي يَوْمًا، قَالَتْ: نَعَمْ، فَانْطَلَقْتُ فَاحْتَطَبْتُ حَطَبًا، فَبِعْتُهُ بِأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَصَنَعْتُ طَعَامًا، فَأَتَيْتُهُ بِهِ وَهُوَ جَالِسٌ بَيْنَ أَصْحَابِهِ، فَوَضَعْتُهُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قُلْتُ: هَدِيَّةٌ، فَوَضَعَ يَدَهُ، وَقَالَ لِأَصْحَابِهِ: خُذُوا بِسْمِ اللهِ ، وَقُمْتُ خَلْفَهُ، فَوَضَعَ رِدَاءَهُ، فَإِذَا خَاتَمُ النُّبُوَّةِ، فَقُلْتُ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ فَقَالَ: وَمَا ذَاكَ؟ فَحَدَّثْتُهُ عَنِ الرَّجُلِ، وَقُلْتُ: أَيَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَإِنَّهُ حَدَّثَنِي أَنَّكَ نَبِيٌّ؟ فَقَالَ: لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا

نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ " فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُ أَخْبَرَنِي أَنَّكَ نَبِيٌّ أَيَدْخُلُ الْجَنَّةَ؟ قَالَ: لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ)رواه احمد قال ارنؤط إسناده محتمل للتحسين

-( عَنِ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فِي قَوْلِهِ: ذَلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ قَالَ: هُمُ النَّجَاشِيُّ الَّذِي أَرْسَلَ بِإِسْلامِهِ وَإِسْلامِ قَوْمِهِ كَانُوا سَبْعِينَ رَجُلا اخْتَارَهُمْ مِنْ قَوْمِهِ الْخَيِّرَ مِنَ الْخَيِّرِ فِي الْفِقْهِ وَالسُّنَنِ، فَلَمَّا أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَدَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَرَأَ عَلَيْهِمْ: يس وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ حَتَّى أَتَى عَلَى آخِرِهَا فَبَكَوْا حِينَ سَمِعُوا الْقُرْآنَ وَعَرَفُوا أَنَّهُ الْحَقُّ فَنَزَلَ عَلَيْهِمْ ذَلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا إِلَى قَوْلِهِ: تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ وَنَزَلَ فِيهِمْ أَيْضًا الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِهِ هُمْ بِهِ يُؤْمِنُونَ إِلَى قَوْلِهِ: أُولَئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا إِلَى آخِرِ الآيَاتِ) اخرجه ابن ابي حاتم

**************************

## وتاری ژماره (٣٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٨٧) سورەتی (المائدة)**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٨٧﴾المائدة

واته: گۆشەگیریی و رەبەنیەت لە ئیسلامدا پەسەند نییە: (بوخاریی) لە (ئیبن عەباس)ەوە– خوا لێیان رازی بێت– دەڵێت: هەندێ لە هاوەڵان، ژنهێنان و گۆشتخواردنیان لەخۆ حەرامکردو، تەنانەتی وتیان: ئامێری پیاوەتیمان دەبڕین و واز لەدنیا دێنین و خۆمان دەکەینە گەڕۆك و سەیاح و، گۆشەگیرو رەبەن، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو فەرمووی ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە ! ئەو شتە پاکانە خوا رەوای داون بۆتان بەناوی زوهدو خواناسییەوە لەخۆتانی حەرام مەکەن لەرادەش تێمەپەڕن و بەسەر سنوورەکانی خوادا دەستدرێژیی مەکەن، چ لەحەڵاڵدا، چ لەحەرامدا، واتە: جل و بەرگی جوان و، خواردن و خەوو ئیسراحەت و، هاوسەریی ژنان لەخۆ حەرام مەکەن، چونکە ڕۆح و چاوو گوێ و، ماڵ و خێزان و میوان و خزمان، هەقیان لەسەرتانەو، دەست هەڵگرتن لەمانە زیادەڕەویی وسنوور بەزانە، دڵنیاشبن خوا خەڵکانی سنوور دەرچووی خۆش ناوێ (ڕامان)

وە ئایەتی دوای ئەم ئایەتە جوان روونی دەکاتەوە چۆن هەڵسوکەوتەکان لەگەڵ نیعمەتەکان بکەین:

﴿وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ٨٨﴾

واتە: بخۆن لەو ڕزق و ڕۆزیانەی کە خوا پێ ی بەخشیوون کە حەڵاڵ و پاکن خۆتان بپارێزن و بترسن لەو خوایەی کە ئێوە باوەڕتان پێ یەتی.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَوْلُهُ: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ الله لكم قَالَ هُمْ رَهْطٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالُوا نَقْطَعُ مَذَاكِيرَنَا وَنَتْرُكُ شَهَوَاتِ الدُّنْيَا وَنَسِيحُ فِي الأَرْضِ كَمَا يَفْعَلُ الرُّهْبَانُ. فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ لَهُمْ فَقَالُوا: نَعَمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأُصَلِّي وَأَنَامُ وَأَنْكِحُ النِّسَاءَ، فَمَنْ أَخَذَ بِسُنَّتِي فَهُوَ مِنِّي وَمَنْ لَمْ يَأْخُذْ بِسُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي) تفسير ابن كثير

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ : ئەو ئایەتە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ الله لكم) دەڵێ ئەوانە کۆمەڵێك بوون لە هاوەڵانی پێغەمبەر گوتیان پیاوەتیمان ناهێڵین ، وخۆشیەکانی دونیا وازلێ دێنین ، سەرهەڵدەگرین دەڕۆین بە زەویدا وەك چۆن راهیبەکان وازیان لە ژن و دونیا هێنا، ئەو قسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ، پێی فەرموون واتان گوتووە ، گوتیان بەڵێ ، پێغەمبەر فەرمووی : بەڵام من بە ڕۆژوو دەبم ، وبەڕۆژووش نابم ، دەخەوم و ژنیش مارە دەکەم ، ئەوەی لەسەر رێبازی من بڕوات لە منە ، ئەوەی لەسەر رێبازی من نەروات لەمن نیە

٢-(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي إِذَا أَصَبْتُ اللَّحْمَ انْتَشَرْتُ لِلنِّسَاءِ وَأَخَذَتْنِي شَهْوَتِي فَحَرَّمْتُ عَلَيَّ اللَّحْمَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمْ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا) الترمذي قال الالباني صحيح

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ: پیاوێك گوتی ئەی نێرراوی خوا، من کاتی دەگەمە گۆشت ئارەزوم بۆ ئافرەتان دەجوڵی، لەبەر ئەوە گۆشتم لە خۆم حەرام کردوە، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمْ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا)

**ئەم دەقەش هەیە دەربارەی شت لە خۆ حەرام کردن:**

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ جَاءَ ثَلَاثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُونَ عن عِبَادَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا فَقَالُوا وَأَيْنَ نَحْنُ مِنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ قَالَ أَحَدُهُمْ أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا وَقَالَ آخَرُ أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلَا أُفْطِرُ وَقَالَ آخَرُ أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلَا أَتَزَوَّجُ أَبَدًا فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِمْ فَقَالَ أَنْتُمْ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ فَمَنْ رَغِبَ عن سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي) متفق عليه

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە خوا لێ ڕازی بێ دەڵێ: سی کەس چوونە ماڵی پێغەمبەر، پرسیاریان کرد لە خواپەرستی پێغەمبەر، کە هەواڵیان پێدرا، گوتیان ئێمە لە کوێ ئەو لە کوێ، لە کاتێکدا خوا لە هەموو گوناحی رابردوو و داهاتووی خۆش بووە، ئەو جا بەم شێوەش خۆی ماندو کردوە و عیبادەتی کردوە، یەکێ لەم سێ کەسانە گوتی: شەوێ هەمووی شەونوێژ دەکەم ناخەوم، یەکێ گوتی: من ڕۆژی هەمووی بە ڕۆژوو دەبم، یەکێ گوتی: منیش ژن ناهێنم، پێغەمبەر فەرمووی: ئایا ئێوە ئەو قسانەتان کردوە، فەرمووی: سوێند بەخوا من لە

هەمووتان زیاتر لە خوا دەترسم، بەتەقواترینتانم ، بەلاَم بەرۆژوو دەبم و بەرۆژووش نابم، شەونوێژ دەکەم دەشخەوم، ئافرەتیش مارە دەکەم، ئەوە رێبازی منە ئەو لێ لابدا، لە من نیە.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٨٩) سورەتی (المائدة)

(لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَٱحْفَظُوٓاْ أَيْمَٰنَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ٨٩)المائدة

واتە: کەفارەت و بارتەقای سوێند: خوا بەسوێندی سەرزارەکیی و بێ مەبەست و بێ نیاز ، وەك بلێیت (نا واللە ، بەلێ واللە) نا تانگرێ و جەزرەبەتان نادا بەلاَم بەو سوێندانە دەتانگرێ و سزاتان دەدا، کە بەدلّ گرێیان دەدەن و لەناخی دلّتانەوەن و نایشیانبەنە سەر جا دەبێ لە کەفارەتی ئەم جۆرە سوێندانەدا خۆراك بە دەکەسی بێ نەواو هەژاربدەن لەو خۆراکە مام ناوەندیە، کە ئێوە رۆژانە بەماڵ و مندالّ و خێزانی خۆتانی دەدەن یان دەبێ دە هەژار پۆشتە بکەن یان دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکەن ئینجا هەرکەسێك ئەوانەی نەبوو، دەبێ سێ رۆژان بە رۆژوو بێ ئەوسێ جۆرەیە باسکران، کەفارەت و تۆلّەی ئەوسوێندانەیە بەئەنقەست خواردوتانن ودەیانشکێنن دەسا سوێندەکانتان راگرن و بیانپارێزن، بەناچاری نەبێت مەیانشکێنن ئا بەوشێوەیە خوا یاساکانی خۆی روونەکاتەوە بۆتان بەشکو سوپاسگوزاری پەروەردگارتان بکەن. تێبینی: مرۆڤ لەوکەفارەتەدا (موخەییەر) و سەرپشکە، هەرکامێکیان هەلّبژێرێ دەتوانێ. پۆشاکیش: ئەوی لەناوخەلّکانی

ماقووڵدا پێی بڵێن (پۆشاك) دەبێ. خۆراكەكەش: یان دەبێ (٦٠٠) گرام بێت، یان دەبێ نرخەكەی بدات، ڕۆژووەكەش: مەرج نیە هەر سێ ڕۆژەكە بەسەریەكەوە بێت (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ﴾ فِي قَوْلِ الرَّجُلِ: لَا وَاللَّهِ وَبَلَى وَاللَّهِ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واتە: لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ : ئەو ئایەتە دابەزیوە ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ﴾ دەربارەی قسەی كەسێك كە دەڵێ نەخێر بەخوا، بەڵێ بەخوا.

٢-(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَ الرَّجُلُ يَقُوتُ أَهْلَهُ قُوتًا فِيهِ سَعَةٌ وَكَانَ الرَّجُلُ يَقُوتُ أَهْلَهُ قُوتًا فِيهِ شِدَّةٌ فَنَزَلَتْ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ ) ابن ماحه قال الالباني صحيح

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێ : هەندێك خێزان خواردنێكی فراوانیان دەدایە ماڵ ومندالیان ، وەهەندێك كەمێك خوارنیان دەدایە ماڵ ومندالّیان، جا بۆ كەفارەتی سوێند خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند فەرمووی خواردنێكی مامناوەند بدەن لە كەفارەتی سوێندەكانتان.

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٩٠ تاکو ٩٣) سورەتی (المائدة)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ٩١ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٩٢ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٩٣﴾

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتـان هێنـاوە بێگومـان ئـارەق و قومـار و ئـەو بەردانـەی کـە کراون بە بت و ئەو پارچە دارانـەی( کـە بەکارئـەهێنرێن بـۆ دیـاری کردنـی بـەش و چارەنووس) ئەوانە پیسن و لە کردەوەی شەیتانن کەواتـە دوور کەونـەوە لـیٚ ی تـا ڕزگـاربن (٩٠) بێگومـان شـەیتان هـەر ئـەوەی ئـەویٚ کـە دوژمنایـەتی و کینـە و ڕق بخاتە ناوتانەوە بەهۆی ئارەق و قومارەوە وە بەرگریتان بکات لە یاد و باسی خوا و لە نوێژ کردن دەی ئایا ئێوە واز دەهێنن(لەو خراپان) ە.(٩١) وە فەرمانبەر و گـویٚ ڕایەڵی خوا بـن وە فەرمانبـەر و گـویٚ ڕایـەڵی نێرراوەکـەی بـن و بترسـن(ئاگـادارین) ئینجا ئەگەر ئێوە ڕوو وەرگێڕن و فەرمان بەری نەکەن ئەوا بـزانن بێگومـان ئـەوەی کــە لەســەر نێردراوەکــەی ئێمــە بــیٚ بــەس ڕاگەیانــدنی ڕوون و ئاشــکرای ئایینەکەیە.(٩٢) نەبووە و نی یە لەسـەر ئەوانـەی کـە بڕوایـان هێنـاوە وە کـردەوە چاکەکانیان کردووە هیچ گوناهێك لەوەی خواردویانە (ئارەق و پـارەی قومـار پـێش حەرام کردنیان) ئەگەر خۆیان پاراستبیٚ (لەو چەرخەدا لەوەی کـە حـەرام بـووە لـە سـەریان) وە بـاوەڕدار بـووبن و کـردەوە چـاکەکانیان کردبـیٚ پاشـان خۆیـان پاراستبیٚ(لەوەی کە حەرام کرابیٚ) و بڕواشیان هەبوبێت(بەوەی کە هاتبیٚ لـە لایـەن

خواوه) پاشان بەردەوام بووبن لەسەر خۆ پارێزی و چاکەکانیشیان بە چاکی کردبێ وە خوا ئەو چاکەکارانەی خۆش دەوێ.(٩٣) (پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

کۆمەڵێك گێرانەوە لەم بارەوە هەن:

١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: إِنَّمَا نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ فِي قَبِيلَتَيْنِ مِنْ قَبَائِلِ الْأَنْصَارِ شَرِبُوا فَلَمَّا ثَمِلَ الْقَوْمُ عَبَثَ بَعْضُهُمْ بِبَعْضٍ ، فَلَمَّا أَنْ صَحَوْا جَعَلَ الرَّجُلُ يَرَى الْأَثَرَ بِوَجْهِهِ وَرَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ ، فَيَقُولُ: صَنَعَ بِي هَذَا أَخِي فُلَانٌ ، وَكَانُوا إِخْوَةً لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ ضَغَائِنُ ، وَاللهِ لَوْ كَانَ بِي رَءُوفًا رَحِيمًا مَا صَنَعَ هَذَا بِي ، حَتَّى وَقَعَتِ الضَّغَائِنُ فِي قُلُوبِهِمْ ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ هَذِهِ الْآيَةَ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ) (المائدة: ٩١)، فَقَالَ نَاسٌ مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ: هِيَ رِجْسٌ ، وَهِيَ فِي بَطْنِ فُلَانٍ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ؟ فَأَنْزَلَ اللهُ سُبْحَانَهُ هَذِهِ الْآيَةَ: (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا) (المائدة: ٩٣) إِلَى قَوْلِهِ: (ثُمَّ اتَّقَوْا وَأَحْسَنُوا وَاللهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) (المائدة: ٩٣) السنن الكبرى للبيهقي (ثمل: سكران ، الضغن : اي الحقد الشديد)

واتە:لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: حەرامکردنی ئارەق دابەزی بۆ دوو هۆزی ئەنصار ، کاتی سەرخۆش بوون هەندێك گاڵتەیان بە هەندێکیان کرد، کاتێ بەهۆش دەهاتنەوە ، دەیانبینی شوێنەواری گاڵتە و شت بەدەم وچاوو ریشیان دەیارە، دەیگوت براکەم فولان کەس وای لێکردوم، ئەوان برابوون رەقیان لەدڵدا نەبوو،

دەیانگوت والله ئەگەر رەحمی هەبوایە وای لە من نەدەکرد، تاکو وای لـیٚ هـات رەق و کینە کەوتە نێوانیان ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزندوفەرمووی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ) جا هەندیٚ کەسی بـە زەحمـەت گوتیان : ئەو ئارەقە پیسە، هەندیٚ موسڵمان لـە شـەری ئوحـد کـوژران لـە زگیـان دابوو لە کاتی مرد، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا ) واتـە: ئەوانـەی ئیمانیـان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردوە، گوناحیان ناگاتیٚ، کاتی خۆی کە هێشتا ئـارەق حەرام نەکرابوو خواردیتیان، ئەگەر بەتەقوا و ئیمانداربن.

٢-( عن أَنَسٍ قَالَ كُنْتُ سَاقِيَ الْقَوْمِ حَيْثُ حُرِّمَتْ الْخَمْرُ فِي مَنْزِلِ أَبِي طَلْحَةَ وَمَا شَرَابُنَا يَوْمَئِذٍ إِلَّا الْفَضِيخُ فَدَخَلَ عَلَيْنَا رَجُلٌ فَقَالَ إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ وَنَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْنَا هَذَا مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (رواه ابوداود) قال الالباني صحيح (القضيخ:عصير العنب)

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە دەڵیٚ : من ئارەقم بۆ کۆمەڵێك دەگێرا کاتیٚ حەرام کـرا، لە ماڵی ئەبی تەلحە ، لەو رۆژدا ئارەقەکەمان لە کوشراوی تەریٚ بوو ، پیاوێك هاتـە ژوریٚ گوتی ئارەق حەرام کراوە، لـەو کاتـەش جارچـی پێغەمبـەر جاریـدا بـە گـوێی خەڵکدا.

٣-( عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كُنْتُ سَاقِيَ الْقَوْمِ يَوْمَ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ فِي بَيْتِ أَبِي طَلْحَةَ، وَمَا شَرَابُهُمْ إِلَّا الْفَضِيخُ: الْبُسْرُ وَالتَّمْرُ، فَإِذَا مُنَادٍ يُنَادِي، فَقَالَ: اخْرُجْ فَانْظُرْ، فَخَرَجْتُ، فَإِذَا مُنَادٍ يُنَادِي: (أَلَا إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ)، قَالَ: فَجَرَتْ فِي سِكَكِ

الْمَدِينَةِ، فَقَالَ لِي أَبُو طَلْحَةَ: اخْرُجْ فَاهْرِقْهَا، فَهَرَقْتُهَا، فَقَالُوا - أَوْ قَالَ بَعْضُهُمْ: - قُتِلَ فُلَانٌ، قُتِلَ فُلَانٌ، وَهِيَ فِي بُطُونِهِمْ، - قَالَ: فَلَا أَدْرِي هُوَ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ -، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ) (المائدة: ٩٣) رواه مسلم

واته: له ئەنەسەوه هاتووه دەڵێ : من ئارەقم بۆ كۆمەلێك دەگێرا كاتێ حەرام كرا، له ماڵی ئەبی تەلحە ، لەو رۆژدا ئارەقەكەمان لـه كوشـراوی خورمـای تـازه وخورمـا بوو ، لەو كاتەش جارچی پێغەمبەر جاریدا گوتی وەردەرێ تەماشا بكـه ، هاتمـه دەرێ ، یـەكێك بـانگی دەكـرد ، دەیگـوت ئاگـاداربن ئـارەق حـەرامكراوه ، ئـارەق دەرۆیشت بەناو كۆلآنـەكانی مەدینـە ، ئـەبو تەلحـە پێـی گـوتم بـرۆ دەرێ بیرێـژه ، منیش رێشتم ، گوتیان فلانه كەسه وفلانەكەس كوژراون ئارەقی له زگیاندایه ، جا ئـەو ئایەتەدابـەزی فـەرمووی : گوناحبـارنین ئـەو ئیماندارنـەی كـردەوەی چـاكیان كردوه ، ئەوەی پێشترخواردیتان ، ئەگەر تەقوایان كردبی ئیمانیان هێنابیێ و كـاری چـاكیان كردبـێ. (واتـه: ئـەوەی پـێش حـەرام بـونی ئـارەق ، ئـارەقی خواربێتـەوه گوناحی ناگاتیێ)

وەبم ریوایەتـەش هـاتووه-( عن أَبِي النُّعْمَانِ قَالَ كُنْتُ سَاقِيَ الْقَوْمِ فِي مَنْزِلِ أَبِي طَلْحَةَ فَنَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ فَأَمَرَ مُنَادِيًا فَنَادَى فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ اخْرُجْ فَانْظُرْ مَا هَذَا الصَّوْتُ قَالَ فَخَرَجْتُ فَقُلْتُ هَذَا مُنَادٍ يُنَادِي أَلَا إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ فَقَالَ لِي اذْهَبْ فَأَهْرِقْهَا قَالَ فَجَرَتْ فِي سِكَكِ الْمَدِينَةِ قَالَ وَكَانَتْ خَمْرُهُمْ يَوْمَئِذٍ الْفَضِيخَ فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ قُتِلَ قَوْمٌ وَهْيَ فِي بُطُونِهِمْ قَالَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا ) رواه البخاري

-( عن أَنَسٍ قَالَ حُرِّمَتْ عَلَيْنَا الْخَمْرُ حِينَ حُرِّمَتْ وَمَا نَجِدُ يَعْنِي بِالْمَدِينَةِ خَمْرَ الْأَعْنَابِ إِلَّا قَلِيلًا وَعَامَّةُ خَمْرِنَا الْبُسْرُ وَالتَّمْرُ ) رواه البخاري

## سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەڵێ (٤) ئایەت دەربارەی من دابەزیون:

( عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ سَعْدٍ، ، قَالَ: أُنْزِلَتْ فِيَّ أَرْبَعُ آيَاتٍ: أَصَبْتُ سَيْفًا، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ نَفِّلْنِيهِ، قَالَ: (ضَعْهُ)، ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَفِّلْنِيهِ، وَاجْعَلْنِي كَمَنْ لَا غَنَاءَ لَهُ، قَالَ: (ضَعْهُ مِنْ حَيْثُ أَخَذْتَ)، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ) (الأنفال: ١) وَصَنَعَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ طَعَامًا، فَدَعَانَا، فَشَرِبْنَا الْخَمْرَ حَتَّى انْتَشَيْنَا، فَتَفَاخَرَتِ الْأَنْصَارُ وَقُرَيْشٌ، فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: نَحْنُ أَفْضَلُ مِنْكُمْ، وَقَالَتْ قُرَيْشٌ: نَحْنُ أَفْضَلُ، فَأَخَذَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ لَحْيَ جَزُورٍ فَضَرَبَ أَنْفَ سَعْدٍ، فَفَزَرَهُ، فَكَانَ أَنْفُ سَعْدٍ مَفْزُورًا، قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) (المائدة: ٩٠) وَقَالَتْ أُمُّ سَعْدٍ: أَلَيْسَ قَدْ أَمَرَ اللَّهُ بِالْبِرِّ، وَاللَّهِ لَا أَطْعَمُ طَعَامًا، وَلَا أَشْرَبُ شَرَابًا حَتَّى أَمُوتَ أَوْ تَكْفُرَ، قَالَ: فَكَانُوا إِذَا أَرَادُوا أَنْ يُطْعِمُوهَا شَجَرُوا فَاهَا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا) (العنكبوت: ٨) الْآيَةُ، قَالَ: وَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا مَرِيضٌ يَعُودُنِي، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: فَبِثُلُثَيْهِ؟ قَالَ: (لَا)، قُلْتُ: فَبِنِصْفِهِ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: فَبِثُلُثِهِ؟ قَالَ: فَسَكَتَ) رواه ابن حبان واحمد قال الالباني صحيح

(معاني الكلمات: ففزره فَكَأَن أَنفه مفزورا أَي: شقَّه ،جزور: البعير ، مفزورا: مشقوقا)

واتە: لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە هاتووە (واتە : سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) ئەویش لەباوکیەوە : واتە سەعد دەڵێ چوار ئایەت دەربارەی من دابەزیون : یەکەم

: لەجەنگدا شمشێرێکم دەست کەوت گوتم ئەی نێرراوی خوا ئەم شمشێرم بدەرێ ، فەرمووی فرێبدە ناو دەستکەوتەکان ، دووبارە داوام کردوە ، دووبارە فەرمووی : لە کوێت هێناوە ببەرەوە ئەوێ ، جائەو ئایەتەدابەزی (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ) (الأنفال: ١) دووەم ئایەت: پیاوێك لە ئەنصاریەکان خواردنێکی دروست کردبوو ، ئێمەی دەعوەت کرد ، ئارەقمان خواردەوە تاکو سەرخۆش بووین ، ئەنصار وقوریش خۆیان بەسەر یەکتر هەڵدەکێشا ، ئەنصارەکان گوتیان ئێمە لە ئێوە بەرێزترین ، قوریشیەکان گوتیان ئێمە چاکترین، پیاوێکی ئەنصار دەستی کردە پارچە هێسکێك لە لوتی سەعدی دا، برینداری کرد ، دەڵێ ئەم ئایەتە دابەزی (إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) ، سێیەم ئایەت : دایکی سەعد گوتی ئەی سەعد ئایا خوا فەرمانی پێ نەکردوی چاکە بکەی لەگەڵ من ، سوێند بەخوا نان و ئاو ناخۆم تاکو پاشگەز نەبیتەوە لە ئیسلام ، دەڵێ : بە زۆر دەمیان لێك دەکردوە خواردنیان دەداێ تاکو نەمرێ ، جا ئەو ئایەتە دابەزی (وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا) (العنكبوت: ٨) ئایەتی چوارەم : سەعد دەڵێ : نەخۆش بووم پێغەمبەر هاتە سەردانم ، گوتم ئەی نێرراوی خوا ئایا ماڵی خۆم هەمووی بکەم خێر؟ فەرمووی نەخێر ، گوتم دوو لەسەر سێی ، فەرمووی نەخێر ، گوتم نیوەی ، فەرمووی نەخێر ، گوتم ئەدی سێیەکی ، ئەوجارە بێ دەنگ بوو. واتە رازی بوو

******************************************

# وتاری ژماره (٤٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠١) سورەتی** (المائدة)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ١٠١﴾المائدة

واته: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە پرسیار مەکەن لە شتانێك ئەگەر ئاشكرا بكرێن بۆتان ناخۆش و خراپ دەبێت بۆتان وە ئەگەر پرسیار بكەن دەربارەیان كاتێ قورئان دەنێررێتە خوارەوە، بۆتان ئاشكرا دەكرێ خوا بووردوە لەو پرسیارانەی لەوەوپێش وە خوا زۆر لێبوردەی لەسەر خۆ و هێدی یە.(پوختەی تەفسیر)

**ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟**

١- (عن أَنَس بْن مَالِكٍ، يَقُولُ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَبِي؟ قَالَ (أَبُوكَ فُلَانٌ). فَنَزَلَتْ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ) (المائدة: ١٠١) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واته : له ئەنسی كوڕی مالیكەوە هاتووە دەڵێ : پیاوێك گوتی ئەی نێرراوی خوا بابی من كێیە؟ ئەویش فەرمووی : بابت فلانە كەسە ، جا ئەو ئایەتە دابەزی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ) واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە پرسیاران لە هەندێ شت مەكەن ، چونكە ئەگەر بۆتان روون بێتەوە زیانتان پێدەگەینی.

٢-(عن أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُطْبَةً مَا سَمِعْتُ مِثْلَهَا قَطُّ قَالَ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا قَالَ فَغَطَّى أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وُجُوهَهُمْ لَهُمْ خَنِينٌ فَقَالَ رَجُلٌ مَنْ أَبِي قَالَ فُلَانٌ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ لَا تَسْأَلُوا عن أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ) رَوَاهُ البخاري

والخنين: نوع من البكاء دون الانتحاب. وهو خروج الصوت من الأنف. (**بەكوردى فنكە فنك**)

٣-(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ كَانَ قَوْمٌ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتِهْزَاءً فَيَقُولُ الرَّجُلُ مَنْ أَبِي وَيَقُولُ الرَّجُلُ تَضِلُّ نَاقَتُهُ أَيْنَ نَاقَتِي فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِمْ هَذِهِ الْآيَةَ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ حَتَّى فَرَغَ مِنْ الْآيَةِ كُلِّهَا( البخاري )معاني الكمات (قوم) أناس من المنافقين واليهود وفي نسخة (ناس). (تسؤكم) لأنها تكشف حالكم

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ : هەندێ کەسی مونافیق مەبەستیان گاڵتە کردن بوو، پرسیاریان دەکرد لە پێغەمبەر دەیانگوت باوکم کێیە؟ وە یەکێ پرسیاری دەکرد وشترم بزر بووە لە کوێیە؟ جا خوا دەربارەی ئەو جۆرە کەسانە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ)

## خوا (٣) شتی پێ ناخۆشە:

(إِنَّ اللَّهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلَاثًا قِيلَ وَقَالَ وَإِضَاعَةَ الْمَالِ وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ)رواه البخاري

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : خوا سێ شتی بۆتان پێی ناخۆشە : گوتە گوت ، ماڵ بەفیرۆدان ، وە زۆر پرسیارکردن لە شتی بێ مانا.

**له گێرانەوەی دیكدا هاتووە :**

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلَاثًا، وَرَضِيَ لَكُمْ ثَلَاثًا: رَضِيَ لَكُمْ أَنْ تَعْبُدُوهُ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا، وَأَنْ تَنْصَحُوا لِوُلَاةِ الْأَمْرِ، وَكَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ)

**رواه احمد قال الالبانی صحيح**

واتە: لەئەبو هوریرەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی خوا سێ شتی پێی ناخۆشە و سێ شتی پێی خۆشە ، ئەوەی پێ خۆشە بیپەرستن و هاوبەشی بۆ بریار مەدەن، وە هەمووتان دەست بە حەبلی خواوە بگرن كە قورئانە ، وە ئامۆژگاری كردنی كاربەدەستان ، ئەو (٣) شتەی پێی ناخۆشە : گۆتی گۆتی ، و ماڵ بەفیرۆدان ، وزۆر پرسیاركردن.

وەبەم ریوایەتەش هاتووە:

(عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الْأُمَّهَاتِ وَوَأْدَ الْبَنَاتِ وَمَنَعَ وَهَاتِ وَكَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ وَإِضَاعَةَ الْمَالِ)

رواه البخاري

معاني الكلمات: (عقوق الأمهات) أصل العقوق القطع أطلق على الإساءة للأم وعدم الإحسان إليها لما في ذلك من قطع حقوقها وخص الأمهات بالذكر وإن كان يستوي في ذلك الآباء والأمهات لأن الجرأة عليهن أكثر في الغالب. (وأد البنات) دفنهن وهن أحياء. (ومنع وهات) منع الواجبات من الحقوق وأخذ ما لا يحل لكم من الأموال أو طلب ما ليس لكم فيه حق

واتە: لە موغیرەی كوری شوعبەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی : بێگومان خوا حەرامی كردوە دایك ئەزیەت بدرێ ، و كچ زیندە بەچاڵ بكرێ و

واجباتیش قەدەغە بکرێ ، وە سێ شتی پێناخۆشە  گۆتی گۆتی ، و ماڵ بەفیرۆدان ، وزۆر پرسیارکردن.

### هەندێ شت باس نەکردن رەحمەتە بۆ ئیمانداران :

(إِنَّ اللَّهَ فَرَضَ فَرَائِضَ فَلَا تُضَيِّعُوهَا وَحَرَّمَ حُرُمَاتٍ فَلَا تَنْتَهِكُوهَا وَحَدَّ حُدُودًا فَلَا تَعْتَدُوهَا وَسَكَتَ عَنْ أَشْيَاءَ مِنْ غَيْرِ نِسْيَانٍ فَلَا تَبْحَثُوا عَنْهَ) رواه دارقطني قال الالباني صحيح في تراجعات الالباني

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : خوا واجبەکانی لەسەرتان داناوە مەیانفوتێنن، وە هەندێ شتی حەرام کردوە پێشێلیان مەکەن، هەندێ سنووری داناوە مەیانبزێنن، وە هەندێ شتی باس نەکردوە خوا لەبیری نەکردوە ، ئێوەش پرسیار مەکەن و لێیان مەکۆڵنەوە.

### ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠٦) سورەتی (المائدة)

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِۚ تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ ثَمَنٗا وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ وَلَا نَكۡتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلۡأٓثِمِينَ ١٠٦)المائدة

واتە: ئەوانەی  باوەڕتان هێناوە هەرکات یەکێکتان مەرگی هات ویستی وەسیەتێ بکا، دەبێ لەکاتی وەسیەتەکەدا دوو کەسی دادگەر لەخۆتان بکاتە شایەد خۆئەگەر چوونە سەفەر و مەرگتان ئەوقە بوو، موسڵمانیشتان دەست نەکەوت، دەتوانن دوو

کەستر لە غەیری خۆتان بکەنە شایەد جائەگەر لەو دوو شایەدە بەد گومان بوون، هەتا دوای نوێژی عەسر هەردوو ڕا گرن، ئەوسا دەبێ سوێندێ بخۆن کە: ئێمە لەبەرهیچ کەسێك دینمان بە هیچ شتێك نا فرۆشین هەر چەندەئەو کەسەکە بە سوێندەکەی ئێمە شتێکی دەستکەوێ خزمیشمان بێت و شایەتی خوایش نەشارینەوە ئەگینە تاوانبارو گوناهبار دەبین(ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَهْمٍ مَعَ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ وَعَدِيِّ بْنِ بَدَّاءٍ فَمَاتَ السَّهْمِيُّ بِأَرْضٍ لَيْسَ بِهَا مُسْلِمٌ فَلَمَّا قَدِمَا بِتَرِكَتِهِ فَقَدُوا جَامًا مِنْ فِضَّةٍ مُخَوَّصًا مِنْ ذَهَبٍ فَأَحْلَفَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ وُجِدَ الْجَامُ بِمَكَّةَ فَقَالُوا ابْتَعْنَاهُ مِنْ تَمِيمٍ وَعَدِيٍّ فَقَامَ رَجُلَانِ مِنْ أَوْلِيَائِهِ فَحَلَفَا لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِنْ شَهَادَتِهِمَا وَإِنَّ الْجَامَ لِصَاحِبِهِمْ قَالَ وَفِيهِمْ نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمْ الْمَوْتُ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ وَأَبُو دَاوُد

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ هاتووە دەڵێ: پیاوێکی لە تیرەی بەنی سەهم لەگەڵ تەمیمی داری و عەدی کوڕی بەدا (ئەو دوو نەفەرە گاور دەبن) دەرچوو بۆ سەفەری بازرگانی ، پیاوە سەهمیەکە مرد لە جێگایەك هیچ موسڵمانی لێ نەبوو ، کاتێ میراتی مردوەکەیان هێنایەوە ، جامێکی زیوی بە زێر چینراو بزردەبێ ، پێغەمبەریش دووکەسە گاورکە (تەمیم وعدی) سوێند دەدات ، دوای جامەکە لە مەککە دۆزرایەوە ، گوتیان ئەم جامەمان کریوە لە (تمیمی داری ) و (عدی) جا دووکەس لە خزمانی مردوکە هەڵسان سوێندیان خوارد ، گوتیان شایەدی ئێمە راسترە لە شایەدی ئەوان ، و جامەکەش هی خزمی خۆمانە

.دەربارەی ئەمانە ئـەو ئایەتـە دابـەزی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمْ الْمَوْتُ)

ئەم دوو نەفەرە پاش مردنی گەنجەکە جامەکە دەدزن و دیفرۆشن .

## ئامۆژگاری عائیشە دەربارەی سورەتی المائدە:

(عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ قَالَ: حَجَجْتُ، فَدَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، فَقَالَتْ لِي: يَا جُبَيْرُ هَلْ تَقْرَأُ الْمَائِدَةَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَتْ: أَمَا إِنَّهَا آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ، فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهَا مِنْ حَلَالٍ، فَاسْتَحِلُّوهُ وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهَا مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ) السنن الكبرى للبيهقي والحاكم

واتە: لە جوبێری کوڕی نەفیرەوە هـاتووە دەڵـێ : فـەریزەی حـەجم ئەنجامـدا ، وە سەردانی عائیشەم کرد خوا لێی ڕازی بـێ ، پێـی گـوتم ئـەی (جـبێر) ئایا سـوڕەتی مائدەت خوێندوە ؟ گوتم بەڵێ ، گوتی : ئەو سورەتە دواهەمین سورەتە دابەزیوە ، ئـەوەی ئـەو سـوڕەتە بـە حـەلاڵی دانـاوە ئێـوەش حـەلاڵی بکـەن، ئـەوەی ئـەو سوڕەتەش حەرامی کردوە ئێوەش حەرامی بکەن.

******************************

## وتاری ژماره (٤١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**سەرەتا : سورەتی (الانعام)**

–له ریزبەندا (٦) سورەته، ژمارەی ئایەتەکانی (١٦٥) ئایەته.

سورەتی (الانعام) سورەتێکی درێژی مەککەیە ، باسی عەقیدەوبیروباوەڕ دەکات ، بەکورتی دەتوانین بلێن ئەم بابەتانەی له خۆ گرتووه ١– بابەتی خواپەرستی ٢– بابەتی وەحی و پەیام ٣–بابەتی زیندوبونەوه و پاداشت .

–ئایا بۆچی ناونراوه (الانعام) ؟ چونکه باسی ئاژەڵان دەکات وه فەرموویەتی

﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبٗا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعۡمِهِمۡ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَاۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمۡ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمۡۗ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ١٣٦﴾ له (صفوت التفاسیر)دا دەڵێ ئبنو عباس دەڵێ ئەم سورەته بەشەو دابەزی بەیەك جاری لەمەککه (٧٠٠٠٠) مەلائیکه تەسبیحاتیان دەکرد(حولها سبعون الف ملك یجأرون بالتسبیح)

(عَن ابْن عَبَّاس قَالَ: نزلت سُورَة الْأَنْعَام بِمَكَّة لَيْلًا جملَة حولهَا سَبْعُونَ ألف ملك يجأرون بالتسبيح) الدر المنثور للسيوطي.

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نَزَلَتْ عَلَيَّ سُورَةُ الْأَنْعَامِ جُمْلَةً وَاحِدَةً يُشَيِّعُهَا سَبْعُونَ أَلْفِ مَلَكٍ لَهُمْ زَجَلٌ بِالتَّسْبِيحِ وَالتَّحْمِيدِ) حيلية الالياء والمعجم الصغير للطبراني

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٦ ) سورەتی ( الانعام )

﴿وَهُمۡ يَنۡهَوۡنَ عَنۡهُ وَيَنۡـَٔوۡنَ عَنۡهُۖ وَإِن يُهۡلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٢٦﴾ الانعام

واتە: ئەوان بەرگری (خەڵك) ئەكەن لەو (قورئانە) و خۆشیان لیّ ی دوور دەكەنەوە هیچ كەسیش لە ناو نابەن خۆیان نەبیّ و هەستیش ناكەن.

١- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فِي قَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ (وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ، وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ) (الأنعام: ٢٦) قَالَ: نَزَلَتْ فِي أَبِي طَالِبٍ كَانَ يَنْهَى الْمُشْرِكِينَ أَنْ يُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَيَتَبَاعَدُ عَمَّا جَاءَ بِهِ) الحاكم

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە خوا لەخۆی وبابی رازی بیّ ، دەڵیّ قسەی خوا كە فەرموویەتی (وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ، وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ) دابەزیوە دەربارەی (ئەبی تالیب) رێگری دەكرد موشریكان ئازاری پێغەمبەر بدەن ، بەلاّم خۆشی دوور دەكەوتەوە لە ئیسلام.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٥١+٥٢ ) سورەتی ( الانعام )

﴿وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ٥١ وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ مَا عَلَيۡكَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَمَا مِنۡ حِسَابِكَ عَلَيۡهِم مِّن شَيۡءٖ فَتَطۡرُدَهُمۡ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥٢﴾ الانعام

واتە: تۆ بەم قورئانە ئەوكەسانە بترسێنە كە دەترسن رۆژێك پێشبێت لای پەروەردگاریان كۆبكرێنە ودەشزانن كەجگە لەویش هیچ دۆست و یارمەتیدەرو تكاكارێكیان نیە بەشكو 'لەم دنیایەدا لە خوا بترسن و، كارێكی باش بكەن بۆ

قیامەتیان . هاوبەشدانەرەکان – وەکو(ئیبن ماجە و ئیبن جەریر)دەڵێن– ئەو دەمە کە (سوهەیب وعەممارو بیلال و خەبباب)، و دەستەیەکی تر لەموسـڵمانە بـێ نـەواو هەژارەکان ، لە دانیشتنەکانی پێغەمبەردا(صلی اللە علیـە وسـلم) ئامـادە دەبـوون، وتیان: دەبێ تۆ ئەوانە لەخۆت دوور بخەیتەوەو نەێنە لات، ئەوجار ئێمـە دێینـە لات و شوێنیشت دەکەوین ! ئیتر ئەم ئایەتە هات و فەرمووی(**وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥ.....**) واتە: تۆهەرگیز ئەوکەسانە تارمەنێ کەبە بـەیانیان و ئێـواران یـادی پـەروەردگاریان دەکـەن و بـەدڵ و دەروونـیش هـەر رەزامەندی ئەویان ئەوێ چونکە تۆ هیچ کارت بەکاری ئەوانەوە نییە وما من حسابك علـیهم مـن شـئ و ئـەوانیش هـیچ کارێکیـان بەسـەر تـۆوە نییـە، بـەڵکو حیسـابی هەردوولاتان لای خوایە تاریان مەنێ بانەچیتە ریـزی سـتەمکارانەوە. لـەم ئایەتـەدا خوای گەورە ومیهرەبان رێ لـە پەیامبـەر(صـلی اللـە علیـە وسـلم) دەگـرێ کـە ئـەو موسڵمانە کزو لاوازانە (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَن سعد قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سِتَّةَ نَفَرٍ فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسلم: اطرد هَؤُلَاءِ لَا يجترؤون عَلَيْنَا. قَالَ: وَكُنْتُ أَنَا وَابْنُ مَسْعُودٍ وَرَجُلٌ مِنْ هُذَيْلٍ وَبِلَالٌ وَرَجُلَانِ لَسْتُ أُسَمِّيهِمَا فَوَقَعَ فِي نَفْسِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقَعَ فَحَدَّثَ نَفْسَهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ) رَوَاهُ مُسلم

واتـە: لە سەعدەوە هاتووە دەڵێ: ئێمە شەش کەس بووین لە خزمەت پێغەمبـەردا ، موشریکان گوتیانە پێغەمبەر ئەوانە لای خـۆت دەرکـە چـونکە ئەوانـە هـی ئـەوەنین

لەمەجلیس ئێمە دانیشن سەعد دەڵێ ئەو شەش کەس (من و عبدالله کوری مەسعود و پیاوێك بوو لە تیرەی هوزیل و بیلال و دوو پیاو ناویانم لەبیر نیە، جا شتێك دروست بوو لە دڵی پێغەمبەر ، جا خوا ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ واتە : (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار) نەکەیت ئەوانە دەربکەیت (لە مزگەوت و کۆڕی خواناسین) کە لە بەیانیان و ئێواراندا لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و (دەیپەرستن) مەبەستیشیان تەنها ڕەزامەندی ئەوە، حساب و لێپرسینەوەی هیچ شتێکی ئەوان لەسەر تۆ نیە و حساب و لێپرسینەوەی هیچ شتێکی تۆیش لەسەر ئەوان نیە، دەرکردنی تۆ بۆ ئەو موسڵمانانە دەبێتە هۆی ئەوەی تۆ بچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە.

٢-( عَنْ خَبَّابٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى وَلَا تَطْرُدْ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ إِلَى قَوْلِهِ فَتَكُونَ مِنْ الظَّالِمِينَ قَالَ جَاءَ الْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ وَعُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنٍ الْفَزَارِيُّ فَوَجَدَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَ صُهَيْبٍ وَبِلَالٍ وَعَمَّارٍ وَخَبَّابٍ قَاعِدًا فِي نَاسٍ مِنْ الضُّعَفَاءِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ فَلَمَّا رَأَوْهُمْ حَوْلَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَقَرُوهُمْ فَأَتَوْهُ فَخَلَوْا بِهِ وَقَالُوا إِنَّا نُرِيدُ أَنْ تَجْعَلَ لَنَا مِنْكَ مَجْلِسًا تَعْرِفُ لَنَا بِهِ الْعَرَبُ فَضْلَنَا فَإِنَّ وُفُودَ الْعَرَبِ تَأْتِيكَ فَنَسْتَحْيِي أَنْ تَرَانَا الْعَرَبُ مَعَ هَذِهِ الْأَعْبُدِ فَإِذَا نَحْنُ جِئْنَاكَ فَأَقِمْهُمْ عَنْكَ فَإِذَا نَحْنُ فَرَغْنَا فَاقْعُدْ مَعَهُمْ إِنْ شِئْتَ قَالَ نَعَمْ قَالُوا فَاكْتُبْ لَنَا عَلَيْكَ كِتَابًا قَالَ فَدَعَا بِصَحِيفَةٍ وَدَعَا عَلِيًّا لِيَكْتُبَ وَنَحْنُ قُعُودٌ فِي نَاحِيَةٍ فَنَزَلَ جِبْرَائِيلُ عَلَيْهِ السَّلَام فَقَالَ وَلَا تَطْرُدْ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِمْ مِنْ شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنْ الظَّالِمِينَ ثُمَّ ذَكَرَ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ وَعُيَيْنَةَ بْنَ حِصْنٍ فَقَالَ وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لِيَقُولُوا أَهَؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ بَيْنِنَا أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ثُمَّ قَالَ وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا فَقُلْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ قَالَ فَدَنَوْنَا مِنْهُ حَتَّى وَضَعْنَا

رُكَبَنَا عَلَى رُكْبَتِهِ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَجْلِسُ مَعَنَا فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ قَامَ وَتَرَكَنَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ وَلَا تُجَالِسْ الْأَشْرَافَ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا يَعْنِي عُيَيْنَةَ وَالْأَقْرَعَ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا قَالَ هَلَاكًا قَالَ أَمْرُ عُيَيْنَةَ وَالْأَقْرَعِ ثُمَّ ضَرَبَ لَهُمْ مَثَلَ الرَّجُلَيْنِ وَمَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا قَالَ خَبَّابٌ فَكُنَّا نَقْعُدُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا بَلَغْنَا السَّاعَةَ الَّتِي يَقُومُ فِيهَا قُمْنَا وَتَرَكْنَاهُ حَتَّى يَقُومَ) سنن ابن ماجه قال الالباني صحيح

واته:له خەببابەوە هاتووە دەڵێ : قسەی خوای بەرز (وَلَا تَطْرُدْ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ) تاكو دەگاتە (فَتَكُونَ مِنْ الظَّالِمِينَ) دەڵێ : ئەقرەعی كوڕی حابیسی تەمیمی و عویەینەی كوڕی حیصینی فەراری بینیان پێغەمبەر لەگەڵ (صوهیب و عەممار وخەبباب دانیشتوە ، لەناو خەڵكێكی لاواز و هەژار لە موسڵمانان ، كاتێك ئەمانەیان بینین لە دەوری پێغەمبەر ، بەچاوی سووك سەیریان كردن ، (ئەقرەع و عویەینە) گوتیانە پێغەمبەر تۆ بۆ ئێمە كۆڕو مەجلیسێكی تایبەت دانێ ، چونكە عەرەب فەزل و گەورەیی ئێمە دەزانن ، شەرەم دەكەین لەگەڵ ئەم عەبدانە دانیشین ،جا ئەگەر ئێمە هاتینە لای تۆ با ئەوان بڕۆن لە مەجلیسەكە، كە ئێمە رۆیشتین بائەوان بێنەوە لەگەڵت دانیشن ، پێغەمبەر فەرمووی باشە ، ئەوانیش گوتیان نوسراوێكمان بۆ بنوسە ، خەباب دەڵێ : پێغەمبەر داوای پەڕاوی كرد و بانگی (علی) كرد بنوسێ ، ئێمەش لەلایەكی مەجلیسەكە دانیشتبوین ، لەوكاتدا جوبرائیل دابەزی سەلامی خوا لەسەربێ ، گوتی (وَلَا تَطْرُدْ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِمْ مِنْ شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنْ الظَّالِمِينَ) دوای بۆ ئەقرەع و عویەیینەی باس كرد ، گوتی (وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لِيَقُولُوا أَهَؤُلَاءِ

مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ بَيْنِنَا أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ (٥٣) الانعام) واتـه: وه بـهو جۆره هەندێكيانمان به هەندێكی تريان تاقی كردەوه بۆ ئەوەی بڵێن ئايا ئەوانه خوا ڕێز و بەهرەی پێ بەخشيوون له ناو ئێمەدا ؟ ئايا خوا لـه هـەموو كـەس زانـاتر نی يه بەوانەی شوكرانه بژێرن

دوای گـوتی (وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا فَقُلْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ.....(٥٤) الانعام)) واته: وه كاتێ ئەوانەی كـه بڕوايـان هەيـه بـه ئايەتـەكانی ئێمـه هـاتن بـۆ لات ئـەوه پێيـان بڵـێ سـڵاوتان لـێ بـێ پـەروەردگارتان بـەزەيی و ميهرەبانی لەسەر خۆی پێويست كردووه

خەباب دەڵێ : ئێمه نزيك بوينەوه له پێغەمبەر تاكو ڕانەمان لەسەر ڕانەكانی دانـا ، پێغەمبەر له مەجليس لەگەلمان دانيشت ، ئەگەر ويستابی هەڵسێ و جێمان بهێڵێ ، خـوا ئـەم ئايەتـەی دابەزانـد (وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ٢٨) واتـه: خۆت ڕاگره لەگەڵ ئەوانەی له پەروەردگاريان دەپاڕێنەوه (و دەيپەرستن) بـەيانيان و ئێواران كه مەبەستيان ڕەزامەندی خوايه چاوەكانت لـەوان لامـەده و وەرمـەگێڕه (بۆ كەسانی بێ باوەڕی دەوڵەمەند) كه جوانی و ڕازاوەيی ژيانی ئەم دنيای دەوێـت و بەگوێی كەسێك مەكه كه دڵيمان له يادی خۆمان بێ ئاگا كردووه و شوێنی هـەواو ئارەزووی خۆی كەوتووه هەموو كارەكانی خراپ و له سنوور دەرچووه.

واته: لەگەڵ ئەو گەورانه دامەنيشه كه دونيـا ويسـتن ، بەقسـەی ئەوانـه مەكـه كـه دڵيان قوفڵ دراوه له يادی خوا ، واته (عويەيينـه وئـەقرەع) ، وه بـەدوای ئـارەزوی خۆيـان كـەوتوون ، فـەرمووی : تياچـووينه كـاری عويەيينــه و ئـەقرەع ، دوای نموونەی بۆ هێنانەوه ، نموونـەی دوو پيـاو ژيـانی دونيـا ، (خـەباب) دەڵـێ : ئێمـه

دادەنیشتین لەگەڵ پێغەمبەردا ، تاکو کاتی  هەڵسان ، خۆمان هەڵدەستاین ئـەوجا پێغەمبەر هەڵدەستا.

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی  ( ٩١ ) سورەتی ( الانعام )

﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ٩١﴾ الانعام

واتە: (جوولەکە)وەك پێویست رێزیان لەخوا نەگرت ونەیانناسی کاتیَ گوتیـان: خـوا هـیچ نامـەو وەحێکـی بـۆ هـیچ ئادەمییـەك نـەناردووە! دیـارە ئـەم عینــادیی و ئێرەییەیان ، تەنیا لە ڕقی قورئاندایـە، بۆیـە ئینکـاری هـەموو وەحیـی و سروشـێك دەکەن بە (تەورات)ـەکەی خۆشیانەوە پێیان بڵێ: باشە! ئـەو نامـەی (تـەورات)ـە مووسا هێنای کـێ دایبەزانـد کەبوویـە ڕووناکیی و، ڕێنمـایی بـۆ مـەردم؟ کـە ئێـوە ئێستا لەنوسخە ڕەسەنەکەی پەڕە پەڕەی دەکەن بەشێکی کـەمی کـە بـەقازانجتان بێ بۆ خەڵکی دەردەخەن و، باسی دەکەن و، زۆرێکیشی کە بەزیانی خۆتـانی بـزانن ئەیشارنەوە، وەك ئەو پەسن و سیفەتە جوانانەی سەبارەت بەپەیامبەر (صـلی اللـه علیە وسلم) لە تەوراتدا هاتوون و باشە ئەگەر خوا هـیچ نامەیـەکی نـەناردووە! ئـەو هەواڵانـە کـە لـەم قورئانـەدا بـەئێوە ڕاگەیـەنرا کەنـە خۆتـان و، نـە باوباپیرانتـان دەتانزانین کێ فێری کردن؟ دەسا بڵێ: هەر خوایگەورەبوو ئەو قورئانەی نارد ئـیتر وازیان لێ بێنە باهـەر بەقسـەی نابـەجێی خۆیانـەوە سـەرقاڵبن وگاڵتـەو مەسـخەرە بکەن، ئەوسا چاك دەزانن (رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١–( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: قَوْلَهُ: إِذْ قَالُوا مَا أَنْـزَلَ اللَّهُ عَلَى بَشَـرٍ مِنْ شَـيْءٍ يَعْنِي مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، قَالَتِ الْيَهُودُ: أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ كِتَابًا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالُوا: وَاللَّهِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ كِتَابًا. فَأَنْزَلَ اللَّهُ: قُلْ يَا مُحَمَّدُ: مَنْ أَنْـزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَى نُورًا وَهُدًى لِلنَّاسِ) تفسير ابن ابي حاتم والطبري في (جامع البيان)

واتە: لەئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : قسەی خوا کە دەفەرموێ (إِذْ قَالُوا مَا أَنْـزَلَ اللَّهُ عَلَى بَشَرٍ مِنْ شَيْءٍ) مەبەستی نـەوەی ئیسـرائیلە، جوولەکـە گوتیانـە پێغەمبـەر کیتابەکەت بۆ دابەزیوە؟ ، ئەویش فەرمووی بەڵێ ، گوتیان سوێند بـەخوا ، خـوا هیچ پەڕتووکێ دانەبەزیوە لە ئاسمان ، جا ئایەتی نـاردە خـوارەوە فـەرمووی ئـەی (محمد) :بلێ کێ ئەو کیتابەی بۆ (موسی) دابەزاندوە روناکی و هیدایەتی تێدایە بۆ خەڵکی .

٢–( عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: جَاءَ حَبْـرٌ مِنَ الْيَهُـودِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أُصْبُعٍ وَالْأَرَضِينَ عَلَى أُصْبُعٍ وَالْجِبَالَ وَالشَّجَرَ عَلَى أُصْبُعٍ وَالْمَاءَ وَالثَّرَى عَلَى أُصْبُعٍ وَسَائِرَ الْخَلْقِ على أصبع ثُمَّ يَهُزُّهُنَّ فَيَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَنَا اللَّهُ. فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَعَجُّبًا مِمَّا قَالَ الْحَبْرُ تَصْدِيقًا لَهُ. ثُمَّ قَرَأَ: (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يشركُونَ) مُتَّفق عَلَيْهِ

واتە: لە عەبدولاَی کوڕی مەسعودەوە هاتووە دەڵێ : زانایـەکی جوولەکـە هاتـە لای پێغەمبەر ، گوتی ئەی (محمد) بێگومان خوا لە ڕۆژی قیامەت ئاسمانـەکان بـە یـەك پەنجــە رادەگــرێ ، وە زەویــش لەســەر پەنجەیــەك رادەگــرێ ، وە چــیاكان و درەختەكان لەسەر پەنجەك ، وئاو و خۆلیش لەسەر پەنجەك ، وە دروسـتکراوەکانی

دیکـەش هـەمووی لەسـەر پەنجەیـەك رادەگـرێ ، دەیـانجولێنێ و دەفـەرمووی مـن پاشـام و مـن خـودام، پێغەمبـەر پێکـەنی بەقسـەی ئـەو زانـا جوولەکەیـە ، وەك پشتگیری قسەکەی وبەراست دانانی ، جا ئەو ئایەتەی خوێندوە (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يشركُونَ) واتە: جوولەکە وەکو پێویست قەدروڕێزی خوایان نەگرتووە ......)

تێبینی : ئەم سورەتە لە یەك شەو لەیەك كاتـدا دابـەزیوە ، ئـەدی بۆچـی هۆکـاری دابـەزینی هەیـە؟ وەلاّم : چـونکە خـوا وەلاّمـی هـەموو پرسـیارەکانی ئـەو کـاتی داوەتەوە بەهۆی دابەزینی ئەم سورەتە.

## وەك پێویست عیبادەتی خوامان نەکردوە:

( عن سلمان رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال يوضع الميزان يوم القيامة فلو وزن فيه السموات والأرض لوسعت فتقول الملائكة يا رب لمن يزن هذا فيقول الله لمن شئت من خلقي فيقولون سبحانك ما عبدناك حق عبادتك) رواه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم قال الالباني صحيح لغيره

واتە : لە سەلمانەوە هاتووە خوا لیّ رازی بیّ دەڵێ : پێغەمبـەر فـەرمووی : ڕۆژی قیامەت (تەرازوو) دادەنرێت ئەگەر هەموو ئاسمانـەکان و زەوی لەسـەر دابنرێـت جێگای دەبێتەوە ، فریشتـەکان دەڵێن خوایە کێی پیّ دەکشرێت؟ خوا دەفەرمووی ئەوەی حەز بکەم لە دروستکراوەکانم ، جا فریشـتەکان دەڵـێن خودایـە بەراسـتی ئێمە وەکو ئەوەی شایەنی تۆیە عیبادەتی تۆمان نەکردوە ) بەرێزان فریشتە هەیـە لەوەتەی خوا دروستی کردوە ، بەردەوام سەری لە سـوجدەدایە ، ئنجـا دەڵـیّ خـوا وەکو پێویست تۆمان نەپەرستووە ، ئەدی ئێمەی گوناحبار ئەبیّ چی بڵێن ؟

لەم گێرانەوەدا هاتووە : ( عَنْ سَلْمَانَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: يُوضَعُ الْمِيزَانُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَلَوْ وُزِنَ فِيهِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ لَوَسِعَتْ، فَتَقُولُ الْمَلَائِكَةُ: يَا رَبِّ لِمَنْ يَزِنُ هَذَا؟ فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: لِمَنْ شِئْتُ مِنْ خَلْقِي، فَتَقُولُ الْمَلَائِكَةُ: سُبْحَانَكَ مَا عَبَدْنَاكَ حَقَّ عِبَادَتِكَ، وَيُوضَعُ الصِّرَاطُ مِثْلَ حَدَّ الْمُوسَى فَتَقُولُ الْمَلَائِكَةُ: مَنْ تُجِيزُ عَلَى هَذَا؟ فَيَقُولُ: مَنْ شِئْتُ مِنْ خَلْقِي، فَيَقُولُ: سُبْحَانَكَ مَا عَبَدْنَاكَ حَقَّ عِبَادَتِكَ) رواه الحاكم قال الالباني صحيح

واتە : لە سەلمانەوە هاتووە خوا لێ رازی بێ دەڵێ : پێغەمبەر فەرمووی : ڕۆژی قیامەت (تەرازوو) دادەنرێت ئەگەر هەموو ئاسمانەکان و زەوی لەسەر دابنرێت جێگای دەبێتەوە ، فریشتەکان دەڵێن خوایە کێی پێ دەکشرێت؟ خوا دەفەرمووی ئەوەی حەز بکەم لە دروستکراوەکانم ، جا فریشتەکان دەڵێن خودایە بەراستی ئێمە وەکو ئەوەی شایەنی تۆیە عیبادەتی تۆمان نەکردوە، وەهەروەها (پردی سرات) رادەنوێردرێت وەکو موس تیژە ، فریشتەکان دەڵێن کێ دەپەڕێتەوە لەسەر ئەم پردە؟ خوا دەفەرمووی : کێ حەز بکەم لە دروستکراوەکانم ، جا فریشتەکان دەڵێن خودایە بەراستی ئێمە وەکو ئەوەی شایەنی تۆیە عیبادەتی تۆمان نەکردوە.

–لە ڕۆژی قیامەت مرۆڤی گەورە هەیە دەیکێشن بەلاّم قورسای بەقەدەر باڵە پێشکە نیە، لەبەر بێ دینی ، وەك لەم دەقەدا هاتووە:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يَزِنُ عندَ الله جَناحَ بعوضة) وَقَالَ: اقرؤوا (فَلَا نُقِيمُ لَهُم يومَ القيامةِ وَزْناً) مُتَّفق عَلَيْهِ

واتە: لە ئـەبی هـوریرەوە هـاتووە دەڵـێ : پێغەمبـەر فەرموویـەتی : رۆژی قیامـەت پیاوێکی گەورەی قەڵەو دێنن ، لـەلای خـوا وەزنـی بـە ئەنـدازەی باڵـە پێشـەکەیەك نیە، وە فەرمووی ئەگەر حەزدەکەن چاکتر بـزانن ئـەم ئایەتـە بخوێنـەوە (فَلَا نُقِيمُ لَهُم يومَ القيامةِ وَزْناً) واتە : رۆژی قیامەت هیچ قورسایان نیە .

پرسیار ئایا ڕۆژی قیامەت کردەوەکان دەکێشرێن یان مرۆڤەکان؟

وەڵام : هەردووکیـان هەم کردەوەکان هەم مرۆڤەکان دەکێشرێن.

## پیاوێك ڕۆژی قیامەت لاقەکانی لە چیای ئوحد قورسترە:

(عن عَلِيّ، يَقُولُ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ابْنَ مَسْعُودٍ أَنْ يَصْعَدَ شَجَرَةً فَيَأْتِيَهُ بِشَيْءٍ مِنْهَا، فَنَظَرَ أَصْحَابُهُ إِلَى حُمُوشَةِ سَاقَيْهِ فَضَحِكُوا مِنْهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا يُضْحِكُكُمْ؟ لَرِجْلُ عَبْدِ اللَّهِ فِي الْمِيزَانِ أَثْقَلُ مِنْ أُحُدٍ) ابن ابي شيبة

واتە: ڕۆژێك پێغەمبەر (عبدالله کوڕی مسعود) دەنێرێتە سەردارێك تاکو سیواکی بـۆ بکات ، لەوکاتدا بایەکی بەهێز هەڵدەکا ، عەبدولآ دەچی ودێ چونکە قاچی باریـك و لاواز بوون ، بۆیە هاوەڵان پێدەکەنن ، پێغەمبەر فەرمووی ئەوە بـە لاقـە لاوازاکـانی عەبـدولآ پێدەکـەنن ، ئـەم دوو لاقـەی عەبـدولآ لـە ڕۆژی قیامـەت لـە کێـوی ئوحـد قورسترن لەلای خوا.

**زیكرێك هەیە لەسەر میزان قورسە :**

پێغەمبەر فەرموویەتی (كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ) رواه ابن ماجه قال الالباني صحيح

دیارە پاش سووتان لە ئاگر ئەوەی بەئەندازەی دەنكە جۆیەك قورسای چاكەی هەبێ دەچێتە بەهەشت :

(عن أنَس بْن مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فَيَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِنْ الْخَيْرِ مَا يَزِنُ شَعِيرَةً ثُمَّ يَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِنْ الْخَيْرِ مَا يَزِنُ بُرَّةً ثُمَّ يَخْرُجُ مِنْ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِنْ الْخَيْرِ مَا يَزِنُ ذَرَّةً (رواه احمد): ١٢١٧٤ (شعيب): إسناده صحيح على شرط الشيخين

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە دەڵێ: لە ئاگر دێتە دەرەوە ئەوەی گوتویەتی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) وە لە دڵیدا هەبێ قورسایی بە ئەندازەی دەنكە جۆیەك ، لە پاشان دێتە دەر لە ئاگر ئەوەی گوتویەتی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) وە لە دڵیدا هەبێ بە ئەندازەی گەریلەیەك خێر و ئیمان.

*************************

## وتاری ژماره (٤٢) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١١٨ تاکو ١٢١) سورەتی (الانعام)

﴿فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَـٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ١١٨ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ١١٩ وَذَرُوا۟ ظَـٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْسِبُونَ ٱلْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا۟ يَقْتَرِفُونَ ١٢٠ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ١٢١﴾ الانعام

واتە: دەسا ئێوە ئەی موسڵمانان! لە گۆشتی ئەو ئاژەڵانە بخۆن کە لە کاتی سەر بڕینیاندا ناوی خوایان لە سەرهێنراوە ئەگەر راستە بڕواتان بە ئایەت و بەڵگەکانی خواهەیە، واتە: لەو حەیوانانە مەخۆن کە: یان مردارەوە بوون ، یان بۆغەیری خوا سەربڕاون(١١٨)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَتَى أُنَاسٌ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَأْكُلُ مَا نَقْتُلُ وَلَا نَأْكُلُ مَا يَقْتُلُ اللَّهُ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كُنْتُمْ بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ﴾ (الأنعام: ١١٨)– إِلَى قَوْلِهِ – ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ (الأنعام: ١٢١) (الترمذي) قال الألباني : صحيح

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : کۆمەڵێك لە خەڵکی هاتنە لای پێغەمبەر گوتیان ئەوەی ئێمە دەیکوژین (سەری دەبڕین ) حەلاڵە بەلاّم ئەوەی خوا دەیکوژی (دەمرێ ) حەرامە ، ئەوە چۆن دەبێ ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند و فەرمووی (فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كُنْتُمْ بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ) (الأنعام: ١١٨)-) الى قوله (وَلَا تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ) (١٢١) الانعام

واتە: لەو (سەر براوە) مەخۆن کەناوی خوای لەسەر نەهێنرایەوە (کاتی سەربڕین) بێگومان (خواردنی) ئەوە تاوان و لەسنوور دەرچوونە وە بێگومان شەیتانەکان بەنهێنی شت بەدۆستانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلەو دەمە دەمێتان لەگەڵ بکەن جا ئەگەر بەگوێیان بکەن ئەوە بێگومان لەهاوبەش بڕیار دەران دەبن.

٢-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: (وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) (الأنعام: ١٢١) قَالَ: خَاصَمَهُمُ الْمُشْرِكُونَ، فَقَالُوا: مَا ذَبَحَ اللَّهُ فَلَا تَأْكُلُوهُ، وَمَا ذَبَحْتُمْ أَنْتُمْ أَكَلْتُمُوهُ) رواه النسائي قال الالباني صحيح

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : دەربارەی قسەی خوای گەورە (وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) موشریکان موناقەشەیان لەگەڵ ئیمانداران کرد گوتیان ئەوەی خوا سەری بڕیوە (مرداربوتەوە) نایخۆن ، بەلاّم ئەوەی خۆتان سەرتان بڕیوە دەیخۆن .

## رای زانایان دەربارەی ( بسم الله ) نەکردن لە کاتی سەر بڕینی ئاژەڵ:

زانایان پێنج رایان هەیە، لەسەر (بسم الله ) بۆ خواردن و سەربڕین و نێچیرگرتن.

١- ئەگەر بە لەبیرچونەوە بیّ حەلاڵە ، بەلاّم ئەگەر بە ئەنقەست (بسم الله) نەکات دروست نیە،هیچیان ناخورێن.

٢- ئەگەر بە ئەنقەست یان بە لەبیرچوونەوە (بسم الله) نەکات ، حەلاّلە دروستە بخوریّ

٣-ئەگەر بە ئەنقەست یان بە بیرچوونەوە (بسم الله) نەکات ، حەرام بیانخوات.

٤-ئەگەر بە ئەنقەست (بسم الله) نەکردبی شتێکی ناپەسندە ، بەلاّم گۆشتەکی حەڕام نیە.

٥-ئەگەر ئەنقەست (بسم االله) لیّ نەکردبیّ دەخوریّ ، بەمەرجێك لە رووی بەکەم گرتنەوە نەبووبیّ (بۆ نموونە نەیگوتبیّ جا (بسم الله) بکەم و نەکەم چییە؟ (تەفسیری قورئانی بەرز وبەپێز سوڕەتی الانعام لاپەرە(٧١٤)

## بسم الله بەرەکەتە:

(عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَأْكُلُ طَعَامًا فِي سِتَّةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ جَائِعٌ فَأَكَلَهُ بِلُقْمَتَيْنِ فَقَالَ أَمَا إِنَّهُ لَوْ ذَكَرَ اسْمَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ لَكَفَاكُمْ فَإِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ فَإِنْ نَسِيَ بِسْمِ اللَّهِ فِي أَوَّلِهِ فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ فِي أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ) رواه احمد والبيهقي قال الالباني صحيح

واتە: لە عائیشەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر لەگەڵ شەش هاوەڵانی نانی دەخوارد پیاوێکی ئەعرابی برسی هات بە دوو پاروان هەمووی خەلاس کرد ، پێغەمبەر

فەرمووی : ئەگەر ئەم پیاوە (بسم الله) كردبایە بەشی هەمووانی دەكرد، ئەگەر هەر یەكێك لە ئێوە نانی خوارد با ناوی خوای لێ بێنێ، ئەگەر ناوی خوا هێنانی لە بیركرد لەسەرەتا، با بڵێ (بسم الله) لەسەرەتاو كۆتایی.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٦٠) سورەتی (الانعام)

**﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ١٦٠﴾ الانعام**

واتە: هەركەسێك لەم دونیایەدا چاكەیەك بكا، لەڕۆژی قیامەتدا دەبەرامبەر چاكەی لەگەڵ دەكرێتەوە هەركەسێكیش خراپەیەك بكا، تەنها بەئەندازەی ئەوخراپەیە تۆڵە وجەزرەبە ئەدرێ، واتە: زیاد لە تاوانەكەی خۆی تۆڵە نادرێ بەسەریا وەكو دەفەرموێ: بەهیچ شێوەیەكیش ستەم لەهیچ كەسێكیان ناكرێت (رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَحْضُرُ الْجُمُعَةَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ: فَرَجُلٌ حَضَرَهَا بِلَغْوٍ فَذَلِكَ حَظُّهُ مِنْهَا. وَرَجُلٌ حَضَرَهَا بِدُعَاءٍ فَهُوَ رَجُلٌ دَعَا اللَّهَ إِنْ شَاءَ أَعْطَاهُ وَإِنْ شَاءَ مَنعه. وَرجل حَضَره بِإِنْصَاتٍ وَسُكُوتٍ وَلَمْ يَتَخَطَّ رَقَبَةَ مُسْلِمٍ وَلَمْ يُؤْذِ أَحَدًا فَهِيَ كَفَّارَةٌ إِلَى الْجُمُعَةِ الَّتِي تَلِيهَا وَزِيَادَةِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ وَذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ يَقُولُ: (مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا. .)رَوَاهُ أَبُو دَاوُد قال الالباني حسن

واتە: لە عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرمووی : سێ كەس ئامادەی نوێژی هەینی دەبن ، پیاوێك لەغو دەكات بەشەكەی لەغوەكەیەتی ، وە

پیاوێك ئامادەی دەبێ دوعا دەكات ، ئەوە كەسێكە لەخوا پاڕاوتەوە خواش ئەگەر حەز بكات پێی دەبەخشی و ئەگەر حەزبكات پێی نابەخشێ ، وە پیاوێك ئامادەی هەینی دەبێ ، بێ دەنگ و گوێی دەگرێ لە خەتیب و پازنادات بەسەر شانی موسڵمانان ، و كەس ئازار نادات ، بۆ ئەو كەسە هەینی دەبێتە كەفارەتی گوناحەكانی تاكو هەینی داهاتوو ، وە سێ ڕۆژیش زیاتر ، واتە (١٠) ڕۆژان ، ئەوەیە خوا فەرموویەتی (مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا) واتە ئەوەی چاكێك بكات خوا بە دە قات پاداشتی دەداتەوە

٢-( عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَامَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ فَقَدْ صَامَ الدَّهْرَ كُلَّهُ، ثُمَّ قَالَ: صَدَقَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ: (مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا) (الأنعام: ١٦٠) سنن النسائي قال الالباني صحيح

واتە: لە ئەبی زەڕی غەفاریەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی : ئەوەی سێ ڕۆژان لە هەموو مانگێك بەڕۆژوو بێ ، وەكو ئەوە وایە هەموو ساڵەكە بەڕۆژوو بووە ، دوای پێغەمبەر فەرمووی خوا لە قورئان ڕاستی فەرمووە (مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا)

٣-( عَنْ ثَوْبَانَ، مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ صَامَ سِتَّةَ أَيَّامٍ بَعْدَ الْفِطْرِ كَانَ تَمَامَ السَّنَةِ، مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا) ابن ماجه قال الالباني صحيح

واتە: لە سوبانی خزمەتكاری پێغەمبەرەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی : هەر كەسێك شەش ڕۆژان بە ڕۆژووبێ لە دوای ڕەمەزان وەكو كەسێك وایە هەموو ساڵ بەڕۆژووبێ ، وەك خوا فەرموویەتی (مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا)

## گوناح بە یەك و چاكە یەك بە دەیە :

-( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِسَيِّئَةٍ فَلَا تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا سَيِّئَةً، وَإِذَا هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا عَشْرًا) رواه مسلم

واتە: لە ئەبی هوریرەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی : خوا فەرموویەتی : ئەگەر عەبدی من گوناحێكی بەدڵداهات بۆی مەنوسن ، ئەگەر كردیە قسەوكردوە بەیەك گوناح بۆی بنووسن ، بەلاّم ئەگەر چاكەیەكی بەدڵداهات و نەشی كردە كردوە یەك چاكەی بۆ بنووسن ، ئەگەر كردیە كردەوە دە چاكەی بۆ بنووسن .

## هەندێ جار چاكە تاكو ( ٧٠٠ ) پلە بەرزدەبێتەوە :

( عَن أَبِي هُرَيْرَةَ عَن رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِحَسَنَةٍ وَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبْتُهَا لَهُ حَسَنَةً فَإِنْ عَمِلَهَا كَتَبْتُهَا عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ وَإِذَا هَمَّ بِسَيِّئَةٍ وَلَمْ يَعْمَلْهَا لَمْ أَكْتُبْهَا عَلَيْهِ فَإِنْ عَمِلَهَا كَتَبْتُهَا سَيِّئَةً وَاحِدَةً) وصحيح مسلم

واتە: لە ئەبی هوریرەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی : خوا فەرموویەتی : ئەگەر عەبدی من چاكەیەكی بەدڵداهات ، ئەوە چاكەیەكی بۆ دەنووسم ، ئەگەر كردیە كردەوە دەچاكەی بۆ دەنووسم تاكو حەوت سەد پلە ، بەلاّم ئەگەر خراپەی بەدڵدا هات و نەیكردە كردەوە، هیچی بۆ نانووسرێت ، بەلاّم ئەگەر كردیە كردوە یەك خراپەی بۆ دەنووسرێت .

**********************************

## وتاری ژماره (٤٣) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**سورەتی ( الاعراف )** له سورەته درێـژەکانی مەککەیـە، لـه ریزبەنـدی سـورەتەکاندا ژماره (٧) و ژمارەی ئایەتەکانی (٢٠٦) ئایەته ، باسـی نیعمەتـەکانی خـوا دەکـات بەسەر مرۆڤایەتی بەگشتی .

–باسی چیرۆکی ئادەم و شەیتان دەکات .

–چوار بانگەوازی تێدایه بۆ نەوەکانی ئادەم وەك (یابنی ادم)

–باسی چیرۆکی کۆمەڵێك له پێغەمبـەران دەکات.سـەلات وسـەلامی خوایـان لەسـەر بێ.

–ئایا بۆچی ناونراوه (الاعراف)؟ چونکه باسی ئەو شوێنه دەکاتـه کـه دیوارێکـه لـه نێوان بەهەشت و دۆزەخ ، کەسانی ئەعراف ئەو کەسانەن که چاك و خراپەیان وەك یەکه ، لەوێ رادەگیرێن تاکو خوا حیسابیان بۆ دەکات .

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٣١) سورەتی (الاعراف)

﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١﴾ الاعراف

واته: پێشـەوا(موسـلیم) لـه (ئـیبن عـەبباس)ه وەدەگێڕێتـەوەو ئـەڵێ: لەسـەردەمی نەفامیی و جاهیلیەتدا، ژنان بەرووتی تەواف کابەیان دەکردو دەسـووڕانەوەو، تـەنها پەڕۆیەکیان لەسەر شەرمینگایان دادەناو دەیانگوت: ئەگەرچـی ئـەمڕۆ هـەمووی یـا

هەندێکی بە دەرەوەبێ، لەوە زیاتر بە حەڵاڵ و ڕەوای نازانم دەرکەوێ ! ئـەوجا لـە بەرامبەر ئەوکارە دزێوەوە خوای گەورە فەرمووی: ئەی ڕۆڵـەکانی ئـادەم ! هەرکـە دەچنە مزگەوت بۆ نوێژو هـەر خـوا پەرسـتیەکی تـر، جـل و بـەرگی جـوان و پـاك و خاوێن لەبەر بکـەن. دەسـا لـە حـەڵاڵ بخـۆن و، بخۆنـەوەو، هـەرگیز زۆر خـۆریی و زیـادەڕەویی مەکـەن چـونکە خـوا خۆشـی لەوانـە نایـە ئەندازەشـکێنی دەکـەن و، لەسنوور دەردەچـن. هەنـدێ لـەزانایانی (سـەلەف) دەڵـێن: خـوای گـەورە تـەواویی بابەتـە پزیشـکییەکانی لـەنیوەی ئـەم ئایەتـەی: (کلـوا واشـربوا ولا تسـرفوا )دا کۆکردۆتەوە،(ئیبن عەباس) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: هەرچـی دەخـۆی بخـۆ، هەرچیش لەبەر دەکەیت لەبەری بکە، بەمەرجێ نەگاتە زیادەخۆریی و، دەعیەو فیز کردن. بوخاریی/کتاب اللباس ۱۸۲/۷) (رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وكُلُواْ وَاشْرَبُوا وَلاَ تُسْرِفُوا إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ ) هَـذِهِ الْآيَـةُ الْكَرِيمَـةُ رَدٌّ عَلَى الْمُشْرِكِينَ فِيمَـا كَـانُوا يَعْتَمِدُونَـهُ مِنَ الطَّوَافِ بِالْبَيْـتِ عـراة، كمـا روي عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ، قَـالَ: كَـانُوا يَطُوفُـونَ بِالْبَيْـتِ عُـرَاةً الرِّجَـالُ وَالنِّسَاءُ، الرجال بالنهار وَالنِّسَاءُ بِاللَّيْلِ، وَكَانَتِ الْمَرْأَةُ تَقُولُ: الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهُ وَمَا بَدَا مِنْهُ فَلَا أُحِلُّهُ ، فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَالنَّسَائِيُّ وَابْنُ جَرِيرٍ وَاللَّفْظُ لَهُ) تفسير ابن كثير

واتە: ئیبنو کەسیر دەڵێ ئەو ئایەتە پیرۆزە (يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وكُلُواْ وَاشْرَبُوا وَلاَ تُسْرِفُوا إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ) ڕەدی موشـریکان دەداتـەوە کـە تەوافیان دەکرد بە رووتی ، هەروەك لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵـێ : پیـاو و ژن

تەوافیان دەکرد بە رووتی ، پیاوان بە رۆژ و ژنانیش بە شەو ، جا ژن دەیگوت ئەمرۆ هەندێك یان هەمووم دەردەخەم ، بەلاّم لەوە زیاترە بەحەلاّلی نازانم ، جا خوای بەرز فەرمووی (خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ) واتە خۆتان داپۆشن لە هەموو مزگەوتەکان

وفي رواية-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَهِيَ عُرْيَانَةٌ ، وَتَقُولُ: الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهْ ... وَمَا بَدَا مِنْهُ فَلَا أُحِلُّهْ ، فَنَزَلَتْ: (يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ) (الأعراف: ٣١) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

دوو تێبینی :١- هەندی لە زانایان دەڵێن (عند كل مسجد :ای عند كل عيبادە) واتە لەکاتی هەموو خواپەرستێك جل وبەرگی جوان دەبەربکەو پۆشتە بن.

٢-دوو جۆر لباس (جل وبەرگ) هەیە (جل وبەرگی سەر پێست و جل و بەرگی سەردڵ)

(يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ (الأعراف:٢٦)

واتە: ئەی نەوەی ئادەم بێگومان پۆشاکمان بۆ ناردوون کە عەیب و عەورەتتان دادەپۆشێ وە پۆشاکی جوان و ڕازاوەیش(مان بۆ ناردوون) بەڵام پۆشاکی ترسان لە خوا و پارێزگاری چاکتر و باشترە ئەوەی باسکرا هەندێکە لە بەڵگەو نیشانەکانی خوا بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و ئامۆژگاری وەرگرن.(پوختە)

واتە: (سێ جۆری لیباس هەیە ١-لیباسی خۆداپۆشین ٢- لیباسی خۆڕازاندنەوە ٣-لباسی ترس و تەقوا.

-( هیدایەتی ئادەمیزاد بۆ پۆشینی جلوبەرگی لەش و جلوبەرگی دڵ ( کە تەقوایە) هیدایەتێکە خودا بەخشیویەتی بە ئادەمیزاد، تا بەشکو یادەوەری بکەن و بیر

بکەنەوەو گەورەیی خودایان بۆ دەربکەوێت و سوپاسی بکەن. (ریش) بە مانای جلوبەرگ و جوانی دێت، هەروەها بە پەڕی باڵندەیش دەوترێت.. جوانی ئادەمیزاد بە جلوبەرگەوەیە، نەك بە ڕووتبوونی، هەروەها جوانی باڵندەکانیش بە پەڕەکانیەوەیە) گوڵشەن.

**ژن ومێرد بۆ یەکتر پۆشاکن:**

**(هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ) البقره**

**واتە: ژن و مێرد هەریەکەیان جلوبەرگ و پەرژیینە بۆ ئەوی تریان.**

**٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٧٥) سورەتی (الاعراف)**

**(وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ١٧٥) الاعراف**

واتە: نموونەی زانای لارو لاسار: ئینجا خوای گەورە نموونەی زانا خراپەکانی سەردەم دێنێتەوەو ئەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر! (صلی اللە علیە وسلم) دەنگ و باسی ئەوکەسە سەر لێشواوەیان بۆ بخوێنە کە بەڵگەو نیشانەی خۆمانمان پێدا. (عەبدوڵڵای کوری مەسعود) ئەڵێ: ئەوزانایە (بەلعەمی کوڕی باعورا)یە، کاتی خۆی موسا ناردی بۆ ئامۆژگاری پاشای (مەدیەن) و، پاشاکەش ڕێزێکی زۆری لێگرت و، لە ئەنجامی ئەو ڕێز لێگرتنەوەوە چووە سەر ئایینی ئەوان و، نەگەڕایەوە لای موسا) ڕامان(فَانْسَلَخَ مِنْهَا) واتە (خۆی لە ئایینی حەق داماڵی)

موجاهید دەڵێ: (سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: بَلْعَامُ بْنُ بَاعِرَ مِنْ بني إسرائيل فَانْسَلَخَ مِنْهَا قَالَ: مَا نُزِعَ مِنْهُ الْعِلْمُ )

-(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ (وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانْسَلَخَ مِنْهَا) (الأعراف: ١٧٥) قَالَ: هُوَ بَلْعَمُ بْنُ بَاعُورَاءَ ) رواه الحاكم في مستدركه

**دوو نموونە لە قورئان وفەرموودە لەسەر زانای خراپ:**

١-زانای خراپ وێنا کراوە (تشبیە) بە کەر (گوێدرێژ):

**(مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا ۚ بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (الجمعة:٥)**

واتە: نموونەی بەسەرهاتی ئەوانەی کە تەوراتیان درا بەسەردا لەپاشان هەڵیان نەگرت (ڕەفتاریان پێ نەکرد) وەك گوێ درێژێکە کە کتێبێکی زۆری هەڵگرتبێ ئای چەند خراپە نموونەی ئەو گەلەی کە نیشانەکانی خوایان بەدرۆ زانی وە خوا ڕێنموونیی گەلی ستەمکاران ناکات. (پوختەی تەفسیر)

نموونەی دووەم لەفەرموودە لەسەر زانای خراپ:

(عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَرَرْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي عَلَى أُنَاسٍ تُقْرَضُ شِفَاهُهُمْ وَأَلْسِنَتُهُمْ بِمَقَارِيضَ مِنْ نَارٍ. قُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ خُطَبَاءُ أُمَّتِكَ، الَّذِينَ يَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَيَنْسَوْنَ أَنْفُسَهُمْ ) وَأَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ فِي صَحِيحِهِ، وَابْنُ أَبِي حَاتِمٍ، وَابْنُ مَرْدَوَيْهِ

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیك هـاتووە دەڵـێ: گـوێم لـە پێغەمبـەر بـوو، دەیفـەرموو شەوی ئیسراو میعراج بەلای کەسانێکدا تێپەڕیم ، لیو وزمانیان دەبڕین بە مەقەسـی ئاگر ، گوتم ئەوانە کێن ئە جوبریل ؟ گوتی ئەوانە وتاربێژەکانی ئوممەتی تۆن ، کـە فەرمان بەخەڵکی دەکەن بەچاکە ، بەلاّم خۆیان جێ بەجێی ناکەن. (واتە : قسە و عەمەلیان یەك نیە)

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٩٩) سورەتی (الاعراف)

(خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ١٩٩) الاعراف

واتە: دەست بگرە بە لێبوردەیی یەوە (چاوو پۆشی بکە) فەرمانیش بدە بە چاکە و چاکە کردن و ڕوو وەرگێڕە لە نـەفامان و نـەزانان واتـە وازیـان لـێ بێنـە.(پوختـەی تفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ خُذْ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ قَالَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَّا فِي أَخْلَاقِ النَّاسِ ،عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ أَمَرَ اللَّهُ نَبِيَّهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَأْخُذَ الْعَفْوَ مِنْ أَخْلَاقِ النَّاسِ أَوْ كَمَا قَالَ ) البخاري

واتە:لە عەبدولاّی کوڕی زوبیرەوە هاتووە دەڵـێ : ئایـەتی (خُذْ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ) دەربارەی ئاکـار ورەوشـتی جـوانی پێغەمبـەر دابـەزیوە . وە عەبـدولاّ دەڵـێ : خـوا فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی لێبوردنی هەبێ لەگەڵ خەڵکی .

## عومەر خوا لێی ڕازی بێ بەرامبەر ئەم ئایەتە ڕاوەستا :

(عن عَبْد اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ قَدِمَ عُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنِ بْنِ حُذَيْفَةَ بْنِ بَدْرٍ فَنَزَلَ عَلَى ابْنِ أَخِيهِ الْحُرِّ بْنِ قَيْسِ بْنِ حِصْنٍ وَكَانَ مِنْ النَّفَرِ الَّذِينَ يُدْنِيهِمْ عُمَرُ وَكَانَ الْقُرَّاءُ أَصْحَابَ مَجْلِسِ عُمَرَ وَمُشَاوَرَتِهِ كُهُولًا كَانُوا أَوْ شُبَّانًا فَقَالَ عُيَيْنَةُ لِابْنِ أَخِيهِ يَا ابْنَ أَخِي هَلْ لَكَ وَجْهٌ عِنْدَ هَذَا الْأَمِيرِ فَتَسْتَأْذِنَ لِي عَلَيْهِ قَالَ سَأَسْتَأْذِنُ لَكَ عَلَيْهِ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَاسْتَأْذَنَ لِعُيَيْنَةَ فَلَمَّا دَخَلَ قَالَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ وَاللَّهِ مَا تُعْطِينَا الْجَزْلَ وَمَا تَحْكُمُ بَيْنَنَا بِالْعَدْلِ فَغَضِبَ عُمَرُ حَتَّى هَمَّ بِأَنْ يَقَعَ بِهِ فَقَالَ الْحُرُّ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ لِنَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُذْ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنْ الْجَاهِلِينَ وَإِنَّ هَذَا مِنْ الْجَاهِلِينَ فَوَاللَّهِ مَا جَاوَزَهَا عُمَرُ حِينَ تَلَاهَا عَلَيْهِ وَكَانَ وَقَّافًا عِنْدَ كِتَابِ اللَّهِ ) رواه البخاري

واتە: لە عەبدوڵای کوڕی عەبباسەوە خوا لە خۆی وبابی ڕازی بێ هاتووە دەڵێ : عویەیینەی کوڕی حوزیفە هات میوانی برازاکەی بوو کە ناوی (حورر کوڕی قەیس ) بوو ، ئەو کەسانەی لە عومەر نزیك بوون لە مەجلیس قورئان خوێنەکان بوون ، لە جوامێران و گەنجان ، جا (عوەیینە) گوتیە برازاکەی تۆ (عومەر) ڕێزت دەگرێ ، مۆڵەتم بۆ وەربگرە بچمە لای ، ئیبنو عەباس دەڵێ ئەویش مۆڵەتی بۆ وەرگرت ، کە چووە ژوورەوە ، گوتیە عومەر ، ئەی کوڕی خەتتاب سوێند بەخوا هیچ حیسابت بۆمان نەکردوە ، ودادگەریش نەبووی لەگەڵمان ، عومەر توڕەبوو ، خەریك بوو لێبدات ، (حورره) گوتی ئەی پێشەوای ئیمانداران خوا بە پێغەمبەرەکەی فەرمووە(خُذْ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنْ الْجَاهِلِينَ) (واتە: دەست بە عەفوەوە بگرە وفەرمانیش بە چاکە بکەو پشت لە جاهیلان بکە) ئەوەش جاهیلە ، دەڵێ سوێند بەخوا لەجێگای خۆی وەستاو جوڵەی نەکرد ، عومەر بەرامبەر قورئان تەسلیم دەبوو.

(وَقَالَ الْبُخَارِيُّ قَوْلُهُ:(خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ) العرف: المعروف )ابن كثير

## خەڵكی چاكار (معروف) بەخێر دەمرن:

١-(عَنْ أَبِي سَعِيْدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (صَدَقَةُ السِّرِّ تُطْفِيءُ غَضَبَ الرَّبِّ، وَصِلَةُ الرَّحِمِ تَزِيْدُ فِي الْعُمرِ، وَفِعلُ الْمَعْرُوف يَقِي مَصَارِعَ السُّوءِ) رواه البيهقي صَحيح

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خێركردن بە نهێنی تووڕەیی خوا دەكوژێنێتەوە، وە بەجێهێنانی پەیوەندیی خزمایەتیو سەردانی كردنیان تەمەن زیاد دەكات، وە كردەوەی چاك دەیپارێزێ لە مردن لە حاڵەتی خراپ.

٢-(عَنْ أَبِي سَعِيْدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (صَدَقَةُ السِّرِّ تُطْفِيءُ غَضَبَ الرَّبِّ، وَصِلَةُ الرَّحِمِ تَزِيْدُ فِي الْعُمرِ، وَفِعلُ الْمَعْرُوف يَقِي مَصَارِعَ السُّوءِ) حَديثٌ صَحيحٌ

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خێركردن بە نهێنی تووڕەیی خوا دەكوژێنێتەوە، وە بەجێهێنانی پەیوەندیی خزمایەتیو سەردانی كردنیان تەمەن زیاد دەكات، وە كردەوەی چاك دەیپارێزێ لە مردن لە حاڵەتی خراپ.

## ٤- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٠٤ ) سورەتی ( الاعراف )

﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ٢٠٤﴾ الاعراف

واتە: كاتێكیش كە قورئان دەخوێندرێت، ئەوە گوێی بۆ بگرن و دڵی بدەنێ و بێ دەنگ بن، بۆ ئەوەی ئێوە ڕەحمتان پێ بكرێت و پەروەردگار بەزەیی پێتاندا بێتەوە (گوێ گرتن بەدڵ و بێدەنگی كار كردی خۆی هەیە لەسەر بیسەر، بێجگە لە پاداشتی بێ سنوور).

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا يَتَكَلَّمُونَ فِي الصَّلَاةِ كَمَا يَتَكَلَّمُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى، حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا﴾ (الأعراف: ٢٠٤) رواه عبدالرزاق في المصنف

واتە: لە عەتاوە هاتووە دەڵێ : پێم گەیشتووە موسڵمانان لە ناو نوێژدا قسەیان دەكرد ، وەكو چۆن جوولەكە و گاور لە ناونوێژدا قسە دەكەن ، تاكو ئایەتی ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا﴾ دابەرزی ، واتە : پاش ئەم دابەزینە قسە قەدەغەكرا.

٢-(عَنْ مُجَاهِدٍ ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا﴾ (الأعراف: ٢٠٤) قَالَ: (فِي الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ) ابن ابي شيبة

٣-(عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقْرَأُ، وَرَجُلٌ يَقْرَأُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا﴾ (الأعراف: ٢٠٤) ابن ابي شيبة

٤-(عَنْ أَبِي وَائِلٍ أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ سَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَرُد عَلَيْهِ، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ، وَكَانَ قَبْلَ ذَلِكَ يَتَكَلَّمُ فِي صَلاتِهِ وَيَأْمُرُ بِحَاجَتِهِ فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَدَّ عَلَيْهِ وَقَالَ: إِنَّهَا نَزَلَتْ وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ ترحمون) ابن حاتم

واته: له ئەبی وائیلەوه هاتووه دەڵێ : ئیبنو مەسعود سلاّوی لـه پێغەمبەر کـرد ، بەلاّم جوابی نەدایەوه ، کاتێ پێغەمبەر له نوێژ تەواو بوو، فـەرمووی : خـوا چـۆن حەزبکا وادەکا، پێشان لەناو نوێژ قسه دەکراو ، و داوای پێویسـتیان لێـك دەکـرد ، کاتێ پێغەمبەر له نوێژ تەواو بوو ، وەلاّمی سەلامی دایـەوه وفـەرمووی ئـەو ئایەتـه دابەزیوه (وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ ترحمون)

٥-(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا) رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالنَّسَائِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ (إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ ) أَيْ: لِيُقْتَدَى بِهِ

واته: له ئەبو هوریرەوه هـاتووه دەڵـێ : پێغەمبـەر فەرموویـەتی : ئیمـام بـۆ ئـەوه دانراوه تاکو وەکو ئەو هەنگاو بنرێـت ، ئەگـەر گـوتی (الله اکبر) ئـەوەش بڵـێن (الله اکبر) ، ئەگەر ئیمام قورئانی خوێند ئێوه بێدەنگ بن.

## هەنگاوبه هەنگاو له دوای ئیمام:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُنَا أَنْ لَا تُبَادِرُوا الْإِمَامَ بِالرُّكُوعِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا وَإِذَا قَالَ: غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ، فَقُولُوا آمِينَ فَإِنَّهُ إِذَا وَافَقَ كَلَامَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لِمَنْ فِي الْمَسْجِدِ وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا ) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ

وفى روايه(.....وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ.... )البخاري

واته: لەئەبو هوریرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فێرکربووین و پێ فەرمووین: پێش ئیمام دەست بە نوێژ مەکەن، ئەگەر گوتی: الله اكبر، ئێوەش بلێن الله اكبر، ئەگەر گوتی: (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ) ئیوە بلێن (امين) ئەگەر لەگەڵ ئامینی فریشتەکان تێکی کردوە خوا لە هەموو ئەوان خۆش دەبێ کە لە مزگەوتن، ئەگەر ئیمان رکوعی برد ئێوەش برۆن رکوع، ئەگەر گوتی (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ئێوەش بلێن (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) ئەگەر سوجدەی برد ئێوەش سوجدە بەن.

## وتاری ژماره (٤٤) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### سورەتی (الانفال):

لـه سـورەتەکانی مەدینەیـە، لـه ریزبەنـدی سـورەتەکان ژمـاره (٨)ه و ژمـارەی ئایەتەکانی (٧٥) ئایەتە .

–باسی جەنگ و جیهاد و حوکمی دیل دەکات ، پاش جەنگی بەدر دابەزیوه .

–شەش بانگەوازی تێدایه بۆ بڕواداران.

–لەکۆتایی پێمان دەڵی ئێوه یەك ئومەتن هەرچەنده رەگەزجیاوازبن

–ئایا له کوی دابەزیوه؟ عبـدالله کـوری عبـاس دەڵـی لـه (بـدر) دابـەزیوه ، عبـدالله کوری زبیر دەڵێ له مەدینه دابەزیوه.

–ئایـا بۆچـی نـاونراوه (الانفـال) ؟ وەڵام : چـونکه باسـی دەسـتکەوتەکانی جـەنگ دەکات . (النفل: یانی الغنمه ، واته دەستکەوتەکان . (النفل بەمای زیادەش دێ)

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١) سورەتی (الانفال)

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَـالِ قُلِ ٱلْأَنفَـالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ فَـٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ١﴾ الانفال

واته: ئەی موحەممەد(صلی اللـه علیـه وسـلم) پرسـیارت لـێ دەکـەن سـەبارەت بـه دەسـتکەوتەکان(ی جـەنگی بـەدر) تـۆش بڵـێ: ئـەو دەسـتکەوتانه هـەر بـۆ خـواو

پێغەمبەرن(صلی اللە علیە وسلم) کەواتە خۆتان بپارێزن و لە خوا بترسن وە پەیوەندی نێوان خۆتان چاك بکەنەوە و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بن ئەگەر ئێوە بڕوادارن.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عوبادە) دەڵێت: ئەم ئایەتە لەبارەی ئێمەی ئەهلی بەدرەوە هاتە خوارێ، چونکە ئێمە بووین لە شێوەی دابەشکردنی دەستکەوتەکەدا کێشەو ناکۆکیمان بوو، ئەوسا خوایش ئەنفالەکەی لێ سەندینەوەو خستیە بەر دەست پەیامبەری خۆی (صلی الله علیه وسلم)، پێشەوا (ئەحمەد) ریوایەتی کردووە (رامان) ئەمەش دەقەکەی :

١-( عَنْ مَكْحُولٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ عَنِ الْأَنْفَالِ فَقَالَ: فِينَا مَعْشَرَ أَصْحَابِ بَدْرٍ نَزَلَتْ حِينَ اخْتَلَفْنَا فِي النَّفْلِ، وَسَاءَتْ فِيهِ أَخْلَاقُنَا، فَنَزَعَهُ اللهُ مِنْ أَيْدِينَا، فَجَعَلَهُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَسَمَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِينَا عَنْ بَوَاءٍ ، يَقُولُ: عَلَى السَّوَاءِ) رواه احمد قال شعيب الأرنؤوط حسن لغيره

٢- (عن سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: نَزَلَتْ فِيَّ أَرْبَعُ آيَاتٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى، كَانَتْ أُمِّي حَلَفَتْ أَنْ لَا تَأْكُلَ وَلَا تَشْرَبَ حَتَّى أُفَارِقَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً). وَالثَّانِيَةُ: أَنِّي كُنْتُ أَخَذْتُ سَيْفًا أَعْجَبَنِي فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَبْ لِي هَذَا فَنَزَلَتْ: (يَسْأَلونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ) وَالثَّالِثَةُ: أَنِّي مَرِضْتُ فَأَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَقْسِمَ مَالِي أَفَأُوصِي بِالنِّصْفِ فَقَالَ لَا فَقُلْتُ الثُّلُثُ فَسَكَتَ فَكَانَ الثُّلُثُ بَعْدَهُ جَائِزًا، وَالرَّابِعَةُ إِنِّي شَرِبْتُ الْخَمْرَ مَعَ قَوْمٍ مِنَ

**موعجیوەیەکی پێغەمبەر بۆ عەباسی مامی :**

٣-( قَالَ الْعَبَّاسُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي كُنْتُ مُسْلِمًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اللهُ أَعْلَمُ بِإِسْلَامِكَ، فَإِنْ يَكُنْ كَمَا تَقُولُ فَاللَّهُ يَجْزِيكَ، فَافْدِ نَفْسَكَ وَابْنَيْ أَخَوَيْكَ: نَوْفَلَ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَعُقَيْلَ بْنَ أَبِي طَالِبِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَحَلِيفَكَ عُتْبَةَ بْنَ عَمْرِو بْنِ جَحْدَمٍ أَخَا بَنِي الْحَارِثِ بْنِ فِهْرٍ " فَقَالَ: مَا ذَاكَ عِنْدِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: فَأَيْنَ الْمَالُ الَّذِي دَفَنْتَ أَنْتَ وَأُمُّ الْفَضْلِ فَقُلْتَ لَهَا: إِنْ أُصِبْتُ فَهَذَا الْمَالُ لِبَنِي الْفَضْلِ، وَعَبْدِ اللَّهِ وَقُثَمَ؟ فَقَالَ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ، إِنَّ هَذَا لِشَيْءٍ مَا عَلِمَهُ أَحَدٌ غَيْرِي وَغَيْرُ أُمِّ الْفَضْلِ، فَاحْسِبْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَصَبْتُمْ مِنِّي عِشْرِينَ أُوقِيَّةً مِنْ مَالٍ كَانَ مَعِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (افْعَلْ) فَفَدَى الْعَبَّاسُ نَفْسَهُ وَابْنَيْ أَخَوَيْهِ وَحَلِيفَهُ، وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنَ الْأَسْرَى إِنْ يَعْلَمِ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِمَّا أُخِذَ مِنْكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (الأنفال: ٧٠) فَأَعْطَانِي مَكَانَ الْعِشْرِينِ الْأُوقِيَّةِ فِي الْإِسْلَامِ عِشْرِينَ عَبْدًا كُلُّهُمْ فِي يَدِهِ مَالٌ يَضْرِبُ بِهِ مَعَ مَا أَرْجُو مِنْ مَغْفِرَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ «هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ) رواه الحاكم

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٦٧ ) سورەتی ( الانفال )

(مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٦٧) الانفال

واتە: نابێ بەر لەدەسەڵات دیل رابگیردرێ: ئیمامی(مسلیم) ئەڵێ: (عومەری کوڕی خەتتاب/ خوا لێی رازی بێ) وتی: کاتێ کە لەبەدرا قورەیش حەفتایان لێکوژراو، حەفتاشیان لێ دیلکرا، پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) لە بارەی دیلەکانەوە پرس

و ڕاوێژی بەهاوەڵان کرد: ئایا چی بکرێ باشە! (ئەبو بەکر/ خوا لێی ڕازی بێ) وتی: من پێم چاکە فیدیەو بریتیان لێ وەربگیردرێ، تا خۆمانی پێ بەهێز بکەین، لەولایشەوە بەڵکو لە ئایندەدا خوا ڕێنمایان بکاو موسڵمان ببن، پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەی کوڕی خەتتاب تۆ ڕات چییە ؟ (عومەر)یش وتی: من وام پێ چاکە فلانی خزمم بدەیتە دەست با بیکوژم، (عەقیل)ی ئامۆزایشت بدە دەستی (عەلی)با بیکوژێ، فلانە کەسیش بدە دەستی (حەمزە) با بیکوژێ، تا هەموو کەسێ بزانێ کە: ئێمە لەگەڵ کافراندا نەرم ونیان نین، بەتایبەتی ئەوانەیان سەرۆك و پێشەوای کوفرن، پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم) ڕاو بۆچوونەکەی (ئەبووبەکر)ی قەبووڵ کرد (عومەر) گوتی: جا بۆ سبەینێ چووم دیتم وا پەیامبەرو ئەبوبەکر–هەردوو–خەفەتبارن و ئەگرین، منیش وتم: پێم بڵێن چی قەوماوە ؟ فەرمووی: بۆ ئەوە دەگریم کەهاوەڵان فیدیەو بریتیان هەڵبژارد، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: بە هیچ پەیامبەرێك ڕێ نەدراوە کە دیلی هەبێ و، دیل ڕاگرێ ، یان بریتی وەرگرێ هەتا هێزو دەسەڵات بەدەست دەگرێت ئێوە دەتانەوێ لەززەت و کاڵای دونیاتان دەسکەوێ لەوەرگرتنی بریتیدا خوایش پاشە ڕۆژی ئەوێ بۆتان، ئەیەوێ پاداشی گەورەو مەزنتان دەستکەوێ و، پاشە ڕۆژ هەڵبژێرن. تێبینیەك: ئەم گلەیی وعیتابە روو لەوکەسانە دەکات پێغەمبەر راوێژی پێکردن وئەوانیش فیدیەیان هەڵبژارد خوا بۆخۆی زۆر بەدەسەڵات وزۆریش کارجوانە

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عن عُمَر بْن الْخَطَّابِ قَالَ لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ نَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَهُمْ أَلْفٌ وَأَصْحَابُهُ ثَلَاثُ مِائَةٍ وَتِسْعَةَ عَشَرَ رَجُلًا فَاسْتَقْبَلَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْقِبْلَةَ ثُمَّ مَدَّ يَدَيْهِ فَجَعَلَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ اللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي اللَّهُمَّ

آتِ مَا وَعَدْتَنِي اللَّهُمَّ إِنْ تُهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةَ مِنْ أَهْلِ الْإِسْلَامِ لَا تُعْبَدْ فِي الْأَرْضِ فَمَا زَالَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ مَادًّا يَدَيْهِ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ حَتَّى سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ مَنْكِبَيْهِ فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ فَأَخَذَ رِدَاءَهُ فَأَلْقَاهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ ثُمَّ الْتَزَمَهُ مِنْ وَرَائِهِ وَقَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ كَفَاكَ مُنَاشَدَتُكَ رَبَّكَ فَإِنَّهُ سَيُنْجِزُ لَكَ مَا وَعَدَكَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنْ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ فَأَمَدَّهُ اللَّهُ بِالْمَلَائِكَةِ قَالَ أَبُو زُمَيْلٍ فَحَدَّثَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ بَيْنَمَا رَجُلٌ مِنْ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَئِذٍ يَشْتَدُّ فِي أَثَرِ رَجُلٍ مِنْ الْمُشْرِكِينَ أَمَامَهُ إِذْ سَمِعَ ضَرْبَةً بِالسَّوْطِ فَوْقَهُ وَصَوْتَ الْفَارِسِ يَقُولُ أَقْدِمْ حَيْزُومُ فَنَظَرَ إِلَى الْمُشْرِكِ أَمَامَهُ فَخَرَّ مُسْتَلْقِيًا فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ قَدْ خُطِمَ أَنْفُهُ وَشُقَّ وَجْهُهُ كَضَرْبَةِ السَّوْطِ فَاخْضَرَّ ذَلِكَ أَجْمَعُ فَجَاءَ الْأَنْصَارِيُّ فَحَدَّثَ بِذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ صَدَقْتَ ذَلِكَ مِنْ مَدَدِ السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ فَقَتَلُوا يَوْمَئِذٍ سَبْعِينَ وَأَسَرُوا سَبْعِينَ قَالَ أَبُو زُمَيْلٍ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَلَمَّا أَسَرُوا الْأُسَارَى قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ مَا تَرَوْنَ فِي هَؤُلَاءِ الْأُسَارَى فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ يَا نَبِيَّ اللَّهِ هُمْ بَنُو الْعَمِّ وَالْعَشِيرَةِ أَرَى أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُمْ فِدْيَةً فَتَكُونُ لَنَا قُوَّةً عَلَى الْكُفَّارِ فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَهْدِيَهُمْ لِلْإِسْلَامِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا تَرَى يَا ابْنَ الْخَطَّابِ قُلْتُ لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَرَى الَّذِي رَأَى أَبُو بَكْرٍ وَلَكِنِّي أَرَى أَنْ تُمَكِّنَّا فَنَضْرِبَ أَعْنَاقَهُمْ فَتُمَكِّنَ عَلِيًّا مِنْ عَقِيلٍ فَيَضْرِبَ عُنُقَهُ وَتُمَكِّنِّي مِنْ فُلَانٍ نَسِيبًا لِعُمَرَ فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ فَإِنَّ هَؤُلَاءِ أَئِمَّةُ الْكُفْرِ وَصَنَادِيدُهَا فَهَوِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا قَالَ أَبُو بَكْرٍ وَلَمْ يَهْوَ مَا قُلْتُ فَلَمَّا كَانَ مِنْ الْغَدِ جِئْتُ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبُو بَكْرٍ قَاعِدَيْنِ يَبْكِيَانِ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَبْكِي أَنْتَ وَصَاحِبُكَ فَإِنْ وَجَدْتُ بُكَاءً بَكَيْتُ وَإِنْ لَمْ أَجِدْ بُكَاءً تَبَاكَيْتُ لِبُكَائِكُمَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبْكِي لِلَّذِي عَرَضَ عَلَيَّ أَصْحَابُكَ مِنْ أَخْذِهِمْ الْفِدَاءَ لَقَدْ عُرِضَ عَلَيَّ عَذَابُهُمْ أَدْنَى مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ شَجَرَةٍ قَرِيبَةٍ مِنْ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (مَا كَانَ

لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ إِلَى قَوْلِهِ فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَالًا طَيِّبًا فَأَحَلَّ اللَّهُ الْغَنِيمَةَ لَهُمْ ) رواه مسلم

واته: له عومەری کوری خەتابەوە هاتووە دەڵێ : ڕۆژی بەدر ، پێغەمبەر تەماشای موشریکانی کرد (١٠٠٠) کەس بوون ، وە هاوەڵان (٣١٩) پیاو بوون ، پێغەمبەر رووی له قیبله کرد و دەستی درێژکردن و پارایەوە فەرموو( خودایە بەڵێنەکەت بۆم جێ بەجێ بکە، خوا ئەوەی وەعدەت پێم داوە پێم ببەخشە ، خودایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە لەناو بچن ناپەرستریی لە سەر زەوی، بەردەوام دوعای دەکرد ، تاکو عەباکەی بربویەوە لەسەر شانی ، ئەبوبەکر عەباکەی لەسەر شانی دانایەوە ، گوتی ئەی نێرراوی خوا بەس پارانەوە لەبەر خوا ، خوا وەعدەکەی بۆت جێ بەجێ دەکات ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ) به فریشتەکان خوا پشتگیری کرد ، ئەبو زومەیل دەڵێ ئیبنو عەباس بۆی گێرانەوە گوتی هاوەڵان هەستیان دەکرد فریشتە جەنگ دەکەن گوێیان لە دەنگی لێدانی قامچی و سوارچاك دەبوو لەسەروی خۆیان دەیگوت (أَقْدِمْ حَيْزُومُ) موسڵمان تەماشای موشریکی دەکرد لەپێش خۆی بەردەبویەوە دەکەوتە سەرپشت ، تەماشایان دەکرد لوتیان دەبراو دەم وچاویان شەق دەبوو ، وەك لێدانی قامچی هەموو لاشەی شین دەبوو ، پیاوێکی ئەنصاری هات ئەو حاڵەتەی بۆ پێغەمبەر باس کرد فەرمووی (راست دەکەی ئەوە هاوکاری ئاسمانی سێیەمە) لەو ڕۆژدا حەفتا کەسیان لێ کوژراو حەفتایان لێ بە دیل گیرا ، ئەبو زومەیل دەڵێ ئیبنو عەباس گوتی کاتی دیلەکان گیران ، پێغەمبەر فەرمووە ئەبو بەکر وعومەر راتان چییە؟ دەربارەی دیلەکان ، ئەبوبەکر گوتی ئەی نێرراوی خوا ئەوان کوڕە مام و خزمن ، فیدیەوپارەیان لێ وەرگرە بۆ ئێمە دەبێتە هێزە و ئومێدیش دەکرێ ئەوانیش دوای خوا هیدایەتیان بدات بۆ ئیسلام ، جافەرمووی

ئەی کوڕی خەتاب ئەی تۆ رات چییە؟ عومەر دەڵێ گوتم ، نەخێر سوێند بەخوا من رام وەکو رای ئەبوبەکر نیە ، رام وایە رێگامان بدەی لە گەردەنیان بدەین ، با (علی) لەگەردەنی (عقیل) بدات ، منیش وەرداش زاوای خۆم لەملی دەدەم ، ئەوانە سەروپێشەوای کوفرن ، پێغەمبەر مەیلی بۆ رای ئەبوبەکر چوو ، لەگەڵ رای من نەبوو، کاتێ بەیانی هات چوومە لای پێغەمبەر دەبینم پێغەمبەر و ئەبوبەکر دانیشتوون و دەگرین ،گوتم: ئەی نێرراوی خوا هەواڵم پێ بدە بۆچی تۆ و هاوەڵەکەت دەگرین ؟ ئەگەر منیش گریانم بێت بابگریم، ئەگەر گریانم نەهات خۆم دەگرێنم بۆ گریانی ئێوە، فەرمووی دەگریم بۆ هاوەڵانت سزا لەو درەختە لێیان نزیکترە، درەختێك بوو لەوێ لە پێغەمبەر نزیك بوو ، فەرمووی: خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٦٧............ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٦٩)) واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوا نی یە کە دیلی(لە دوژمنان) هەبێ هەتا کوشتاری زۆریان لێ نەکات لە زەویدا ئێوە ماڵی دونیاتان دەوێ (بە وەرگرتنی فیدیە) وە خواش (پاداشتی) ڕۆژی دوایی دەوێ (بۆ ئێوە) وە خوا تواناو زاڵی کار دروستە. ، جا خوا دەستکەوتەکانی حەلاڵ کرد

تێبینی : خاوەنی تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز دەڵێ : هەڵبەتە ئەمە لە (صحیح مسلم) هاتووە

بەلام من تێبینم لەسەر هەیە چونکە تێك دەگیرێ لەگەڵ چەمکی ئایەتەکە و چەمکی ئایەتی ژمارە (٤) سورەتی (محمد) ناشبێ فەرموودەی پێغەمبەر لەگەڵ ئایەت تێکبگیرێ ، لە رووی سەندەوە تەواون ، لە رووی ناوەرۆکەوە لەگەڵ قورئاندا ناگونجێن یان لەگەڵ روحی شەریعەدا ناگونجێن .

ئایەتی (٤) سورەتی (محمد) ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ ۛ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَاْ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ٤﴾

واتە: (ئەم فەرمانەبۆ کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەیەك لەگۆرەپانی جەنگدا) جا کاتێك گەیشتن بەوانەی بێ باوەڕ بوون، بێنە دەست لێیان و لەگەردنیان بدەن (ئەگینا ئەوان ئێوە دەکوژن)، تا کاتێك کوشتاری زۆریان لێ دەکەن، ئینجا کەهێزیان نەما، بەدیل بیانگرن بەتوندی باڵبەستیان بکەن، ئەوسا یەکێك لەم دوو کارەیان لەگەڵدا ئەنجام بدەن: یان بەپیاوەتی و منەت، یاخود بەگۆڕینەوەو فیدیە ئازادیان بکەن، تا شەر کۆتایی دێت و ئاسەواری نامێنێت و دوژمنان چەك دادەنێن، بڕیارەکە ئاوهایە، ئەگەر خوا بیویستایە خۆی تۆڵەی لێ دەسەندن، بەڵام دەیەوێت بەیەکتر تاقیان بکاتەوە، ئەوانەش لەپێناوی خوادا شەهید بوون، هەرگیز پاداشتی هەوڵ و کۆششیان بەزایە نادات (ئاسان)

لەم ئایەتدا بەئاشکرای باسی وەرگرتنی (فیدیە) دەکات ، کەواتە خوا هیچ بواری نەهیشتۆتەوە کە بگوترێ خوا رەخنەی لە پێغەمبەرو هاوەلآن گرتووە بۆچی دیلەکانیان نەکوشتووە؟ بەڵکو رەخنەکە لەبەر ئەوە بووە کە نەدەبوو بەدیلیان بگرن تاکو لەپەل وپۆیان دەخستن وزۆریان لێ دەکوشتن.

وەهەروەها سوننەتی کردەیی پێغەمبەر وابوە دیلەی نەکوشتوون ، نەك هەر لەشەڕی بەدردا، بەڵکو لە شەرەکانیدیکەشدا ، یان بە قەرەبوو بەریداون یان بە خۆرایی ، لەفەتحی مەککە (٢٠٠٠) کەس بەدیل گیرا لەمزگەوتی حەرام دوایی ئازادی کردن ) تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز بەرگی حەوتەم لاپەر (٤٢٦-٤٢٧)

### ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٦٨ ) سورەتی (الانفال )

﴿لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٦٨﴾ الانفال

واتە: ئەگەر نووسراو(و بڕیار) ێك لە لایەن خواوە پێش نەكەوتایە (كە خۆش بووە لە گوناهەكانی بەشدارانی غەزای بەدر) بێگومان لەبەر ئەو (فیدیە) ی كە وەرتان گرت تووشتان دەبوو سزایەكی گەورە. (پوختەی تەفسیر)

بەڵام لە تەفسیری گوڵشەن دەڵێ:

(ئەی موسڵمانینە ! كە ئەمە كردەوەتان بوو، ئەگەر تەقدیری خودا لە عیلمی ئەزەلی خۆیدا وانەبوایە كە لە هەموو گوناهێكتان خۆش ببێت، بەهۆی ئەو كارەتانەوە دووچاری سزایەكی گەورە دەهاتن. هەندێك لە تەفسیرنووسان دەڵێن: ئەم عیتاب و گازاندەیە ڕوو لە پێغەمبەرە (صلی الله علیە وسلم) چونكە دوای تەواوبوونی شەڕەكە فەرمانی نەدا بە كوشتنی ئەو دیلانەی كە لە شەڕەكەدا گیرا بوون ، بەڵام لە ڕاستیدا وانیەو، هیچ عیتابێكی بۆ پێغەمبەر تێدا نیە، بەڵكو گازاندەكە لە موسڵمانەكانە، چونكە دیل ناكوژرێت، مەگەر دیلێك نەبێت كە پێشتر تاوانی زۆری زۆری ئەنجام دابێت و شایانی كوشتن بێت، بەڵگەیش ئەوەیە كە ئایەتەكە ئاڕاستەی موسڵمانەكان كراوە، نەك پێغەمبەری خودا (صلی الله علیە وسلم).

بۆ زیاتر ڕوونكردنەوە ئایەتی (٦٨) ش دێنین :

﴿فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٦٩﴾

واتە: كەواتە بخۆن لەوەی كە بە غەنیمەت گرتان حەڵاڵ و پاكە وە لە خوا بترسن بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە.

١-( عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ تَحِلَّ الْغَنَائِمُ لِقَوْمٍ سُودِ الرُّءُوسِ قَبْلَكُمْ كَانَتْ تَنْزِلُ النَّارُ مِنْ السَّمَاءِ فَتَأْكُلُهَا كَانَ يَوْمَ بَدْرٍ أَسْرَعَ النَّاسُ فِي الْغَنَائِمِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (لَوْلَا كِتَابٌ مِنْ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَالًا طَيِّبًا ) مسند أحمد:٧٤٢٧قال الشيخ الأرناؤوط : إسناده صحيح على شرط الشيخين و سنن الترمذي قال الالبانى صحيح

واته: لـه ئـەبو هـوریرەوە هـاتووە دەڵـێ : پێغەمبـەر فـەرمووی : دەستکەوتەکانی شـەر بـۆ گـەلانی سـەر رەش حـەلاڵ نـەبوو لـە پـێش ئێـوەدا، ئـاگر دادەبـەزی دەیسوتاند ، ڕۆژی بەدر خـەڵکی پەلـە یـان کـرد بـۆ دەستکەوتەکان ، خـواش ئـەو ئایەتەی دابەزانـدو فـەرمووی : (لَوْلَا كِتَابٌ مِنْ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَالًا طَيِّبًا) واتە: ئەگەر نووسراو(و بڕیار) ێك لە لایەن خواوە پێش نەکەوتایە (کە خۆش بووە لە گوناهەکانی بەشدارانی غـەزای بـەدر) بێگومـان لەبەر ئەو (فیدیە) ی کە وەرتان گرت تووشتان دەبوو سزایەکی گەورە.

٢-(لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا تَقُولُونَ فِي هؤلاء الأسارى؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَوْمُكَ وَأَهْلُكَ، اسْتَبْقِهِمْ وَاسْتَتِبْهُمْ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَتُوبَ عليهم، وقال عمر: يا رسول الله كذبوكَ وأخرجوكَ فقدمهم فاضرب أعناقهم، وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْتَ فِي وَادٍ كَثِيرِ الْحَطَبِ فَأَضْرِمِ الْوَادِي عَلَيْهِمْ نَارًا ثُمَّ أَلْقِهِمْ فِيهِ، قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يرد عليهم شيئاً، ثم قال فَدَخَلَ، فَقَالَ نَاسٌ: يَأْخُذُ بِقَوْلِ أَبِي بَكْرٍ، وَقَالَ نَاسٌ: يَأْخُذُ بِقَوْلِ عُمَرَ، وَقَالَ نَاسٌ: يَأْخُذُ بِقَوْلِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَوَاحَةَ؛ ثُمَّ خَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: "إِنَّ اللَّهَ لَيُلِينُ قُلُوبَ رِجَالٍ حَتَّى تَكُونَ أَلْيَنَ مِنَ اللَّبَنِ، وَإِنَّ اللَّهَ لَيُشَدِّدُ قُلُوبَ رِجَالٍ فِيهِ حَتَّى تَكُونَ أَشَدَّ مِنَ الْحِجَارَةِ، وَإِنَّ مَثَلَكَ يَا أَبَا بَكْرٍ كمثل إبراهيم عليه السلام قال: (من تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رحيم)، وَإِنَّ مَثَلَكَ يَا أَبَا بَكْرٍ

كَمَثَلِ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ قَالَ: (إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)، وإن مثلك يا عمر كمثل مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ قَالَ: (رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلاَ يُؤْمِنُواْ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ)، وإن مثلك يا عبد الله كَمَثَلِ نُوحٍ عَلَيْهِ السَّلَامُ قَالَ: (رَّبِّ لاَ تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً) أنتم عاله فلا ينفكن أَحَدٌ مِنْهُمْ إِلَّا بِفِدَاءٍ أَوْ ضَرْبَةِ عُنُقٍ، قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلَّا (سُهَيْلُ بْنُ بَيْضَاءَ) فَإِنَّهُ يَذْكُرُ الْإِسْلَامَ، فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَا رأيتني في يوم أخوف من أَن تَقَعَ عَلَى حِجَارَةٌ مِّنَ السَّمَاءِ مِنِّي فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ حَتَّى قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِلَّا سُهَيْلُ بْنُ بيضاء)، فأنزل اللَّهُ عزَّ وجلَّ: (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ (رَوَاهُ الإمام أحمد والترمذي والحاكم في المستدرك وقال: صحيح الإسناد ولم يخرجاه).

واته:له ڕۆژی بەدردا پێغەمبەر فەرمووی (چی دەڵێن دەربارەی دیلەکان ؟ ئەبوبەکر گوتی ئەی نێرراوی خوا خزم وقەومی تۆن ، داوای تۆبەیان لێ بکە بەڵکو خوا تۆبەیان لێ قەبوول بکا ، عومەر گوتی ئەی نێرراوی خوا تۆیان بەدرۆزن دناوە و دەریان کردوی با لەملیان بدەم ، عەبدوڵای کوری رەواحە گوتی لەو دۆڵە دار زۆرە بائاگر بکینەوە فرپیان بدینە ناو ئاگر ، دەڵێ پێغەمبەر بی دەنگ بوو ، وەڵامی نەدانەوە ، چووە ژوورەوە ، خەڵکی گوتیان: رای ئەبوبەکر وەردەگرێ ، هەندێ گوتیان رای عومەر وەردەگرێ ، هەندێ گوتیان رای عەبدوڵای کوڕی رەواحە وەردەگرێ ، پێغەمبەر هاتەوە لایان فەرمووی (خوا دڵی پیاوانێك نەرم دەکات وەك شیر نەرم ، وەخوا دڵی هەندێك رەق دەکات تاکو لە بەرد رەقترە دەبێ، ئەی ئەبوبەکر نموونەی تۆ وەك نموونەی (ابراهیم)ە سەلامی خوای لێ بێ کە گوتی (من تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رحيم) وە نموونەی تۆ ئەی ئەبوبەکر وەك نموونەی (عیسی) سەلامی خوای لێ بێ کە گوتی (إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن

تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) وەنموونــەی تــۆ ئــەی عومــەر وەك نموونــەی (موسی)یە سەلامی خوای لەسەربێ کە گوتی (رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلاَ يُؤْمِنُواْ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ) وە نموونــەی تــۆ ئــەی (عبــدالله) وەك نموونەی (نــوح) ســەلامی خــوای لەســەر بــێ کــە گــوتی (رَّبِّ لاَ تَذَرْ عَلَى الأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً) ئێوە ســەرکەوتوون ، کــەس بــەرنادرێ یــان دەبــێ فیدیــە بــدات یــان لەملی دەدرێ

ئیبنو مەسعود دەڵێ : گوتم ئەی نێرراوی خــوا تــەنها (سُهَيْلُ بْنُ بَيْضَاءَ) ئــەو باســی ئیســلامی دەکــرد، پێغەمبــەر بــێ دەنــگ بــوو ، ئــەو ڕۆژە لەبــەر ئــەو قســە ترســام لــەئاسمان بــەردم بەســەردا ببــارێ ، دوای پێغەمبــەر فــەرمووی: ، تــەنها (سُهَيْلُ بْنُ بَيْضَاءَ) نەبێ ، جا خوا ئــەم ئایەتــەی دابەزانــد (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ.

٣-عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَمَّا أُسِرَ الْأُسَارَى يَوْمَ بَدْرٍ أُسِرَ الْعَبَّاسُ فِيمَنْ أُسِرَ، أَسَرَهُ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، قَالَ: وَقَدْ أَوْعَدَتْهُ الْأَنْصَارُ أن يقتلوه، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي لَمْ أَنَمِ اللَّيْلَةَ مِنْ أَجْلِ عَمِّي الْعَبَّاسِ، وَقَدْ زَعَمَتِ الْأَنْصَارُ أَنَّهُمْ قَاتِلُوهُ) فَقَالَ له عمر: أفآتهم؟ فقال: (نعم)، فأتى عمر الأنصار، فقال لهم: أرسولا العباس، فقالواك لَا وَاللَّهِ لَا نُرْسِلُهُ، فَقَالَ لَهُمْ عُمَرُ: فَإِنْ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رِضًى، قَالُوا: فَإِنْ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رِضًى فَخُذْهُ، فَأَخَذَهُ عُمَرُ، فَلَمَّا صَارَ فِي يَدِهِ قَالَ لَهُ: يَا عَبَّاسُ أَسْلِمْ، فَوَاللَّهِ لَأَنْ تُسْلِمَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يُسْلِمَ الْخَطَّابُ، وَمَا ذَاكَ إِلَّا لَمَّا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يعجبه إسلامك، قال: وَاسْتَشَارَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَا بكر فيهم، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: عَشِيرَتُكَ فَأَرْسِلْهُمْ، فَاسْتَشَارَ عُمَرَ فَقَالَ: اقْتُلْهُمْ، فَفَادَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى) الآية (أخرجه ابن مردويه والحاكم في المستدرك وقال الحاكم: صحيح الإسناد). تفسير ابن كثير

*************************

## وتاری ژماره (٤٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٧٠) سورەتی (الانفال)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٠﴾ الانفال

واتە: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): بەو دیلانە بڵێ کە لەبەر دەستاندان، ئەگەر خوا خێر لە دڵەکانتاندا بەدی بکات، ئەوە زۆر لەوە باشترتان پێ دەبەخشێت کە لێتان وەرگیراوە، (ئەگەر باوەڕ بهێنن) لێتان خۆش دەبێت، خوایش لێخۆشبوو میهرەبانە.(ئاسان)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمَّا بَعَثَ أَهْلُ مَكَّةَ فِي فِدَاءِ أَسْرَاهُمْ، بَعَثَتْ زَيْنَبُ بِنْتُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي فِدَاءِ أَبِي الْعَاصِ، وَبَعَثَتْ فِيهِ بِقِلَادَةٍ كَانَتْ خَدِيجَةُ أَدْخَلَتْهَا بِهَا عَلَى أَبِي الْعَاصِ حِينَ بَنَى عَلَيْهَا. فَلَمَّا رَآهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَقَّ لَهَا رِقَّةً شَدِيدَةً وَقَالَ: إِنْ رَأَيْتُمْ أَنْ تُطْلِقُوا لَهَا أَسِيرَهَا وَتَرُدُّوا عَلَيْهَا الَّذِي لَهَا فَافْعَلُوا ، قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ. فَأَطْلَقُوه وَرَدُّوا عَلَيْهَا الَّذِي لَهَا. وَقَالَ الْعَبَّاسُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي كُنْتُ مُسْلِمًا ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اللهُ أَعْلَمُ بِإِسْلَامِكَ ، فَإِنْ يَكُنْ كَمَا تَقُولُ فَاللهُ يَجْزِيكَ، فَافْدِ نَفْسَكَ وَابْنَيْ أَخَوَيْكَ نَوْفَلَ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ وَعَقِيلَ بْنَ أَبِي طَالِبِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَحَلِيفَكَ

عُتْبَةَ بْنَ عَمْرِو بْنِ جَحْدَمٍ ، أَخُو بَنِي الْحَارِثِ بْنِ فِهْرٍ ، فَقَالَ: مَا ذَاكَ عِنْدِي يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: فَأَيْنَ الْمَالُ الَّذِي دَفَنْتَ أَنْتَ وَأُمُّ الْفَضْلِ فَقُلْتَ لَهَا: إِنْ أُصِبْتُ فَهَذَا الْمَالُ لِبَنِيَّ الْفَضْلِ وَعَبْدِ اللهِ وَقُثَمَ؟ ، فَقَالَ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُهُ، إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ مَا عَلِمَهُ أَحَدٌ غَيْرِي وَغَيْرُ أُمِّ الْفَضْلِ، فَاحْتَسِبْ لِي يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَصَبْتُمْ مِنْ عِشْرِينَ أُوقِيَّةٍ مِنْ مَالٍ كَانَ مَعِي ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَفْعَلُ فَفَدَى الْعَبَّاسُ نَفْسَهُ وَابْنَيْ أَخَوَيْهِ وَحَلِيفَهُ، وَأَنْزَلَ اللهُ فِيهَا (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنَ الْأَسْرَى إِنْ يَعْلَمِ اللهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِمَّا أُخِذَ مِنْكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (الأنفال: ٧٠)، وَأَعْطَانِي اللهُ مَكَانَ الْعِشْرِينَ الْأُوقِيَّةِ فِي الْإِسْلَامِ عِشْرِينَ عَبْدًا، كُلُّهُمْ فِي يَدِهِ مَالٌ يَضْرِبُ بِهِ، مَعَ مَا أَرْجُو مِنْ مَغْفِرَةِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ ، كَذَا فِيمَا حَدَّثَنَا بِهِ شَيْخُنَا أَبُو عَبْدِ اللهِ فِي كِتَابِ الْمُسْتَدْرَكِ ) البيهقي والحاكم والواحدي في اسباب النزول

واتە: لەعائیشەوە هاتووە خوا لێی رازی بێ دەڵێ : کاتێ خەڵکی مەککە پاریان نارد بۆ کرینەوەی دیلەکان ، (زینب)ی کچی پێغەمبەر بۆ کرینەوەی مێردەکەی کەناوی (ابی عاص) بوو ، ملوانەکەی خۆی نارد ، کەکاتی خۆی دیاری خدیجەی دایکی بوو ، کاتێ پێغەمبەر چاوی بە ملوانکەی زەمانی خدیجە کەوت سۆزی وبەزەیی جولا ، فەرمووی : ئەگەر ئێوە رازی بن مێردەکەی بۆ ئازاد بکەن و ملوانەکەشی بۆ بگێرنەوە ، گوتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەبی عاصیان بۆ بەردا و ملوانەکەشیان بۆ گێراندەوە ، (عباس) گوتی ئەی نێرراوی خوا من پێشتر موسڵمان بوویمە ، پێغەمبەر فەرمووی : خوا دەزانی بە موسڵمان بونت ، ئەگەر راست بکەی خوا پاداشتت دەداتەوە ، بەڵام ئەبێ فیدیە بدەی ، بۆ خۆت و دووبرازەکەت (نوفل و عەقیل) و هاوپیمانت (عوتبەی کوری عەمر) (عباس ) گوتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ماڵەم نیە ئەی نێرراوی خوا ، پێغەمبەر فەرمووی : ئەدی

ئەو پارەی تۆ و دایکی فەزل شارتانەوە ، پێت گوت : ئەگەر لەم شەڕە کوژرام ئـەو ماڵە با بـۆ (فـەزل و عبـدالله و قوسـەم) بـێ ، لـە کوێیـە؟ عـەباس گـوتی (والله) تـۆ پێغەمبەری خوای ، ئـەو شـتە جگـە لـەمن و دایکـی فـەزل کـەس نـازانێ ، جـا (٢٠) ئۆقەیەم لێ وەرگرە لەو ماڵەی پێمە، پێغەمبەر فەرمووی : وادەکەم ، جـا عـەباس فیدیەی خۆی ودوو برازاکەی وهاوپیمانەکـەی دا ، خـواش ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنَ الْأَسْرَى إِنْ يَعْلَمِ اللهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِمَّا أُخِذَ مِنْكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) واتـە: ئـەی پێغەمبـەر(صـلى الله عليـه وسلم): بەو دیلانە بڵێ کە لەبەر دەستاندان، ئەگەر خوا خێـر لـە دڵەکانتانـدا بـەدی بکات، ئەوە زۆر لەوە باشترتان پێ دەبەخشێت کە لێتان وەرگیراوە، (ئەگەر بـاوەڕ بهێنن) لێتان خۆش دەبێت، خوایش لێخۆشبوو میهرەبانـە ، عبـاس دەڵـێ خـوا لـە جیـاتی (٢٠) ئۆقیەکـە لـە نـاو ئیسـلامدا (٢٠) عەبـدی دامـێ و هـەموویان ماڵیـان لەدەست دابوو ، لەگەل ئومید بوونم بە لێخۆش بوونی خوا )

٢-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنَ الأَسْرَى إِنْ يَعْلَمِ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِمَّا أُخِذَ مِنْكُمْ كَانَ الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أُسِرَ يَوْمَ بَدْرٍ افْتَدَى نَفْسَهُ بِأَرْبَعِينَ أُوقِيَّةً مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ الْعَبَّاسُ حِينَ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ لَقَدْ أَعْطَانِي اللَّهُ خَصْلَتَيْنِ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِيَ بِهِمَا الدُّنْيَا: إِنِّي أُسِرْتُ يَوْمَ بَدْرٍ فَفَدَيْتُ نَفْسِي بِأَرْبَعِينَ أُوقِيَّةً فَأَعْطَانِي اللَّهُ أَرْبَعِينَ عَبْدًا وَأَنَا أَرْجُو الْمَغْفِرَةَ الَّتِي وَعَدَنَا اللَّهُ) اخرجه ابن ابي حاتم

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵـێ : ئـەو ئایەتـەی دەفـەرمووی (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنَ الأَسْرَى إِنْ يَعْلَمِ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِمَّا أُخِذَ مِنْكُمْ)واتـە: ئـەی پێغەمبـەر(صـلى الله عليـه وسـلم): بـەو دیلانـە بڵـێ کـە لەبـەر دەستاندان، ئەگەر خوا خێر لە دڵەکانتاندا بـەدی بکـات، ئـەوە زۆر لـەوە باشـترتان

پێ دەبەخشێت کە لێتان وەرگیراوە، (ئەگەر باوەڕ بهێنن) لێتان خۆش دەبێت، خوایش لێخۆشبوو میهرەبانە ، عەباس کوری عبدولمتەلیب یەکێ بوو لە دیلەکانی (بەدر) خۆی کریەوە بە (٤٠) ئۆقیە زێر ، عەباس دەڵێ : کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی خوا دوو شتی پێبەخشیم لە دونیا ، یەکەم : خۆم کریوە بە (٤٠) ئۆقیە ، خوا (٤٠) عەبدی پێ بەخشیم ، دووەم : وە ئومێدەوارم خوا لێم خۆش بێ لەو وەعدەی پێمانی داوە ، واتە ئەو وەعدەی لە ئایەتەکە هاتووە .

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٧٥) سورەتی (الانفال)

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٧٥﴾ الانفال

واتە: وە ئەوانەی لە دوایی دا بڕوایان هێناو کۆچیان کرد و لەگەڵ ئێوەدا تێکۆشان ئا ئەوانە لە ئێوەن وە ئەوانەی خزمی یەکترن هەندێکیان (بۆ میرات گرتن) شایستە ترن بە هەندێکی تریان لە کتێبی خوادا(قورئان یا لوح المحفوظ) بەڕاستی خوا بە هەموو شتێك زانایە (پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ : آخَى رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– بَيْنَ أَصْحَابِهِ وَوَرَّثَ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (وَأُولُو الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ) فَتَرَكُوا ذَلِكَ وَتَوَارَثُوا بِالنَّسَبِ) السنن الكبرى للبيهقي

واته: لەئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر لەنێوان هاوەڵان برایەتی کرد ، وهەندێك میراتی لە هەندێك دەگرت ، تاکو ئەم ئایەتە دابەزی (وَأُولُو الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ) جا وازیان هێنا لە میراتی برایەتی ، وبەخزمایەتی میراتیان لەیەکدی دەگرت .

٢–لە (الصحيح المسند من اسباب النزول)دا هاتووە :

(قوله تعالى:(وَأُولُوا الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ) الآية ٧٥، عن عكرمة عن ابن عباس قال آخى رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم بين أصحابه وورث بعضهم من بعض حتى نزلت (وَأُولُوا الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ) فتركوا ذلك وتوارثوا بالنسب)الحديث رواه الطبراني وقال الهيثمي في مجمع الزوائد ج٧ ص٢٨ ورجاله رجال الصحيح، ورواه ابن أبي حاتم ج٤ ص٢٥، ورواه الحاكم من حديث الزبير بن العوام وقال صحيح الإسناد، وأقره الذهبي

<u>تێبینی</u> :ئەم ئایەتە لە سورەتی (الاحزاب)ش هەیە.

١-( قَالَ الزُّبَيْرُ بْنُ الْعَوَّامِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: فِينَا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (وَأُولُو الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ) (الأحزاب: ٦) قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ آخَى بَيْنَ رَجُلٍ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَرَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ فَلَمْ نَشُكَّ أَنَّا نَتَوَارَثُ لَوْ هَلَكَ كَعْبٌ وَلَيْسَ لَهُ مَنْ يَرِثُهُ، فَظَنَنْتُ أَنِّي أَرِثُهُ وَلَوْ هَلَكْتُ كَذَلِكَ يَرِثُنِي) حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ (وَأُولُو الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ) (الأحزاب: ٦) اخرجه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي ، وسنن دارقطني

واتە: زوبێری کوڕی عەوام خوا لێی ڕازی بێ هاتووە دەڵێ : ئەو ئایەتە دەربارەی ئێمە دابەزیوە (وَأُولُو الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ) (الأحزاب: ٦) دەڵێ پێغەمبەر برایەتی کرد لە نێوان پیاوێکی ئەنصارو پیاوێکی موهاجیر ، هیچ

گومانمان نەبوو لەوە کە ئێمە میرات لێك دەگرین ، ئەگەر (کعب) مردبایە هیچ میراتگری نەبونایە گومانم وابوو من میراتی لیّ دەگرم ، وە ئەگەر منیش بمرم ئەو میراتم لیّ دەگریّ (دیارە ئەو دووانە کراون بەبرا ) تاکو ئەو ئایەتە دابەزی (وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ)

*************************

## وتاری ژماره (٥٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

**سورەتی (التوبه)**

له ریزبەندا ژماره(٩) و ژمارەی ئایەتەکانی (١٢٩) ئایەته.

سورەتی (التوبه) له چەند خالێکدا:

١–لەسورەتەکانی مەدینەیه ، له بوخاریدا هاتوه دواین سورەته دابەزیوه ، ئیبنو کەسیر دەڵێ سەرەتای ئەم سورەته لەپاش گەرانەوه له غەزای تەبوك دابەزیوه

٢–باسی چۆنیەتی موعامله دەکات لەگەڵ هاوبەشدانەران ،هەم دوو رووەکانی فەزح دەکات ،

٣–حوزیفه دەڵێ ئەونده دابەزی تاکو باسی هەموو شتێکی مونافیقانی کرد ، ابن عباس دەلێ پرسیارم کرد له ئیمامی (علی) بۆچی (بسم الله) تیدانیه ، گوتی چونکه (بسم الله) ئەمانه ئەم سورەتەش ئەمانی تێدانیه ، هەروەها باسی مزگەوتی زیرار دەکات بۆ دووبەرەکیان دروستیان کردبوو.

٤–ئایا سورەتی (التوبه) چەند ناوی هەیه؟ وەلاّم : توێژەرەوانی قورئان ئەڵێن نزیکەی (١٤) ناوی هەیه .

٥–ئایا بۆچی ناونراوه (التوبه)؟ وەلاّم : بۆیه ناونراوه تۆبه چونکه بۆ ئیماندارن تۆبەی تێدایه ، وەبۆ مونافیقان فەزاحەتی تێدایه.

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٩) سورەتی (التوبه)

﴿أَجَعَلۡتُمۡ سِقَايَةَ ٱلۡحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ كَمَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ لَا يَسۡتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٩﴾
التوبه

واتە: ئایا پێتان وایە ئاودان بە حاجییان و (سەرپەرشتی و) ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی بەرێز وەکو کەسێکە کە باوەڕی هێنا بێت بەخوا و بەڕۆژی دوایی و تێکۆشانی کردبێ لەڕێ ی خوادا؟ چوون یەك نین بەلای خواوە(و یەکسان نین) وە خوا ڕێنموونی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات.(پوختەی تەفسیر)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عن النُّعْمَان بْنُ بَشِيرٍ، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا أُبَالِي أَنْ لَا أَعْمَلَ عَمَلًا بَعْدَ الْإِسْلَامِ إِلَّا أَنْ أُسْقِيَ الْحَاجَّ، وَقَالَ آخَرُ: مَا أُبَالِي أَنْ لَا أَعْمَلَ عَمَلًا بَعْدَ الْإِسْلَامِ إِلَّا أَنْ أَعْمُرَ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَقَالَ آخَرُ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ أَفْضَلُ مِمَّا قُلْتُمْ، فَزَجَرَهُمْ عُمَرُ، وَقَالَ: لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، وَلَكِنْ إِذَا صَلَّيْتُ الْجُمُعَةَ دَخَلْتُ فَاسْتَفْتَيْتُهُ فِيمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ (التوبة: ١٩) الْآيَةَ إِلَى آخِرِهَا) رواه مسلم والطبراني

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە هاتووە دەڵێ : لەلای مینبەری پێغەمبەر بووم ، پیاوێك گوتی پاش موسڵمان بوونم ئەگەر هیچ کردەوەیەك نەکەم باکم نیە ، ئەگەر

ئاوبدەمـە حاجیـان ، یـەکی دیکـە گـوتی : پـاش موسـڵمان بـوونم ئەگـەر هـیچ کردەوەیەك نەکەم باکم نیـە ، ئەگـەر مزگـەوتی حـەرام ئاوەدان بکەمـەوە ، یـەکی دیکـە گـوتی : جیهـاد لـە پێنـاوی خـوا چـاکترە لـەوەی ئێـوە گوتـان ، عومـەر سەرزنشتەی کردو گوتی : دەنگتان بەرزمەکەنەوە لەلای مینبەری پێغەمبـەری خـوا ، ئەو ڕۆژە هەینی بوو، بەڵام ئەگەر نوێـژی هـەینیم کـرد ، دەچـمە ژوورەوە پرسـار دەکەم لـەوەی ئێـوە راجیـان ، جـا خـوا ئـەم ئایەتـەی دابەزاندوفـەرمووی (أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ)

٢-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَوْلُهُ: (أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ) (التوبة: ١٩) قَالَ الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ حِينَ أُسِرَ يَوْمَ بَدْرٍ: لَئِنْ كُنْتُمْ سَبَقْتُمُونَا بِالْإِسْلَامِ وَالْهِجْرَةِ وَالْجِهَادِ، لَقَدْ كُنَّا نَعْمُرُ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَنَسْقِي الْحَاجَّ، وَنَفُكُّ الْعَانِيَ، قَالَ اللَّهُ: (أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ) (التوبة: ١٩) . إِلَى قَوْلِهِ: (الظَّالِمِينَ) (التوبة: ١٩) يَعْنِي أَنَّ ذَلِكَ كَانَ فِي الشِّرْكِ، وَلَا أَقْبَلُ مَا كَانَ فِي الشِّرْكِ) اخرجه الطبري في (جامع البيان) و لباب المنقول للسيوطي وابن كثير في تفسيره .

واتە:لەئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : قسەی خوا کە دەفەرموێ (أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ)) عەباسـی مامی پێغەمبەر کاتێ دیل کـرا لەشـەڕی (بـەدر) گـوتی : ئەگـەر ئێـوە لـە موسـڵمان بوون وهیجرەت و جیهاد پـێش ئێمـە کـەوتوون ، ئـەوە ئێمـەش بێگومـان مزگـەوتی حەرامما ن ئاوەدان کردۆتەوە ، وە حاجیمان ئاوداوە، وخەڵکمان رزگارکردوە ، خـوا فـەرمووی (أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي

ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ) واته : ئەوانە لە زەمانی موشریکی بوون و کردەوەکانی سەردەمی شیرك وەرناگرم .

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٣٤) سورەتی (التوبه)

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۗ وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ٣٤) التوبه

واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بەڕاستی زۆر لە زاناو عابیدەکان (ی جوولەکە و گاوور) سامان و ماڵی خەڵکی دەخۆن بەناهەق و بەرگری (خەڵك) دەکەن لە ڕێگەی خوا وە ئەوانەی ئاڵتون و زیوو سەریەك دەنێن و کۆدەکەنەوە و بەختی ناکەن لە ڕێ ی خودا ئەوە موژدەیان پێ بدە بە سزایەکی ئازاردەر.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ مَرَرْتُ بِالرَّبَذَةِ فَإِذَا أَنَا بِأَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقُلْتُ لَهُ مَا أَنْزَلَكَ مَنْزِلكَ هَذَا قَالَ كُنْتُ بِالشَّأْمِ فَاخْتَلَفْتُ أَنَا وَمُعَاوِيَةُ فِي الَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ مُعَاوِيَةُ نَزَلَتْ فِي أَهْلِ الْكِتَابِ فَقُلْتُ نَزَلَتْ فِينَا وَفِيهِمْ فَكَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ فِي ذَاكَ وَكَتَبَ إِلَى عُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَشْكُونِي فَكَتَبَ إِلَيَّ عُثْمَانُ أَنْ اقْدَمْ الْمَدِينَةَ فَقَدِمْتُهَا فَكَثُرَ عَلَيَّ النَّاسُ حَتَّى كَأَنَّهُمْ لَمْ يَرَوْنِي قَبْلَ ذَلِكَ فَذَكَرْتُ ذَاكَ لِعُثْمَانَ فَقَالَ لِي إِنْ شِئْتَ تَنَحَّيْتَ فَكُنْتَ قَرِيبًا فَذَاكَ الَّذِي أَنْزَلَنِي هَذَا الْمَنْزِلَ وَلَوْ أَمَّرُوا عَلَيَّ حَبَشِيًّا لَسَمِعْتُ وَأَطَعْتُ ) رواه البخاري

واته: لەزیدی کوڕی وەهبەوە هاتووە دەڵێ : بەلای (الرَّبَذَةِ) تێپەریم گەیشتمە ئـەبو زەر خـوا لێـی رازی بـێ ، پـێم گـوت چـۆنە لێـرەی ، گـوتی لەشـام بـووم ، لەگـەڵ موعاویە کێشەم هەبوو دەربارەی ئەوانەی ماڵ کۆدەکەنەوە و نایبەخشن لـە ڕێگـای خوا، موعاویە گوتی : ئەم ئایەتە دەربارەی ئەهلی کیتـاب دابـەزیوە ، منـیش گـوتم دەربارەی ئێمە وئەوان دابەزیوە ، ئەوەبویە شتێك لەنێوانماندا ، ئـەویش نامەیـەکی بۆ (عوسمان) نوسی شکایەتی لێ کردم ، عوسمانیش نامەیەکی بۆم نوسـیوە ئـەڵێ وەرەوە مەدینە ، وامنیش هاتۆمەوە ، خـەڵکی لـێم کۆبونەتـەوە هـەر دەڵـێ منیـان نەبینیوە، ئەمنیش ئەوەم بۆ عوسمان باس کرد، گوتی : ئەگەر حەزدەکەی جـێگیر بە و نزیك بە لێمان ، بۆیە ئێستا وا لێرەم ئەگەر بەندەیەکی حەبەشیش فەرمانم پێ بکات گوێ رایەڵی دەبم.

٢-(عَنْ خَالِدِ بْنِ أَسْلَمَ قَالَ خَرَجْنَا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ أَخْبِرْنِي عَنْ قَوْلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا مَنْ كَنَزَهَا فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهَا فَوَيْلٌ لَهُ إِنَّمَا كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تُنْزَلَ الزَّكَاةُ فَلَمَّا أُنْزِلَتْ جَعَلَهَا اللَّهُ طُهْرًا لِلْأَمْوَالِ ) رواه البخاري

واته: لە خالیدی کوڕی ئەسلمەوە هاتووە دەڵێ : دەرچووین لەگەڵ عەبدوڵای کوری عومـەر خـوا لـە خـۆی وبـابی رازی بـێ ، عـەرەبێکی دەشـتەکی گـوتی : هـەواڵم پێگەیشتووە دەربارەی قسەی خوا کە دەفەرمووی (وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ) واتە : ئەوانەی زێرو زیو کۆدەکەنـەوە دوایـی لـە پێنـاوی خوا نایبەخشن ، ئیبنو عومەر گوتی : ئـەوەی کۆیانبکاتـەوە ، وزەکاتیـان لێنـەدا ، وەیل بۆ ئەوکەسە ، ئەو هەرەشە بۆ ئەو کاتە بوو کە هێشتا زەکات فـەرز نـەکرابوو ، جا کاتێ ئایەتی زەکات دابەزی خوای گێرای بەهۆی پاکبونەوە ماڵ .

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (٤٩) سورەتی (التوبه)

﴿وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ٤٩﴾ التوبه

واتە: دەگێڕنەوە پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی بە (جەددی کوڕی قەیس) کە یەکێك بوو لە پیاو ماقوڵ و سەرانی مەدینە لەگەڵیاندا بچێت بۆ تەبووك بۆ غەزای ڕۆمەکان، بەڵام جەددی ووتی: ئیزنم بدە با من نەیەم، چونکە من پیاوێکم زۆر حەزم لە ئافرەتەو دەترسم ئافرەتی ڕۆمەکان ببینم تووشی بەڵایەك ببم... جا ئەم فەرمایشتە دەفەرموێت: بەڕاستی با ئەوانە بزانن کە ڕۆچوون و کەوتوونەتە ناو قوڵایی بەڵای ڕۆژی دوایی... بێگومان دۆزەخ بە تەواوەتی دەورەی بێ باوەڕانی داوەو ڕێگای دەربازبوونیان نیە. واتە: بە مسۆگەری لە ڕۆژی قیامەتدا دەورەیان دەدات. (گوڵشەن)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا أَرَادَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَخْرُجَ إِلَى غَزْوَةِ تَبُوكَ قَالَ لِجَدِّ بْنِ قَيْسٍ: (يَا جَدُّ بْنَ قَيْسٍ، مَا تَقُولُ فِي مُجَاهَدَةِ بَنِي الْأَصْفَرِ؟) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي امْرُؤٌ صَاحِبُ نِسَاءٍ، وَمَتَى أَرَى نِسَاءَ بَنِي الْأَصْفَرِ أَفْتَتِنْ، فَأْذَنْ لِي وَلَا تَفْتِنِّي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي وَلَا تَفْتِنِّي أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ) (التوبة: ٤٩) الطبراني في المعجم الاوسط والبيهقي والطبري في جامع البيان وابن ابي حاتم في تفسيرة وقال الالباني اسناده حسن

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : کاتێ پێغەمبەر ویستی بڕوات بۆ شەڕی تەبووك ، فەرموویە بە (جەددی کوڕی قەیس ) ئەی جەددی کوڕی قەیس ئەی ڕات

چۆنە وچی دەڵێ دەربارەی جیهادکردن لەگەڵ بەنی ئەصفەر (واتە: ڕۆمەکان) ؟ جەددیش گوتی : ئەی نێرراوی خوا من پیاوێکم ئافرەتم هەنە ، وە ئەگەر چاوم بە ئافرەتی ڕۆمەکان بکەوێ توشی فتنە دەبم و خۆم پێ ڕاناگیرێ، ئەوجا لێم گەری مۆڵەتم بدە و توشی فتنەم مەکە، جا خوا ئایەتی دەربارە ناردەخوارەوە فەرمووی (وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي وَلَا تَفْتِنِّي أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ) واتە : وە هەندێ کەس لەوانە دەڵێن (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) ڕوخسەتم بدە(با نەیەم بۆ جیهاد) و تووشی گوناح و خراپەم مەکە ئاگاداربن(لە ئێستاوە) کەوتوونەتە ناو گوناح و خراپەوە و بێگومان دۆزەخ دەوری بێ باوەڕانی داوە.

### ٤- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٥٨ ) سورەتی ( التوبه )

(وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُوا۟ مِنْهَا رَضُوا۟ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا۟ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ٥٨) التوبه

واتە: پێشەوا (موسلیم)ئەڵێ: کاتێ پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستکەوتەکەی جەنگی (حونەین)ی دابەشکرد، پیاوێك لە دوو ڕووەکان هات و گوتی: موحەممەد ! .دادگەر بە ! ! بە ڕاستی تۆ پیاوێکی دادگەرنیت! پەیامبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ويلك إن لم أعدل فمن يعدل ؟) واتە: تیاچیت ! باشە ! ئەر من دادگەر نەبم، دەبێ کێ دادگەر بێ ؟ پاشانیش ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ومنهم من يلمزك فى الصدقات لە دوو ڕووەکاندا هەیە عەیبدارت دەکا لەدابەشکردنی سەدەقەداو بەدڵی ئەو نیە ! (فإن أعطوا منها رضوا) خۆ ئەگەر بەشی خۆیانیان لێبدرایە دڵشادو ڕازی دەبوون (وإن لم يعطوا منها إذا هم يسخطون)

و ئەگەر بەشیان نەدرابا لێی، دەبینی بەخێرایی تورەو قەڵسدەبن و ڕقت لێ هەڵدەگرن، وەك ئەو كابرایە لەخۆیەوە ئەوقسانەی تووڕدا(رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ بَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْسِمُ جَاءَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ ذِي الْخُوَيْصِرَةِ التَّمِيمِيُّ فَقَالَ اعْدِلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ وَيْلَكَ وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَهُ قَالَ دَعْهُ فَإِنَّ لَهُ أَصْحَابًا يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلَاتَهُ مَعَ صَلَاتِهِ وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِ ،يَمْرُقُونَ مِنْ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَّةِ يُنْظَرُ فِي قُذَذِهِ فَلَا يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ ثُمَّ يُنْظَرُ فِي نَصْلِهِ فَلَا يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ ثُمَّ يُنْظَرُ فِي رِصَافِهِ فَلَا يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ ثُمَّ يُنْظَرُ فِي نَضِيِّهِ فَلَا يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ قَدْ سَبَقَ الْفَرْثَ وَالدَّمَ آيَتُهُمْ رَجُلٌ إِحْدَى يَدَيْهِ أَوْ قَالَ ثَدْيَيْهِ مِثْلُ ثَدْيِ الْمَرْأَةِ أَوْ قَالَ مِثْلُ الْبَضْعَةِ تَدَرْدَرُ يَخْرُجُونَ عَلَى حِينِ فُرْقَةٍ مِنْ النَّاسِ قَالَ أَبُو سَعِيدٍ أَشْهَدُ سَمِعْتُ مِنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَشْهَدُ أَنَّ عَلِيًّا قَتَلَهُمْ وَأَنَا مَعَهُ جِيءَ بِالرَّجُلِ عَلَى النَّعْتِ الَّذِي نَعَتَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فَنَزَلَتْ فِيهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ ) متفق عليه

واتە: لەئەبی سەعیدی خودریەوە هاتووە دەڵێ: كاتێ پێغەمبەر دەستكەوتەكانی دابەش دەكرد (عبدالله كوڕی زی خوەیسیرە)ی تەمیمی هات گوتی : ئەی نێرراوی خوا دادگەربە، پێغەمبەر فەرمووی : واویلا بۆ تۆ، ئەگەر من دادگەرنەبم كێ دادگەرە ، عومەری كوڕی خەتاب گوتی : ئەی پێغەمبەر لێم گەرێ با لە ملی بدەم، پێغەمبەر فەمووی : لێی گەرێ هاوەڵانی وای هەن كە نوێژ دەكەن و رۆژوو دەگرن ، ئێوە نوێژو رۆژی خۆتان بەكەم دادەنێن لە چاو هی وان ، ئەوانە لە دین دەردەچن وەك چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێ هیچ خوێنی پێوە نیە، جا پێغەمبەر كۆمەڵێك

سیفاتی باس کردن ....، ئەبو سەعیدی خودری شایەدی دەدەم گوێم لە پێغەمبەر بوو، وە شایەدی دەدەم لەگەڵ (علی) شەڕم لەگەڵ کردن پیاوێکیان هێنا ئەو نیشانەی هەبوون کە پێغەمبەر پێ وەسف کردبوون.

****************************

# وتاری ژماره (٥١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٦٥) سورەتی (التوبه)

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ٦٥﴾ التوبه

واتـه: (ولـئن سـألتهم ) ئەگـەر لێیـان بپرسـیت: سـەبارەت بـە گاڵتـە کـردن بـەخواو ئایەتەکانی و پێغەمبەری خوا: (لیقولن إنما کنا نخـوض ونلعـب) ئـەڵێن: بەڕاسـتمان نەبووەو، بەڵکو تـەنها گاڵتـەو گـەپمان دەکـرد. (قـەتادە) دەڵێـت: لـەو دەمـەدا کـە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەرقاڵی خەزای (تەبووك) بوو، چـەند سـوارێك لـە دووڕووەکان بەبەردەمیا تێپەڕین و گوتیان: زۆر سەیرە ! ئـەم پیـاوە پێـی وایـە کـە کۆشـك و قـەڵای رۆمـەکان دەگـرێ ؟! هـای هـای لـەوە ! پاشـان ئـەم قسـەیە بـە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیشتەوە، ئـەویش بـانگی کـردن وگوتیـان: ئەمـە سوێندی بێ بەگاڵتەوە گوتومانە، ئەوسا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: (قـل أبالله وآیاته ورسوله کنتم تستهزؤن)( پێیان بڵێ: ئایا گاڵتـەتان بـەخواو ئایەتـەکانی و، بەپێغەمبەرەکەی کردبوو؟ واتـە: هـەر وتـەیکی کـوفرو ناشـیرین و ناقۆڵا لـەدەم دەرچێت، بێگومانە مرۆڤی پێ کافر دەبێت (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ فِي مَجْلِسٍ، مَا رَأَيْنَا مِثْلَ قُرَّائِنَا هَؤُلَاءِ أَرْغَبَ بُطُونًا وَلَا أَكْذَبَ أَلْسِنَةً وَلَا أَجْبَنَ عِنْدَ اللِّقَاءِ، فَقَالَ رَجُلٌ فِي الْمَجْلِسِ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ مُنَافِقٌ، لَأُخْبِرَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَنَزَلَ الْقُرْآنُ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: فَأَنَا رَأَيْتُهُ مُتَعَلِّقًا بِحَقَبِ نَاقَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، تَنْكُبُهُ الْحِجَارَةُ، وَهُوَ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ) تفسير ابن ابي حاتم ووالطبري في جامع البيان وابن كثير في تفسيره والوادعي في الصحيح المسند في اسباب النزول.

واتە: لەعەبدولاَّی کوڕی عومەرەوە هاتووە دەڵێ : لە خەزای تەبووك پیاوێك لە مجلیسێك گوتی : نەمان بینیوە وەك ئەو قورئان خوێنانەی ئێمە کە خەمی زگیتیان و درۆزنتر لەزمانیان و ترسنۆکتر لە کاتی رووبەڕووبونەوەدا ، پیاوێك لەم مەجلسدا گوتی : درۆدەکەی و تۆ مونافیقی ، بێگومان ئەم هەواڵە دەگەینمەوە پێغەمبەری خوا ، گەیشتەوە پێغەمبەرە ، و قورئان دابەزی ، عەبدولاَّی کوڕی عومەر دەڵێ : ئەو کەسم دیت خۆی بە وشتری پێغەمبەر هەڵواسی بوو لە بەردان دەخشا و دەیگوت : ئەی نێرراوی خوا ئێمە گالتەمان دەکرد ، پێغەمبەریش دەفەرموو (ئایا گالتە بە خوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی دەکەن ، هیچ بیانوو مەهێنەوە کوفرتان کرد پاش ئیمان هێنان .

٢-( وقال ابن إسحاق: كَانَ جَمَاعَةٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ مِنْهُمْ (وَدِيعَةُ بْنُ ثابت) ورجل من أشجع يقال له (مخشى بن حمير) يسيرون مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ مُنْطَلِقٌ إِلَى تَبُوكَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: أَتَحْسَبُونَ جِلَادَ بَنِي الْأَصْفَرِ كَقِتَالِ الْعَرَبِ

بَعْضِهِمْ بَعْضًا، وَاللَّهِ لَكَأَنَّا بِكُمْ غَدًا مُقَرَّنِينَ فِي الحبال، إرجافاً وترهيباً للمؤمنين، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ: (أَدْرِكِ الْقَوْمَ فَإِنَّهُمْ قَدِ احترقوا فاسألهم عَمَّا قَالُوا، فَإِنْ أَنْكَرُوا فَقُلْ بَلَى قُلْتُمْ كذا وكذا) فانطلق إليهم عمار فقال لهم ذلك، فَأَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يعتذرون إليه، فقال وديعة بن ثابت يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ، فقال مخشى بْنُ حُمَيِّرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَعَدَ بِيَ اسْمِي وَاسْمُ أَبِي، فَكَانَ الَّذِي عُفِي عَنْهُ في هذه الآية (مخشى بْنُ حُمَيِّرٍ) فَتَسَمَّى عَبْدَ الرَّحْمَنِ، وَسَأَلَ اللَّهَ أَنْ يُقْتَلَ شَهِيدًا لَا يُعْلَمُ بِمَكَانِهِ، فَقُتِلَ يوم اليمامة) تفسير ابن كثير ولباب المنقول للسيوطي

واتە: ئیبنو ئیسحاق دەڵێ : کۆمەڵێك لە مونافیقان وە لە ناویاندا (وەدیعەی کوڕی سابت) وە پیاوێك لە ئەشجع پێدەگوترا (مەحشی کوڕی حومەیر) دەرۆیشتن لەگەڵ پێغەمبەر بۆ خەزای تەبووك ، هەندێك بە هەندێکیان دەگوت ئایا پێتان وایە جەنگی رۆمەکان وەکو شەڕی عەرەبە ، سوێند بەخوا بەیانی دەست وپێتان دەبەسترێت بە گوریس ، بۆ ئەوە ئەو قسەیان کرد تاکو موسڵمان بترسێنن و وریان بروخێ ، پێغەمبەر فەرمووی بە (عەمماری کوڕی یاسر) برۆ لای ئەوانە بێگومان ئەوان بەهیلاك چوون ، پرسیاریان لێ بکە چیان گوتوە؟ ئەگەر نکۆلیان کرد ، بلێ نەخێر ئەوەو ئەوەتان گوتووە ، عەماریش چووە لایان و ئەوەی پێگوتن ، هاتنە لای پێغەمبەر عوزیان هێنایەوە بۆی ، (وەدیعی کوڕی سابت ) گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە بەگاڵتەمان بوو ، (مەخشی کوڕی حومەیر) گوتی : ئەی نێرراوی خوا(ناوی باوکم ناوی منی راگرتووە) ئەو کەسە بوو لەم ئایەتە عەفو کرا (مەخشی کوڕی حومەیر ) پێیان دەگوت (عبدالرحمن) داوای لەخوا کرد شەهید بێ و کەسیش شوێنەکەی نەزانێ ، لەرۆژی ئومامە شەهید بوو .

(احترق: هلك ، مقرنين : دەست وپی بەستران )

٣-(وَرُوِيَ أَنَّ مَخْشِيَّ بْنَ حِمْيَرٍ كَانَ فِي النَّفَرِ الَّذِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِمْ : ( وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ) فَأَتَى النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم وَتَابَ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى ، فَقَبِلَ اللَّهُ تَوْبَتَهُ ، وَهُوَ الطَّائِفَةُ الَّتِي عَنَى اللَّهُ تَعَالَى بِقَوْلِهِ :( إِنْ نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً ) فَهُوَ الَّذِي عَفَا اللَّهُ عَنْهُ ، وَسَأَلَ اللَّهَ تَعَالَى ، أَنْ يُقْتَلَ فِي سَبِيلِهِ ، وَلَا يُعْلَمَ بِمَكَانِهِ ، فَقُتِلَ يَوْمَ الْيَمَامَةِ ، وَلَمْ يُعْلَمْ مَوْضِعُهُ) المفصل في شرح حديث من بدل دينه فاقتلوه

واتە: گێردراوەتەوە کە (مەخشی کوڕی حیمەیر) لەو کەسانە بووە کە ئەم ئایەتەی دەربارە هاتە خوار (وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ) هاتە لای پێغەمبەر و تۆبەی کرد بۆ لای خوا ، وتۆبەکەی وەرگیرا و لەو کەسانە بوو خوا دەربارەیان دەفەرمووی(إِنْ نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً) واتە: کۆمەڵێك عەفو دەکەین و کۆمەڵێك عازاب دەدەین .

ئایەتەکە بەتەواوی (لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ (التوبة:٦٦)

واتە: بەهانە مەهێننەوە بەڕاستی ئێوە بێ بڕوا بوونەوە پاش بڕوا هێنانتان ئەگەر ببورین و چاوپۆشی بکەین لە کۆمەڵ و تاقمێکتان (بەهۆی گەڕانەوەتانەوە) سزای کۆمەڵ و تاقمێکی تر دەدەین لە بەرئەوەی بێگومان ئەوانە تاوانبار بوون. (پوختەی تەفسیر)

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٧٤) سورەتی (التوبه)

﴿يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ٧٤﴾ التوبه

واتە: دووڕووەکان سوێند دەخۆن بەخوا (ئەو وتانەی دراوەتە پاڵیان) نەیان وتووە سوێند بەخوا بێگومان وتەی بێ باوەڕییان وتووە وە بێ بڕوا بوونەتەوە لەپاش موسوڵمان بوونیان و نیازی شتێکیان بوو بەڵام بۆیان نەکرا(کوشتنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کاتی گەڕانەوەی لە تەبووك) وە هیچ ڕەخنە و ڕقێکیان نەبوو تەنها ئەوە نەبێ کە خواو پێغەمبەرەکەی(بڕوادارانیان) دەوڵەمەند کردووە لە بەهرەی خۆی ئینجا ئەگەر ئەوان بگەڕێنەوە و پەشیمان ببنەوە ئەوە چاکترە بۆیان وە ئەگەر ڕوو وەرگێڕن ئەوە خوا سزایان دەدات بە سزایەکی سەخت لە دنیاو پاشەڕۆژدا وە لە زەوی دا نی یە بۆ ئەوان هیچ دۆست و یارمەتی دەرێك.( پوختەی تەفسیر)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ الْجُلاسُ بْنُ سُوَيْدِ بْنِ الصَّامِتِ مِمَّنْ تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ- صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَقَالَ: لَئِنْ كَانَ هَذَا الرَّجُلُ صَادِقًا لنحن أشهر مِنَ الْحُمُرِ، فَرَفَعَ عُمَيْرُ بْنُ سَعْدٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ- صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- بِاللَّهِ لَقَدْ كَذَبَ عَلَيَّ عُمَيْرٌ وَمَا قُلْتُ: مَا قَالَ عُمَيْرُ بْنُ سَعْدٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدِ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا فَزَعَمُوا أَنَّهُ تَابَ وَحَسُنَتْ تَوْبَتُهُ، حَتَّى عُرِفَ مِنْهُ الْإِسْلَامُ وَالْخَيْرُ) اخرجه ابن ابي حاتم

# وتاری ژماره (٥٥) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠٨) سورەتی (التوبه)

﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ١٠٨﴾ التوبه

واتـه: هـەرگیز تـۆش ئـەی پێغەمبـەر! لـه مزگـەوتی وادا ڕامەوەستەو نوێژ مەکە دڵنیابە ئەو مزگەوتەیە مزگـەوتی قبـاو کـه هـەر یەکـەم ڕۆژ لەسـەر بناغـەی تـەقوا دامەزرا (أحق أن تقوم فيه) بەهەقترە تۆ نوێژی تیا بکەیت، هەتا مزگەوتی (ضیرار) لەم مزگەوتەدا کۆمەڵە پیاوێکی تێدایە لە پشتیوانان زۆر حەزیانە لەهـەموو چـڵك و چەپەڵیەك و، لەهەر تـاوان و گوناهێـك پـاك ببنـەوە دیـارە خـواش بۆخـۆی پاكـانی خۆش دەوێ (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( وَعَن أبي أَيُّوب وَجَابِر وَأنس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذِهِ الْآيَةِ (فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا، وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ) (التوبة: ١٠٨) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَثْنَى عَلَيْكُمْ خَيْرًا فِي الطُّهُورِ فَمَا طُهُورُكُمْ هَذَا؟) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ، وَالْغُسْلُ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَلْ مَعَ ذَلِكَ غَيْرُهُ؟) قَالُوا: لَا، غَيْرَ أَنَّ أَحَدَنَا إِذَا خَرَجَ مِنَ الْغَائِطِ أَحَبَّ أَنْ يَسْتَنْجِيَ بِالْمَاءِ، قَالَ: (هُوَ ذَاكَ)رواه الحاكم وابن ماجه والبيهقي والدار قطني وقال الالباني صحيح

واتە: لە ئەبو ئەیوب و جابیر و ئەنەسەوە هاتووە خوا لێیان رازی بێ ، ئەوانیش لـە پێغەمبەرەوە دەگێرنەوە سەبارەت بـەم ئایەتـە(فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا، وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ) پێغەمبەر فەرمووی : ئەی کۆمەڵی پشتیوانان بێگومان خـوا مـەدح وستایشـتان دەکـات لەسـەر پاکـژی وخـاوێنی ،ئـەوە چـۆن خۆتـان پـاك دەکەنـەوە ؟گوتیان : ئـەی نێـرراوی خـوا ، دەسـتنوێژ دەگـرین بـۆ نوێـژ، خۆمـان دەشۆین بۆ جەنابەت، پێغەمبەر فەرمووی ئایا جگە لەمە چـیتر دەکـەن؟ گوتیـان: نـەخێر ، جگـە لـەوە ئەگـەر چووینە سـەر ئـاو حەزدەکـەین بـە ئـاو جـوان خۆمـان بکەینەوە ، فەرمووی : ئەوەیە ئەو شتەی خوا مەدحتان دەکات.

## بەڵێ پاکژی نیوەی ئیمانە :

(الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ) رواه مسلم   واتە : پاك وخاوەێنی نیوەی ئیمانە

(مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ جَسَدِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِهِ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە: ئەوەی دەستنوێژێکی چاك بشوات گوناحەکانی لە لاشە دەردەچـن ، تـاکو لـە ژێر نینۆکەکانی دێنە دەرەوە.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (١١٣) سورەتی (التوبە)

(مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ١١٣) التوبە

واتە: بۆ پێغەمبەرو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، ڕەوا نیە داوای لێ خۆشـبوون بـۆ موشریك و هاوەڵگەڕان بکەن هەر چەندە ئەوانە خزمی نزیکیش بن، دوای ئەوەی کە

بۆیان ڕوون بۆتەوە کە بەڕاستی ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن (بەهۆی بێ دینی و تاوان و گوناهیانەوە).(ئاسان)

بوخاری ئەڵێ : ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبو تالیب هاتووتە خوار:

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

**١-(عن سَعِيد بْنُ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ جَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِأَبِي طَالِبٍ يَا عَمِّ قُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ يَا أَبَا طَالِبٍ أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ وَيَعُودَانِ بِتِلْكَ الْمَقَالَةِ حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ هُوَ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ وَأَبَى أَنْ يَقُولَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَا وَاللَّهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ الْآيَةَ ) متفق عليه**

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسیبەوە ئەویش لەبابی کە هەواڵی پێداوە : کاتێ ئەبو تالیب لەسەرە مەرگ بوو ، پێغەمبەر چووە لای دەبینی ئەبو جەهلی کوڕی هیشام وعەبدولاّی کوڕی ئەبی ئومەییە کوڕی موغیرە لەلایەتی ، پێغەمبەر فەرموویە ئەبی تالیب ئەی مامە بڵێ (لا اله الا الله) ئەو وشەیە بەڵگەیە بۆم شاهیدیت بۆ دەدەم لەلای خوا ڕۆژی قیامەت، ئەبوجەهل و عەبدولاّی کوڕی ئەبی ئومەییە گوتیان ئەی ئەبو تالیب واز لە ئایینی عبدالموتەلیب دەهێنێ ، پێغەمبەر بەردەوام ئەو قسەیەی بۆ دەخستە ڕوو ، ئەوانیش سەردانیان دەکرد قسەی خۆیان پێ دەگوت، تاکو ئەبو تالیب دواین قسەی ئەبو بمری لەسەر ئایینی عبدالموتەلیب ، ڕەفزی کرد بڵێ (لا اله الاالله) پێغەمبەر فەرمووی : سوێند بەخوا داوای لێبوردنی بۆ لەخوا دەکەم تا ڕێم

لێ نەگیری، جا خوا ئایەتی دابەزاندوفەرمووی (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ) واتە: ڕەواو شایستە نی یە بۆ پێغەمبەر و باوەڕداران کە داوای لێبوردن بکەن بۆ هاوبەش پەیداکەران با خزمی نزیکیشیان بن لە پاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەوتووە کە بێگومان ئەو (هاوبەش دانەرانە) هاوەڵ و پێڕی دۆزەخن.(پوختەی تەفسیر)

٢-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَوْلُهُ: مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا للمشركين وَكَانُوا يَسْتَغْفِرُونَ لَهُمْ حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ، فَلَمَّا نَزَلَتْ أَمْسَكُوا عَنِ الإِسْتِغْفَارِ وَلَمْ يَنْتَهُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلأَحْيَاءِ حَتَّى يَمُوتُوا ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ: وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لأَبِيهِ إِلا عَنْ مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ للَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ يَعْنِي اسْتَغْفَرَ لَهُ مَا كَانَ حَيًّا، فَلَمَّا مَاتَ أَمْسَكَ عَنِ الإِسْتِغْفَارِ) اخرجه ابن ابي حاتم في تفسيره والطبري في جامع البيان والطحاوي في مشكل الاثار (حسن)

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ ئەم ئایەتە(مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا للمشركين) موسڵمانان داوای ئیستغفاریان دەکرد تاکو ئەو ئایەتە دابەزی ، کە دابەزی وازیان هێنا بۆ مردوان ، بەڵام وازیان نەهێنا بۆ زیندوان تاکو دەمردن، دوایی خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لأَبِيهِ إِلا عَنْ مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ للَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ) واتە: وە داوای لێ خۆش بوونی ئیبراهیم بۆ باوکی تەنها لە بەر وادەو بەڵێنێك بوو کە بە باوکی دابوو(کە داوای لێبوردنی بۆ بکات) جا کاتێ بۆی ڕوون بوویەوە کە بێگومان باوکی دوژمنی خوایە خۆی لێ بەری کرد بەڕاستی ئیبراهیم زۆر لە خوا ترس و لەسەر خۆبوو.

یانی داوای لێبورنی بۆ دەکرد تا زیندو بوو، بەڵام کە مرد ، وازی هێنا لە ئیستغفار.

٣-( عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلًا يَسْتَغْفِرُ لِأَبَوَيْهِ، وَهُمَا مُشْرِكَانِ، فَقُلْتُ: لَا تَسْتَغْفِرْ لِأَبَوَيْكَ، وَهُمَا مُشْرِكَانِ. فَقَالَ: أَلَيْسَ قَدِ اسْتَغْفَرَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ وَهُوَ مُشْرِكٌ؟ فَذَكَرْتُهُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَزَلَتْ (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ، وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ، وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَنْ مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ، فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ) (التوبة: ١١٤ ) رواه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ ووافقه الذهبي ، والنسائي والترمذي واحمد قال الالباني حسن

واتە: لە عەلییەوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ : گوێم لە پیاوێك بوو داوای لێبوردنی بۆ دایك وبابی دەكرد ، ئەوانیش موشریك بوون ، پێم گوت : داوای لێبوردنیان بۆ مەكە، ئەوان موشریكن ، گوتی : بێگومان ئیبراهیم داوای لێبوردنی بۆ باوكی كردوە موشریكیش بووە؟ منیش بۆ پێغەمبەرم باسكرد ، جا ئەو ئایەتە دابەزی (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ، وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ، وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَنْ مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ، فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ)

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١١٧+١١٨ ) سورەتی ( التوبە )

(لَقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١١٧ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١١٨) التوبە

واتە: بێگومان خـوا تـەوبـەی وەرگـرت لـە پێغەمبـەر(صـلى اللـە عليـە وسـلم) و ئـەو کۆچەر و یاریدە دەرانەی کە شوێنی (پێغەمبەر(صلى اللـە عليـە وسـلم) کـەوتن لـە کاتی سەختی و ناڕەحەتیدا پاش ئەوەی نزیك بوو دڵی کۆمەڵێکیان لـە هـەق لابـدات پاشان خوا تەوبەی لیّ وەرگرتن بەڕاستی خوا لە گەڵیان دڵسۆز و میهرەبانـە.(١١٧) هەروەها (خوا تەوبەی وەرگرت) لەو سیّ کەسـەش کـە دواخـران (خـوا دەربارەیـان بڕیاری نەدابوو) هەتا ئـەو کاتـەی لێیـان تەسـك بوویـەوە زەوی بـەو فراوانیـەی کـە هەیەتی و بێزاربوون لە گیانی خۆشیان و زانیان هیچ پەناگەیەك نـی یـە لـە (سـزای) خـوا مەگـەر پـەنایی خـۆی پاشـان پەشـیمانی لـیّ وەرگـرتن (بـە دابەزانـدنی چـەند ئایەتێك) بۆ ئەوەی تۆبە بکەن بەڕاستی خوا هەمیشە تۆبە وەرگری میهرەبانە

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١ -(عن كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ يُحَدِّثُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ قِصَّةِ تَبُوكَ قَالَ كَعْبٌ لَمْ أَتَخَلَّفْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا إِلَّا فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ غَيْرَ أَنِّي كُنْتُ تَخَلَّفْتُ فِي غَزْوَةِ بَدْرٍ وَلَمْ يُعَاتِبْ أَحَدًا تَخَلَّفَ عَنْهَا إِنَّمَا خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرِيدُ عِيرَ قُرَيْشٍ حَتَّى جَمَعَ اللَّهُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ عَدُوِّهِمْ عَلَى غَيْرِ مِيعَادٍ وَلَقَدْ شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ حِينَ تَوَاثَقْنَا عَلَى الْإِسْلَامِ وَمَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهَا مَشْهَدَ بَدْرٍ وَإِنْ كَانَتْ بَدْرٌ أَذْكَرَ فِي النَّاسِ مِنْهَا كَانَ مِنْ خَبَرِي أَنِّي لَمْ أَكُنْ قَطُّ أَقْوَى وَلَا أَيْسَرَ حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْهُ فِي تِلْكَ الْغَزَاةِ وَاللَّهِ مَا اجْتَمَعَتْ عِنْدِي قَبْلَهُ رَاحِلَتَانِ قَطُّ حَتَّى جَمَعْتُهُمَا فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ وَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرِيدُ غَزْوَةً إِلَّا وَرَّى بِغَيْرِهَا حَتَّى كَانَتْ تِلْكَ الْغَزْوَةُ غَزَاهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَرٍّ شَدِيدٍ وَاسْتَقْبَلَ سَفَرًا بَعِيدًا وَمَفَازًا وَعَدُوًّا كَثِيرًا فَجَلَّى لِلْمُسْلِمِينَ

أَمْرَهُمْ لِيَتَأَهَّبُوا أُهْبَةَ غَزْوِهِمْ فَأَخْبَرَهُمْ بِوَجْهِهِ الَّذِي يُرِيدُ وَالْمُسْلِمُونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَثِيرٌ وَلَا يَجْمَعُهُمْ كِتَابٌ حَافِظٌ يُرِيدُ الدِّيوَانَ قَالَ كَعْبٌ فَمَا رَجُلٌ يُرِيدُ أَنْ يَتَغَيَّبَ إِلَّا ظَنَّ أَنْ سَيَخْفَى لَهُ مَا لَمْ يَنْزِلْ فِيهِ وَحْيُ اللَّهِ وَغَزَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تِلْكَ الْغَزْوَةَ حِينَ طَابَتْ الثِّمَارُ وَالظِّلَالُ وَتَجَهَّزَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ فَطَفِقْتُ أَغْدُو لِكَيْ أَتَجَهَّزَ مَعَهُمْ فَأَرْجِعُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا فَأَقُولُ فِي نَفْسِي أَنَا قَادِرٌ عَلَيْهِ فَلَمْ يَزَلْ يَتَمَادَى بِي حَتَّى اشْتَدَّ بِالنَّاسِ الْجِدُّ فَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ وَلَمْ أَقْضِ مِنْ جَهَازِي شَيْئًا فَقُلْتُ أَتَجَهَّزُ بَعْدَهُ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ ثُمَّ أَلْحَقُهُمْ فَغَدَوْتُ بَعْدَ أَنْ فَصَلُوا لِأَتَجَهَّزَ فَرَجَعْتُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا ثُمَّ غَدَوْتُ ثُمَّ رَجَعْتُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا فَلَمْ يَزَلْ بِي حَتَّى أَسْرَعُوا وَتَفَارَطَ الْغَزْوُ وَهَمَمْتُ أَنْ أَرْتَحِلَ فَأُدْرِكَهُمْ وَلَيْتَنِي فَعَلْتُ فَلَمْ يُقَدَّرْ لِي ذَلِكَ فَكُنْتُ إِذَا خَرَجْتُ فِي النَّاسِ بَعْدَ خُرُوجِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَطُفْتُ فِيهِمْ أَحْزَنَنِي أَنِّي لَا أَرَى إِلَّا رَجُلًا مَغْمُوصًا عَلَيْهِ النِّفَاقُ أَوْ رَجُلًا مِمَّنْ عَذَرَ اللَّهُ مِنْ الضُّعَفَاءِ وَلَمْ يَذْكُرْنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى بَلَغَ تَبُوكَ فَقَالَ وَهُوَ جَالِسٌ فِي الْقَوْمِ بِتَبُوكَ مَا فَعَلَ كَعْبٌ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ يَا رَسُولَ اللَّهِ حَبَسَهُ بُرْدَاهُ وَنَظَرُهُ فِي عِطْفِهِ فَقَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ بِئْسَ مَا قُلْتَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ إِلَّا خَيْرًا فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ فَلَمَّا بَلَغَنِي أَنَّهُ تَوَجَّهَ قَافِلًا حَضَرَنِي هَمِّي وَطَفِقْتُ أَتَذَكَّرُ الْكَذِبَ وَأَقُولُ بِمَاذَا أَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ غَدًا وَاسْتَعَنْتُ عَلَى ذَلِكَ بِكُلِّ ذِي رَأْيٍ مِنْ أَهْلِي فَلَمَّا قِيلَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ أَظَلَّ قَادِمًا زَاحَ عَنِّي الْبَاطِلُ وَعَرَفْتُ أَنِّي لَنْ أَخْرُجَ مِنْهُ أَبَدًا بِشَيْءٍ فِيهِ كَذِبٌ فَأَجْمَعْتُ صِدْقَهُ وَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَادِمًا وَكَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ فَيَرْكَعُ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ جَلَسَ لِلنَّاسِ فَلَمَّا فَعَلَ ذَلِكَ جَاءَهُ الْمُخَلَّفُونَ فَطَفِقُوا يَعْتَذِرُونَ إِلَيْهِ وَيَحْلِفُونَ لَهُ وَكَانُوا بِضْعَةً وَثَمَانِينَ رَجُلًا فَقَبِلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَانِيَتَهُمْ وَبَايَعَهُمْ

وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ وَوَكَلَ سَرَائِرَهُمْ إِلَى اللَّهِ فَجِئْتُهُ فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَيْهِ تَبَسَّمَ تَبَسُّمَ الْمُغْضَبِ ثُمَّ قَالَ تَعَالَ فَجِئْتُ أَمْشِي حَتَّى جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَقَالَ لِي مَا خَلَّفَكَ أَلَمْ تَكُنْ قَدْ ابْتَعْتَ ظَهْرَكَ فَقُلْتُ بَلَى إِنِّي وَاللَّهِ لَوْ جَلَسْتُ عِنْدَ غَيْرِكَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا لَرَأَيْتُ أَنْ سَأَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ بِعُذْرٍ وَلَقَدْ أُعْطِيتُ جَدَلًا وَلَكِنِّي وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ لَئِنْ حَدَّثْتُكَ الْيَوْمَ حَدِيثَ كَذِبٍ تَرْضَى بِهِ عَنِّي لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يُسْخِطَكَ عَلَيَّ وَلَئِنْ حَدَّثْتُكَ حَدِيثَ صِدْقٍ تَجِدُ عَلَيَّ فِيهِ إِنِّي لَأَرْجُو فِيهِ عَفْوَ اللَّهِ لَا وَاللَّهِ مَا كَانَ لِي مِنْ عُذْرٍ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ قَطُّ أَقْوَى وَلَا أَيْسَرَ مِنِّي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْكَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَّا هَذَا فَقَدْ صَدَقَ فَقُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِيكَ فَقُمْتُ وَثَارَ رِجَالٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ فَاتَّبَعُونِي فَقَالُوا لِي وَاللَّهِ مَا عَلِمْنَاكَ كُنْتَ أَذْنَبْتَ ذَنْبًا قَبْلَ هَذَا وَلَقَدْ عَجَزْتَ أَنْ لَا تَكُونَ اعْتَذَرْتَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَا اعْتَذَرَ إِلَيْهِ الْمُتَخَلِّفُونَ قَدْ كَانَ كَافِيَكَ ذَنْبَكَ اسْتِغْفَارُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَكَ فَوَاللَّهِ مَا زَالُوا يُؤَنِّبُونِي حَتَّى أَرَدْتُ أَنْ أَرْجِعَ فَأُكَذِّبَ نَفْسِي ثُمَّ قُلْتُ لَهُمْ هَلْ لَقِيَ هَذَا مَعِي أَحَدٌ قَالُوا نَعَمْ رَجُلَانِ قَالَا مِثْلَ مَا قُلْتَ فَقِيلَ لَهُمَا مِثْلُ مَا قِيلَ لَكَ فَقُلْتُ مَنْ هُمَا قَالُوا مُرَارَةُ بْنُ الرَّبِيعِ الْعَمْرِيُّ وَهِلَالُ بْنُ أُمَيَّةَ الْوَاقِفِيُّ فَذَكَرُوا لِي رَجُلَيْنِ صَالِحَيْنِ قَدْ شَهِدَا بَدْرًا فِيهِمَا أُسْوَةٌ فَمَضَيْتُ حِينَ ذَكَرُوهُمَا لِي وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُسْلِمِينَ عَنْ كَلَامِنَا أَيُّهَا الثَّلَاثَةُ مِنْ بَيْنِ مَنْ تَخَلَّفَ عَنْهُ فَاجْتَنَبَنَا النَّاسُ وَتَغَيَّرُوا لَنَا حَتَّى تَنَكَّرَتْ فِي نَفْسِي الْأَرْضُ فَمَا هِيَ الَّتِي أَعْرِفُ فَلَبِثْنَا عَلَى ذَلِكَ خَمْسِينَ لَيْلَةً فَأَمَّا صَاحِبَايَ فَاسْتَكَانَا وَقَعَدَا فِي بُيُوتِهِمَا يَبْكِيَانِ وَأَمَّا أَنَا فَكُنْتُ أَشَبَّ الْقَوْمِ وَأَجْلَدَهُمْ فَكُنْتُ أَخْرُجُ فَأَشْهَدُ الصَّلَاةَ مَعَ الْمُسْلِمِينَ وَأَطُوفُ فِي الْأَسْوَاقِ وَلَا يُكَلِّمُنِي أَحَدٌ وَآتِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأُسَلِّمُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي مَجْلِسِهِ بَعْدَ الصَّلَاةِ فَأَقُولُ فِي نَفْسِي هَلْ حَرَّكَ شَفَتَيْهِ بِرَدِّ السَّلَامِ عَلَيَّ أَمْ لَا ثُمَّ أُصَلِّي قَرِيبًا مِنْهُ فَأُسَارِقُهُ النَّظَرَ فَإِذَا أَقْبَلْتُ عَلَى صَلَاتِي أَقْبَلَ إِلَيَّ وَإِذَا الْتَفَتُّ نَحْوَهُ أَعْرَضَ عَنِّي حَتَّى إِذَا طَالَ عَلَيَّ ذَلِكَ مِنْ جَفْوَةِ النَّاسِ مَشَيْتُ حَتَّى

تَسَوَّرْتُ جِدَارَ حَائِطِ أَبِي قَتَادَةَ وَهُوَ ابْنُ عَمِّي وَأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَوَاللَّهِ مَا رَدَّ عَلَيَّ السَّلَامَ فَقُلْتُ يَا أَبَا قَتَادَةَ أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُنِي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَسَكَتَ فَعُدْتُ لَهُ فَنَشَدْتُهُ فَسَكَتَ فَعُدْتُ لَهُ فَنَشَدْتُهُ فَقَالَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ فَفَاضَتْ عَيْنَايَ وَتَوَلَّيْتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ الْجِدَارَ قَالَ فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي بِسُوقِ الْمَدِينَةِ إِذَا نَبَطِيٌّ مِنْ أَنْبَاطِ أَهْلِ الشَّأْمِ مِمَّنْ قَدِمَ بِالطَّعَامِ يَبِيعُهُ بِالْمَدِينَةِ يَقُولُ مَنْ يَدُلُّ عَلَى كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ فَطَفِقَ النَّاسُ يُشِيرُونَ لَهُ حَتَّى إِذَا جَاءَنِي دَفَعَ إِلَيَّ كِتَابًا مِنْ مَلِكِ غَسَّانَ فَإِذَا فِيهِ أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِي أَنَّ صَاحِبَكَ قَدْ جَفَاكَ وَلَمْ يَجْعَلْكَ اللَّهُ بِدَارِ هَوَانٍ وَلَا مَضْيَعَةٍ فَالْحَقْ بِنَا نُوَاسِكَ فَقُلْتُ لَمَّا قَرَأْتُهَا وَهَذَا أَيْضًا مِنْ الْبَلَاءِ فَتَيَمَّمْتُ بِهَا التَّنُّورَ فَسَجَرْتُهُ بِهَا حَتَّى إِذَا مَضَتْ أَرْبَعُونَ لَيْلَةً مِنْ الْخَمْسِينَ إِذَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْتِينِي فَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَعْتَزِلَ امْرَأَتَكَ فَقُلْتُ أُطَلِّقُهَا أَمْ مَاذَا أَفْعَلُ قَالَ لَا بَلْ اعْتَزِلْهَا وَلَا تَقْرَبْهَا وَأَرْسَلَ إِلَى صَاحِبَيَّ مِثْلَ ذَلِكَ فَقُلْتُ لِامْرَأَتِي الْحَقِي بِأَهْلِكِ فَتَكُونِي عِنْدَهُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِي هَذَا الْأَمْرِ قَالَ كَعْبٌ فَجَاءَتْ امْرَأَةُ هِلَالِ بْنِ أُمَيَّةَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هِلَالَ بْنَ أُمَيَّةَ شَيْخٌ ضَائِعٌ لَيْسَ لَهُ خَادِمٌ فَهَلْ تَكْرَهُ أَنْ أَخْدُمَهُ قَالَ لَا وَلَكِنْ لَا يَقْرَبْكِ قَالَتْ إِنَّهُ وَاللَّهِ مَا بِهِ حَرَكَةٌ إِلَى شَيْءٍ وَاللَّهِ مَا زَالَ يَبْكِي مُنْذُ كَانَ مِنْ أَمْرِهِ مَا كَانَ إِلَى يَوْمِهِ هَذَا فَقَالَ لِي بَعْضُ أَهْلِي لَوْ اسْتَأْذَنْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي امْرَأَتِكَ كَمَا أَذِنَ لِامْرَأَةِ هِلَالِ بْنِ أُمَيَّةَ أَنْ تَخْدُمَهُ فَقُلْتُ وَاللَّهِ لَا أَسْتَأْذِنُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَا يُدْرِينِي مَا يَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اسْتَأْذَنْتُهُ فِيهَا وَأَنَا رَجُلٌ شَابٌّ فَلَبِثْتُ بَعْدَ ذَلِكَ عَشْرَ لَيَالٍ حَتَّى كَمَلَتْ لَنَا خَمْسُونَ لَيْلَةً مِنْ حِينَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كَلَامِنَا فَلَمَّا صَلَّيْتُ صَلَاةَ الْفَجْرِ صُبْحَ خَمْسِينَ لَيْلَةً وَأَنَا عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِنَا فَبَيْنَا أَنَا جَالِسٌ عَلَى الْحَالِ الَّتِي ذَكَرَ اللَّهُ قَدْ ضَاقَتْ عَلَيَّ نَفْسِي وَضَاقَتْ عَلَيَّ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ سَمِعْتُ صَوْتَ صَارِخٍ أَوْفَى عَلَى جَبَلِ سَلْعٍ

بِأَعْلَى صَوْتِهِ يَا كَعْبُ بْنَ مَالِكٍ أَبْشِرْ قَالَ فَخَرَرْتُ سَاجِدًا وَعَرَفْتُ أَنْ قَدْ جَاءَ فَرَجٌ وَآذَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِتَوْبَةِ اللَّهِ عَلَيْنَا حِينَ صَلَّى صَلَاةَ الْفَجْرِ فَذَهَبَ النَّاسُ يُبَشِّرُونَنَا وَذَهَبَ قِبَلَ صَاحِبَيَّ مُبَشِّرُونَ وَرَكَضَ إِلَيَّ رَجُلٌ فَرَسًا وَسَعَى سَاعٍ مِنْ أَسْلَمَ فَأَوْفَى عَلَى الْجَبَلِ وَكَانَ الصَّوْتُ أَسْرَعَ مِنْ الْفَرَسِ فَلَمَّا جَاءَنِي الَّذِي سَمِعْتُ صَوْتَهُ يُبَشِّرُنِي نَزَعْتُ لَهُ ثَوْبَيَّ فَكَسَوْتُهُ إِيَّاهُمَا بِبُشْرَاهُ وَاللَّهِ مَا أَمْلِكُ غَيْرَهُمَا يَوْمَئِذٍ وَاسْتَعَرْتُ ثَوْبَيْنِ فَلَبِسْتُهُمَا وَانْطَلَقْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَتَلَقَّانِي النَّاسُ فَوْجًا فَوْجًا يُهَنُّونِي بِالتَّوْبَةِ يَقُولُونَ لِتَهْنِكَ تَوْبَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ قَالَ كَعْبٌ حَتَّى دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ حَوْلَهُ النَّاسُ فَقَامَ إِلَيَّ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ يُهَرْوِلُ حَتَّى صَافَحَنِي وَهَنَّانِي وَاللَّهِ مَا قَامَ إِلَيَّ رَجُلٌ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ غَيْرَهُ وَلَا أَنْسَاهَا لِطَلْحَةَ قَالَ كَعْبٌ فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَبْرُقُ وَجْهُهُ مِنْ السُّرُورِ أَبْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مَرَّ عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدَتْكَ أُمُّكَ قَالَ قُلْتُ أَمِنْ عِنْدِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمْ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ قَالَ لَا بَلْ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا سُرَّ اسْتَنَارَ وَجْهُهُ حَتَّى كَأَنَّهُ قِطْعَةُ قَمَرٍ وَكُنَّا نَعْرِفُ ذَلِكَ مِنْهُ فَلَمَّا جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِ اللَّهِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ قُلْتُ فَإِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِي الَّذِي بِخَيْبَرَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ إِنَّمَا نَجَّانِي بِالصِّدْقِ وَإِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ لَا أُحَدِّثَ إِلَّا صِدْقًا مَا بَقِيتُ فَوَاللَّهِ مَا أَعْلَمُ أَحَدًا مِنْ الْمُسْلِمِينَ أَبْلَاهُ اللَّهُ فِي صِدْقِ الْحَدِيثِ مُنْذُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْسَنَ مِمَّا أَبْلَانِي مَا تَعَمَّدْتُ مُنْذُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى يَوْمِي هَذَا كَذِبًا وَإِنِّي لَأَرْجُو أَنْ يَحْفَظَنِي اللَّهُ فِيمَا بَقِيتُ وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ إِلَى قَوْلِهِ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ فَوَاللَّهِ مَا أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنْ نِعْمَةٍ قَطُّ بَعْدَ أَنْ

هَدَانِي لِلْإِسْلَامِ أَعْظَمَ فِي نَفْسِي مِنْ صِدْقِي لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ لَا أَكُونَ كَذَبْتُهُ فَأَهْلِكَ كَمَا هَلَكَ الَّذِينَ كَذَبُوا فَإِنَّ اللَّهَ قَالَ لِلَّذِينَ كَذَبُوا حِينَ أَنْزَلَ الْوَحْيَ شَرَّ مَا قَالَ لِأَحَدٍ فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انْقَلَبْتُمْ إِلَى قَوْلِهِ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَى عَنْ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ قَالَ كَعْبٌ وَكُنَّا تَخَلَّفْنَا أَيُّهَا الثَّلَاثَةُ عَنْ أَمْرِ أُولَئِكَ الَّذِينَ قَبِلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ حَلَفُوا لَهُ فَبَايَعَهُمْ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ وَأَرْجَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمْرَنَا حَتَّى قَضَى اللَّهُ فِيهِ فَبِذَلِكَ قَالَ اللَّهُ وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا وَلَيْسَ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ مِمَّا خُلِّفْنَا عَنْ الْغَزْوِ إِنَّمَا هُوَ تَخْلِيفُهُ إِيَّانَا وَإِرْجَاؤُهُ أَمْرَنَا عَمَّنْ حَلَفَ لَهُ وَاعْتَذَرَ إِلَيْهِ فَقَبِلَ مِنْهُ ) متفق عليه

واته: ئیبنو ئیسحاق گوتویەتی زوهری (محمدی کوڕی موسلیمی کوڕی شیهاب) لە عەبدالرحمانی کوڕی عبداللە ی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە خوا لێیان رازی بێت هێناویەتی گوتویەتی: عبداللە ی بابی واتا : عبداللە بۆ عبدالرحمانی باسکردووەکە عبداللە ش دەستکێشی بابی بوە ، واتا دەسکێشی کەعبی کوڕی مالیك بووە ، دوای ئەوەی کە چاوی نەماوە ، چاوی لەدەستداون گوتویەتی : گوێم لە بابم بوو (کەعبی کوڕی مالیك )بوو، کە بەسەرهاتی خۆی دەربارەی بەجێمانی لە پێغەمبەری خوا لە جەنگی تەبوکدا دەگێرایەوە وە بەسەرهاتی دوو هاوەڵەکەی (میراری کوڕی رەبیع و هیلالی کوڕی ئومەییەی)دەگێرایەوە ، بەو شێوە گێرایەوە:

کەعب دەڵێ: من لە هیچ جەنگێك لە جەنگەکاندا کە پێغەمبەری خوا کردوونی هەرگیز لێی بەجێ نەماوم و بەژداربووم تەنیا لەجەنگی بەدر بەجێمام کە خوا سەرزەنشتەی کەسی نەکرد و هەروەها پێغەمبەر سەرزەنشتەی کەسی نەکرد کەبەجێ مابوون ، چونکە پێغەمبەری خوا کەدەرچوو بۆ جەنگی بەدر بەتەمای رێگرتن بەکاروانی قورەیشیەکان بوو، هەتا بێئەوەی کە بیانەوێ بەبێ مەعید دانان پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی لەگەڵ دوژمنەکەیدا (واتا سوپای قورەیشیەکان

بەفەرماندایەتی ئەبو جەهل ) کۆی کردنەوە ، کەعب دەڵێ ئەگەر نا من لە خزمەت پێغەمبەری خودا کاتێك کە پەیمانمان لەگەڵ بەست لە عەقەبە (کەمەبەستی پێی پەیمانی عەقەبەی دووەمە) لەوێ بەخزمەت پێغەمبەری خوا گەیشتم (واتا هەر لەو کاتەوە) کە حەزم نەدەکرد ئامادەبوونم لە پەیمانی عەقەبە بیگۆرمەوە بە ئامادەبوونم لە جەنگی بەدردا (واتا : ئەوم پێ گرنگتربوو کە بەراستی گرنگتریش بووە چونکە سەرەتای ئەو گرێبەستە کۆمەڵایەتیە بووە لەنێوان پێغەمبەری خوا لەلایەك و مسوڵمانانی مەدینە لەلایەکی دیکەوەدا بەستراراوە) هەرچەندە جەنگی بەدر زیاتر لە نێو خەڵکدا باسکراوە و ناو و شۆرەتی زیاتر بووە، دەڵێ: هەواڵی من لەکاتێك کە من لە پێغەمبەری خوا بەجێمام لە جەنگی تەبوکدا ئەوەبوو کە من هیچ کاتێك لەوکاتەدا بەهێزتر نەبووم وە هیچ کاتێك لەوکاتە دەسترۆیشتووتر نەبووم لەرووی ماڵ و سامانەوە ، کاتێك کەلەو جەنگە بەجێمام (واتا بەهۆی نەخۆشی یان تەنگدەستی بەجێ نەمام ) وە سوێند بەخوا هیچ کاتێکیش من دوو وڵاغی سواریم نەبوون دوو حوشتری سواری و باربەر(هەم بۆ بار هەم بۆ سواری لەم جەنگەدا خاوەنی دوو وشتران بووم دیارە کە وشتری ئەو کاتە لە جێی سیارەی زۆر مۆدێل بەرزی ئەم رۆژگارەی ئێمە بووە وەك چۆن یەکێك دەڵێ ئێمە دوو سەیارەمان هەن ئەویش دەڵێ دوو وشترم هەبوون) وە پێغەمبەری خوا کەمتر وابووە بچێت بۆ جەنگێك مەگەر ئاماژەی دەکرد بە شوێنێکی دیکە (نەك ئەو شوێنەی کەمەبەستە بۆ ئەوەی ئەگەر دوژمن بیستی وەك جۆرێك لە سەرلێ شێواندن بیت نەزانێ کە راستەوخۆ بەرەو ئەوێ دەچێت ، بۆ وێنە ئەگەر بەرەو لای راست چوبایە قسەیەکی دەکرد کە خەڵك وابزانێ بۆ لای چەپ دەچێت ) بەڵام بەنسبەت جەنگی تەبووکەوە پێغەمبەری خوا زۆر بەروونی مەبەست و ئامانجەکەی خۆی بەهاوەڵانی وت، چونکە پێغەمبەری خوا لە کاتێکدا کە گەرمایەکی زۆر بوو وەسەفەرێکی دووربوو وەبەرو

رووی دوژمنێك دەچوو كە ژمارەیان زۆر بوو كە ڕۆمەكان بوون وەبەخەڵكی فەرموو تاكو خۆیانی بۆ ئامادەبكەن. مسوڵمانانێكیش كە دوای پێغەمبەری خوا كەوتن بۆ جەنگ كە ژمارەیان زۆر بوو هیچ لیستێك نەیدەگرتنەوە ( واتا هێندە زۆر بوون كە ژمارەیان تۆمار نەكراوە كە بەپێی هەندێك ریوایەت ژمارەی سوپایەكەی پێغەمبەر (٣٠٠٠٠) هەزار كەس بووە).كەعب دەڵێ:بۆیە ئەگەر هەر كەسێك دیار نەبووایە ئامادەنەبوایە بۆ ئەو جەنگە گومانی وابوو كە ئەم شتە دەشاردرێتەوە و پەنهان دەبێت چونكە خەڵكێكی زۆر زۆر بوو ( تێیدا ون دەبوو) بەمەرجێك ئەو كەسەی كە نەچووە وەحی خوای پەنهانزانی دەربارە نەیەتە خوار وە پێغەمبەر كاتێك ئەو جەنگەی كرد كە میوە پێگەیشتبوون وە سێبەر خۆشەویست ببون وەك خەڵك حەزیان دەكرد بچنە بەر سێبەران .ئینجا پێغەمبەری خوا خۆی ئامادەكرد ئینجا مسوڵمانانیش لەگەڵیدا خۆیان ئامادەكرد منیش چومەوە تاكو خۆم ئامادە بكەم و بۆ ئەو جەنگە بچم ئیدی پێغەمبەر و ئەوان خەریكی خۆ ئامادەكردن بوون منیش هەر دەچوومەوە ماڵێ و ئیشەكەم بەدەستەوە نەدەهات لەدڵی خۆمدا دەموت من لەتوانامدا هەیە هەركاتێك ویستم خۆ ئامادە دەكەم ئیدی هەر بەو شێوەیە كاتەكە درێژەی كێشا هەتا خەڵك قۆڵیان هەڵمالی و خەریكی بەرێكەوتن بوون وە پێغەمبەر بەرێكەوت هەروەها مسوڵمانانیشی لەگەڵیدا ، من جارێ هیچم نەكردووە خۆم ئامادە نەكردووە هەر دەموت دوای پێغەمبەر منیش بە ڕۆژێك دوو ڕۆژان خۆم ئامادە دەكەم و بەپێغەمبەری خوا دەگەم .ئینجا دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشت هەردەچووم خۆم ئامادە بكەم دیسان چوومەوە هیچم نەكرد( واتا خۆم ئامادە نەكرد و بەرێ نەكەوتم) دوایی هەر چوومەوە و هیچم نەكرد هاتا ئەوان ڕۆیشتن و بەرێكەوتن و دوور كەوتنەوە ،ئینجا ویستم بەرێبكەوم و وڵاغەكەم بێنم و باری لی بنێم و فریایان بكەوم خۆزگە واشم بكردبایە بەڵام ئەوەشم نەكرد( وەك گوتراوە

پێیەکی دەبردە پێشێ و پێیەکی دەهێنایە دواوە) ئینجا دوای ئـەوەی ڕۆیشـتن کـە چوومە دەر بۆنێو خەڵکی و بەنێو خەڵکیدا گـەرام ئـەوە دڵتـەنگی کـردم کـە تـەنیا پیاوێکە کە تۆمەتبار کراوە بەوەی کە مونافیقە ئـەهلی نیفاقـە وە تـەنیا کەسانێکم دەبـینی کـە خـەڵکی بـێ هێـز و بـێ توانـان وە پۆزشـیان هێناوتـەوە و خـوای پەروەردیگار عوزری قەبووڵکردوون .دیارە پێغەمبەری خواش باسی مـنی نـەکردبوو تاکو گەیشتبوونە تەبووك لەوێ کە دادەنیشێ لەنێو کۆمەڵێکدا دەفەرموێت (کـەعبی کوڕی مالیك) چی کرد ؟

پیـاوێکیش لەبـەنی سـەلەمە دەڵێـت :بـەرگ و پۆشـاکە جوانەکـەی و تەماشـاکردنی ئەولا و ئەولای شانی (واتا ئەوەی کە ماڵ و سامانی هەیە و فیز و کەشخەی لێـداوە) ئەوە وایکردووە کەنەیەت ، موعازی کوڕی جەبەلیش دەڵێت قسەیەکی خراپـت کـرد بەخوا پێغەمبەری خوا ئێمە جگە لە چاکە لێمان نەزانیوە ، پێغەمبـەری خـواش بـێ دەنگ بووە .ئینجا کاتێك بیستم کە پێغەمبەری خوا لەجەنگی تەبووك دەگەڕێتـەوە (واتا بەرەو مەدینە ) ئینجا خەم و خەفەتم زۆر هاتە دڵ وەبیرم لـەوە کـردەوە ئایـا چۆن لە تورەیی پێغەمبەر بچمە دەر بەیانی کە دێتەوە ؟ وەراوێژم دەکرد بەهـەموو ئەوانەی کە خاوەن عەقڵ و بۆچوونی چاك بوون کە چی بڵێم چاکە ؟ درۆ بکەم یـان ڕاست بکەم؟

کاتێك گوتیان ئەوە پێغەمبەری خوا خەریکە بگاتەوە جێ هەرچی باتیل بوو لەدڵمدا لاچوو ( واتا کە پەنا ببەمە بەر درۆ و دەلەسە ) وەزانیم کە من بەراستگۆیی نـەبێت رزگـارم نـابێ ئیـدی بریارمـدا کـە ڕاسـتی لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا بڵـێم .ئینجـا پێغەمبەری خـوا دەمـەو بـەیان گەیشـتەوە مەدینـە ، کاتێك کەگەیشـتەوە مەدینـە عادەتی وابوو کە دەهاتەوە لەسەفەر دەچووە مزگەوت و دوو ڕکات نوێژی دەکـردن و دوایی دادەنیشت لەنێو خەڵکیدا ، کاتێك بەو شـێوەیە چـووە مزگـەوت و دانیشـت

لەنێو خەڵکیدا ئەوانەی کە بەجێ مابوون دەچوون بۆ خزمەتی و سوێندیان بۆ دەخوارد و پۆزشیان بۆ دەهێنایەوە کە ژمارەیان هەشتا و ئەوەندە پیاوە بوو ، پێغەمبەری خواش وەکو ڕواڵەتی خۆیان دەیانگوت کە عوزرمان هەبوو(یەك دەیگوت نەخۆشبووم یەك دەیگۆت پارەم نەبوو یەك دەیگۆت لە فلّان عەشیرەتە ترساوم بێنە سەر ماڵ وحاڵم) مامەڵەی لەگەڵدا کردن و داوای لێبوردنی بۆ لەخوا کردن و نهێنیەکانیشی حەواڵەی خوای پەنهانزان کردن .دەڵێ: ئینجا منیش چووم بۆ خزمەتی و سەلامم لێ کرد و پێغەمبەر زەردە خەنەیەکی هاتێ وەك زەردەخەنەی کەسێکی تورە، دوایی پێی فەرمووم: وەرە پێش منیش چووم هەتا لەپێشی دانیشتم ، پێی فەرمووم: چ شتێك تۆی بەجێ هێشت ئەی وڵاغی باربەرت نەکریبوو؟(واتا وڵاغی بار و سواریت نەبوو) منیش گوتم بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لەلای غەیری تۆ دانیشتبام لە خەڵکی دونیا دەمزانی چۆن خۆم لە توورەیی ئەو بە پۆزش هێنانەوەیەك دەرباز دەکەم وە بایی ئەوەندەش ڕەوانبێژی و قسەزانیم هەیە بەڵام بەخوا دەزانم ئەگەر ئەمڕۆ درۆت لەگەڵدا بکەم بۆ ئەوەی لێم ڕازی بیت نزیکە خوا وابکات تۆ لێم تورە بیت ، وەئەگەر ئێستا قسەیەکت بۆ بکەم کە ڕاست بێت بەڵام دڵی تۆی پێ نیگەران بێت ئومێدم وایە کە سەرەنجامم خێر بێت.

بەخوا من هیچ بیانوێکم نەبوو وە هەرگیز هیچ کاتێك لەم جارەم بەهێزتر نەبووم وەلە ڕووی دارایەوە حاڵم باشتر نەبووە کەلەتۆ بەجێ ماوم (واتا بەجێ ماوم و کەمتەرخەمیم کردووە و تەواو) پێغەمبەری خواش فەرمووی : ئەوەی کە گوتت ڕاستت کرد دە هەڵسە تاکو خوا لەبارەی تۆوە بڕیار دەدات، منیش هەڵسام وەك کۆمەلێك لە پیاوانی بەنی سەلەمە(واتا لەهۆزەکەی خۆی ) بەدوام کەوتن و پێیان وتم نەمانزانیوە کە پێش ئەو گوناحە کە تۆ گوناحت کردبێت وەتۆ دەسە پاچە

بوویت كه پۆزش بۆ پێغەمبەری خوا بێنیەوە بەو شێوەیەی كه ئەوان بەجێمابوون پۆزشیان بۆ هێنایەوە بۆ گوناهەكەشت ئەوەندە بۆتۆ بەس بوو كه پێغەمبەری خوا داوای لێبوردنت بۆ بكات .بەخوا هەر وا لەگەڵم خەریك بوون هەتا نزیك بوو بگەڕێمەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا و خۆم بەدرۆ بخەمەوە بڵێم ئەی پێغەمبەری خوا منیش بەهۆی ئەو شتە و ئەو شتە بەجی ماوم .دوایی پێم وتن: ئایا جگە لەمن كەسی دیكه ئەو هەڵوێستەی بووە ؟وتیان: بەڵێ دوو پیاوی دیكەش هەمان ئەو قسەی تۆیان كردووە وەهەمان شت كەبەتۆ گوتراوە بە ئەوانیش گوتراوە ، گۆتم :ئەو دوانە كێن ؟گۆتیان : (میرارەی كوری عەمر لەبەنی عەمری كوری عوف )و(هیلالی كوری ئومەییەی واقیفی)دووپیاویان بۆ ناو بردم كه دوو پیاوی چاك بوون بۆمن شایستە بوون كه بچم تەماشایان بكەم و بیانكەمە سەر مەشق ، بۆیە منیش بێ دەنگ بووم كاتێك ئەو دوانەیان بۆ باسكردم (واتا لەسەر هەڵوێستی خۆم كە ڕاستی گوتنە بەردەوام بووم).

وە پێغەمبەری خوا قەدەغەی كرد كه قسە لەگەڵ ئەوسێیانەماندا بكرێت لەنێو ئەو هەموو خەڵكەدا كه بەجێ مابوون ، ئەوانەی كه بەدرۆ عوزریان هێنایەوە دەهاتن و دەچوون و خەڵك قسەی لەگەڵدا دەكردن و قسەیان لێ دا نەبڕیبوون بەڵام ئەو سێیەمان پێغەمبەر فەرمووی: نابێ كەس بیان دوێنێت بۆیە خەڵك دووریان لێ كردین وە خەڵك لەگەڵمان گۆڕان هەتا واملێهات كه كەوڵی خۆم لی وەتەنگ هات وەزەویم لێ وەتەنگهات ئەو دونیا و زەویەی كه پێشتر دەمبینی ئەوەنەبوو كه من دەمبینی .

ئینجا بەم شێوەیە پەنجا شەو ماینەوە بەڵام دوو هاوەڵەكەم (واتا: هیلالی كوری ئومەییەی) و(میرارەی كوری رەبیع )وە بەبێ هێزیی و سەركزۆڵی لە ماڵی خۆیان دانیشتن (ئەوان دیارە بەتەمەنتر بوون ) زۆر بەخەفەتباری دانیشتن و نەدەچوونە

دەرێ ، بەڵام مـن چونکە لـەوان گـەنجتر بـووم و بـەهێزتربووم دەچـومە دەرێ وە نوێژەکانیشم لەگەڵ مسوڵمانانـدا دەکردن وە بـە بازارەکانیشـدا دەسوڕامەوە بـەڵام کەس قسەی لەگەڵدا نـەدەکردم وەدەچـومە لای پێغەمبـەری خـوا دوای ئـەوەی کـە نوێـژی دەکـرد لـەدوای نوێـژ دانیشـتن منـیش سـلاوم لـی دەکـرد ، لـەدڵی خۆمـدا دەمگوت ئایـا پێغەمبـەر لێـوی جوڵانـدن وەڵـامی سـلاوەکەم بداتـەوە یـان نا؟(واتـا بەئەسـپایی وەڵـامی داوەتـەوە) دوایـی لـەنزیك پێغەمبـەرەوە نوێـژم دەکـرد وە لـە دەرفەتدا تەماشام دەکرد کاتێـك مـن دەچـوومە نێـو نوێژەکەمـەوە هەسـتم دەکـرد پێغەمبەری خوا تەماشام دەکات بەڵام تەماشای نێـو چـاوی نـەدەکردم ، وە کاتێـك من ئـاوڕم لەپێغەمبـەر دەدایـەوە ڕووی لـیێ وەردەگێـرام، ئیـدی ئـەو دووریگرتنـەی مسوڵمانان لەمن وەقسە نەکردنیان لەگەڵ من درێـژەی کێشـا .تـاکو ڕۆژێـك چـوومە سەر دیواری باخێکی ئەبی قەتادە کە کوڕە مامم بوو کە نزیکترین و خۆشەویسـترین کەس بوو لەلام ،سڵاوم لێکرد بەخوا وەڵامی سڵاوەکەی نەدامەوە، گوتم: ئەی ئەبوو قەتادە خوات بەگژدا دەکەم یان بەخوا داوات لی دەکەم، ئایا پێت وایە کەمن خوا و پێغەمبەرەکەیم خۆشدەوێن ؟ بێ دەنگ بوو.دووبارە پێم گوتەوە ئایا پێتوایە کەمن خوا و پێغەمبەرەکەیم خۆشدەوێن؟دیسان بێ دەنگ بوو ، بۆ جاری سـێیەم دیسـان پێمگوتەوە، ئەویش گوتی: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن (ئایا خۆشـت دەوێـن یـان خۆشت ناوێن) کە وای گوت چـاوەکانم فرمێسـکیان پێـدا هـات ، وەبـازم دایـە سـەر دیوارەکە و هاتمەوە دوای هاتم بۆ بازار، لەکاتێکدا من بەبازاڕدا دەڕۆیشتم بەخـەم و خەفەتەوە بابایەکی (نەبتی) (ئەوانە بوون کە شتیان هێنـاوە لـە شـامەوە تەماشـام کـرد لـەمنی دەپرسـی دەیگـوت : کـێ کـەعبی کـوڕی مـالیکم پـیێ پیشـان دەدات ؟ خەڵکیش ئامارەیان بۆ کرد بۆلای مـن هـەتا هاتـە لام نامەیـەکی پێـدام لـە پادشـای غەسسـانەوە لـە پارچـە قوماشـێکی ئاوریشـمدا نامەیـەکی نوسـیبوو ئـەوەی تێـدا

نوسـيبوو( دوای ئـەوە پێمـان گەیشـتووە کـە هاوەڵەکـەت دووری لـەتۆ کـردووە و ناتدوێنێت خوا تۆی ناچار نەکردووە بەزەبوونی بژی وە تۆ بیٚ کەس و بیٚ شوێن نی وەرە بـۆ لای ئێمـە و ئێمـە دڵـت دەدەینــەوە و ئاگامـان لێـت دەبێـت، کاتێـك کـە خوێندمــەوە گـوتم : ئـەوەش تاقیکردنەوەیـەکی دیکەیـە ئایـا مـن گەیشـتوومەتە رادەیەك کە پیاوێك لە ئەهلی شیرك تەماع لەمن بکات ، بۆیە من نامەکەم بردە نێو تەندوریٚ و سوتاندم ، ئینجا بەم شێوەیەماینەوە تاکو چل شەو لە پەنجا شـەوەکە رۆیشت دوای ئەوە کە چل شەوەکە رۆیشت پێغەمبەر نوێنەرێکی ناردە لام وتی کـە پێغەمبەری خوا فەرمانت پیٚ دەکات کە دووری لە هاوسـەرەکەت بکـەیت ، وتم ئایـا تەلاقی بدەم یـان چـی لـیٚ بکـەم ؟ وتـی نـا تـەڵاقی مـەدە بـەڵام نزیکـی مەکـەوە ، هەروەها ناردی بۆلای دوو هاوەڵەکەشم بەهەمان شێوە منیش بە ژنەکەی خۆمم وت بچۆوە بـۆلای خـزم و کەسـت لـەلایان بـە تـاکو خـوا دەربـارەی مـن بڕیـار دەدات، وەخێزانی هیلالی کوڕی ئومەییەش چووبووە لای پێغەمبەری خوا و پێی گـوت ئـەی پێغەمبەری خوا هیلالی کوڕی ئومەییە پیاوێکی بەتەمەنە وخزمەتکاری نیە ئایا پێت ناخۆشە خزمەتی بکەم ؟ ئەویش فـەرمووبووی نـەخێر بـەڵام بـا نزیکـت نەکـەوێت ، ئەویش وتی ئەی پێغەمبەری خوا هیچ جوڵەی نەماوە (واتا توانی نەماوە سەرجێییم لەگەڵدا بکـات )بـەلاٚم هـەر دەکرێـت لـەو کاتـەوە ئـەوە لێـی ڕویـداوە تـا ئـەمرۆ وە تەنانەت من مەترسی ئەوەم لێی هەیە کە چاوەکانی لەسەر دابنیٚ هێنـدە دەگرێـت، ئینجـا هێنــدێك لــە خــزم و کەســم بــەمنیان وت ئەگــەر تــۆ مۆڵــەت وەربگــری لــە پێغەمبەری خوا بۆ ئەوەی خێزانەکەت لەلات بێـت چـونکە مۆڵـەتی داوە بـۆ هیلالـی کوڕی ئومەییە تاکو خێزانەکەی خزمەتی بکات ، منیش گوتم: بـەخوا داوای مۆڵـەتی لـیٚ ناکـەم کـە هاوسـەرەکەم لـەلام بێـت چـونکە مـن نـازانم پێغەمبـەری خـوا چـی دەفەرموێت، لەکاتێکدا من پیاوێکی گەنجم(یانی گەر داوای لێبکەم خێزانم لەلام بێت

رەنگە مۆڵەتم نەدات)ئیدی (١٠) شەوی دیکەش بەو جۆرە ماینەوە و پەنجا شەو تەواو بوو ، لەوکاتەوە کە پێغەمبەری خوا بە مسوڵمانانی قەدەغەکردبوو کە قسەمان لەگەڵدا بکەن.

دوای ڕۆژێك نوێژی بەیانیم کرد، بەیانی شەوی پەنجایەمین لەسەر پشتی خانوێك لە خانوەکانمان، بەو حاڵەی کە خوای بەبەزەیی باسی کردووە، کە دونیاو سەر زەویمان لێ وە تەنگ هاتبوو، وە نەفسی خۆشم و کەوڵی خۆم لێ وەتەنگ هاتبوو ، منیش چادرێکم هەڵدابوو لەسەر (سلع) (شوێنێکە لە نزیك مەدینە) لەوێ دەمامەوە، گوێم لێ بوو بانگ کەرێك بانگی دەکرد، زۆر بەدەنگی بەرز بانگی دەکرد ، دەیگوت ئەی (کعب کوڕی مالیك ) موژدەت لێ بێ، منیش یەکسەر سوجدەم برد، زانیم ئەوە خوای میهربان دەرووی لێ کردمەوە، پێغەمبەری خوا خەڵکی ئاگادار کردبۆوە ، ئیدی خەڵك دەهاتن موژدەیان پێ دەداین،منیش چەند کەسێکی موژدەر هاتن، موژدەیان پێ دەداین، وە چەند کەسێکی موژدەر چوون بۆ لای دوو هاوەڵەکەم، وەپیاوێکیش بەسواری ئەسپ کە موژدەم پێ بدات، یەکێکیش بە پیادە هات،لە هۆزی ئەسلەم، هەتا چووە سەر شاخێك، دیارە دەنگەکە خێرا تر بوو لە ئەسپەکە، لەوێرا بانگی کرد،ئینجا ئەو کەسەی کە بەبانگکردن موژدەی پێدام هات، ئەو دوو پۆشاکەی لەبەرم دابوون (واتە:سەرو خوار)، ئەم دوو پۆشاکەم دانان ، دوو پۆشاکی دیکەم بە ئەمانەت وەرگرتن ، دوو پۆشاکەی خۆم وەکو موژدانە دان دام بەو کەسەی بەدەنگی بەرز موژدەی پیدام ،دوای ڕۆیشتم بەرەو پێغەمبەری خوا، وە خەڵك پێم دەگەیشت موژدەی تۆبە قەبوول کردنیان پێ دەدام، دەیانگوت دڵخۆشبە بەوەی خوا لێت خۆش بووە، تاکو چوومە ناو مزگەوت پێغەمبەری خوا دانیشتبوو وخەڵکیش لە دەورەی ، دەڵێ : تەلحەی کوڕی عبیداللە هەڵسا سلاوی لێکردم وە پیرۆز بایی لێ کردم، بەخوا لە کۆچکەران هیچ پیاوێك هەڵنسا جگە لەو

، (كعب) دەڵێ: كاتێك سلاوم له پێغەمبەری خوا كرد، پێی فەرمووم : لە كاتێكدا كه ڕووی دەدرەوشایەوه و فەرمووی: موژدت لێ بەباشترین ڕۆژت لەو ڕۆژەوە كه دایكت تۆی بووه، منیش گوتم ، ئایا لەلایەن تۆوەیە یان له لایەن خواوه، فەرمووی لەلایەن خواوەیە، (كعب) دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەرچی هەمه لە ماڵ وسامانی دونیا هەمووی دەبەخشمه خوا و پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی : هەندێكی بهێڵەوه بۆ تۆ باشتره، گوتم : ئەو بەشەی خەیبەر دەهێڵمەوه ، گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا ، خوا منی بەهۆی راستگۆی رزگار كرد، بەڵێن بێ تاكو ماوم تەنها راستی بڵێم . وه دەڵێ: مەبەست لە ئایەتەكه ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ.......(١١٨)التوبه﴾ مەبەست ئەوه نەبوو كه لەجەنگ دواخرابین ،بەڵكو مەبەست ئەوەیە خوا ئێمەی دوا خستبوو بریارمان لەبارەوه بدات،دوای ئەوەی ئەوانی دیكه چووبوونه لای پێغەمبەر داوایان لێكرد ، كه داوای لێبوردنیان بۆ بكات ، پێغەمبەریش لێ قەبوول كردبوون. (له تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێزه وەرگیراوه له تەفسیر سورەتی التوبه)

## سورەتی هود

ئەم سورەتە مەککەیە، لە ریزبەندا ژمارە(١١) یە ، ژمارەی ئایەتەکانی (١٢٣) ئایەتە. باسی چیرۆکی (هود) پێغەمبەر دەکات بۆیە بەم ناوە نراوە

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤﴾ هود

واتە: وە نوێژ ئەنجام بدە لەم سەرو ئەوسەری ڕۆژدا و لە بەشێك لە شەودا چونكە بەڕاستی (كردەوە) چاكەكان (كردەوە) خراپەكان لادەبەن ئەوە پەند و ئامۆژگاری یە بۆ پەند وەرگران.

(عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ أَنَّ رَجُلًا أَصَابَ مِنْ امْرَأَةٍ قُبْلَةً فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَقِمْ الصَّلَاةَ طَرَفَيْ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنْ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ فَقَالَ الرَّجُلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِي هَذَا قَالَ لِجَمِيعِ أُمَّتِي كُلِّهِمْ) صحيح البخاري و الصحيح المسند ولباب المنقول

وفي رواية (عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنِّي عَالَجْتُ امْرَأَةً فِي أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَإِنِّي أَصَبْتُ مِنْهَا مَا دُونَ أَنْ أَمَسَّهَا وَأَنَا هَذَا فَاقْضِ فِيَّ مَا شِئْتَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ سَتَرَكَ اللَّهُ لَوْ سَتَرْتَ عَلَى نَفْسِكَ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا، فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ فَأَتْبَعَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً، فَدَعَاهُ فَتَلاَ عَلَيْهِ (وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ

ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ: هَذَا لَهُ خَاصَّةً؟ قَالَ: لاَ، بَلْ لِلنَّاسِ كَافَّةً) رواه الترمذي قال الالباني صحيح حسن

واته: له عەبدولاّی کوڕی مەسعودەوە هاتووە دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر گوتی: من چارەسەری ئافرەتێکم دەکرد لەو سەری شاری، منیش ماچم کرد ، وە پەشیمانم هاتووم تۆڵەم لێ وەرگرەوە ، پێشەوا عومەر فەرمووی : خوا تۆی داپۆشیەوە بۆچی گوناحەت دەردەخەی؟ پێغەمبەر بێ دەنگ بوو، کابرا ڕۆیشت ، پێغەمبەر هاوەڵێکی بەدوانارد ، ئەم ئایەتە دابەزی (وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ) پیاوێك گوتی : ئەی نێرراوی خوا ئەم بڕیارە تایبەتە بۆ ئەو کەسە؟ فەرمووی : نەخێر گشتیە بۆ هەموو کەسێ.

تێبینی: ئەم کابرایە زۆر پەشیمان بویەوە، تۆبەیەکی ڕاستەقینەی کرد تەنانەت ئامادەی تۆڵەکردنەوە بوو ، بۆیە ناکرێت ئینسان چاوی لە ناموسی خەڵکی بێ.

***************************

# وتاری ژماره (٥٦) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

تێبینی : ئەمە دەبێتە دوو وتار چونکە درێژە

سورەتی (یوسف) سورەتێکی مەککی یە ، لە ریزبەندەی (١٢) یە ، ژمارەی ئایەتەکانی (١١١)ئایەتە

-ئایا بۆچی ناونراوە (یوسف)؟ چونکە باسی چیرۆکی یوسف پێغەمبەرو ژیانی پێغەمبەران دەکات

-خوا بەپێغەمبەر دەفەرمووی : جوانترین چیرۆکت بۆ دەگێرینەوە: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ٣﴾یوسف

-ئەم سورەتە (٤) خەونی تێدایە (١-خەونی یوسف ٢-خەونی پاشا ٣+٤-خەونی دوو بەندکراوەکانی لەگەڵ یوسف بوون.

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٣) سورەتی یوسف)

﴿الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ١ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ٢ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ٣ ﴾ یوسف

واتە: بە (ئەلیف ، لام ، ڕا) دەخوێنرێتەوە ئەمانە نیشانەکانی کتێبی ئاشکران.(١) بەڕاستی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە قورئانێك بە عەرەبی بۆ ئەوەی ژیربن و لێ ی تێ بگەن(٢) ئێمە دەگێڕینەوە بۆ تۆ جوان ترین چیرۆك و بەسەرهات لەڕێگای ئەم

قورئانەوە نیگامان کردووە بۆت هەرچەندە تۆ لەپێش (هاتنی) ئەم قورئانـەدا لـەبێ ئاگایان بووی(٣) (پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: (أُنْزِلَ الْقُرْآنُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَتَلَا عَلَيْهِمْ زَمَانًا، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ قَصَصْتَ عَلَيْنَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينَ) (يوسف: ١) إِلَى قَوْلِهِ: (نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ) (يوسف: ٣) فَتَلَاهَا عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَمَانًا، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ حَدَّثْتَنَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُتَشَابِهًا) (الزمر: ٢٣) الْآيَةَ، كُلُّ ذَلِكَ يُؤْمَرُونَ بِالْقُرْآنِ) و قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَكِّرْنَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ (أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ(الحديد: ١٦ ) رواه ابن حبان والحاكم قال الالباني حسن وقال ارنؤط اسناده قوي . قال الحاكم هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ ووافقه الذهبي

واتە: لە موسعەبی کوڕی سەعدەوە ئەویش لەباببیەوە دەڵـێ: قورئـان بـۆ پێغەمبـەر دادەبـەزی ، ئـەویش بەسـەر هـاوەڵانی دەخوێنـدەوە ماوەیـەك ، دوایـی هـاوەڵان گوتیـان : ئـەی نێـرراوی خـوا بـەڵکو چـیرۆکمان بـۆ بخوێنیـەوە ، جـا خـوا بـۆی دابەزاندن وفەرمووی (الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينَ) (١) إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ٢ (نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ) (يوسف: ٣) پـاش ماوەیـەك گوتیان : ئەی نێرراوی خـوا بـەڵکو فەرمایشـتمان بەسـەردا بخوێنیتـەوە ، جـا خـوا ئەمـەی دابەزانـد وفـەرمووی (اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُتَشَابِهًا.....(الزمـر٢٣) واتە: خوا جوانترین فەرمایشتی ناردۆتـە خـوارەوە قورئانێکـە (کـە ئایەتـەکانی) لـە

یەکچـووی دووپـات کراوەن)،هـەموو ئەوانـە فـەرمانیان پێکـراو لـە قورئـان ، دوای گوتیان : ئەی نێرراوی خوا یادی خوامان بیرخەرەوە ، جائـەم ئایەتـە دابـەزی (أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلُ فَطَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ) واتە: ئایا وەختی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران کە دڵیان ملکەچـی بـێ بـۆ ئامۆژگـاری خـوا و ئـەو قورئانـەی کـە ناردویەتیـە خـوارەوە؟ وەك ئـەو کەسـانە (جوولەکـەو گـاوور) مـەبن کـە لەمـەوپێش کتـێبی ئاسمانیـان پێـدرا وە ماوەیـەکی دووروو درێژیان بەسـەردا تێپـەڕی ئینجـا دڵیـان ڕەق بـوو وە زۆربـەیان یـاخی و لـە سنوور دەرچوون.

### پێشەوا عومەر ڕۆژێك دەیەوێت تەورات بخوێنێتەوە:

(عەبدوڵڵای کوڕی سابت) دەڵێ: (عومەر) هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتـی: برادەرێکـی هـۆزی بـەنی قـورەیزەم کورتـەو پوختەیـەکی (تـەورات)ـی بـۆ نووسیوم، ئایا ڕێم پێدەدەی بۆتی بخوێنمەوە؟ پێغەمبەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) ڕەنگ و ڕوخساری پیرۆزی گۆڕا. عەبدوڵڵا دەڵێ: بەعومەرم گوت: نابینی ڕوخسـاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەتووڕەییدا چۆن گۆڕا؟! عومەر وتی: (رضينا بالله ربا، وبالإسلام دينـا، وبحمد رسولا) پاشـان پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) فـەرمووی: سـوێند بـەو زاتـەی کـە گیـانی موحەممـەدی بەدەسـتە، ئەگـەر ئێسـتا (مووسا)یش بێتەوە ناوتان و، پەیڕەوی لێبکەن و، پشت لـەمن بکـەن، گـومڕاو لاڕێ دەبن. ئێوە لەناو ئوممەتەکاندا بەشی منن، منیش لەناو پێغەمبەرانا بەشی ئێـوەم) رواه احمد.

ئەمەش دەقەکەیەتی : (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ جَاءَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي مَرَرْتُ بِأَخٍ لِي مِنْ بَنِي قُرَيْظَةَ فَكَتَبَ لِي جَوَامِعَ مِنْ التَّوْرَاةِ أَلَا أَعْرِضُهَا عَلَيْكَ قَالَ فَتَغَيَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ فَقُلْتُ لَهُ أَلَا تَرَى مَا بِوَجْهِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ عُمَرُ رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَسُولًا قَالَ فَسُرِّيَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَصْبَحَ فِيكُمْ مُوسَى ثُمَّ اتَّبَعْتُمُوهُ وَتَرَكْتُمُونِي لَضَلَلْتُمْ إِنَّكُمْ حَظِّي مِنْ الْأُمَمِ وَأَنَا حَظُّكُمْ مِنْ النَّبِيِّينَ (رواه احمد )

## سورەتی ( الرعد ):

سورەتی (الرعد) سورەتێکی مەککی یە ، لە ریزبەندا ژمارە (١٣) یە ، ژمارەی ئایەتەکانی (٤٢)ئایەتە

–ئایا بۆچی ناونراوە (الرعد)؟ وەڵام : چونکە باسی دیاردەی هەورە تریشقە دەکات

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٣) سورەتی (الرعد)

(وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مِنۡ خِيفَتِهِۦ وَيُرۡسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمۡ يُجَٰدِلُونَ فِي ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلۡمِحَالِ ١٣) الرعد

واتە: وە هەورە گرمە سوپاس و ستایشی ئەو (خوا) دەکات هەروەها فریشتەکانیش لە هەیبەت و ترسی ئەو (خوا ستایشی دەکەن) وە (پەروەردگار) هەورە بروسکەکان دەنێرێ و دەیدات لە هەر کەسێ کە بیەوێ لە کاتێکدا ئەوانە دەمە

دەمێ دەکەن دەربارەی خوا و ئەو (خوا) هێزو توانای زۆر بەتینە.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِهِ إِلَى رَأْسٍ مِنْ رُؤُوسِ الْمُشْرِكِينَ يَدْعُوهُ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَقَالَ لَهُ الْمُشْرِكُ: هَذَا الْإِلَهُ الَّذِي تَدْعُو إِلَيْهِ مَا هُوَ؟ مِنْ ذَهَبٍ هُوَ أَمْ مِنْ فِضَّةٍ؟ قَالَ: فَتَعَاظَمَ مَقَالَةُ الْمُشْرِكِ فِي صَدْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَانْتَهَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَاللَّهِ لَقَدْ بَعَثْتَنِي إِلَى رَجُلٍ سَمِعْتُ مِنْهُ مَقَالَةً لَهُ لَيَتَّكَادُنِي أَنْ أَقُولَهَا، قَالَ لَهُ: (ارْجِعْ إِلَيْهِ) . فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَرَجَعَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا زَادَنِي عَلَى مَا قَالَ لِي. قَالَ: (ارْجِعْ إِلَيْهِ) . فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ. قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَيْهِ صَاعِقَةً مِنَ السَّمَاءِ فَأَهْلَكَتْهُ، وَرَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَدْرِي، فَانْتَهَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَهْلَكَ صَاحِبَكَ بَعْدَكَ) . فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَنْ يَشَاءُ وَهُمْ يُجَادِلُونَ فِي اللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ) (الرعد: ١٣) الاسماء والصفات للبيهقي والسنن الكبرى للنسائي والطبراني في المعجم الاوسط والبزار ومسند ابو يعلى الموصلي وقال حسين سليم اسيد استاده صحيح

واتە: لەئەنەسەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر پیاوێکی لە هاوەڵانی ناردە لای یەکێ لە سەرانی موشریکان ، بانگی کرد بۆ لای دینی خوا، موشریکەکە گوتی : ئەو پەرستراوەی تۆ بانگەوازی بۆ دەکەی چییە؟ ئایا ئەو لە زێرە یان لە زیوە ، ئەو قسە لەسەر نێرراوەکەی پێغەمبەر قورس بوو ، هاتەوە لای پێغەمبەر گوتی : ئەی

نێـرراوی خـوا ، بێگومـان تـۆ منـت ناردۆتـه لای پیاوێـك قسـه‌یه‌كی وایكـرد خۆزگـه ده‌خوازم قسه نه‌كه‌م ، پـێ فـه‌رموو (بگـه‌ڕێوه لای) گه‌ڕایـه‌وه لای ، هـه‌مان قسـه‌ی كردوه ، گه‌ڕایه‌وه لای پێغه‌مبه‌ر ، گوتی: سوێند به‌خوا ئه‌ی نێرراوی خـوا ، ئـه‌وه‌ی پێ گوتم هیچی لێ زیاد نه‌كرد( واته: هـه‌مان قسـه‌ی كـردوه) فـه‌رمووی : (بگـه‌ڕێوه لای) گه‌ڕایه‌وه لای ، كابرا هه‌مان شتی پێ گوته‌وه ، ده‌ڵێ خواش هه‌وره تریشقه‌ی بۆ دابه‌زاند له ئاسمان وله‌ناوی برد ، وه نوێنه‌ری پێغه‌مبه‌ری خواش نه‌ی ده‌زانی ، كه گه‌ڕایه‌وه لای پێغه‌مبه‌ر ، پێ فه‌رموو(له‌پاش تۆ خوا هاوه‌ڵه‌كه‌تی له‌ناوبرد ،جا خـوا ئـه‌م ئایه‌تـه‌ی نـارده‌خواره‌وه(وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَنْ يَشَاءُ وَهُمْ يُجَادِلُونَ فِي اللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ)

٢-(عَن أَنَسٍ، قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّم رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِهِ إِلَى رَجُلٍ مِنْ عُظَمَاءِ الْجَاهِلِيَّةِ يَدْعُوهُ إِلَى اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فَقَالَ: أَيْش رَبُّكَ الَّذِي تَدْعُو إِلَيْهِ؟ مِنْ نُحَاسٍ هُوَ؟ مِنْ حَدِيدٍ هُوَ؟ مِنْ فِضَّةٍ هُوَ؟ مِنْ ذَهَبٍ هُوَ؟ فَأَتَى النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّم فَأَخْبَرَهُ فَأَعَادَهُ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّم الثَّانِيَةَ ، فَقَالَ: مِثْلَ ذَلِكَ فَأَتَى النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّم فَأَخْبَرَهُ فَأَرْسَلَهُ إِلَيْهِ الثَّالِثة فَقَالَ: مِثْلَ ذَلِكَ فَأَتَى النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّم فَأَخْبَرَهُ فَأَرْسَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَلَيْهِ صَاعِقَةً فَأَحْرَقَتْهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّم: إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَدْ أَرْسَلَ عَلَى صَاحِبِكَ صَاعِقَةً فَأَحْرَقَتْهُ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَنْ يَشَاءُ وهم يجدلون في الله، وهُو شديد المحال) رواه البزار

واتـه: لـه ئه‌نه‌سـه‌وه هـاتووه ده‌ڵـێ : پێغه‌مبـه‌ر پیـاوێكی لـه هـاوه‌ڵانی نـارده لای پیاوێكی گه‌وره‌ی جاهیله‌كان تاكو بانگی بكات بۆ لای خوا، كابرا گوتی : خـوای تـۆ له‌چییه؟ ئایا ئه‌و له مسه؟ یان یان له زیوه ؟ یان له زێـره؟ هاتـه‌وه لای پێغه‌مبـه‌ر قسه‌ی كابرای بـۆ گێڕایـه‌وه ، پێغه‌مبـه‌ر دووبـاره ناردیـه‌وه ، كـابرا هـه‌مان قسـه‌ی

کردوه، ئەویش دووبارە قسەکەی بۆ پێغەمبەر گێرایەوە، پێغەمبەر جاری سێیەم ناردیەوە ، هەمان قسەی کردوە ، هاوەڵەکەش قسەکەی بۆ پێغەمبەر گێرایەوە، خواش هەورە تریشقەیەکی ناردەی سەری سوتاندی ، پێغەمبەر فەرمووە هاوەڵەکە (خوا هەورە تریشقەی ناردە سەر هاوەڵەکەت سووتاندی ) جا ئەو ئایەتە دابەزی (وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَنْ يَشَاءُ وهم يجدلون في الله، وهُو شديد المحال)) واتە: وە هەورە گرمە سوپاس و ستایشی ئەو (خوا) دەکات هەروەها فریشتەکانیش لە هەیبەت و ترسی ئەو (خوا ستایشی دەکەن) وە (پەروەردگار) هەورە بروسکەکان دەنێرێ و دەیدات لە هەر کەسێ کە بیەوێ لە کاتێکدا ئەوانە دەمە دەمێ دەکەن دەربارەی خوا و ئەو (خوا) هێزو توانای زۆر بەتینە.

**دوعای هەورە تریشقە:**

(وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالْمَلائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ)

عن عبد الله بن الزبير رضي الله عنهما أَنَّهُ كَانَ إِذَا سَمِعَ الرَّعْدَ تَرَكَ الْحَدِيثَ وقال: (وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالْمَلائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ) (الرعد: ١٣) ثُمَّ يَقُولُ: إِنَّ هَذَا لَوَعِيدٌ شَدِيدٌ لِأَهْلِ الْأَرْضِ) رَوَاهُ مَالك

صحيح (تخريج الكلم)

**********************

## وتاری ژماره (٥٧) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### سورەتی ( ابراهیم )

سورەتی (ابراهیم) سورەتێکی مەککی یە وەك (ابن عباس) فەرموویەتی جگە لە دوو ئایەت نەبێ لە مەدینە دابەزیون ئەم دوو ئایەتەش دەبارەی کوژاروەکانی بەدر دابەزیون کە ئەمانەن (أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ٢٨ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ٢٩ ) ابراهیم

–ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژماره (١٤) یە ، ژمارەی ئایەتەکانی (٥٢) ئایەتە.

–ئایا بۆچی ناونراوە (ابراهیم)؟ وەلاّم :

چونکە باسی (ابراهیم) پێغەمبەر دەکات و باسی شکاندنی بتەکان دەکات .

### ١- هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٧ ) سورەتی ( ابراهیم )

(يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ٢٧) ابراهیم

واتە: جا ئەوانە کە باوەڕیان بەخواو بەگشت بڕیارەکانی خوا هێناوە، بەهۆی ئەم وشە جێگرو نەگۆڕاوەی (لا اله إلا لله)وە خوا پێگەیان قایم و تابت دەکا لەژیانی ئەم دونیاو، لەژیانی ئەودونیا و ستەمکارانیش گومڕاو سەرلێشێواو دەکات خوا بیەوێ هەرشتێ بکات، زۆر بەئاسانی دەیکات، حەز بکا کێ رێنموونی بکاو، کێیش گومڕاو سەرلێشێواو بکا، ئەمانە هەموو لە دەسەلاّتی ئەودان. پێشەوا (بوخاریی) ئەم فەرموودەیە دێنێ و دەلێت: موسلمان هەر کە خرایە گۆڕەوەو پرسیاری لێکرا، خێرا

بەهۆی راستی دنیایەوە شایەتمانێکی راست و بەهەق دێنیّ، مەبەستیش بەم ئایەتە کە خوا دەفەرمویّ: هەر ئەمەیە، بۆیە لەوکاتە ناسك و تەنگەدا وەڵامی پرسیارەکانی گۆڕی بۆئاسان دەکاو، لە گشت گرفتەکان دەیپارێزیّ. بەڵام مرۆڤی لارو لاسارو خوانەناس کە خرایە گۆڕەوەو پرسیارەکانی لێکرا، دەحەپەسیّ و وەکو شێتی لێدیّ و هیچ نازانیّ و سەرگەردانە(رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (يُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ) (إبراهيم: ٢٧) قَالَ: نَزَلَتْ فِي عَذَابِ الْقَبْرِ، فَيُقَالُ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللهُ، وَنَبِيِّي مُحَمَّدٌ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا، وَفِي الْآخِرَةِ) (إبراهيم: ٢٧) متفق عليه

واتە: لەبەرای کوڕی عازەبەوە هاتووە دەڵیّ : پێغەمبەر فەرمووی : (يُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ) بەرا دەڵیّ : دابەزیوە دەربارەی عەزابی قەبر ، بەمردووەکە دەگوترێ : خوات کێیە؟ ئەویش دەڵیّ : خوام (الله) یە و پێغەمبەرم (محمد)ە ، ئەوەیە فەرمایشتی خوا کە فەرموویەتی: (يُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا، وَفِي الْآخِرَةِ) واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات بە وتەی بەڕیّ و جیّ (کە شایەتمانە) لە ژیانی دنیادا و لەڕۆژی دوایشدا وە خوا ستەم کارانیش گومڕا دەکات وە خوا هەرچی بیەویّ دەیکات.(پوختەی تەفسیر)

٢-(عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ الْمُسْلِمُ إِذَا سُئِلَ فِي الْقَبْرِ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَذَلِكَ قَوْلُهُ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ ) رواه البخاري

واته: لەبەرای کوڕی عازەبەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی: موسڵمان کاتێ پرسیاری لێ دەکرێ لەناو گۆڕ : (شایەدی دەدات هیچ پەرستراوێك نیە ، جگە لە(الله) وە (محمد) نێرراوی خوایە، ئەوەیە مانای فەرمایشتی خوا (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ)

٣-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّ الْمُؤْمِن إِذَا حضره الموت، شهدته الملائكة، فسلموا عليه وبشروه بالجنة، فإذا مات، مشوا معه في جنازته، ثُمَّ صلوا عليه مع الناس، فإذا دفن، أجلس في قبره فيقال لَهُ: مِنْ ربك؟ فَيَقُولُ: ربي الله. فيقال لَهُ: مِنْ رسولك؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّد. فيقال لَهُ: مَا شهادتك؟ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ إِنَّ لَا إِلَهَ إِلَا اللَّهُ وَأَشْهَدُ إِنَّ محمدًا رَسُول الله. فذلك قوله: يُثَبِّتُ اللَّهُ الذين آمنوا ... الآية. فيوسع لَهُ في قبره مد بصره. وأما الكافر، فتنزل الملائكة فيبسطون أيديهم- والبسط هُوَ الضرب- يضربون وجوههم وأدبارهم عند الموت، فإذا دَخَلَ قبره أقعد فقيل لَهُ: مِنْ ربك؟ فلم يرجع إِلَيْهِمْ شيئا وأنساه الله ذكر ذَلِكَ. وَإِذَا قيل لَهُ: مِنَ الرسول الّذِي بعث إليكم؟ لَمْ يهتد لَهُ ولم يرجع إِلَيْهِمْ شيئًا، فذلك قوله: ويضل الله الظالمين

٤-(عَنْ قَتَادَة رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فِي قَوْلِهِ: يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ قَالَ: أما الحياة الدُّنْيَا، فيثبتهم بالخير والعمل الصالح، وأما قوله: وَفِي الآخِرَةِ ففي القبر) الدرر

٥-(عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ قال: إذا حدثتكم بحديث أنبأتكم بتصديق ذَلِكَ مِنْ كتاب الله إِنَّ الْمُؤْمِن إِذَا وضع في قبره أجلس فيه فيقال لَهُ: مِنْ ربك وما دينك ومن نبيك فيثبته الله

فَيَقُولُ: ربي الله وديني الإسلام ونبيي مُحَمَّد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فيوسع لَهُ في قبره ويروح لَهُ فيه، ثُمَّ قرأ عَبْد الله: يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ فإذا مات الكافر أجلس في قبره فيقال لَهُ: مِنْ ربك؟ وما دينك؟ ومن نبيك؟ فَيَقُولُ: لا أدري، قَالَ: فيضيق عليه قبره ويعذب فيه، ثُمَّ قرأ وَمَنْ أَعْرَضَ، عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا) الدر المنثور

## ئەم دەقانەی خوارەوە بە درێژی باسی رووح کێشان وژیانی ناو گۆڕ دەکەن:

٦-(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنه حدثهمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ أَتَاهُ مَلَكَانِ فَيُقْعِدَانِهِ فَيَقُولَانِ مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ لِمُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ فَيُقَالُ لَهُ انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ قَدْ أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنَ الْجنَّة فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا قَالَ قَتَادَة وَذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ ثمَّ رَجَعَ إِلَى حَدِيث أنس قَالَ وَأَمَّا الْمُنَافِقُ وَالْكَافِرُ فَيُقَالُ لَهُ مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ فَيَقُولُ لَا أَدْرِي كُنْتُ أَقُولُ مَا يَقُولُ النَّاسُ فَيُقَالُ لَا دَرَيْتَ وَلَا تَلَيْتَ وَيُضْرَبُ بِمَطَارِقَ مِنْ حَدِيدٍ ضَرْبَةً فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا مَنْ يَلِيهِ غَيْرَ الثقلَيْن) وَلَفظه لِلْبُخَارِيّ

واتە: لەئەنەسی کوڕی مالیکەوەهاتووە خوا لێ رازی بێ دەڵێ : پێغەمبەر فەرمووی (کاتی بەندە لە گۆڕنرا ، خەڵکی گەرایەوە مردوو گوێی لە دەنگی پێڵاوەکانیان دەبێ ، دوو فریشتە دێنە لای و دای دەنیشێنن ، وپێی دەڵێن : چی دەڵێ دەربارەی ئەم پیاوە کە (محمد)ە ، ئیماندار دەڵێ : شایەدی دەدەم ئەو بەندەو نێرراوی خوایە ، پێ دەڵێن تەماشای شوێنی خۆت بکە لە ئاگر خوا بۆتی گۆڕیەوە

به بەهەشت ،و هەردوو شوێنەکەی پیشان دەدرێ ، قەتادە دەڵێ بۆمـان باسـکراوە قەبرەکەی بۆ فراوان دەکرێـت ، دوای گەڕایـەوە سـەر فەرموودەکـەی ئەنـەس ، کـە پێغەمبەر فەرمووی : بەڵام مونافیق و کافر پێیان دەگوترێ : لە دونیا چیت دەگوت دەربـارەی ئـەم پیـاوە ، ئـەویش دەڵـێ : نـازانم ئـەوەی خـەڵکی دەیگـوت منـیش دەمگوت ، پێی دەگوترێ یـاخوا هەرنـەزانی ، بـە گـورزی ئاسـن لـێ دەدرێ، هـاوار دەکات بەدەنگێکی بەرز هەموو شتێك گوێی لـێ دەبـێ جگـە لـە ئینسـان و جنۆکـە نەبێ.

معاني الكلمات : (تولي) تولى مشيعوه وذهبوا. (قرع نعالهم) صوتها عند المشي. (لا دريت ولا تليت) دعاء عليه أي لا كنت داريا ولا تاليا فلا توفق في هذا الموقف ولا تنتفع بما كنت تسمع أو تقرأ. (يليه) من ملائكة وغيرهم. (الثقلين) الإنس والجن سموا بذلك لثقلهم على الأرض

وفي رواية (إنّ العَبْدَ إذا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وتَوَلَّى عنهُ أصْحابُهُ حَتَّى أنهُ يَسْمَعُ قَرْعَ نِعالِهِمْ أتاهُ مَلَكانِ فَيُقْعِدانِهِ فَيقولانِ لهُ: مَا كُنْتَ تَقولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ لِمُحَمَّدٍ فأمَّا المُؤْمِنُ فيَقول: أشْهَدُ أنه عبدُ اللَّهِ ورَسُولُهُ فيُقالُ: انْظُرْ إلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ قد أبْدلَكَ الله بِهِ مقْعدا منَ الجَنَّةِ فيَراهُما جَمِيعاً ويُفْسَحُ لهُ فِي قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِراعاً ويُمْلأُ عَلَيْهِ خَضِراً إلَى يَوْمِ يُبْعَثونَ ؛ وأمَّا الكافِرُ أَوِ المُنافِقُ فيُقالُ لهُ مَا كُنْتَ تَقولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ فيَقولُ: لَا أدْرِي كُنْتُ أقُولُ مَا يَقولُ الناسُ فيُقالُ لهُ: لَا دَرِيتَ وَلَا تَلِيتَ ثمَّ يُضْرَبُ بِمِطْراقٍ مِنْ حَدِيدٍ ضَرْبَةً بَيْنَ أُذُنَيْهِ فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُها مَنْ يَلِيهِ غَيْرَ الثَّقَلَيْنِ ويَضِيقُ عَلَيْهِ قَبْرُهُ حَتَّى تَخْتَلِفَ أضْلاعُهُ) (رواه احمد و البيهقي وابو داود والنسائي) قال الالباني صحيح

وفي رواية (عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَنَازَةِ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ وَلَمَّا يُلْحَدْ فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ وَجَلَسْنَا حوله كَأَن على رؤوسنا الطَّيْرَ وَفِي يَدِهِ عُودٌ يَنْكُتُ بِهِ فِي الْأَرْضِ فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: (اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ) مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الْعَبْدَ الْمُؤْمِنَ إِذَا كَانَ فِي انْقِطَاعٍ مِنَ الدُّنْيَا وَإِقْبَالٍ مِنَ الْآخِرَةِ نَزَلَ إِلَيْهِ من السَّمَاء مَلَائِكَة بِيضُ الْوُجُوهِ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الشَّمْسُ مَعَهُمْ كَفَنٌ مِنْ أَكْفَانِ الْجَنَّةِ وَحَنُوطٌ مِنْ حَنُوطِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَجْلِسُوا مِنْهُ مَدَّ الْبَصَرِ ثُمَّ يَجِيءُ مَلَكُ الْمَوْتِ حَتَّى يَجْلِسَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَيَقُولُ: أَيَّتُهَا النَّفْسُ الطَّيِّبَةُ اخْرُجِي إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنَ الله ورضوان قَالَ: (فَتَخْرُجُ تَسِيلُ كَمَا تَسِيلُ الْقَطْرَةُ مِنَ فِي السِّقَاءِ فَيَأْخُذُهَا فَإِذَا أَخَذَهَا لَمْ يَدَعُوهَا فِي يَدِهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ حَتَّى يَأْخُذُوهَا فَيَجْعَلُوهَا فِي ذَلِكَ الْكَفَنِ وَفِي ذَلِكَ الْحَنُوطِ وَيَخْرُجُ مِنْهَا كَأَطْيَبِ نَفْحَةِ مِسْكٍ وُجِدَتْ عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ) قَالَ: فَيَصْعَدُونَ بِهَا فَلَا يَمُرُّونَ – يَعْنِي بِهَا – عَلَى مَلَأٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ إِلَّا قَالُوا: مَا هَذِه الرّوح الطّيب فَيَقُولُونَ: فلَان بن فُلَانٍ بِأَحْسَنِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانُوا يُسَمُّونَهُ بِهَا فِي الدُّنْيَا حَتَّى ينْتَهوا بهَا إِلَى سَمَاء الدُّنْيَا فيستفتحون لَهُ فيفتح لَهُ فَيُشَيِّعُهُ مِنْ كُلِّ سَمَاءٍ مُقَرَّبُوهَا إِلَى السَّمَاءِ الَّتِي تَلِيهَا حَتَّى ينتهى بهَا إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ – فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: اكْتُبُوا كِتَابَ عَبْدِي فِي عِلِّيِّينَ وَأَعِيدُوهُ إِلَى الْأَرْضِ فَإِنِّي مِنْهَا خَلَقْتُهُمْ وَفِيهَا أُعِيدُهُمْ وَمِنْهَا أخرجهم تَارَة أُخْرَى قَالَ: فتعاد روحه فيأتيه ملكان فَيُجْلِسَانِهِ فَيَقُولُونَ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ الله فَيَقُولُونَ لَهُ: مَا دِينُكَ؟ فَيَقُولُ: دِينِيَ الْإِسْلَامُ فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ؟ فَيَقُول: هُوَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَقُولَانِ لَهُ: وَمَا عِلْمُكَ؟ فَيَقُولُ: قَرَأْتُ كِتَابَ اللَّهِ فَآمَنْتُ بِهِ وَصَدَّقْتُ فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنَ السَّمَاء أَن قد صدق فَأَفْرِشُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَأَلْبِسُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إِلَى الْجَنَّةِ قَالَ: (فَيَأْتِيهِ مِنْ رَوْحِهَا وَطِيبِهَا وَيُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ مَدَّ بَصَرِهِ) قَالَ: وَيَأْتِيهِ رجل حسن الْوَجْه حسن الثِّيَاب طيب الرّيح فَيَقُولُ: أَبْشِرْ بِالَّذِي يَسُرُّكَ هَذَا يَوْمُكَ الَّذِي كُنْتَ تُوعَدُ فَيَقُولُ لَهُ: مَنْ أَنْتَ؟ فَوَجْهُكَ الْوَجْه يَجِيء بِالْخَيْرِ فَيَقُولُ: أَنَا عَمَلُكَ الصَّالِحُ فَيَقُولُ: رَبِّ أَقِمِ السَّاعَةَ رَبِّ أَقِمِ السَّاعَةَ حَتَّى أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِي

وَمَالِي. قَالَ: وَإِنَّ الْعَبْدَ الْكَافِرَ إِذَا كَانَ فِي انْقِطَاعٍ مِنَ الدُّنْيَا وَإِقْبَالٍ مِنَ الْآخِرَةِ نَزَلَ إِلَيْهِ مِنَ السَّمَاءِ مَلَائِكَةٌ سُودُ الْوُجُوهِ مَعَهُمُ الْمُسُوحُ فَيَجْلِسُونَ مِنْهُ مَدَّ الْبَصَرِ ثُمَّ يَجِيءُ مَلَكُ الْمَوْتِ حَتَّى يَجْلِسَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَيَقُولُ: أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْخَبِيثَةُ اخْرُجِي إِلَى سَخَطٍ مِنَ اللَّهِ " قَالَ: " فَتُفَرَّقُ فِي جسده فينتزعها كَمَا ينتزع السفود من الصُّوف المبلول فَيَأْخُذُهَا فَإِذَا أَخَذَهَا لَمْ يَدَعُوهَا فِي يَدِهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ حَتَّى يَجْعَلُوهَا فِي تِلْكَ الْمُسُوحِ وَيخرج مِنْهَا كَأَنْتَنِ رِيحِ جِيفَةٍ وُجِدَتْ عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ فَيَصْعَدُونَ بِهَا فَلَا يَمُرُّونَ بِهَا عَلَى مَلَأٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ إِلَّا قَالُوا: مَا هَذَا الرّوح الْخَبِيث؟ فَيَقُولُونَ: فلَان بن فُلَانٍ – بِأَقْبَحِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانَ يُسَمَّى بِهَا فِي الدُّنْيَا – حَتَّى يَنْتَهِي بهَا إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيُسْتَفْتَحُ لَهُ فَلَا يُفْتَحُ لَهُ " ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سم الْخياط) فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: اكْتُبُوا كِتَابَهُ فِي سِجِّين فِي الأَرْض السُّفْلى فتطرح روحه طرحا ،ثُمَّ قَرَأَ: (وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرّيح فِي مَكَان سحيق) فَتُعَادُ رُوحُهُ فِي جَسَدِهِ وَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ فَيَقُولَانِ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ: فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لَا أَدْرِي فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا دِينُكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لَا أَدْرِي فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لَا أَدْرِي فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ أَن كذب عَبدِي فأفرشوا لَهُ مِنَ النَّارِ وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إِلَى النَّارِ فَيَأْتِيهِ حَرُّهَا وَسَمُومُهَا وَيُضَيَّقُ عَلَيْهِ قَبْرُهُ حَتَّى تَخْتَلِفَ فِيهِ أَضْلَاعُهُ وَيَأْتِيهِ رَجُلٌ قَبِيحُ الْوَجْهِ قَبِيحُ الثِّيَابِ مُنْتِنُ الرِّيحِ فَيَقُولُ أَبْشِرْ بِالَّذِي يسوؤك هَذَا يَوْمُكَ الَّذِي كُنْتَ تُوعَدُ فَيَقُولُ: مَنْ أَنْتَ؟ فَوَجْهُكَ الْوَجْهُ يَجِيءُ بِالشَّرِّ فَيَقُولُ: أَنَا عَمَلُكَ الْخَبِيثُ فَيَقُولُ: رَبِّ لَا تُقِمِ السَّاعَةَ) وَفِي رِوَايَة نَحوه وَزَاد فِيهِ:

إِذَا خَرَجَ رُوحُهُ صَلَّى عَلَيْهِ كُلُّ مَلَكٍ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَكُلُّ مَلَكٍ فِي السَّمَاءِ وَفُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ لَيْسَ مِنْ أَهْلِ بَابٍ إِلَّا وَهُمْ يَدْعُونَ اللَّهَ أَنْ يُعْرَجَ بِرُوحِهِ مِنْ قِبَلِهِمْ.

وَتُنْزَعُ نَفْسُهُ يَعْنِي الْكَافِرَ مَعَ الْعُرُوقِ فَيَلْعَنُهُ كُلُّ مَلَكٍ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَكُلُّ مَلَكٍ فِي السَّمَاءِ وَتُغْلَقُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ لَيْسَ مِنْ أَهْلِ بَابٍ إِلَّا وَهُمْ يَدْعُونَ اللَّهَ أَنْ لَا يُعْرِجَ رُوحَهُ مِنْ قبلهم ) رَوَاهُ أَحْمد قال الالباني صحيح في مشكاة المصابيح

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٨) سورەتی ابراهیم)

(أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّواْ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ٢٨) ابراهیم

واتە: ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە لە جیاتی (سوپاسی) بەهرەو چاکەی خوا بێ باوەڕ و سپڵە بوون و گەلەکەیان بەرەو هەڵدێر برد.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَةَ اللَّهِ كُفْرًا قَالَ هُمْ وَاللَّهِ كُفَّارُ قُرَيْشٍ قَالَ عَمْرٌو هُمْ قُرَيْشٌ وَمُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِعْمَةُ اللَّهِ وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ قَالَ النَّارَ يَوْمَ بَدْرٍ ) رواه البخاري

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لێ رازی بێ دەڵێ : (الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَةَ اللَّهِ كُفْرًا) دەڵێ : سوێند بەخوا کافرانی قوریش بوون ، عەمریش دەڵێ : مەبەستی قوریشە وە (محمد)یش نیعمەتی خوایە، (وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ) دەڵێ : مەبەستی ئاگری ڕۆژی بەدر بوو(واتە: لەناو چوون)

٢-(عن عَامِرِ بْنُ وَاثِلَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَامَ فَقَالَ سَلُونِي قَبْلَ أَنْ تَفْقِدُونِيَ، وَلَنْ تَسْأَلُوا بَعْدِي مِثْلِي، فَقَامَ ابْنُ الْكَوَّاءِ فَقَالَ: مَنِ الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَةَ اللَّهِ

كُفْرًا وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ؟ قَالَ: مُنَافِقُوا قُرَيْشٍ قَالَ: فَمَنِ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا؟ قَالَ: مِنْهُمْ أَهْلُ حَرُورَاءَ )رواه الحاكم في المستدرك (هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَالٍ) وَبَسَّامُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الصَّيْرَفِيُّ مِنْ ثِقَاتِ الْكُوفِيِّينَ مِمَّنْ يُجْمَعُ حَدِيثُهُمْ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ

واته: له عامیری کوڕی واسیله هاتووه دهڵێ: گوێم له (علی) بوو خوا لێ ڕازی بێ، ههڵساو گوتی : پرسیارم لێ بکهن پێش ئهوهی بزرم بکهن (واته: پێش ئهوهی بمرم) کوڕی ئهلکهووا ههڵساو گوتی ئهوانه کێنه که خوا دهربارهیان دهفهرموێت (الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَةَ اللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ)؟ عهلی گوتی : ئهوانه مونافیقهکانی قوریشن ، کابرا گوتی : ئهی ئهوانه کێنه که خوا دهربارهیان دهفهرمووی (الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا)؟ گوتی: حهرورا بهشێکن لهوانه (واته: خهواریج)

٣-(قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يَعْنِي بِنِعْمَةِ اللَّهِ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلِهَذَا نَدَبَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ إِلَى الِاعْتِرَافِ بِهَذِهِ النِّعْمَةِ وَمُقَابَلَتِهَا بِذِكْرِهِ وشكره. وقال: (فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلاَ تَكْفُرُونِ) قَالَ مُجَاهِدٌ فِي قَوْلِهِ: (كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنْكُمْ) يقول: كما فعلتُ فاذكروني.

قال زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ: أَنَّ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ قَالَ: يَا رَبِّ كَيْفَ أَشْكُرُكَ؟ قَالَ لَهُ رَبُّهُ: (تَذْكُرُنِي وَلَا تَنْسَانِي فَإِذَا ذَكَرْتَنِي فَقَدْ شكرتني، وإذ نسيتني فقد كفرتني) قال الحسن البصري: إِنَّ اللَّهَ يَذْكُرُ مَنْ ذَكَرَهُ، وَيَزِيدُ مَنْ شَكَرَهُ، وَيُعَذِّبُ مَنْ كَفَرَهُ) تفسير ابن كثير

واته:ئیبنو عهباس دهڵێ: نیعمهتی خوا واته: (محمد) وهلهبهر ئهوهشه خوا ئیمانداران هاندهدات دان بنێن بهو نیعمهته و باسی وشوکری خوای لهسهر بکرێ ، وهك فهرموویهتی (فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلاَ تَكْفُرُونِ) وهموجاهید دهڵێ :

فەرمایشتی خوا (كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنْكُمْ) دەفەرمووی : چۆن بۆم رەوانە کردوون سوپاسم بکەن.

وە زیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ : موسا پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ گوتی :خوایە چۆن سوپاست بکەم ؟، خوا پێی فەرمووی یادم بکەم و لەبیرم مەکە، ئەگەر یادم بکەی بێگومان سوپاست کردووم ، ئەگەر لەیادم بەکەی بێگومان ناشوکریت کردوە.

وە(حسن) البصری دەڵێ : بیگومان خوا یادی کەسێك دەکا، ئەوەی یادی بکا، بۆی زیاد دەکات ئەوەی شوکری بکات ، وە عازابی کەسێك دەدات کەناسوپاس بێ .

*********************************

# وتاری ژماره (٥٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

سورەتی (الحجر) سورەتێکی مەککی یە ، لە ریزبەندا (١٥) یە ، ژمارەی ئایەتەکانی (٩٩) ئایەتە.

-ئایا بۆچی ناونراوە (الحجر)؟ چونکە باسی شوێنی هۆزی (سەمود) دەکات ، کەدەکەوێتە نێوان مەدینە و شام ، وپێی دەگوترێ (الحجر).

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢) سورەتی الحجر

(رُبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ٢) الحجر

واتە: ئەو کەسانەی کە لەدنیادا خوا نەناسبوون ، کاتێ لە رۆژی قیامەتدا سزا دەبینن ، گەلێ جار ئاوات ئەخوازن کە: خۆزگا موسڵمان بوویان، بەتایبەتی ئەو رۆژە کە موسڵمانەکان دەبینن لەدۆزەخ دێنە دەرێ و رزگاریان دەبێ (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا اجْتَمَعَ أَهْلُ النَّارِ فِي النَّارِ، وَمَعَهُمْ مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ مَنْ شَاءَ اللَّهُ قَالُوا: مَا أَغْنَى عَنْكُمْ إِسْلَامُكُمْ، وَقَدْ صِرْتُمْ مَعَنَا فِي النَّارِ؟ قَالُوا: كَانَتْ لَنَا ذُنُوبٌ، فَأُخِذْنَا بِهَا، فَسَمِعَ اللَّهُ مَا قَالُوا، قَالَ: فَأَمَرَ بِمَنْ كَانَ فِي النَّارِ مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ فَأُخْرِجُوا فَيَقُولُ الْكُفَّارُ: يَا لَيْتَنَا كُنَّا مُسْلِمَيْنِ، فَنُخْرَجُ كَمَا أُخْرِجُوا، قَالَ: وَقَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَقُرْآنٍ مُبِينٍ رُبَّمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمَيْنَ) (الحجر: ٢) مُثَقَّلَةً

) رواه الحاكم في المستدرك وقال (هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ) ووافقه الذهبي

واته: له ئەبی موساوه هاتووه خوا لـێ رازی بـێ دەڵـێ : پێغەمبەر فەرموویـەتی : کاتێ خەڵکی ئاگر کۆکرانەوه لـه ئـاگر، وه ئـەهلی ئیمـان وقیبلەشـیان لەگـەڵ دایـه ئەوانـەی گوحبـارن ، جـا بەئـەهلی ئیمـان و قیبلـه دەڵـێن : ئێـوەش ئیسـلامتان فریانەکـەوت ولەگـەڵ ئێمـه بونـه جەهەننـەمی ، ئیمانـداران دەڵـێن : ئـاخر ئێمـه گوناحمان هەیه، بەم گوناحانه ئەسوتێن ، خواش قسەکانیان ئەبیستێ ،جـا دەڵـێ : خوا فەرمان دەکا ئـەوەی لـه نـاو ئـاگره لـه ئـەهلی قیبلـه بیانـه هێنـەدەرێ، جـا کـافران دەڵـێن : خۆزگـه موسـڵمان بوینایـه، هاتباینـه دەر لـه ئـاگر وەك چـۆن موسڵمانان هاتنه دەر لەئاگر ، دەڵێ : پێغەمبەر ئەم ئایەتەی خوێنـدەوە (الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَقُرْآنٍ مُبِينٍ رُبَّمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِيْنَ)

٢-(عن صَالِحِ بْنِ أَبِي طَرِيفٍ، قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَسَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي هَذِهِ الْآيَةِ: (رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمَيْنَ) (الحجر: ٢)؟ فَقَالَ: نَعَمْ سَمِعْتُهُ، يَقُولُ: (يُخْرِجُ اللَّهُ أُنَاسًا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ مِنَ النَّارِ بَعْدَمَا يَأْخُذُ نِقْمَتَهُ مِنْهُمْ، قَالَ: لَمَّا أَدْخَلَهُمُ اللَّهُ النَّارَ مَعَ الْمُشْرِكِينَ، قَالَ الْمُشْرِكُونَ: أَلَيْسَ كُنْتُمْ تَزْعُمُونَ فِي الدُّنْيَا أَنَّكُمْ أَوْلِيَاءُ فَمَا لَكُمْ مَعَنَا فِي النَّارِ، فَإِذَا سَمِعَ اللَّهُ ذَلِكَ مِنْهُمْ أَذِنَ فِي الشَّفَاعَةِ، فَيَتَشَفَّعُ لَهُمُ الْمَلَائِكَةُ وَالنَّبِيُّونَ حَتَّى يَخْرُجُوا بِإِذْنِ اللَّهِ، فَلَمَّا أُخْرِجُوا، قَالُوا: يَا لَيْتَنَا كُنَّا مَثَلَهُمْ، فَتُدْرِكُنَا الشَّفَاعَةُ، فَنُخْرَجَ مِنَ النَّارِ، فَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ جَلَّ وَعَلَا: (رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمَيْنِ) (الحجر: ٢)، قَالَ: فَيُسَمَّوْنَ فِي الْجَنَّةِ الْجَهَنَّمِيِّينَ مِنْ أَجْلِ سَوَادٍ فِي وُجُوهِهِمْ، فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا أَذْهِبْ عَنَّا هَذَا الِاسْمَ، قَالَ: فَيَأْمُرُهُمْ فَيَغْتَسِلُونَ فِي نَهْرٍ فِي الْجَنَّةِ فَيَذْهَبُ ذَلِكَ مِنْهُمْ) رواه ابن حبان قال الالباني صحيح لغيره في ظلال الجنة وقال شعيب ارنوؤط صحيح

واتە:لە صالیحی کوڕی ئەبی تەریف هاتووە دەڵێ : بە ئەبی سەعیدی خودریم گوت ، ئایا گوێت لە پێغەمبەر بووە دەربارەی ئەم ئایەتە (رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمَيْنَ) گوتی : بەڵێ گوێم لێی بووە، دەیفەرموو(خوا خەڵکانێك لە ئاگر دەردێنیت لە ئیمانداران پاش ئەوەی سزا دەدرێن ، گوتی: کاتێ خوا خستنە ئاگر لەگەڵ موشریکان ، جا موشریکان دەڵێن : ئایا باوەرتان وانەبوو دۆستی خوان ئەدی بۆچی لەگەڵ ئێمەن لە ئاگر ، کە خوا ئەم قسە دەبیستی مۆڵەت دەدات شەفاعەتیان بۆ بکرێ ، جا فریشتەکان وپێغەمبەران تکایان بۆ دەکەن، تاکو بێنە دەرەوە بەفەرمانی خوا، کە هێنانەدەر ،کافران دەڵێن: خۆزگە وەکو ئێوە بوینایە، تکامان بۆ کرابایە، و لە ئاگر هاتباینە دەر ، ئەوەیە فەرمایشتی خوا کە فەرموویەتی (رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمَيْنِ) فەرمووی ئەوانە لە بەهەشت پێیان دەڵێن (دۆزەخیەکان) لەبەر ڕەشبوونی دەم وچاویان ، دەڵێن خوایە ئەم ناوەمان لەسەر لادە، فەرمووی : فەرمانیان پێی دەکرێ خۆیان بشۆن لە روباری بەهەشت جا ئەم ڕەشایەتیە نامینێ.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٤) سوڕەتی الحجر

(وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ٢٤) الحجر

واتە: سوێند بەخوا ئێمە ئاگادارین بەوانەی لەپێش ئێوەوە بوون و سوێند بەخوا بێگومان ئەوانەش دەناسین کە پاش ئێوە دێن.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَتْ امْرَأَةٌ تُصَلِّي خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَسْنَاءُ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ قَالَ فَكَانَ بَعْضُ الْقَوْمِ يَتَقَدَّمُ فِي الصَّفِّ الْأَوَّلِ لِئَلَّا يَرَاهَا وَيَسْتَأْخِرُ بَعْضُهُمْ حَتَّى يَكُونَ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ فَإِذَا رَكَعَ نَظَرَ مِنْ تَحْتِ إِبْطِهِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنْكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ ) رواه النسائي و والترمذي واحمد وابن حبان وابن ماجه والطبراني قال الالباني صحيح والحاكم في المستدرك ووافقه الذهبي

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: ئافرەتێکی زۆر جوان لە دوای پێغەمبەر نوێژی دەکرد لە نوێژی بە کۆمەڵ ، دەڵێ: کەسانێك لە موسڵمانان دەچوونە ریزەکانی پێشەوە تاکو ئەم ئافرەتە نەبینن وئاگایان لەنوێژەکەیان بێ، بەلام کەسانێك هەبوون خۆیان دەخستە ریزکانی دواوە کاتێ دەچوونە رکوع لەبن هەنگڵیان تەماشای دواوەیان دەکرد تاکو ئەم ئافرەتە ببینن ، جاخوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنْكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ) واتە: سوێند بەخوا ئێمە ئاگادارین بەوانەی لەپێش ئێوەوە بوون و سوێند بەخوا بێگومان ئەوانەش دەناسین کە پاش ئێوە دێن.

## دەرسەکانی ئەم ئایەتە:

١-خوا چاودێرە بەسەرمانەوە ٢-لەنوێژ هەموو شتێك وەلانێ ٣-وابزانە ئەم نوێژ کۆتا نوێژ

یەکێ لە ئافرەتە خوا ناسەکان دەڵێ: وا نوێژ بکە کە چاوت لە کەعبیە و لای راستت بەهەشت و لای چەپت دۆزەخە .

یـەکی دیکـە دەڵـێ: چـۆن دڵ خۆشـبم بـەم دونیایـە، مـردن لـە دوامـە هـەر بمگـرێ دەمگرێ، قەبر لە پێشمە بەرەو ئەو هەنگاو دەنێم

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٩٤+٩٥) سورەتی ) الحجر

﴿فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٩٤ إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ ٩٥﴾ الحجر

واتە: جـا هـەر فـەرمانێکت پـێ دەدرێ بـە ئاشـکرا رای گەیەنـە و گـوێ بەهاوبـەش دانەران مەدە.(٩٤) بەڕاستی ئێمە گاڵتە چیانمان لە کۆڵ کردیتـەوە(٩٥) (پوختـەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ، فِـي قَوْلِـهِ: ﴿إِنَّـا كَفَيْنَـاكَ الْمُسْـتَهْزِئِينَ﴾ (الحجـر: ٩٥) ، وَقَـالَ: ﴿الْمُسْتَهْزِئِينَ: الْوَلِيدُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، وَالْأَسْوَدُ بْنُ عَبْدِ يَغُوثَ، وَالْأَسْوَدُ بْنُ الْمُطَّلِبِ أَبُو زَمْعَةَ مِنْ بَنِي أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى، وَالْحَارِثُ بْنُ غَيْطَلٍ السَّهْمِيُّ، وَالْعَاصُ بْنُ وَائِلٍ السَّهْمِيُّ. فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ فَشَكَاهُمْ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَرَاهُ أَبَا عَمْرٍو الْوَلِيدَ بْنَ الْمُغِيرَةِ، فَأَوْمَأَ جِبْرِيلُ إِلَى أَبْجَلِهِ، فَقَالَ: مَا صَنَعْتَ شَيْئًا؟ فَقَالَ: كَفَيْتَكَهُ، ثُمَّ أَرَاهُ الْحَارِثُ بْنُ غَيْطَلٍ السَّهْمِيَّ، فَأَوْمَأَ إِلَى بَطْنِهِ، فَقَالَ: مَا صَنَعْتَ شَيْئًا؟ فَقَالَ: كَفَيْتَكَهُ، ثُمَّ أَرَاهُ الْعَاصَ بْنَ وَائِلٍ السَّهْمِيَّ، فَأَوْمَأَ إِلَى أَخْمَصِهِ، فَقَالَ: مَا صَنَعْتَ شَيْئًا؟ فَقَالَ: كَفَيْتَكَهُ. فَأَمَّا الْوَلِيدُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، فَمَرَّ بِرَجُلٍ مِنْ خُزَاعَةَ وَهُوَ يَرِيشُ نَبْلًا لَهُ، فَأَصَابَ أَبْجَلَهُ فَقَطَعَهَا، وَأَمَّا الْأَسْوَدُ بْنُ الْمُطَّلِبِ فَعَمِيَ فَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ: عَمِيَ كَذَا،

وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ: نَزَلَ تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَجَعَلَ يَقُولُ: يَا بَنِيَّ، لَا تَدْفَعُونَ عَنِّي؟ قَدْ هَلَكْتُ أُطْعَنُ بِشَوْكٍ فِي عَيْنِي، فَجَعَلُوا يَقُولُونَ: مَا نَرَى شَيْئًا، فَلَمْ يَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى عَمِيَتْ عَيْنَاهُ، وَأَمَّا الْأَسْوَدُ بْنُ عَبْدِ يَغُوثَ فَخَرَجَ فِي رَأْسِهِ قُرُوحٌ فَمَاتَ مِنْهَا، وَأَمَّا الْحَارِثُ بْنُ غَيْطَلٍ فَأَخَذَهُ الْمَاءُ الْأَصْفَرُ فِي بَطْنِهِ حَتَّى خَرَجَ خَرَؤُهُ مِنْ فِيهِ فَمَاتَ مِنْهَا، وَأَمَّا الْعَاصُ بْنُ وَائِلٍ فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ يَوْمًا حَتَّى دَخَلَ فِي رِجْلِهِ شِبْرِقَةٌ حَتَّى امْتَلَأَتْ مِنْهَا فَمَاتَ) اخرجه الطبراني في المعجم الاوسط

**واته: ئیبنو عەباس دەڵێ: فەرمایشتی خوا (إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ) دەربارەی ئەوانەی گاڵتەیان بە پێغەمبەر و ئایین دەکرد هەریەك و بەدەردێك چوون و خوا لە ناوی بردن**

٢-أخرجه الحافظ البزار في قوله تعالى: (إِنَّا كَفَيْنَاكَ المستهزئين). وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ: كَانَ عُظَمَاءُ الْمُسْتَهْزِئِينَ خمسة نفر، وكانوا ذَوِي أَسْنَانٍ وَشَرَفٍ فِي قَوْمِهِمْ، مِنْ بَنِي أسد بن عبد العزى (أَبُو زَمْعَةَ) كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا بَلَغَنِي قَدْ دَعَا عَلَيْهِ لما كان يبلغه من أذاه

واستهزائه، فَقَالَ: (اللَّهُمَّ أَعْمِ بَصَرَهُ وَأَثْكِلْهُ وَلَدَهُ)، وَمِنْ بني زهرة (الأسود بن عبد يغوث)، ومن بني مخزوم (الوليد بن المغيرة)، ومن بني سهم (العاص بن وائل)، ومن خزاعة (الحارث بن الطلاطلة). فَلَمَّا تَمَادَوْا فِي الشَّرِّ وَأَكْثَرُوا بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الِاسْتِهْزَاءَ أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ - إِلَى قَوْلِهِ - فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ) تفسير ابن كثر

واته: ئیبنو حافیزی بەزار دەڵێ: ئەو ئایەتە(إِنَّا كَفَيْنَاكَ المستهزئين) محمد کوڕی ئیحساق دەڵێ: سەرکردە گاڵتەچیەکان (٥) کەس بوون ، لەناو تیرەکانیان ناوداربوون ، ١-لەتیرەی بەنی ئەسد عەبدولعوزا (ئەبو زەمعە) بوو ، پێمان

گەیشتووە پێغەمبەر دوعای لێ کردوە، چونکە ئازاری پێغەمبەری دەدا بە گالتە پێی کردنی ، فەرموویەتی (خوا چاوەکانی کوێر بکەی و منداڵەکی ڕۆ ڕۆی بۆ بکات) ٢–وەلە بەنی زوهورە(ئەلئەسودی کوڕی عەبد یەغوس) بوو ٣–لە بەنی مەخزوم (وەلیدی کوڕی موغیرە) بوو ٤–وە لە بەنی سەهم (العاصی کوڕی وائل) بوو ، ٥– وەلە بەنی خوزاعە (الحارسی کوڕی تەلاڵە) بوو ، کاتێ لەسەر شەڕ بەردەوام بوو ،و گالتەیان زۆر بە پێغەمبەر دەکرد ، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (**فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٩٤ إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ ٩٥**) الحجر

(تمادی : ای دام علیه)

## بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە ئەم ئایەتە ئەم دەقانەش هاتوون:

٣–( قال الحليمي رحمه الله: وكانت للنبي صلى الله عليه وسلم قبل فرض الجهاد منازل مع المشركين، فأول ذلك أنه كان يوحى إليه ولا يؤمر في غير نفسه بشيء، ثم أمر بالتبليغ، فقيل له: قم فأنذر فأشفق من ذلك فنزل: (يا أيها الرسول بلغ) (المائدة: ٦٧)– إلى قوله – (والله يعصمك من الناس) (المائدة: ٦٧) فلما بلغ كذبوه، واستهزءوا به، فأمر بالصبر فقيل له: (فاصدع بما تؤمر وأعرض عن المشركين إنا كفيناك المستهزءين) ثم أمر باعتزالهم، فنزل: (واصبر على ما يقولون واهجرهم هجرا جميلا) (المزمل: ١٠)، ونزل (وإذا رأيت الذين يخوضون في آياتنا فأعرض عنهم حتى يخوضوا في حديث غيره وإما ينسينك الشيطان فلا تقعد بعد الذكرى مع القوم الظالمين) (الأنعام: ٦٨)، ثم أذن لمن آمن به في الهجرة دونه، فنزل: (ومن يهاجر في سبيل الله يجد في الأرض مراغما كثيرا وسعة) (النساء: ١٠٠) شعب الايمان للبيهقي

# وتاری ژماره (٥٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (النحل)

-لەریزبەندی سورەتەکان ژمارە(١٦)یە وە ژمارەی ئایەتەکانی (١٢٨) ئایەتە.

سورەتی (النحل) سورەتێکی مەککی یە، باسی توحیدو رۆژی زیندوبونەوە دەکات.

**-باسی سەرەنجامی کوفر بە نیعمەتەکانی خوا دەکات.**

-لەکۆتایدا فەرمان بە پێغەمبەر دەکات خەڵکی بانگ بکات بۆ دینی خوا بە(حیکمەت و ئامۆژگاری جوان) وەك دەفەرمووێ (**ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ۖ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ (النحل:١٢٥)**)

واتە: خەڵکی بانگ بکە بۆ رێگەی پەروەردگارت بە لێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین وە لە گەڵیان بدوێ (موجادەلە بکە) بدوێ بەچاکترین شێوە بێگومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانێ بەوانەی گومڕابوون و لایانداوە لەڕێگاکەی وە هەر خۆشی زانایە بەوانەی لەسەر رێگای ڕاستن.(پوختەی تەفسیر)

-ئایا بۆچی ناونراوە (النحل) ؟ چونکە باسی مێش هەنگ دەکات ، کە یەکێکە لە دروستکراوە سەرسوڕهێنەرەکان ، وەك فەرموویەتی:

(**وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ٦٨**) النحل واتە: لێرەدا خودا بەڵگەیەکی تر لەسەر گەورەیی و توانای

خۆی دەخاتە ڕوو، دەفەرموێت: ئەی مرۆڤی هۆشیارو تێگەیشتوو! بزانە خودا چۆن ئیلهامی کردووە بۆ (مێش هەنگ) کە لە ناو شاخ و دارو بن کەپرەکان لانەو ماڵی شەش سووچ بۆ خۆی درووست بکات... ڕەنگە ئیلهام لێرەدا (غەریزە) بێت.(تەفسیری گوڵشەن) وەفەرموویەتی:

﴿ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ٦٩﴾ النحل

واتە: پاشان لە هەموو بەرو بوومێك بمژە ئەوسا ئەو ڕێگایانەی پەروەردگارت بگرە بەر بە ملکەچی لە سکی ئەو (هەنگانەوە) دێتە دەر خواردنەوەیەك کە ڕەنگەکانی جیاوازە کە شیفای تێدایە بۆ خەڵکی بێگومان لەوەدا نیشانەی گەورە هەیە بۆ کەسانێك کە بیر دەکەنەوە.(پوختەی تەفسیر)

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٤٢) سورەتی )النحل

﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِيٓ إِلَيْهِمْ ۚ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ٤٣﴾النحل

واتە: وە ڕەوانەمان نەکردووە لە پێش تۆ بێجگە لە پیاوانێ کە نیگامان بۆ ناردوون دەی پرسیار بکەن لەزانایان ئەگەر ئێوە نازانن. (پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَن سعيد بن جُبَير فِي قَوْله: (فاسألوا أهل الذّكر) قَالَ: نزلت فِي عبد الله بن سَلام وَنَفر من أهل التَّوْرَاة وَكَانُوا أهل كتب يَقُول: فاسألوهم (إِن كُنْتُم لَا تعلمُونَ) أَن

الرجل ليُصَلِّي ويصوم ويحج ويعتمر وَأَنه لمنافق قيل: يَا رَسُول الله بِمَاذَا دخل عَلَيْهِ النِّفَاق قَالَ: يطعن على إِمَامه وإمامه من قَالَ الله فِي كِتَابه: (فاسألوا أهل الذّكر أَن كُنْتُم لَا تعلمُونَ(النحل : ٤٣) الدر المنثور /عبد الرحمن بن أبي بكر، جلال الدين السيوطي (المتوفى: ٩١١هـ)

واته: له سهعیدی کوڕی جوبێرەوە هاتووە: فەرمایشتی خوا(فاسألوا أهل الذّكر) دەڵێ : دابەزیوە دەربارەی (عبدالله کوڕی سەلام) و کەسانێك لە ئەهلی تەورات ، ئەوانە ئەهلی کیتابی بوون ، دەفەرمووی پرسیاریان لێ بکەن (ئەگەر نازانن) پیاوێك نوێژ دەکاو بەرۆوو دەبێ وحەج دەکاوعومرەدەکا بەڵام مونافیقە، گوترا : ئەی نێرراوی خوا بەچی چۆتە ناو نیفاف ، فەرمووی : توانج لە پێشەواکەی دەگرێ و پێشەواکەی خوا لەقورئان دەربارەی فەرموویەتی (فاسألوا أهل الذّكر أَن كُنْتُم لَا تعلمُونَ) .

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٧٥) سورەتی (النحل)

(ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبۡدًا مَّمۡلُوكًا لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَمَن رَّزَقۡنَٰهُ مِنَّا رِزۡقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنۡهُ سِرًّا وَجَهۡرًاۖ هَلۡ يَسۡتَوُۥنَۚ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٧٥) النحل

واته: خوا نموونەی هێناوەتەوە بە بەندەیەکی خاوەن دار کە توانای بەسەر هیچ شتێکدا نی یە لەگەڵ کەسێکی (باوەڕدار) کە ڕزق و ڕۆزی چاکمان پێ دابێ لەلایەن خۆمانەوە ئەویش لەو (ڕۆزیە) ی ببەخشێت بە نهێنی و ئاشکرا ئایا ئەو دووانە یەکسانن سوپاس و ستایش بۆ خوا بەڵام زۆربەیان نازانن.(پوختەی تەفسیر)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عن ابن عباس في قوله عز وجل (ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَمْلُوكًا) قال: نزلت في رجل من قريش وعبده، وفي قوله (مَثَلًا رَجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لا يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ) إلى قوله (وَهُوَ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) . قال هو عثمان بن عفان، قال: والأبكم الذي أينما يوجهه لا يأتي بخير، ذاك مولى عثمان بن عفان كان عثمان ينفق عليه ويكفله ويكفيه المؤونة، وكان الآخر يكره الإسلام ويأباه، وينهاه عن الصدقة والمعروف فنزلت فيهما) الحديث رجاله رجال الصحيح) الصحيح المسند من اسباب النزول ولباب المنقول للسيوطي

واتە: لەئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : فەرمایشتی خوا (ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبۡدًا مَّمۡلُوكًا لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَمَن رَّزَقۡنَٰهُ مِنَّا رِزۡقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنۡهُ سِرًّا وَجَهۡرًا ۖ هَلۡ يَسۡتَوُۥنَ ۚ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٧٥) (النحل) دەڵێ : دابەزیوە دەربارەی پیاوێکی قوریش و بەندەکەی ، وەفەمایشتی خوا (وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيۡنِ أَحَدُهُمَآ أَبۡكَمُ لَا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوۡلَىٰهُ أَيۡنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأۡتِ بِخَيۡرٍ هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ وَمَن يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٧٦) النحل) دەڵێ ئەمە (عوسمانی کوڕی عەفانە) دەڵێ : ئەو لاڵەی بۆ کوێ بنێردرێت خێری پێوە نیە، ئەوە خزمتکاری (عوسمانی کوڕی عەفانە) خێری پێدەکرا ، وسەرپەرشتی دەکردو پێداویستیەکانی بۆ جێ بەجێ دەکرد ، دوایش بەئیسلام رازی نەدەبوو ، و سەرپێچی دەکردو رێگری دەکرد (عوسمان) خێروچاکە بکات، جا دەربارەی عوسمان وخزمەتکارەکەی ئەم ئایەتە دابەزی

٢-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَمْلُوكًا لَا يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ) فِي هِشَامِ بْنِ عَمْرٍو، وَهُوَ الَّذِي يُنْفِقُ مَالَهُ سِرًّا وَجَهْرًا، وَمَوْلَاهُ أَبُو الْجَوْزَاءِ الَّذِي كَانَ يَنْهَاهُ وَنَزَلَتْ: (وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ)

أخرجه ابن جرير (١٤/١٠١) وابن أبي حاتم وابن مردويه وابن عساكر (فتح القدير: ١٨٣/٣) من طريق إبراهيم – النخعي – عن عكرمة به وإسناده صحيح.

واته:لەئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: ئەو ئایەتە دابەزی (ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَمْلُوكًا لَا يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ) دەربارەی هیشامی کوڕی عەمر کە ماڵی خۆی دەبەخشی بە نهێنی وئاشکرا ، خزمتکارێکی هەبوو ناوی (أَبُو الْجَوْزَاءِ) بوو ، ڕێگری دەکرد ماڵ ببەخشێ ، جا خوا ئەم ئایەتەی دەربارە ناردە خوار (وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِي هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ٧٦) النحل

واتە: وە هەروەها خوا نموونەی هێناوەتەوە بە دوو پیاو یەکێکیان لاڵی زگماکی یە کە توانای بەسەر هیچ شتێکدا نی یە و ئەو (پیاوە) ئەرك و بارە بەسەر خاوەنەکەیەوە بەرە و هەر شوێنێ بینێرێ هیچ خێر و چاکەیەك ناهێنێتەوە ئایا ئەو کەسە یەکسانە لەگەڵ کەسێك فەرمان بە داد گەری بدات و ئەو (کەسە) لەسەر ڕێگەیەکی ڕاست بێت.(پوختەی تەفسیر)

تێبینی: زۆر جاران ئایەتەکە بۆ کۆمەلێك شت دابەزیوە، بۆیە دەگونجێ بۆ خاڵی یەکەم و دووەم دابەزی بێ .

**دەرسەکانی ئەم ئایەتە:**

١–ئەوەی خێر پیشانی خەڵکی بدات ، وەك کەسی خێرکەر وایە وەك پێغەمبەر فەرموویەتی

(الدَّالُّ عَلَى الْخَيْرِ كَفَاعِلِهِ) رواه الْبَزَّار قال الالباني صحيح

٢–ڕێگری لە خێر گوناح و تاوانە.

# وتاری ژماره (٦٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٨٣) سورەتی (النحل)

﴿يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ٨٣﴾ النحل

واتە: ئەوانە بەهرەکانی خوا دەناسن (و دەزانن) پاشان ئینکاری دەکەن وە زۆربەی ئەوانە هەر بێ باوەڕن.(پوختەی تەفسیر)

١-( عن مجاهد أن أعرابياً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهُ فَقَرَأَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِّن بُيُوتِكُمْ سَكَناً)(٨٠) فقال الْأَعْرَابِيُّ: نَعَمْ، قَالَ: (وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ جُلُودِ الأنعام بُيُوتاً)(٨٠). الآية، قَالَ الْأَعْرَابِيُّ: نَعَمْ، ثُمَّ قَرَأَ عَلَيْهِ كُلَّ ذَلِكَ، يَقُولُ الْأَعْرَابِيُّ: نَعَمْ، حَتَّى بَلَغَ: (كَذَلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ)(٨١) فولَّى الْأَعْرَابِيُّ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ( يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ٨٣ ) (أخرجه ابن أبي حاتم والدر المنثور ولباب المنقول

واتە: لەموجاهیدەوە هاتووە دەڵێ : عارەبێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر وپرساری لێ کرد و پێغەمبەریش ئەوئایەتەی بۆ خوێندەوە (وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِّن بُيُوتِكُمْ سَكَناً)(٨٠)النحل) کابرای ئەعرابی گوتی : بەڵی ، وە پێغەمبەر ئەو ئایەتەشی بۆ خوێندەوە(وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ جُلُودِ الأنعام بُيُوتاً)(٨٠) النحل).) ئەعرابیەکە گوتی : بەڵێ (واتە: ڕاستە)، دوای چی بۆ دەخوێندەوە دەیگوت بەڵێ ڕاستە ، تاکو گەیشتە (كَذَلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ)(٨١)النحل) کابرای پشتی هەڵکرد ورۆیشت وموسڵمان نەبوو جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ(٨٣)النحل)

دەرسەكانی ئەم ئایەتە:

١-ناسینی نیعمەتی خوا ٢- دانپیدانانی ٣-دەربرینی ٤-پێوەدیاربوونی ٥-زۆر سوپاس وشوكری خوا بكەین .

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠٣) سورەتی )النحل

(وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ ۗ لِّسَانُ ٱلَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ ١٠٣) النحل

واتە: سوێند بە خوا ئێمە بەڕاستی دەزانین بێ باوەڕان دەڵێن: ئەم قورئانە تەنها كەسێك فێری دەكات، (بەمەر جێك) زمانی ئەو كەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری محمد دەكات، عەجەمیەو عەرەبی نیەو ڕەوان نیە، لەگەڵ ئەوەدا ئەم قورئانە بە زمانی عەرەبی و پاراوو ڕوون و ئاشكرا داڕێژراوە.(تەفسیری ئاسان)

١-(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُسْلِمٍ الْحَضْرَمِيِّ: أَنَّهُ كَانَ لَهُمْ عَبْدَانِ مِنْ أَهْلِ عَيْرِ الْيَمَنِ، وَكَانَا طِفْلَيْنِ، وَكَانَ يُقَالُ لِأَحَدِهِمَا يَسَارٌ وَالْآخَرُ جَبْرٌ، فَكَانَا يَقْرَآنِ التَّوْرَاةَ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رُبَّمَا جَلَسَ إِلَيْهِمَا، فَقَالَ كُفَّارُ قُرَيْشٍ: إِنَّمَا يَجْلِسُ إِلَيْهِمَا يَتَعَلَّمُ مِنْهُمَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ، وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ) (النحل: ١٠٣) اخرجه الطبري في جامع البيان

واتە: لە عەبدولڵای كوڕی موسلیمی حەزرەمییەوە هاتووە دەڵێ: دوو بەندەیان هەبوون لە كاروانی یەمەن ، ئەوانیش دوو منداڵ بوون ، بە یەكیان دەگوت (یەسار) وبە ئەویدیكەیان دەگوت (جەبر) ، ئەو دووانە تەوراتیان دەخوێند ، هەركاتێ پێغەمبەر لەگەڵیان دادەنیشت ، كافرانی قوریش دەیانگوت : بۆیە پێغەمبەر

لەگەلیان دادەنیشێ تاکو شتیان لێ فێربێ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ، وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ)

٢-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ (إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ) (النحل: ١٠٣) قَالُوا: إِنَّمَا يُعَلِّمُ مُحَمَّدًا عَبْدُ بْنُ الْحَضْرَمِيِّ وَهُوَ صَاحِبُ الْكُتُبِ. فَقَالَ اللَّهُ (لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ) الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخرِجَاهُ ووافقه الذهبي

واتە:.... دەیانگوت بێگومان (محمد) فێر بووە لە بەندەیەکی بەنی حەزرەمی ، ئەو خاوەنی و ئەهلی کیتابە ، خواش فەرمووی: (**وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞۗ لِّسَانُ ٱلَّذِي يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيّٞ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيّٞ مُّبِينٌ ١٠٣ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهۡدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ١٠٤ إِنَّمَا يَفۡتَرِي ٱلۡكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ١٠٥**) **النحل**

## ٣- هۆی دابەزینی ئایەتی (١١٠) سورەتی )النحل

(**ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ١١٠**) **النحل**

واتە: پاشان بەڕاستی پەروەردگارت بۆ ئەوانەی کۆچیان کردوە لەپاش ئەوەی سزا دران پاشان جیهاد و تێ کۆشانیان کرد و بەئارام بوون بێگومان پەروەردگارت لەدوای ئەوە پێشهاتانە لێبوردەی میهرەبانە (بەرامبەر ئیمانداران) .

١-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ: كَانَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ أَسْلَمُوا ، وَكَانُوا يَسْتَخْفُونَ بِالْإِسْلَامِ ، فَأَخْرَجَهُمُ الْمُشْرِكُونَ يَوْمَ بَدْرٍ مَعَهُمْ ، فَأُصِيبَ بَعْضُهُمْ ، فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: كَانَ

أَصْحَابُنَا هَؤُلَاءِ مُسْلِمَيْنِ وَأُكْرِهُوا ، فَاسْتَغْفِرُوا لَهُمْ. فَنَزَلَتْ: (إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ) (النساء: ٩٧) الْآيَةُ قَالَ: فَكَتَبَ إِلَى مَنْ بَقِيَ بِمَكَّةَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ بِهَذِهِ الْآيَةِ ، وَأَنَّهُ لَا عُذْرَ لَهُمْ. قَالَ: فَخَرَجُوا ، فَلَحِقَهُمُ الْمُشْرِكُونَ ، فَأَعْطَوْهُمُ الْفِتْنَةَ ، فَنَزَلَتْ فِيهِمْ: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ) (العنكبوت: ١٠) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ ، فَكَتَبَ الْمُسْلِمُونَ إِلَيْهِمْ بِذَلِكَ ، فَحَزِنُوا وَأَيِسُوا مِنْ كُلِّ خَيْرٍ ، ثُمَّ نَزَلَتْ فِيهِمْ: (ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا فُتِنُوا ثُمَّ جَاهَدُوا وَصَبَرُوا إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَحِيمٌ) (النحل: ١١٠) فَكَتَبُوا إِلَيْهِمْ بِذَلِكَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ جَعَلَ لَكُمْ مَخْرَجًا. فَخَرَجُوا ، فَأَدْرَكَهُمُ الْمُشْرِكُونَ ، فَقَاتَلُوهُمْ حَتَّى نَجَا مَنْ نَجَا وَقُتِلَ مَنْ قُتِلَ) الصحيح المسند من اسباب النزول واخرجه ابن جرير الطبري في جامع البيان

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : هەندێ لە خەڵكی مەككە موسڵمان بوو ، بەڵام موسڵمانەتیەكەیان شاردبویەوە واتە : بەدزی موسڵمان بوون ، موشریكانی مەككە لە رۆژی بەدر لەگەڵ خۆیان هێنابوون بۆ شەر ، جا هەندێكیان كوژران لەو شەرەدا، موسڵمانەكان گوتیان :ئەوانە برای ئێمە بوون و بەزۆر هێناویانن بۆ شەر وكوژراون ، داوای لێ بوردنیان بۆ لەخوا بكەن، خواش لەم بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (**إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا ۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا** ٩٧) واتە: بەڕاستی ئەوانەی كە فریشتەكان گیانیان دەكێشن لە كاتێكدا كە ستەمیان لە خۆیان دەكرد(بە كۆچ نەكردنیان) بە تەشەرەوە پێیان دەڵێن(دەربارەی ئایینەكەتان) لە چیدا بوون ؟! دەڵێن ئێمە چەوساوە بووین لەسەر زەوی

دا(پێیان) دەڵێن مەگەر زەویی خوا فراوان نەبوو ؟. تا کۆچتان بکردایە تیایدا جا ئەوانە شوێنیان دۆزەخە ئای چ پاشە ڕۆژێکی خراپە.،

دەڵێ : پاش دابەزینی ئەم ئایەتە موسڵمان ئەم ئایەتەیان نوسی و ناردیان بۆ خەڵکی موسڵمان بووی مەککە، ئەوانە هیچ بیانویان نەماوە چیتر لە مەککە بن،جا ئەوانیش هاتن بەرەو مەدینە ، لە ڕێگا توشی موشریکان بوون ، و توشی ئازار و ئەشکەنجە و گرتن وکوشتن بوون ، جا ئەو ئایەتەیان بۆ دابەزی (**وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ ۖ وَلَئِن جَآءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ ۚ أَوَ لَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٠** العنكبوت) واتە: ، موسڵمان ئەو ئایەتەیان بۆ ناردن ، و ئەوانیش دڵتەنگ و بێ ئومێد بوون لە هەموو خێرێك ، دوای خوای میهربان ئەو ئایەتەی بۆ دابەزاند وفەرمووی (**ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ١١٠** النحل) واتە: پاشان بەڕاستی پەروەردگارت بۆ ئەوانەی کۆچیان کردوە لەپاش ئەوەی سزا دران پاشان جیهاد و تێ کۆشانیان کرد و بەئارام بوون بێگومان پەروەردگارت لەدوا ئەوە لێبوردەی میهرەبانە. ، جا ئەو ئایەتەشیان بۆ نوسی وناردیان ، بۆیان نوسین وناردیان کە بێگومان خوا دەرووی خێریان لێ دەکاتەوە ، ئەوانیش دەرچوون بۆ مەدینە موشریکانیان پێگەیشتن وشەریان پێفرۆشتن ، هەندێکیان گیران و هەندێکیان کوژران .

*****************************

# وتاری ژماره (٦١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (١٢٦- ١٢٨) سورەتی (النحل)

﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ١٢٦ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ١٢٧ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ١٢٨﴾ النحل

**مانای ئەم (٣) ئایەتە :**

واتە: وەئەگەر تۆڵەتان کردەوە ، بادار بە داربێو، سەرەرۆیی وزیادە ڕەوی تێدا نەبێ. ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: ئەم ئایەتە (مەدەنی)یەو سەبارەت بە (حەمزە)ی (سید الشهداء) هاتۆتە خوارەوە، ئەوکاتە کە لە (ئوحود) پاش شەهیدبوونی موشریکەکان لاشەکەیان تێکداو سکیان دڕیی، ئەوجا پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم) زۆر دڵگران و بێ تاقەت بوو، بۆیە فەرمووی: سوێند بەخوابێ: ئەگەر ئەمجارە خوای گەورە زالم بکا بەسەریانا، ئەوەی بە (حەمزە) کراوە، بەحەفتا کەسیانی دەکەم. دڵنیاشبن ئەگەر ئێوە خۆ ڕابگرن و تۆڵە نەکەنەوە، ئەگەرچی هەقیشتان بێت تۆڵە بکەنەوە دیارە کاری وا بۆ خۆ ڕاگران و ئارامگران باشترە تا تۆڵە وەرگرتنەوە، بەمەرجێ بتوانن شەڕو خراپە لەخۆتان دوور بخەنەوەو، بیشزانن دەبێتە سەرکەوتن بۆتان(١٢٦) وە (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) دان بەخۆتدا بگرە ئارام گرتنەکەشت هەر بە (یارمەتی) خوایە و خەفەتیان بۆ مەخۆ و بەو فێڵ و پیلانانەش دەیکەن دڵ تەنگ مەبە.(١٢٧) بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانەیە

که خۆیان پاراستووه (له تاوان) هەروەها ئەوانەش کـه چـاکەکارن.(١٢٨) (رامـان و پوختە)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عن أُبَيُّ بْن كَعْبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ أُصِيبَ مِنَ الْأَنْصَارِ أَرْبَعَةٌ وَسِتُّونَ رَجُلًا، وَمِنَ الْمُهَاجِرِينَ سِتَّةٌ، فَمَثَّلُوا بِهِمْ، وَفِيهِمْ حَمْزَةُ فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: لَئِنْ أَصَبْنَاهُمْ يَوْمًا مِثْلَ هَذَا لَنُرْبِيَنَّ عَلَيْهِمْ. فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ، وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ) (النحل: ١٢٦) فَقَالَ رَجُلٌ: لَا قُرَيْشَ بَعْدَ الْيَوْمِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كُفُّوا عَنِ الْقَوْمِ غَيْرَ أَرْبَعَةٍ )رواه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ ووافقه الذهبي ، والطبراني في المعجم الاوسط والترمذي قال الالباني صحيح

واتە: لـە ئوبـەی کـوڕی کەعبـەوە هـاتووە خـوا لێـی رازی بـێ دەڵـێ: کـاتێ شـەڕی (ئوحد)روویـدا (٤٦) کـەس لـە ئەنصـار و(٦) لـەموهاجیران کـوژران ، کافرەکـان جەنازەی موسڵمانە کوژراوەکانیان شێواند (واتە:ئەندامـەکانیان دەبـڕین وەك لـوت، گوێ،دەست...) ئەو شێوێندراوانە (حەمزە) شـیان لـە نـاو بـوو، ئەنصـار گوتیـان : ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان ئێمەش بۆمـان رێککـەوت ئاوایـان لـێ دەکەینـەوە، جـا ڕۆژی ئازادکردنی (مکە) ئەم ئایەتە دابـەزی (وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ، وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ) پیاوێك گوتی : لـەمڕۆ بـەدواوە قـوڕیش نـەما، پێغەمبـەر فەرمووی : دەستتان بپارێزن لە خەڵکی جگە چوار کەس.

**دەربارەی ئەم ئایەتانە له سوننەی دارەمیدا هاتووە:**

(عَنْ أَبِي قَزَعَةَ، قَالَ: قِيلَ لِهَرِمِ بْنِ حَيَّانَ: أَوْصِنا قَالَ: (أُوصِيكُمْ بِالْآيَاتِ الْأَوَاخِرِ مِنْ سُورَةِ النَّحْلِ) وَقَرَأَ ابْنُ حَيَّانَ (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ، وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرِينَ وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِاللَّهِ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ، إِنَّ اللهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ) سنن الدارمي

واته: له ئەبی قەزعەوە هاتووە دەڵێ: گوتیان (هەریمی کوڕی حەیان) : ئامۆژگاریمان بکە، ئەویش گوتی (ئامۆژگاریتان دەکەم بە خوێندنی ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (النحل) جا کوڕی حەیان ئەو ئایەتانەی خوێندەوە (أُوصِيكُمْ بِالْآيَاتِ الْأَوَاخِرِ مِنْ سُورَةِ النَّحْلِ) وَقَرَأَ ابْنُ حَيَّانَ (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ، وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرِينَ وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِاللَّهِ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ، إِنَّ اللهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ)

**پێغەمبەر فەرمووی ئارام دەگرم:**

١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ: لَمَّا قُتِلَ حَمْزَةُ وَمُثِّلَ بِهِ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَئِنْ ظَفِرْتُ بِهِمْ لَأُمَثِّلَنَّ بِسَبْعِينَ رَجُلًا مِنْهُمْ. فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ ) (النحل: ١٢٦) فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَلْ نَصْبِرُ) شرح معاني الآثار

